بەدرخان

**خاوەن ئیمتیاز و بەڕێوەبەری بەرپرس**
**حەمید ئەبوبەکر بەدرخان**

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب | مێژووی هۆزی جاف |
| نووسەر | خوسرەو جاف |
| چاپ | چاپی یەکەم - 2012 |
| تایپ | دارا یاسین خەیات - یادگار زوار - هۆڤین سەباح |
| نەخشەسازی ناوەوە | دارا یاسین خەیات |
| نەخشەسازی بەرگ | دانەر «خوسرەو جاف» |
| هەڵەچن | شێرزاد فەقێ ئیسماعیل |
| تیراژ | 1000 دانە |
| ژمارەی سپاردن | لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (     ) ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە |
| نرخ | 20000 بیست هەزار دینار |
| چاپخانە | |

**لەبڵاوکراوەکانی دەزگای (چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان)ە**
**E-mail: bedrxan@yahoo.com** **www.bedrxan.net**

# پێشەکی

کاتــی ئــەوە هاتووە ئێمــەی کورد بەخۆمانــدا راگەیــن و فریای خۆمان کەوین، ئەگینا کڵاوی بابردوومان بە چنگ ناکەوێتەوە، قەینا لەزۆر بواریشدا کڵاومان هەر نەبووە، ئەوە ناگەیەنێت بە تەمای کڵاو نەبین و هەروا سەرمان بــێ کڵاو بمێنێتەوە، ئەگەرچی تا بە ئێســتا چەندیــن کتاوم لە بارەی مێژوو نووســیوەتەوە و یەکێک دووان رۆمانی مێژووییشــم نووسیوە، بەندە خۆم بە مێژوونووس نازانم و ئەوەش دەزانم مێژوو تەنیا پێزانین نییە و بۆخۆی زانســتە و بوارێکی ئەکادیمییە و مرۆڤی پێشــکەوتووی ئەم سەردەمە دانی

پیانــاوە و ســەلماندوویەتی. بەداخــەوە ئێمــەی کورد لەم بوارەشــدا لەنگ دەڕۆین و دەســتەپاچە و ســەردەرگومین و ئەوی نووســراوە پاش خوانی مێژوونووسانی تورک و عارەب و عەجەمە و «بۆخوا» بڕێک لە چاوساقانی بە ویژدانی بیانییە.

ڕەنگــە لــە رووی ناچارییــەوە تۆزەکێــک لە بارەی رابــردوو و کورد و وڵاتەکەمیان نووسیبێت. خۆ من باس لەوەی ناکەم بڕێک لەو مێژوونووسە خوانەناســانە رەگــەزی ئێمــەی کوردیان بردووەتەوە ســەر دێو و درنج و جنۆکە و بە درێژایی دوو هەزار و پێنج ســەد ســاڵ نارەوایی و کوشــت و کوشــتار و تاڵان و بڕۆ و چەپاو لە وڵاتەکەماندا، ئەگەر بتەوێ و تۆکمەیی زمانی کوردی نەبوایە، ناوی میللەتێک نەدەبیسترا بە ناوی کورد.

با راستگۆیانە گرفتەکە هەڵسەنگێنێن و هەموو تاوانەکە نەخەینە گەردەن و ئەســتۆی خەڵک، ئەی ئێمــەی کوردی چی؟ کوا مێژووی نووســراومان؟ کــوا تەقەللای لێزانانمان؟ کوا کار و کردەوەی کۆلیژە پســپۆرەکانی مێژوو کــوا؟ ئەی خوا. ئەوە دەســەڵات، ئەوە دارایــی و توانا، ئەوە زانکۆ و کۆلیژە تایبەتییەکانــی بواری مێــژوو، ئەتۆ پێم ناڵێی لە بــواری مێژوودا چیمان بە دەستەوەیە؟

ســەدان و هــەزاران، تەپۆلکە و جێ هەوار و ئاســەواری جۆراوجۆر لە کوردستاندا پەخش و بڵاون، بڕێکیان بە ناوی «گاوری» ناسراون و بڕێکی دیکەیان بە ناوی ســەحابە و نازانم چی ناودەبرێن. ســەدان هەزاران ســاڵ گــوزەراوە و ئــاش هەمان ئاشــە. باشــە وەرە بمکوژە، ئێمــەی کورد کەی دەتوانیــن ڕێچکەی رابــردووی خۆمان و وڵاتەکەمــان هەڵگرین و پەنجە لە ڕووداوە راستەقینەکان گیربکەین و ئەوەی ئەوڕۆ بەکەڵکە و هی ئێمە بووە و ئێســتا هــی خەڵکــە بیگێڕینەوە باوان. ئەمــە تەماحێکــی زۆر نییە. ئەگەر هەست بە بەرپرسیاری بکرێت و مەودا و بوار بدرێتە لێزانەکان، بە ئاسانی دەتوانین دارایی دزراومان نوت کەین و لەهەلدا بیگێڕینەوە باوان...

بەندە کابرایەک نیم ئاسان دەستەمۆ کرێم و سەری تەسلیم دانوێنمەوە. نەخێر. ئەوەی دەزانم میللەتانی ئەوڕۆی دنیای پێشکەوتوو بەم قۆناغی ئێمەدا لە مێژە گوزەراون و وەک ئێمە خۆیان نەداوەتە دەست ڕێکەوت و سبەینێوە. بەلایانەوە سبەینێ هەمان ڕۆژ بووە تیادابوون با ئەوەش بڵێم من لە رووی دەمارگرژی خێڵەکییانەوە «مێژووی جاف»م نەنووسیوە، بە پێچەوانەوە بە ئەرکێکی نەتەوایەتیم زانیوە مێژووی ئەم هۆزە گەورەی کوردە، پانتاییەکی بەربڵاوی مێژووی میللەتەکەمی بەخۆوە گرتووە، ئەگەر تۆش وەک من مێژووی ڕووداوێکی ڕاستەقینەی ئەم میللەتە بخەیتە سەر کاغەز و بکەوێتە کتاوخانەی کوردییەوە، لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا ئەو زانیارییە ئەکادیمییانە لەیەک دەدرێنەوە و دەبنە خاوەنی مێژووی نووسراو..

بێ شک، ئەم کتاوەی لەبەردەستدایە بێ کەم و کورتی نییە. زیاتر لە سێ ساڵە پێوەی خەریکم، پەیوەندیم بە زۆر کەسەوە کرد، تا لە بارەی باو و باپیرانیان زانیاریم بۆ بنێرن، بڕێکیان هەستیان بە گرنگیی داواکەم کرد و هەناردیان، بڕێکی دیکەیان کەمتەرخەم و داواکەمیان خستە پشتگوێ، ئەگەر هەست بە کەموکوڕییەک بکرێت، تاوانەکە تەنیا من نیم و زۆری کەمتەرخەمەکان دەگرێتەوە.

بەسەر ئەوەشدا بەش بەحاڵی خۆم داوای لێبووردنتان لێ دەکەم و هەر ئەوەندەم پێکراوە لەگەڵ ڕێزدا.

**خوسرەو جاف**
**٢٠١٢/١/١**



کەیخوسرەو بەگی گەورە باوکی حەمە پاشای جاف
وێنەکەی لەلایەن گەڕیدەی ئینگلیزی «کلودیۆس ریچ»ەوە کێشراوە ١٨٢٠




قەڵای شێروانە لەلایەن حەمە پاشای جافەوە دروستکراوە، وەک زستانە هەوار تیایدا دانیشتووە




حەمە پاشای جاف



پەیکەری حەمە پاشای جاف
لەلایەن پەیکەرسازی گەورەی
عارەب «محەمەد غەنی
حیکمەت»ەوە دروستکراوە



عادیله خانم خێزانی وەسمان پاشای جاف و دایکی ئەحمەد موختار جاف و تایەر بەگی جاف




حەمە بەگی جاف
نوێنەری کەرکووک لە یەکەمین پەرلەمانی عێراقدا



سالّی ١٩٣٨، کەلار، لە راستەوە:
کەریم بەگی جاف
عەبدولڕەحمان بەگی جاف
ڕەزا بەگی جاف
داود بەگی جاف
خالید بەگی جاف
ئەحمەدی برا حەمە
حەمومین بەگی جاف
مەحموود بەگی جاف
مستەفا بەگی جاف
شەوکەت بەگی جاف



وێنەیەکی مێژوویی ١٩١٩
دانیشتوان لە راستەوە بۆ چەپ:
ئەحمەد بەگی ریشین، عادیلە خانم خێزانی وەسمان پاشای جاف، کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف
وەستاو لە راستەوە:
عەلی ئەحمەد بەگی جاف، ئەحمەد موختار جاف، حەمە بەگی جاف باپیری «نووسەر»، داود بەگی حەمە سەعید بەگی جاف

# ناوی جاف

لەم رووەوە زۆر لێدوان هەیە و زۆر لە مێژوونووسان بە پێی لێکدانەوەی خۆیان بێ ئەوەی هیچ بەڵگە و دیکۆمێنتێکی مێژووییان بە دەستەوە بێت، زاراوەی «جاف»یان لێکداوەتەوە، ئیتر هەر کەسە و بە بۆچوونی خۆی شتێکی وتووە یان نووسیوە، ئەمەش دیاردەیەکی تازە نییە، لە چۆنیەتی و دیاری نەکراوی و هەروەها بوونی مێژووی کورد...

هەر ئەو بێ خێوی و خاوەنییە، هەر ئەو نەبوونی دەسەڵات و دەوڵەتی سەربەخۆییەی کوردییە، هەر ئەو پابەند بە ناوەندی دەسەڵاتی فارس و تورک و عارەبە، ئەویش بە درێژی زەمانێکی زۆر، رەنگە هەزاران ساڵەی وایکردووە، لە تەواوی بوارەکاندا ئەوەی هەمان بووە و ئەورۆ بەکەڵکە لێمان دزراوە و ئەورۆ هی خەڵکە. ئەوی مێژووی ئێمەی کوردی نووسیوە غەیری کوردە و بە زمان و پێنووسی رەگەزەکانی دەوروبەرمان نووسراوە و تا رادەیەکی زۆریش لایەنگریی رەگەزی خۆیان کردووە و دەمارگرژیشی پێوە دەرخستووە، یان ئەگەر مێژوونووسێکی بە رەگەز کوردیش هەڵکەوتبێت قەڵەمەکەی لە خزمەتی دەوڵەت و دەسەڵاتی ناوەندا بووە، رەگەزەکەی خۆی و نانی بە نرخی رۆژی خواردووە و تەپڵی دەسەڵاتی سەرکەوتووانی لێداوە. بۆیە برێک لە باوەڕەکانی مێژووی نووسراو، زۆرتر مێژووی سەرکەوتووان و دەسەڵاتدارانە و لە رووداوە راستەقینەکانەوە تا رادەیەکی زۆر بە دوورە و هەر لەبەر ئەوەشە دەوترێت رۆژێک

دێـت، دووباره مێژووی گەلان بنووسـرێتەوە، دەڵێین: (دەنـگ و لەرزینەوەی «زبزبات»ی دەنگ هەرگیـز لـە ناو ناچێت و ئەگەرچی هەزاران سـاڵی بەسـەردا بگوزەرێت ئەو دەنگە لە ئاسـماندا رەهایـە، بەڕەڵڵایـە، رۆژێک دێت ئـەو دەنگانە مرۆڤ بیگێرێتـەوە. «التقاط»، ئـەو کاتە تەواوی بنەمای مێژووی نووسـراو لەبن وەدەر دێت و راسـتەقینەی مێـژوو وەدەر دەکەوێت، بەندە ئەو رۆژە بە دوور نازانم، بیر لە فاکس و ئیمێلی ئەلیکترۆنی بکەوە، بە ئومێدی ئەو رۆژە..

ئـەو جـۆرە زوڵم و زۆر و زەوت و بە هی خۆکردنە تەنیا لـە بواری مێژوودا نەبووە، بەڵکو ئـەوی وشـەی جوانـە واژەی مەوزوونە، ئەوی پەنـد و حیکەمەت و وتەی پەسـن و کولتوور و کەلەپوور و ئاداب و نەریتی شـیاوی ئێمەی کوردە، زۆردارانی دەرو دراوسـێمان خۆیان کردۆتە خاوەنـی، ئێمـەی کوردیـش لە بـەر نەبوونی دەوڵەت و دەسـەڵات و لێزان و چاوسـاقیی بوارە جۆراوجۆرەکان لە هەموو لایەکەوە، تاڵان و چەپاو کراوین و تا بە دوێنێ دەسـتمان لە هەمانەی خاڵییەوە وەدەر هاتووە.

ئەگەر راستەقینەیەکی «حەی عەلا سەلاتیش» وەبەر چاوەوە بێت لیمانیان چەواشە کردووە و بـە هەڵەیـان بردووین، هەر بە ناوێکدا بنواڕە، چەند لێکدانەوەی جۆراوجۆری بێ حیسـابی بێ کیتابیان کردووە و بڕیویانە دووریشیانە...

خۆ ناشوکری خوا نەبێت، من بە تەمای لێکدانەوەی ئەکادیمی یان بۆ خوا پۆی بە مێژووەوە بێت. خۆ نیم. خۆ هەر نەبێت، دەبووا سـەرپێیانەش بوایە بیاننواڕییە بڕێک سـەرچاوەدا، قەینا هی دوژمنانـی ئێمـەی کوردیش بوایەن، چونکی بە کەمێک وردەکاری و لێکدانەوەی رووکەشـانەش، درۆ و دەلەسەکانیان بە زەقی وەدەردەکەوێت. جێگەی داخە ئەوەیان نەکردووە، یان نەیانتوانیوە، یان دەسـتیان لە سـەرچاوە مێژووییەکان گیر نەبووە، تەنیا لێکدانەوەی خۆیان و هەڵسـەنگاندنی تایبەتمەندیی خۆیان بڕێک شتیان سەلماندووە.

با بگەڕێینەوە سەر زاراوەی «جاف» و وردبینەوە و تەماشا بکەین، نووسەر و مێژوونووسی لێزانە بیانییەکان و خۆماڵییەکانیش هەتا وەکو سەرۆک خێڵەکانیش لە بارەی «جاف» چ دەڵێن و چییان وتووە.

وشەی «جاف» بڕێک لایان وایە وشەیەکی عارەبییە و بە مانای «وشک» دێت، ئەم لێکدانەوەیە زاراوەییە، لەگەڵ هۆزێکی واگەورە و گراندا ناگونجێت و هیچ دیکۆمێنتی مێژوویی بە دەسـتەوە نییە، تا ئەوە بسـەلمێنێت، چ لـە رووی «ئینتەرپۆلۆژی»یەوە یان جوگرافـی، بۆ نموونە، بەندەی نووسـەر، ناوم «خوسـرەو»ەوە، بە زمانی عارەبی یانی «دۆڕاو»، لە کاتێکدا لە زمانی فارسـیدا ناوی شاکان بووە و بە ناوێکی پیرۆز لە قەڵەم دراوە...

لە زمانی فارسیدا زاراوەی «جاف» مانایەکی نەشیاو و ناحەز دەگەیەنێت، لە فارسی کۆندا و بە گوێرەی بڕێک سەرچاوەی زمانەوانی، زاراوەی «جاف» بە ئافرەتێک دەوترێت بە مێردێک رازی نەبێت و پێوەسـتە لە گۆڕینی هاوسـەردا بووبێت، ئەمەش بەندە بە شـیاوی نازانم و بە دووری دەزانـم، نـاوی ئـاوا هۆزێک، هەر هۆزێکی تر بـەو ناوە رازی بووبێت و کەمتەرخەمیش نیشـان بدا و لە سـەرەتاوە نەکۆشـابێت، ئەو ناوە بگۆڕێت، بە تایبەت لە سەردەمەکانی رابردوودا هێندە دەمارگرژیـی قەبەلـی و هۆزایەتی بە هێز بووە. ئیدی هۆزێکی کۆچەری فرە ژمارەی تا رادەیەک

سەرەتایی چۆن بێدەنگ دەبێت، ئاوا ناوێکی هەبێت، ئەمە لە لۆژیکی ئەو دەمە و ئێستاشەوە من بە دووری دەزانم، لاشم وا نییە، فارسەکان لە رووی بێ بایکردنی هۆزی جافەوە، ئەو ناوەیان لەو هۆزە نابێت، بەڵکو تەنیا وشەیەکی رێکەوتییە و بەس. وەک ناوی بەندە کە «خوسرەو)ە و لە عارەبیدا یانی دۆڕاو.

لە زمانی تورکیشدا هیچ مانایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێت، تازە ئێمە ئەگەر بێت و تەنیا زمانی دەوروبەرمان بکەینە دیکۆمێنت و وا بزانین «ئایەتی مونەزلن!» رەنگە نەگەینە هیچ جێگە و شوێنێک و تەواوی ژیانمان لەسەر بنچینە و بناغەیەکی ئاشوفتە و پەریشان بونیاد دانەین...
خۆ ئەگەر لە زمانەکانی تری دنیادا، کە هەزاران کیلۆمەتر لە ئێمەوە دوورن، رەنگە هەزاران وشە و واژەی هاوبەش لە نێواندا هەبێت، بەندە سەدان کەسم دیوە لە وڵاتە ئەوروپییەکان و لە ئەمریکادا ناویان «جافJAFF» بووە و نەک ئێمەی جاف، رەنگە نەشزانێت میللەتێک هەیە بە ناوی کوردەوە..

لە دنیای ئەمڕۆدا لە یەکچوونی ناو بە بەڵگە و دیکۆمێنت لەقەڵەم نادرێت و لە بواری مێژووییشەوە هیچ نرخ و بەهایەکی ئەکادیمی نییە و باسیش ناکرێت..
با بێینەوە لای نووسەر و مێژوونووسانی لای خۆمان. مامۆستا «عەلائودینی سجادی» دەڵێت: زاراوەی جاف لە جەفاکێشەوە هاتووە، گوایە وەختی خۆی یەکێک لە شاکانی زنجیرە دەسەڵاتی سەفەوییە، دەستەیەکی پێکەوە ناوە، بۆ پەلامار و پێش قەرەوڵی لەشکر و شەڕ و کوشتن و بڕین، لە بەر ئازایی و چاونەترسی ئەو کۆمەڵە ناونراون «جەفاکێش»..
باشە ئەو کۆمەڵە، ئایا تەنها هەر لە «جاف» پێکهاتوون یان تیرە و هۆزی دیکەشیان لەگەڵدا بووە؟.

ئەگەر هەبووە ئەوان ناویان چ بووە؟
با نەختێک بە وردەکارییەوە لەو رووەوە بدوێین. پایتەختی دەسەڵاتی سەفەوی، لە ئەسفەهاندا بووە و ئەوی روونە و ئاشکرایە ئەو دەسەڵاتە بە زۆری شمشێر و کوشتن و بڕین و داپڵۆسین زۆربەی زۆری دەوروبەری خۆیان و زۆرینەی ئێرانیان کردووتە «شیعە» مەزهەب، ئایا لە دەسەڵاتێکی وا دەمارگرژ و خوێناوی رەفتار، دەگونجێت بڕێک شەڕکەری «سونی» مەزهەبی وەک جاف لە دەوروبەری پایتەختدا دابمەزرێنن، یان بیانکەن بە دەمڕاست و بکوژ و ببڕ؟، ئەوەندە بە زەبر و دەسەڵات بن جەور و جەفا و ئەوی زەحمەت و پەلامار هەیە بخرێتە ئەستۆی ئەو کۆمەڵەوە کە بە «جەفاکێشی» ناو ببرێن؟.

ئەو جۆرە لێکدانەوەیە کە دوورە لە واقیعی جوگرافی و عەشایەری، بیروڕای ئەو سەردەمە، ئەوی لە دەوروبەری شاری ئەسفەهاندا دەژین، هەر هەموویان ئەوسا و ئێستاش هۆز و عەشایری ناسراوی بەهێزی شیعە مەزهەبی دەمارگرژی وەک لوڕ و بەختیاری و قەشقایی و هی تریشن.
ئایا دەگونجێت هەزار، یان دووهەزار سواری «سونی» مەزهەب، بە رەگەز کورد داربەدەست و دەسەڵاتداری ئەو دەڤەر و دەوروبەرەبن..؟ بە جۆرێک بە زەحمەتکێش و پەرچەمدار و سەرەنجام «جەفاکێش» ناو ببرێن؟

«قانع»ی شاعیر دەڵێت: جاف، پاشماوەی هەمان دەستە و سوارە دەسەڵاتدارەکانی دەوروبەری

پایەختی سەفەوییەن، کە بکاتە ئەسفەهان، بە تایبەت لە سەردەمی دوای شا زنجیرە دەسەڵاتی سەفەوییە، «شا سوڵتانی حوسەینی سەفەوی» و بە جەفاکێش ناودەبران و بە گوێرەی زەمان «جەفاکێش 1722.» بووە بە جاف.

ئەم بۆچوونەش زۆر کرچ و کاڵە و لە واقیعییەتەوە دوورە، ئەوانەی ئاگاداری دوادوای دەسەڵاتی سەفەوی بن، بە تایبەت شارەزای کەسایەتی «شا سوڵتان حوسێن سەفەوی» بن، کە ئەورۆ لە سەرتاسەری ئێراندا بۆ ترسنۆکی و بێ دەسەڵاتی ناوی «شا سوڵتان حوسێنی سەفەوی دێننەوە، دەگونجێت کابرایەکی وا، ئاوا جەماعەت و کۆمەڵێک لە دەوری خۆی کۆکاتەوە، بۆ پارێزگاری زەوار و رێگا بازرگانییەکان، وەک «قانع» دەڵێت، ئەو کۆمەڵە سوارە بە ناوی سوارەی «جەفایی» ناونراون و هەر ئەو سوارە جەفایانە لە جێی پاراستنی زەوار و رێگاکان بۆ خۆیان دەستیان کردووە بە تاڵان و رووتکردنەوەی دەوروبەر و رێگا و بان، ئایا ئاسایش بە وان پارێزراوە..؟

کەریم بەگی جاف، سەرۆکی ئەو وەختەی سەرتاسەری هۆزی جاف، لەم رووەوە دەڵێت: هۆزی جاف، هۆزێکی ئازا و دلێر و نەترس بوونە و هەمیشە لە پێشەوەی لەشکرکێشی دەسەڵاتدارانی کوردستاندا بوون، پەیوەستە جەفای سەرتاسەری لەشکرەکەیان کێشاوە و ناونراون «جەفاکێش» و بە گوێرەی درێژەی زەمان وشەی جەفاکێش گۆڕاوە بە جاف.

برێکی تر بۆچوونی تریان هەیە و لایان وایە وشەی «جاف» لە «جەعفەر»ەوە هاتووە و پیاوێک ناوی جەعفەر بووە و نەوەی خستۆتەوە، لە داوییدا بووە بە «جەعفەری» و ئەو ناوەش گۆڕاوە و بووە بە «جافری» و بووە بە «جافی»، سەرەنجام بووە بە «جاف»، وەک سەفەوی، عەباسی، عوسمانی، من لام وانییە ناوی جاف، لە جەعفەرەوە هاتبێت، ئەگەر ئەورۆکە سەرتاسەری ناوی تیرەکانی جاف بگەڕێیت کە بە جافی کوردستانی رۆژهەڵاتەوە دەگەنە سێ ملیۆن کەس، رەنگە سەد «جەعفەر» ناو بەرگوێ نەکەوێت، هەر ئەو پیتی «ع»یە، بۆخۆی قورگ و دەم و لێوی کوردی سۆران برێک زەحمەتە، لەوانە گوزەشتە ئەگەر لە «جەعفەری»یەوە هاتبێت، یانی هەر نەبێت، دەبێ دووسەد ساڵێک ئەو ناوەیان بەسەرەوە بێت و بەو ناوەوە ناسراو بن، (هۆزی جەعفەری)، عەشیرەتی جەعفەری، خێڵ و زەواری جەعفەری)، هەر کەسێک ئەو ناوە ببیستێت راستەوخۆ پێی وایە ئەو هۆزە شیعە مەزهەب بن، لە خۆشەویستیی حەزرەتی جەعفەری ئیمامی شەشەم، ئەو ناوەیان لە خۆ ناوە، لەولاشەوە ئاشکرایە عەشیرەتی جاف هەرگیز لە کوردستان لە کوشتن و برین و بگرە و بەردەی سەفەوییەکاندا نەچوونەتە دەرەوە، بەر کوشتاری نەکەوتوون، تا بە زۆر بکرێنە شیعە مەزهەب و لە مێژووی «جاف»یشدا نەبیستراوە کە یەکێک لە سەرۆکەکانی «جاف» ناوی «جەعفەر» بووبێت.

مامۆستا جەمال بابانیش هەر دەیباتەوە بۆ لای ناوی «جەعفەر» و گوایە بنەمای ناوی «جاف» لە جەعفەرەوە هاتبێت. هەر لەبەر پیتی «ج»؟ باشە بۆ لە ناوی (جەمال، یان جومعە یان جەبار)ەوە نەهاتبێت؟

مامۆستا «بابان» دەڵێت: «دێیەک لە ناوچەی قەرەداغ هەیە بە ناوی «جافەران»، بۆم دەرکەوتووە ئەو ناوەش هەر لە جەعفەرەوە هاتووە..»

من وا دەزانم ئەو دێیەی لەو بەرزاییەدا بونیات نراوە سەرەتا یەکێک بووە لە هەوارگەکانی هـۆزی «جـاف» لە هاتووچۆی گەرمیان و کوێستانیاندا وەک زانراوە هۆزی جاف خاوەنی مەڕ و ماڵات و ئاژیڵی زۆر بوونە و ژیانیان بەسـەر ئاژیلدارییەوە گوزەراوە، بە پێی ڕێکەی گەرمیان و کوێستانی ئەو هۆزە کە سێ ڕێگەیان دەگرت، یەکێک لەو سێ ڕێچکەیە ئەو دەڤەرە بووە، لەو نیوە تەختەڵانییەدا بۆماوەیەک دەبەزین و دەیانکردە هەوارگەی پەچەڕانی خۆیان و ئاژیلەکانیان، بۆیە ناونراوە جافەران.

«سەجادی»یش هەر دەیباتەوە لای «جەعفەر» ناوێک و گوایە ئەو ناوە بووە بە «جافر» و وەک چۆن (مارف) بووە بە (مارە) و ئەحمەد بووە بە ئەحە..

ئەگەر وابێت ئەی پەیوەندی و پۆی نێوان «مەحموود» و خولە دەبێ چی بێت؟.

مامۆستا «مەلا عەبدولکەریمی مودەریس» لای وایـە، بنەمای ناوی «جاف» لە «ژاف»ەوە بووە، یانی «تەڕ» لەبەر ئەوەی هۆزی جاف ئاژیلدار بوونە و پەیوەستە بەدوای سـەوزەڵانی و گژوگیادا ڕۆیشتوون، ئەو ناوەیان لێنراوە. ئەمەی مامۆستا مودەریس دەیڵێت بۆچوونی تایبەتی ئەوە و هیچ بەڵگەیەکی تری بە دەستەوە نییە..

دنیـا ئەوسـا زۆر گـەورە و بـەرەڵا و پـان و پۆڕ بـووە، هـەر میللەتێک هـەر وڵاتێک وای دەزانی وڵاتەکەی ئەو ناوەڕاستی زەوییە، میسرییەکانی سەردەمی فەراعینە «باکوور» بەلایانەوە پێچەوانە بووە، لەبەر ئەوەی «نیل» لە باشوورەوە بەرەو باکوور هەڵکشاوە، کاتێک میسرییەکان بۆ یەکەم جار چاویان بە ڕووباری فورات کەوتووە، تووشـی سەرسـامی و واق وڕمان هاتوون، کە ئەو ڕووبارە بۆ وا پێچەوانە دەڕوا، پێوانە و ئەندازە بە ئەوەندە گوریس یان بەردهاوێژێک یان ئەوەندە گەزی شا دابین کراوە، هەروەها ناوەکانیش لەسەر ڕووداو یان کارێک یان کردەوەیەک ناونـراون، سـەرباقی ئەوانەش ئایین و مەزهەب و جوگرافیا و ڕەگـەز و جۆری ژیانی ئابووری و ئاژیل و جانەوەران دەورێکی کاریگەرییان لە چۆنیەتی ناودا هەبووە. ئێسـتاش لە بڕێک وڵاتدا وەک ئەوسـا وایە، ئەوڕۆکە دنیا گەلێک بچووک بووتەوە، تەکنیک و تەکنەلۆژیا گەیشـتۆتە رادە و پلە و زل زەلامەی دنیادا ئەگەر ڕووداوێک ڕوویدا، لە چرکەیەکدا دەگاتە سەرتاسـەری جیهان، زۆر مرۆڤی ئەوڕۆ، نەک سـەد سـاڵ، بەڵکو لەگەڵ دوو ساڵی رابردوودا جیاوازە، بە ئاسان شت ناسـەلمێنێت، سەرشـۆڕی ژیانی هەروەها بوون نییە و بە عەقڵ و مەنتیق و چاوی بیردەکاتەوە، حەقی خۆشـیەتی، نەناچاری سـەلماندنە و نە نیازی بە لێکدانەوەی جۆراوجۆرە. تەنیا باوەڕی بە دیکۆمێنت و بەڵگەیە، کاتێک دەیسەلمێنێت بەڵگەی بەدەستەوە بێت، بێ شک هەر ئەم جۆرە ژیانە بوونـە هـۆی بەربڵاوی عیلمانیەتی موتڵەق و زۆر کەس لە بیـروڕای ئایینییەوە بە دوورن «خوا بمانپارێزێت...».

بەندە لام وایە مرۆڤ بە خۆیدا دەچێتەوە و زۆر لەو بیروڕایانەی لە بارەی ڕووداوەکانی مێژوو نووسـراون بە هـۆی زەرووڕەتێکەوە وەک مێژوو تۆمارکراون، ئەمڕۆ نا سـبەی تووڕی دەداتە لاوە و حەقیقەتی مێژوویی دەنووسرێتەوە. هەر بە مێژووی نەتەوایەتی کوردا لێکبیدەرەوە لەبەر ئەوەی ئێمەی کورد چەندین سەدە دەسەڵات و دەوڵەتمان نەبووە، مێژووشمان بە شێوەی پێویست نادیارییە و نەزانراوە. هەزاران ساڵە لەم وڵاتەدا ژیاوین خۆ لە ئاسمانەوە دانەباریووین..

ئەوی لە وڵاتەکەماندا بە چاک و خراپەوە ڕوویداوە، بە لای سـەرکەوتووان و داگیرکارانەوە

هــی ئێمــەی کورد نییە و بە هەوەســی خۆیان نووســیویانەتەوە، ڕەنگە لە زۆر جێگە و شــوێنی تری ئەم جیهانە هەر وا بووبێت، هەر وا وەک لای ئێمەی کورد مێژوونووســرابێت، جێگە و شــار و شــوێن و خەڵــک ناونرابێت، ئــەوڕۆی دنیا جیاوازە، ڕۆژ نییە هەڵە دەقگرتووەکان بە شــێوەی ڕاســتەقینە نەخرێتــەوە بەرچاو، وا باوە کە کاوەی ئاســنگەر زوهاکی کوشــتووە، دەرکەوتووە، درۆیەکی زەقە و لە ناو ئێمەی کوردا بووە بە باوەڕ و باو، ئەوڕۆ بێت یا ســبەی تێکڕای میللەت ئەوەی تێدەگا ئەوە هەڵەیە. ئەوڕۆ لەگەڵ دوێنێدا جیاوازە. دوێنێ بە زەحمەت دەتوانرا تاتە بەردە نووســراوە کان ئەوانەی لە سەرەتاوە نووســراون، بخوێنرێتەوە و لە یەک بدرێتەوە، ئەوڕۆ ئەو زمانە لە بیرچووانە بە تەواوی پیت و موفرەداتییەوە زانراوە و شی کراوەتەوە و لە بڕێک کۆلیژی تایبەتمەنــدا قســەی پــێ دەکەن، ئەوڕۆ بڕێک ئامێر و دەســتگا و ئالات بە دەســتی مرۆڤەوەیە لە قووڵایی بنی زەویشدا پارچە ئاسنێک بەدی دەکا، ئەوڕۆ نەخشەی کووچە و کۆڵان و ساختمان و سەرشورگە و بەشە جۆراوجۆرەکانی شارە لەبیرچووەکانی زنجیرە دەسەڵاتەکانی مێژوو لەبەر دەســتدایە و دابین کراوەتەوە، مرۆڤی ئەمڕۆ لە بارەی بنەما زانستەکان، یان بەدەستهێنانی بەڵگە و دیکۆمێنــت زۆر کــەم نیازی دەکەوێتە لێکدانــەوە و بۆچوونی تایبەت و تیۆری «ڕەنگە وابێت» ڕاســتە ئێمــەی کورد لە زۆر بواردا لــە یەکەمین قۆناغداین، بەڵام میللەتانــی کەی دوور و نزیک لە ئێمە زووتر گەیشــتوون و نەزانراوەکان تێگەیشــتوون، لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە (ئەگەر کاوەی ئاســنگەر ئەو شۆڕشــگێڕە بێت وا لای ئێمە بەو شێوەیە ناســراوە، کە پەلاماری کۆشکی زوڵم و زۆری «زوهاک» بدا و بە چەکوش سەری پان بکاتەوە....)، برا فارسەکان هەروا بێدەنگ دەبن و دەڵێن: قەینا لێگەڕێ با بۆ مامە کوردەی بن دەســتی خۆمان بێت؟. لە کاتێکدا شــانامەی فیردەوسی، ئێرانیە دەمارگرژەکان بە قورئانی خۆیانی دادەنێن..؟ ئەوان لەوەی دڵنیان لە شانامەی فردەوســیدا ئاوا پەلامارێک و بە چەکوشــی کاوە «زوهاک» کوشــتنێکی تیادا نییە. ئەوی ئێمەی کورد دروســتمان کردووە چەکوشــەکەی تیادایە «حەیف» داسەکەی کەمە...! کەواتە ئەوڕۆ بێت یا ســبەی مرۆڤی داهاتوو تــەواوی مەتەڵە هەڵنەهێنراوەکان بــە وردی هەڵدێنێت و دەیخاتە روو چەندین ساڵ لەمەوبەر، ناو و زاراوەی «جاوان» و هۆزی «جاوان» و پەیوەندی نێوان «جاف» و «جاوان» نەزانرابوو، ئەوڕۆ چەندین بەڵگە و ســەرچاوە و دیکۆمێنت بە دەســتەوەن. ڕۆژ بە ڕۆژیش بەڵگەی زۆرتر دەکەونە بەردەســت و بە تایبەت ئەوانەی لە بارەی میللەتی کوردەوەیە.. ئەگەر دەوڵەتەکانی «تورک» و عەجەم و عارەب دەکۆشن ئەوەی بەڵگەیە و پەیوەندی بە میللەتی کوردەوە هەیە بیشارنەوە و رووی نەکەن، بۆ نموونە لە (دار الوثائق العثمانیة) یانی (بەڵگەخانەی عوسمانی) سەد ملیۆن بەڵگەی تێدا دەپارێزرێت، لێکیبدەرەوە «سەد ملیۆن» بەڵگە، داخۆ چەنێکی لە بارەی کورد و جوگرافیا و مێژوو، ڕووداو و کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە بێت؟...

ئەو سامانە مێژووییە، ئەوڕۆ بێت یا سبەی ڕەگەزپەرستانی تورک و دەمارگرژەکانی دەسەڵاتی تورک ناتوانن بۆ هەمیشــە بیشــارنەوە، ئەو جۆرە بەڵگانە بە موڵکی مرۆڤایەتی دەناســرێن. هەر دەبێت لەو خەزینانە دەربهێنرێن و بخرێنە روو، ڕاســتی مێژوویی ڕەنگە بۆ ماوەیەک سەرپۆشی بەســەردا دادرێت، بەڵام ڕاســتییەکان هەر وەک خۆیان دەمێننەوە، سالم حوسێن، هونەرمەندێکی سەنتوورژەنی دەماگرژی عارەبە و لام وایە هێشتا لە ژیاندایە، ویستی نان بە نرخی ڕۆژ بخوات و لە سەردەمی (سەدام حوسێن)دا کتێبێکی لە بارەی مێژووی مەقامەکانی ئێراقی نووسی، ئەوی (ســێ گا، پەنجگا، دەشــت، ماهور، نەهاوەند، ســەبا، بەیات، مەنســووری.. هتد) بوو گوایە ئەوانە تەواویــان مەقاماتــی عارەبین.. لە وڵاتی ئێراندا زیاتر لە ٤٣ دەعوای دیکۆمێنتی دادگایان لەســەر تۆمــار کــردووە و فەرمانی گرتــن و زیندانی کردنیــان وەرگرتووە و بە دەســتیانەوەیە. ئێمەش

ئەگــەر داوای مێــژووی دزراومان لە دادگاکان تۆمار بکەین، رەنگــە تەواوی دادگاکانی جیهان بە کێشەکەماندا رانەگات. با بگەڕێینەوە سەر «جاف و «جاوان».

مینورسکی، رۆژهەڵاتناسی رووسی ناسراو، لای وایە رەگەزی جاف دەگەڕێتەوە بۆ عەشایەری جاوان، هەروەها بە مسۆگەری ناوی جاف لەوانەوە هاتووە..

«عەبــاس عەزاوی» مێژوونووســی عــارەب، ئەویش لای وایە جاوانییــەکان خەڵکی دەڤەری «جوانرۆ» بوونە، کە بەشێکن لە عەشایەری جاف، مامۆستا هەژار، لەم رووەوە دەڵێت: بێگومان «هۆزی جاف»ی ئێســتا پاشــماوەی هــۆزی «گاوان»ی کۆنن و وشــەی جاف لــە (جاوان)ەوە هاتووە.

شەهیدی قەڵەم «جەمیل رۆژبەیانی» مێژوونووسی ناسراو دەڵێت: من لەوە دڵنیام لە کۆنەوە ناوی «جاف» گاڤان بووە و بە شــێوەی کرمانجی ژووروو دواون و تا بە ئەوڕۆش لە دەڤەری «ئەبەشــێو»ی ناوچەی دەماوەندی باکووری رۆژهەڵاتی شــاری تارانی ئەورۆ هەر بەو شێوەیە دەدوێــن و لــە زمانــی عارەبیدا پیتی «گ» کراوە بە «ج»، وەک چــۆن گۆران کراوە بە جولان و «گەلالــی» بــووە بە جلالی، هــەروا «گاڤان» کراوەتــە «جاڤان» لە دوایيــدا «جاڤان» دواتریش «جافان». بۆ دووانە – مثنی- کراوەتە جاف، هەروەها رۆژبەیانی دەفەرموویێت «تا ئێســتاش لە کوردســتاندا لە ناوچەی قەرەحەســەن چەند گوندێک هەن لە نێوان جەباری و قەرەحەســەندا، بە ناوی «جافان».

رۆژبەیانی بەردەوام دەبێ و دەڵێ: «لە مێژدا جاف لەو دێهاتانەدا ژیاون...»

عەباس عەزاوی، ســوورە لەســەر ئەوەی کە هەردوو تیرە، «جاف»ی ئێســتا و «جاوان»ی ئەوســا، ژیانیان لەســەر ئاژەڵدای گوزەراوە. زۆربەی زۆریان لە کۆچ و باردا بوونە و لەوەڕ و لەوەڕگا لە جەوەلان و هاتوچۆیاندا دەوری ســەرەکی هەبووە، هەتاکو لە چۆنیەتی پێوەندییان بە بەشەڕهاتن و دوژمنایەتی... عەزاوی درێژەی پێدەدا و دەڵێ: هۆزی جاوان لە سەردەمی دەسەڵاتی بووەیهییەکاندا تووشی دوو جۆر شەڕ هاتوون، شەڕ و ناکۆکی لەگەڵ دەسەڵاتی دەوروبەریاندا، یانی کارەســاتی سروشــتی. وەک بومەلەرزە و سەرما و بەستەڵەک و بەفر و بارانی هەمیشەیی، وەک زانراوە، دەڤەری دەماوەند دەڤەرێکی چیایی ســەخت و دژوارە، چیای دەماوەند ناسراوە بە چیای کەللەشەکری، کە یەکێکە لە بەرزترین چیای ئێران و زۆربەیان بە ناچاری ئەو ناوچەیەیان بەجێهێڵاوە و لە ناوچەی (جاوان + رو) دابەزیون و لە دواییدا ئەو ناوە گۆڕاوە بووە بە «جوانرۆ» کە ئەورۆکە مەڵبەند و هەوارگەی سەرەکی هۆزی «جاف» بووە تاوەکو ئەمڕۆ..

بە لێکدانەوەیەکی سەرپێیی، راستەوخۆ وەدەردەکەوێت هەوارگەی ئێستای جاف، کە جوانرۆی ئێستایە، ئەوساش هەوارگەی هۆزی جاوان بووە.

ئەوە لۆژیکیانە کەوتە بەر چاومان ئەوی دوودڵی و بۆچوونی جۆراوجۆری فراوان لە بارەی ناوی هۆزی جاف، تووڕ دەداتە لاوە و باپیرەگەورەکانی هۆزی جافی ئێستا هەمان «جاوان»ەکانی ئەوسان، کە شاری «حیللەی» ئێستایان لە ساڵی 1200ز دروست کردووە.

ئەوی وەدەرکەوتووە جاوانەکان دەگەڕێنەوە بۆ جاپانەکان، کە پەلاماردەری سووپا و لەشکری ئیمپراتۆریەتی ساسانی بوونە، لەم رووەوە بەڵگە زۆر بە دەستەوەیە..

بەنــدە لــە بۆچوونی برێک نووســەر و بە حیســاب مێژوونووســی عارەب ناگــرم، لە رووی

دەمارگرژییـــەوە تـــا توانیویانە هـــۆزە کوردەکانیان بردۆتە ســـەر رەگەزی ((قەحتـــان))، خزمێکم گێڕایەوە وتی: کارێکی ئیداریم هەبوو لە وەزارەتی ئەوقاف لە شاری بەغدا، لە ژووری چاوەڕوانیدا چاوەڕوانـــی دیتنـــی وەزیری ئەوقاف بـــووم.. چاوەڕوانییەکەم درێژەی کێشـــا و لە پڕ، کابرایەکی عارەبی عەگال بەســـەر هاتە دەرەوە و وەزیری ئەوقافیشـــی بەدوایدا. عەگال بەسەر هاتە ژووری چاوەڕوانی، کە ســـەرجەم دە دوانزە کەســـێ دەبووین، من ئەو عارەبەم نەدەناسی، بەڵام وەزیرم دەناسی کە بە دوای ئەو عارەبەوە بوو، بۆم دەرکەوت دەبێ ئەو عەگال بەسەرە، کابرایەکی گرنگ بێت.. تومەز ئەمە (حاجی خەیروڵڵای تلفاحە) کە بکاتە باوکی ساجیدەی ژنی سەدام حوسەین، من نە دیبووم نە دەشمناســـی، کە هاتە ژوورەوە یەک راســـت هاتە لای منەوە (جل و بەرگی کوردیم لەبەردابوو)، رووی کردە من و وتی: تۆ لەچی کوڕە مامێکی؟

وتم: ((جاف))م

وتی: دەزانی جاف عارەبە؟

وتم: من پێم وانییە...!!

وتـــی: خۆ بە دەســـتی تۆ نییە.. نەک تەنهـــا جاف، بەڵکو زەنگەنەش عارەبـــە، تاڵەبانی عارەبە، بەرزنجە عارەبن، داودە عارەبن، جەباری عارەبن، پشدەر عارەبن.. ئیدی برێکی دیکەی هەڵدا، خۆم پێ ڕانەگیرا. وتم: شـــێخ بە حیســـابی تۆ بێت ئێمەی کورد بە ئەندازەی تەزبیحێکین... من ئەوەندەم لا روونـــە، ئێمەی جـــاف هەرگیز عارەب نەبووینە و خۆمانیش بە عـــارەب نازانین و نەزانیوە. کە وەڵامم دایەوە، وەزیرەکە لە پشتییەوە ئاماژەی دەکرد بێ دەنگ بم..!

ئەگەر کتێبەکانی ئەو کابرایە بخوێنیتەوە، لەم بابەتانەی زۆر نووســـیوە، درۆکانی گەیشـــتۆتە رادەیـــەک دەڵێت: روحیانەتی، یانی ((رۆحیانەتی خەیروڵڵا تلفاح)) لە شـــەڕی ئوحوددا بەشـــداری کردووە و شـــان بە شـــانی پەیامبەری خودا تیر و کەمانی هاویشتووە و برینداریش کراوە (عەبە خوات بێت)!

ئەگەر سەرۆکێک، لە سەرۆکەکانی جاف، لە نەزانییدا خۆی بە سەید دانابێت، زۆرتر لەبەر دوو هۆ بووە، یەکەمیان: خاوەن دەوڵەت و دەســـەڵات بووە، هێشتا ئەوەی بە کەم زانیوە، تەماحگیری بار و بەندی سەید بوون و شێخایەتییەکەش بووە....

مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، لای وایە، بەگزادەی جوانرۆ و بەگزادەی کوردستانی باشوور، کە ئێمەین دەگەڕێینەوە سەر (پیرخدری شاهۆ)، لەبەر ئەوەی باپیرە گەورەیان ناوی (سەید ئەحمەد بـــەگ) بـــووە... بەندە ئەم بەڵگە و بۆچوونی مامۆســـتا مودەڕیســـە زۆر بە بـــێ بنەما و دیکۆمێنت دادەنێم، ئەگەر تەنها هەر لەبەر ناوی ((ســـەید)) بێت، کە بووەتە پێشـــوەندی ئەحمەد بەگ، دیسان نەگونجاو دێتە بەرچاو، ((ســـەید و بەگ)) دوو نازناوی دیاری و ناســـراون لە مێژووی عارەب و عەجەم و تورک و کوردیشدا نەبینراوە بە یەکێک وترابێت ((سەید بەگ)). ئەوسا و ئێستاش لە ناو هۆزی جاف و هۆزەکانی دیکەشدا ناوی ((سەید)) وەک ناو زۆر دادەنرا. وەک ((سەید براکە)) کە یەکێکە لە پیرە گەورەکانی تایفەکانی ئەهلی حەق. ئەمە ئیتر ســـەی مورادە، ســـەی سەلمانە، سەی یاقوە. تا بە ئەمڕۆ ئەو جۆرە ناوانەش دەتوانم ســـەدانت بۆ بژمێرم، لە لایەکی ترەوە، ئەگەر بێت و ئەم هەموو بنەماڵە سەیدانەی لە ناو عارەب و کورد و عەجەم و تورک و ئەفغان و پاکستانیدا هـــەن و بژمێریـــن، لە ســـەردەمی پەیامبەری خوداوە بە گوێرەی زمان و رەگەز و نەســـل، لەگەڵ واقیعدا ناگونجێن، چون ژمارەی بنەماڵە سەیدەکان لە ناو ئەو رەگەزانەدا لە سەدان ملیۆن کەس زۆرترن، ئەگەر هەر نێرینەیەکی ((سەید)) لە سەرەتاوە هەر یەکەو سەد کوڕی هەبووبێت، دیسان

ناگاتە ئەم ژمارەیە وا لە ناو میللەتانی موسڵماندا بەربڵاون، ئەمە هیچ لە جێگە و ڕێز و حورمەتی بنەماڵــە بە راســتی (ســەیدەکان) کەم ناکاتــەوە، بەڵکو پەنجەمــۆرە بۆ رەســەنایەتییان و ڕێز و حورمەتی رەچەڵەکیان، من لەو بڕوایەدام لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا خوێندەواری کورد، ئەکادیمییانی زانکۆکان، بڕوانامەی ماجستێر و دکتۆرا لەسەر ئەم باسە زۆر تۆمار دەکەن.. ئەمڕۆ نا سبەی، بە وردی دەچنە بن و بنچینەی واقیعی ئەم دیاردەیە، تا بزانن هەر نەبێت ژمارەی راستەقینەی نەسلی سەید لە کوردستاندا بخەنە بەرچاو. ژمارە راستەقینەکەیان چەندن؟ وەک مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس دەڵێت: ئێمەی بەگزادەی جاف سەیدین و (سەید ئەحمەد بەگ) باپیرە گەورەمان کوڕی (پیر خدری شاهۆ)یە و ئێمەش لە نەوە و توخمی ((سەید ئەحمەد بەگ))ین.

وەک زانراوە، بنەماڵەی شــێخەکان، ســەیدەکانی ناو کوردســتان لە باپیرە گەورەیانەوە تا بە ئەمــڕۆ خاوەنــی تەکیە و خانەقا و پەیڕەوی ئالیەتی مورشــید و موریدی بوون، ئێمەی بەگزادەی جاف ئەگەر سەیدین، بۆ لە دوای (سەید ئەحمەد بەگ)ەوە، سەیدێکی ترمان تیادا نەبووە..؟ بۆ نە خانەقایە، نە تەکیەیە و نە ئیرشادێکی ئایینی، نە مورید و دەروێشێک. بۆ لە (سەید ئەحمەد بەگ) دا بڕاوەتەوە؟..

بریا ئێمەی بەگزادەی جاف، سەید بواین، بەڵام قورئان بە حەقەت، فرمان بەسەر (سەیدییەوە)) نەبووە، نە ئەوســا و نە ئێســتاش، بە پێچەوانەوە وەک تەواوی ســەر هۆز و دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمانە پەیوەستە لە شەڕ و شۆڕ و تاڵان و بڕۆدا بووینە و بۆ ساتێک لە پێناوی دەوڵەت و دەســەڵاتدا رانەوەستاوین و لە پێناوی پاراســتنی هۆزەکەیاندا لە هیچ جۆرە تەقەڵلا و پەلامارێک درێغییان نەکردووە. پابەندی وتەیەکی عەشایەری بوون، وەک هۆزە عەرەبەکان وتوویانە (أنصر أخاك ولو كان ظالما). بڕۆرە هانای براکەتەوە ئەگەر زوڵمیشی کردبێت... ئەو وتەیە لە سەرتاسەری عەشایەر و هۆزەکانی ئەوسا و بڕێکی ئێستاشدا یەشتا باوە.

دروســتکردنی شەجەرەنامە سەردەمێک لە ناو کەســایەتییەکانی کۆمەڵگای کوردەواریدا باو بــووە، زۆر کــەس هەوڵی داوە و بۆی کۆشــاوە بە شــێوەیەک لە شــێوەکان رەگــەز و بنچینەی بگەیەنێتە بنەماڵەی شــێخ و ســەید و بنەماڵە ئایینییەکان، بڕێک لە ســاختەکەیاندا سەرکەوتوونە و بۆیان چووەتە ســەر و بڕێکی دیکەیان تووشــی نارەزایی بنەماڵەی شێخ و سەیدەکان هاتوونە و هاتنە پاڵیان ـ أنتماء ـ رەتکردۆتەوە.

دەگێڕنەوە، لە ســاڵانی سییەکاندا (30 ـ 1936ز) شێخ تەهای شێخ مەحموودی شێخ ساڵحی گۆبتەپە، بە دایەرە و دەروێشــەوە دەڕواتە ناو تیرەی (باوەجانی ـ جاف). کابرایەکی دەوڵەمەندی باوەجانــی دەڕواتە لای شــێخ و دیــاری و نەقدینەیــەک دەداتە خزمەتی شــێخ و دەڵێت: قوربان هاتــووم مەرحەمــەت بکەیت و بمکەیتە ((شــێخ))، ئیتر چۆن رێک دەکەون رێــک دەکەون و بۆی تۆمار دەکات: بەڵێ وا تۆ بووی بە شــێخ، ئێســتا هەر ئەو پیاوە کوڕ و کوڕەزاکانی ((شــێخن))، کەچی برا و برازاکانی ((ئومین)) و عەشایەرێکی رووتەن....

هەروا نووســراوە، کە شــاعیری گەورەی کورد (مەولەوی تاوەگۆزی) ســوور بوو لەســەر ((سەید)) بوونی تاوەگۆزی و شەجەرەنامەی بنەماڵەکەی دەبردە لای بڕێک لە شێخە ناسراوەکان تا بۆی تۆمار بکەن و بیسەلمێنن کە بەڵێ ((مەولەوی)) سەیدە. هەر بۆ ئەو مەبەستە ((مەولەوی))

دەڕوا بــۆ لای ((شــێخ فەرەجــی بەرزنجە)) کە شــێخ دەزانێ وا مەولەوی هات، بە دانیشــتوانەکە دەڵێت: دەزانم مەولەوی بۆچی هاتووە، ئێستا سەر دەنێمە سەری...

مەولەوی دادەنیشێت و ئەو دەم بە شێخ فەرەج دەڵێت: وەک دەزانی ئێمە سەیدین و هاتووم شەجەرەنامەکەمان ئیمزا بکەیت..

شێخ فەرەج وەڵامی دەداتەوە: ئاخر مەولەوی ئێوەیەک وەک بزنەکێوی بەو چیای زمناکۆوە، چ پەیوەندییەکتان لەگەڵ ((سادات))دا هەیە؟.

مەولەوی، لێی سوور دەبێتەوە و دەڵێت:

فەرەج ئیمزای دەکەی باشــە، ئەگینا لە حەرەکەت دەخەم.. ئەوانەی نەختێک عەرەبی زان بن، دەزانن مەولەوی چی وتووە...

ناوی (فَرَج) ئەگەر فەتحەکەی لابەی دەبێتە (فرْج) یانی زێی ئافرەت. شێخ فەرەج دەڵێت:ماڵت بەقورگیرێ مەولەوی، با بە دە پەنجە بۆت ئیمزا بکەم.. وەرە دەی سەیدیی..!!

هەر لەبەر ئەوە زۆربەی خەڵک دەکۆشان وەک سەید بناسرێن. تا دەسەڵات و رێز و دەم و چەرمویی پایەی سەیدبوون و شێخایەتی لە ناو کۆمەڵدا بە دەست بهێنن، وەک زانراوە مەنزڵیەتی شێخ و سادات، بە لای سەلاتینی عوسمانییەوە، یان شای ئێرانەوە پەیوەستە پارێزراو بووە، هەر یەکە بە گوێرەی زۆری و بۆری مورشــیدەکانی و بەو شــێوە مانگانە و مەعاشیان بۆ بڕاوەتەوە، یان زەوی و زارییان پێ بەخشــراوە، لەم رووەوە شــاعیری هەمیشە زیندووی کورد شێخ رەزای تاڵەبانی فەرموویەتی:

(ئێوە وتتان ئێمە ساداتین معاشمان نابڕن)

داخی داخانم جەباری وا لە ئێوەشیان بڕی)

ئەم هەڵبەســتی شــێخ رەزایە، دیکۆمێنتێکی باوەڕپێکراوە کە ســادات و بنەماڵەی شــێخەکان زۆربەیان لە لایەن دەســەڵاتەوە مەعاشــیان هەبووە... جگە لەوانە هەر بۆ خۆی نازناوەکە پارە و دەرامەدی خولْقاندووە، خۆ لە ناو دنیای ((تەشەیوع))دا ئەندازەی یەک لە پێنج (خُمُسْ) هی تایفەی ساداتە.

جــا وەرە و تەماشــا بکە، ئیدی خەڵکی بۆ نەکۆشــێت و بەهەر فەلاکەتێــک بووە لە زومرەی ساداتی لە قەڵەم بدەن...

لەبیرمــە، ئەنجوومەنــی ئەدیبانی شــاری ((حله)) لە ســاڵی 1987دا، دەعوەتیان لێ کردم، لە یەکێک لە ســاڵۆنەکانی ئەو شــارەدا کۆڕێکی ئەدەبی شیعر خوێندنەوەیان بۆ گێڕام، تا دەربارەی شــیعر و رۆمان و هونەری میعماری بدوێم. هەر لە ســەرەتای دەســت پێکردنەکەمدا، دەستم بە سەڵاو ناردن کرد بۆ روحیانەتی باو باپیرانم کە لە شاری حیللەدا نێژراون و خوێنیان لە پێناوی ئەم شارەدا رشتووە و عەرەق و خوێنیان تێکەڵاو بووە لە دروستکردنی ئەم شارەدا.

دانیشــتوان بە سەرسامییەوە وتەکانیان وەرگرت تا وتم: براینە، هیچ جێگای سەرسامی نییە، ئەوانەی ئاگاداری مێژووی شــاری (حلله)ن بە وردی دەزانن، هۆزی جاوان و عەشــیرەتی بەنی ئەســەد لە ســەدەی پێنجەمی کۆچیدا دووقۆڵی ئەم شــارەیان دروســتکردووە و من ((خوسرەو جاف)) لە نەوە و نەتیجەی ئەو جاوانیانەم، ئەگەرچی درەنگە بەڵام وا دەبینن گەڕاومەتەوە شاری باو باپیرانم.

دانیشتوان هەمووی بە چەپڵەڕێزانەوە هەستانە سەرپا و بڕیار درا لە دوای کۆڕەکە خەڵکەکە لەگەڵمــا بێن و بڕۆین بۆ ســەر مەزاری شــێخ ((وەرام)) کە مەزارەکەی لــە گەڕەکێکی کۆنی ناو

شاری (حلله)دایه.. شێخ وەرامی ناوبراو ((شێخ بارامه)) که ئەوسا ئەمیر بارام بووه و به درێژی زەمان بووه به ((شێخ که سەرۆکێکی دەمڕاست و ئازا و لێهاتووی جاوانییەکان بووه....))

ئاشـکرایه، زۆر لـه پیتـی ((ب)) کورد دەیکاته پیتـی ((و))، بەتایبەت له نـاو خەڵکه زۆرەکەدا ((عامیانه))، وەک ناوی: سوهراب، که بووه به زوراو، کەباب بووه به کەواو، شەراب، شەراو، یان ناوی ((وارماوه)) له بنەڕەتدا بەهرام ئاوایه..!

ئیدی بەو خەڵکەوه ڕۆیشتینه سەر مەزاری (ئەمیر بارامی جاوانی) دوێنێی به ((شێخ وەرام)) ی ئەمرۆی ناو شاری حلله. لەوێڕا، بەڵێنم دا مەزارەکەی تازه بکەمەوه و به شێوەیەکی ئەمرۆیی دووباره ســازی بکەمەوه. ئەوەبوو ئاســن و شــیش و چیمەنتۆم هەڵڕێژا و یەک هەفته دەستم به ئیش کرد و دەوڵەتی ((بەعس)) کارەکەیان پێ ڕاگرتم و ســووکه گۆبەنێکیان بۆ دروســت کردم و سەرئەنجام سەرکارم چۆڵ کرد بۆ یەکێکی ترم بەجێ هێڵا، ئەو کەسه کام کورده و کێیه و کەی ئەوەی دەبێت؟. نازانم.

دیســان هــەر لەم ڕووەوه، لــه پەرلەمانی عیراقدا، ئەندام بــووم (2005 ـ 2007)، دەربارەی کەرکووک و مادەی 58 کێشه و هەرامان بوو، که نۆره هاته سەر من، جنسێی لیوای کەرکووکم دەرهێنا و به وێنەگری TVیم گوت با لەم جنسییەی من ورد بێتەوه که وێنەکەم هی مێردمنداڵیمه و خەڵکــی کەرکووکــم، بەڵام کێشــەی مــن تەنها لەبەر کەرکــووک نییه، مــن داوای موحافەزەی (حیلله) دەکەم، باپیرەکانی من ئەو شارەیان دروست کردووه، من له نەتەوەی ((جاوانم ـ گاوانم)) باوەڕتان هەبێت نەک تەنها کەرکووک، بەڵکو شاری حیللەتانیشی لێ دەسێنینەوه.. کابرایەکی نایب وەڵامی دامەوه و وتی: ئاشکرایه شاری بەغدا عەباسییەکان دروستیان کردووه، دەکرێت بنەماڵەی عەباسی داوای شاری بەغدا بکات؟

وەڵامم دایەوه: ســەرمایەی بنەماڵەی عەباسی ئەوەیه، یەکەم ئەو شارەیان دروست کردووه، دووهەمیان شــاری بەغدا شــاری عارەبه و ناســراوه به (بلد الرشيد)) یانی شاری هارونه ڕەشید منێکی کورد چی..؟ ئەوەتا تۆ گاڵته به مێژوو دەکەیت و لات وایه یەشــتا هارونه ڕەشــید دەڵێت: ئــەی هەوری ئاســمان بۆ هــەر کوێ بڕۆیت بارانت بەســەر زەوی و زاری ژێر دەســەڵاتی مندا دەبارێنیت، کاکه ئەو جۆره تێفکرینانه بەســەرچووه و ســەدەی بیســت و یەکەمه و مرۆ ((کۆپی)) دەکرێت...

با بگەڕێینەوه ســەر باســەکەمان. ((عەباســی عەزاوی)) له جێگەیەکی تردا دەڵێت: سەرکرده جافــەکان خۆیــان دەگەڕێننەوه ســەر ڕەگەزی عــارەب و دەڵێن ئێمه لەگــەڵ هۆزەکانی (بجیل و عەنزه)دا خزم و خوێشین.

هەروەهــا (منــذر الموصلی)ش هــەروا دەڵێت، گوایه دەگەڕێتەوه ســەر ((عەنزه))ی عارەب و بڕێکی تر له تیرەکانی جاف دەچنه ســەر ئەمەوییەکان و حەزرەتی عوســمانی کوڕی عەفان. ئێمه هەر باشه ڕەگەزمان دەگێڕنەوه سەر بڕێک له تیره عەرەبەکان، خۆ بڕێک مێژوونووس و ((نسّابه)) ی عارەب دەڵێن: کورد، له ڕەگەزی جنۆکەیه، گوایه حەزرەتی سلێمان، چەند چاوساقێک دەنێرێت بۆ دەرەوەی ژێر دەســەڵاتی، تا کۆیله و کەنیزەی بۆ بکڕن. بەسەر زەوارەکەی ویردێک ((دوعا)) فێــر دەکا و دەڵێــت: کــه کەنیزەکانت کڕی و گەڕایتەوه، له هەر کوێــدا هەوارگەت کرد و چادر و دەوارت هەڵدا، خەتێک به دەوری چادرەکاندا بکێشه و ئەو وێرده بخوێنه.. کابرای چاوساق هەروا

دەکا وا حەزرەت فەرمووبووی، شەوێک خەتکێشانی دەوری چادرەکانی لە بیر دەچێت و ئەفەنم شەویَ دێو و عفریت دەنیشنە ناو کۆیلە و کەنیزە، هەر هەموویان بەرباد دەکەن.
زەوار دەگاتە لای حەزرەت و دەست بۆ هەر کامیان دەبات تەماشا دەکات شەڵەقاوە و ئاوسە...
حەزرەت بڕیار دەدات، ئەو کۆیلە و کەنیزانە شاربەدەر بکەن و لە چیاکاندا بەرەڵایان کەن (أكردوهن الى الجبال) بەڵێ ژنگەل، زاوزێ دەکەن و ئێمەی کورد لەبەر ئەو ئافرەتانەین و لە توخمانی دێو و درنج و عفریتەکانین، بنواڕە، بڕێک لە مێژوونووسان چۆن دەربارەمان تێدەفکرن..
لە بیرمە، ساڵی ١٩٨٦ز، سەرۆکی هۆزی (شەممەر) دەعوەتی خوالێخۆشبوو ((سەردار جاف)) یان کرد، کە ئەو دەم سەرۆکی هۆزی جاف بوو، منیش لەگەڵی بووم.. شێخی شەممەر، زۆر رێز و حورمەتی لێ گرتین و لە قسە و باسدا وتی: دەزانن ئێمە و ئێوە یەک رەگەزین و ئامۆزاین..؟
من نەمهێڵا، کاک سەردار هیچ لەو بارەوە بڵێت وتم: جەنابی شێخ، وەڵڵا خۆ راست دەفەرموویت، ئێمە ئامۆزاین، بەڵام پێم سەیرە زرووف و زەمانە ئێوەی چۆن کردۆتە عارەب، حەتمەن لە ناو غەرییبدا ژیاون. مەجلیسەکە زۆر بوو، سەرەتا لە وەڵامەکەی من بێدەنگ بوون، ئەو دەم شێخ هەڵسا و وتی: ئامۆزا ئافەرین بۆ وەڵامەکەت...

ئیدی دەسەڵات، لە ونکردنی حەقیقەتدا لە مێژەوە دەوری نواندووە و هەزار خولەی بە ئەحە کردووە.. ئەوی وەک نووسراوی مێژوویی نووسراوە، بڕێکی یەکجار زۆری ساختە و فکر و نیازی زۆرداران و دەسەڵاتداران بووە...
دەگێڕنەوە: کابرایەکی جافی لای ئێمە، کەر و بارێکی پێ دەبێت، بە رێچکە و رێگەیەکدا دەڕوات، تەنها کەسێکی پیا دەگوزەرێت، لە پڕ کابرایەک لە چەقی رێگاکەدا بۆی رادەوەستێت و جووڵە ناکات.. کابرای جافە سەیرێک دەکا و کابرا هەر راوەستاوە. لە چەقی رێگەکەدا جووڵەی لە خۆی بڕیوە.. تیێ دەخوڕێت و دەڵێت: تەکەو لاوە...
کابرا وەڵامی دەداتەوە... تەک نادەمە لاوە..
جافە تووڕە دەبێ و دەڵێت: تەکە دەی خاسە.. نایدەی وەم مژانە تێمە وێژەتا...
کابرا دەڵێ: ناتوانی ...
جافە مژان دەگرێتە دەستەوە و دوو سێ جار رای دەوەشێنێت و دەڵێ: دەویت باوک ناتوانم چییە و تەواوی قورحان عازای عەنامت ئەهاڕم، مەگەر خۆت وەچی ئەزانیت..؟
کابرا دەڵێت: من شەیتانم..
جافە دەڵێت: ژاوە ژاو، من شەیتانم. شەیتان کەی وەک تۆ وایە. تۆ جوان خاسی...
شەیتان دەڵێت: باشە بە لای تۆوە، شەیتان چۆنە؟
جافە دەڵێت: شەیتانی برا سەگ، شاخێکی شکاوە، کەڵپەی وەدەرەوەیە، خوێن وە دەمیا ئەچۆڕێ.
شەیتان وەڵامی دەداتەوە: ئەوی راستی بێت، من شەیتانم، ئاواش بوومە و ئا ئەمەشم چی دەڵێی.. قەڵەم بە دەستی دوژمنەوەیە، بۆیە تۆ وام تێ دەفکریت.
جا، برا پرسیارێک دێتە پێشەوە ناچارمان دەکات هەر دەبێت فکری لێ بکەیتەوە، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بە وردی بیر لە مێژووی نووسراو بکەینەوە، بە تایبەت ئەوەی پەیوەندی و پۆی لەگەڵ میللەتی کوردا هەیە؟...
رەگەزەکانی دەوروبەرمان، عارەب و عەجەم و تورک بە تەواوی توانایانەوە لە بێ بایەخی و

بە هیچ نەبوونی ئێمەدا کۆشاون، جارێک خۆ دەمارگرژانی تورک، رایان وایە کوردی کوردستانی تورکیا لە هوتێلدان و ئەمڕۆ بێت یا سبەی چۆڵی دەکەن. دوژمنانی میللەتی کورد بە تەواوی توانایانەوە لەو بارانەوە کۆشاون، ئەوی توانیویانە کردوویانە، ئەوی بە چاکیان زانیوە گۆڕیویانە، ئەوی بە کەڵک بووە بردویانە، مێژوو، جوگرافیا، ئابووری، پەند و حیکمەت و کەلتوور و کەلەپوور چەپاویان کردووە و خۆیان بە خاوەنی کردووە، لە بیرمە، رۆمانی ((راز))م چاپکرابوو و کەوتبووە کتێبخانەکان و یەکێتی نووسەرانی ئێراق ئێوارە کۆڕێکیان بۆ کرد و ئیتر ئەوی نووسەر و ئەدیب و رۆژنامەوانی کورد و عەرەب بوون کۆبووبوونەوە. یەکێک لە وردە شان تەکێنەکانی ئەو دەمە، ئاماژەی بەوە کرد، کە رۆمانی ((راز))ی خوسرەو جاف گاڵتە و جەفەنگ بە مێژوو دەکا و لە نرخی مێژوو کەم دەکاتەوە. کابرا، پێی وابوو، بەو خاڵە توانیویە من تەنگەتاو بکات، بۆیە بێ یەک و دوو وەڵامم دایەوە، من کە دەبینم بە هەموو جۆرێک لاپەڕەکانی مێژوو ئەوی هی ئێمەیە زۆری تر خۆیان کردووەتە خاوەنی و توانیویانە گاڵتەشیان بە واقیعیەت و مێژووی میللەتی من کردووە...

بۆیە منیش، ئەو مافە بە خۆم دەدەم گاڵتە و لاقرتێش بە مێژووی گەلانی تر بکەم و مەبەستم لەو رۆمانە خاڵی سەرەکی تیایدا ئەو گاڵتەپێکردنەیە.

با بێینەوە سەر رەگەزی جاف و گرنگی دەوری ئەم هۆزە گەورە و کۆنە مێژووە و چەند پرسیارێک خۆی قوت دەکاتەوە، باشە بۆ ناوی جاف لە شەرەفنامە نەهاتووە؟ ئایا ئەم هۆزە لە زەمانی شەرەفخاندا نەبووە؟ ناویان بە جاف نەزانراوە؟ ژمارەیان کەم بووە؟ جێگە و شوێنیان لە نووسەرەوە دوور بووە؟ یا لە بنەڕەتدا ئەم جافی ئەمڕۆیە تازە پێکهاتووە و بەم ژمارە هۆزێک نەناسراو بووە بە ناوی جاف بووە؟ . من بۆخۆم لە مێژەوە ئەم پرسیارانەم لە بیر و ئەندێشەدا شەڵەقا بوو، هەرچی بیرم دەکردەوە، بە وردی نەدەگەیشتمە وەڵام، بڕیارم دا لە خودی مامۆستا ((جەمیل رۆژبەیانی)) وەرگێڕی شەرەفنامە لە کوردییەوە بۆ عەرەبی، بپرسم و بۆ متمانەی زۆرتر لە خوالێخۆشبووان (مامۆستا مەسعود محەمەد و شەکور)یش بپرسم، هەرواشم کرد، یادی بەخێر بەندە نێوانم لەگەڵ خوالێخۆشبوو (مەلا جەمیل)دا زۆر خۆش بوو، زۆربەی رۆژانی هەینی لەگەڵ مەلا شەکوردا یا دەچووین بۆ لای مامۆستا مەسعود محەمەد، یا بۆ لای مامۆستا رۆژبەیانی..

کە لە مامۆستا رۆژبەیانیم پرسی: بۆ شەرەفخان باسی هۆزی ((جاف))ی بەم ژمارە زۆرەیانەوە نەکردووە و لە بیری کردوون؟ رۆژبەیانی فەرمووی: شەرەفخان لە بیری نەکردووە، بەڵکو بە ئەنقەست نەینووسیوە. باسی هۆزی (هەرکی)شی نەکردووە، (سورچی)یشی فەرامۆش کردووە..

شەرەفخان لە شەرەفنامەدا، تەنها باسی هۆزە دەسەڵاتدارە خاوەن ئیماراتی کردووە، یانی ئەو هۆزانەی نیشتەجێ بوونە. جاف، قەینا هۆزێکی زۆر و زەبەند و زەبەلاح بوونە، بەڵام هەر رۆژە و لە جێگە و شوێنێک و سنوور و حەد و حدودێکیان نەبووە.. هۆزی ((هەرکی))یش و (سورچی)) یش و ئەو هۆزانەی کۆچەری بوون شەرەفخان بە پاشبەندی دەسەڵاتەکانی داناون، (جاف)ی لەسەر حیسابی ئیمارەتی ((بابان)) داناوە، مامۆستا مەسعود محەمەد، لە وەڵامدا وتی: وەڵڵاهی منیش بیرم لەوە کردبووەوە، بەڵام هەرچیم دەکرد خۆمی پێ قانع بکەم، نەمدەتوانی و نەمتوانیوە، ئەو ناو نەهێنانە بسەلمێنم، بەش بە حاڵی خۆم، ناو نەهێنانی (جاف و هەرکی) لە شەرەفنامەدا من بە نەقسی دەزانم، ئەو نەقسە شەرەفخان لە کەمتەرخەمییەوە بووە یان ئەنقەست، بەهەر حاڵ بە لای منەوە نەقسە. مەلا شەکور، رای تری هەبوو دەیوت:

هۆزی جاف لە سەردەمی شەرەفخاندا دەورێکی ئەوتۆیان نەبووە، کۆمەڵێک تیرە و تایفەی هاتوچۆکەر بوونە و لە بارودۆخێکی دەوڵەت و دەسەڵاتەوە وە دوور بوونە.

ئەگەر لە شەرەفنامەدا ورد ببینەوە، شەرەفخان زۆرتر باسی دەسەڵاتدارانی وەک ئیمارەت دارەکانی کردووە، ناوی بڕێک هۆزی هێناوە، بە ژمارە زۆر کەمن، بەڵام وەک دەسەڵات پەیوەندییان لەگەڵ دەسەڵاتە زلهێزەکاندا بەهێز بووە و پرسیان پێ کراوە... بەندەش وەک نووسەرێک ((مەسعود محەمەد)م پێ لۆژیکانەترە.. نووسەران و مێژوونووسانی کورد ململانێ و تەقەڵلای زۆریان لە پێشە، تا بتوانن مێژووی راستەقینەی خۆیان بخەنە روو. هەزاران وشە و واژەی کوردی پەتی لێمان دزراوە و کراوەتە فارسی و تورکی هەتا بگرە بە عەرەبی بگێڕنەوە نێو فەرهەنگی زمانی کوردی، کەلتوور و کەلەپوورێک بۆنی بوونی میللەتی ئێمەی تیادا وەدی کرابێت، بووە بە هی خەڵکێکی کە، ئەمڕۆ بێت یا سبەی ئەرکی گەڕانەوەی کەوتۆتە سەر شانی رۆشنبیرانی کورد. دنیای ئەمڕۆ لەگەڵ رابوردوودا جیاوازە، رێگا خۆشە و زۆر ئامێر و دەزگا بە دەم دەستەوەیە، وەک ئەوسا شارەکان لە یەکەوە دوور نین، چەتە و رێگر گەردەنەگیر لە نێوان شاراندا لە مەکۆدا نین، ئەوڕۆ نیازیش بە پەساپۆرت و نامەگەیان و وڵات بە وڵات کردنیش نەماوە، ئەوە ئینتەرنێتە، مۆبایلە، ئیمێڵە. دنیاکە ئەوەندە بچووک کراوەتەوە، بە ئاسان هەموو شت دەگاتە دەست، بە مەرجێک بزانی چیت دەوێ و لە کوێڕا داواکە دەست و پەنجەی بخەیتە سەر، کەواتە ئەگەر رۆشنبیرانی کورد، بۆ لەمەولا تۆزەکێک تەقەڵلا بکەن، خۆیان بە دوای رابردووی میللەتەکەماندا ماندوو بکەن دەتوانن زۆر شتی نەزانراو و دزراو بخەنە بەرچاو.. ئیدی بۆ لەمەولا دەمارگرژەکانی عارەب و عەجەم و تورک بۆیان ناڕواتە سەر، دەربارەی میللەتی کورد و رابردووی ئەم میللەتە، ئەوی دەیانەوێ بیکەن.. کاتی کار و کردەوەی چاوساقانی کورد هاتووە، من لام وایە هەر رۆشنبیرێ تیرەیەکی کورد، تایفەیەکی کورد، هۆزێکی کورد مێژووە دەماو دەمەکەی ناو خزم و خوێشان و هۆزەکەی تۆمار بکا و بیکاتە دیکۆمێنت لە ئایندەیەکی نزیکدا دەبینە خاوەن مێژووی نووسراوی باوەڕپێکراو...

بڕوانە ناوێک، تەنها ناوێک چ گۆبەنێکی وا گەورەی بۆ بنەماڵەی ـ بەگزادەکانی جاف ناوەتەوە ((سەیدی)) ئەم ناوە کە (سەیدی ئەحمەدی بەگ)ی ناوبووە قەینا ناوەکە عارەبی بووە وەک ئەمیر وەک پاشاخان وەک مەلیک وەک سوڵتان.

ئەم ناوانە ئەو دەم و ئێستاش دەنرێت وە زۆر کەس لەو بابەتە ناوانەی لە کوڕەکانیان ناوە بە تایبەت چینی ئاغا و دەست رۆیشتووان، ئیدی باپیرە گەورەی ئێمە ناوی ((سەیدی)) بووە ئەگینا باوکی چۆن سەید نەبووە و کەسێ نە باوکی بە سەید ناوبردووە وە نە کوڕ و کوڕەزای.

مێژوونووسە دەمارگرژەکانی عەرەب لەم رووەوە قسووریان نەکردووە کە تیرە و هۆزەکانی کورد بگێڕنەوە سەر رەگەزی عارەب بە داخەوە مێژوونووسانی کوردیش چەند دانەیەکیان نەبێت لە ترسا یان لە برسا خۆیان لە ئاوا باس و بەزمێک دوور خستووەتەوە.. ئەوسا مێژوونووسی سەردەمی دەسەڵاتی (ناسرودین شای قاجار) (عەلی ئەکبەری وەقایع نیگاری کوردستانی) لە کتاوی (عشایر و ایلات و طوایف کرد)دا لە لاپەڕەی ((٧٨))دا پەنجە دەخاتە سەر ناوی ((سەیدی)) کە ئەو بە پیتی ((ص)) نووسیویەتی (صیدی ئەحمەد بەگ))
یان وەک ناوی شاعیری گەورە ((سەیدای هەورامی)) و سەدان ناوی کەی وەک ئەم شێوە.

# لە بارەی ناوی جاف

عەبدولخالق سەرسام، لە کتێبی ((ئاڤێستای نەورۆز))دا لە لاپەڕە ((٤٣، ٤٤)) دەڵێت:

کاوانی، جاپانی، گاڤانی و جاوانی بەپێی فۆنەتیکی فارسی کە ((ب)) لە جیاتی ((و)) ((سۆرانی)) بەکاردەهێنێ لە کرمانجی سەروو ((ڤ)) وەک ((ئاڤ = ئاو، ئاب یان باب، باو، باڤ، زەهاب، زەهاو. عەرەبیش لەبەر نەبوونی پیتی ((گ))ی کوردی فارسی لە عەرەبیدا هەموو پیتێکی ((گ)) کراوەتە ((ج)) وەک گورگان = جرجان، هتد.. ئەمە هیچ جۆرە گومانێک ناهێڵێتەوە کەوا رەگی گاوانی، جاوانی لە نێو جاپانیدا بدۆزێتەوە، کە لەبەر قورسی ((گ)) لە زمانی کوردیدا بووە بە کاوانی ئەگەر هاتوو گاوانییەکان لە دانیشتوانی ((بابل)) و ((ئور)) و ناوچەکەی بوون، ئەوا ((کاوە)) لە هۆزی ((گاوانی)) یانی جاوانەکان بووە، کە ئەو هۆزە لە ناوچەی حیلە ((بابل)) و ((ئور)) دەژیان لە سەردەمی ساسانییەکاندا، وە هەروەها لە سەردەمی عەباسییەکاندا و سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلام.

لە (رشتەی مرواری) مامۆستا (عەلائەددین سەجادی)دا سەدان داستان و قسەی خۆشی وات بەرچاو دەخات هەر هەمووی دەربارەی هۆزەکانی جافن و تێفکرین و جۆری زیندەگییان تیادا دەخاتە روو.

دەگێڕنەوە، یەکێک لە تیرەکانی جاف دەستدرێژی دەکەنە سەر تیرەیەکی کە. هەر لە ناو جافدا، پاشا لە کەین و بەینی رووداوەکە ئاگادار دەبێتەوە و بڕیار دەدا تیرە زوڵمکەرەکە سزا

بــدات، دەنێرێــت هەرچی ئاژەڵیان هەیــە بە بەرزە وڵاخیانەوە بهێنن دەســت بەســەریاندا بگرن، دوای ماوەیــەک چاوســاقان و دەم چەرمووی هۆز دەڕۆنە لای پاشــا و تــەواوی ئاژەڵ و بەرزە وڵاخەکانیان بۆ دەگێڕنەوە، ئیدی ئاژەڵی خۆیان لەبەر دەدەن.. ((روســە)) یەکێک بووە لە خاوەن ئــاژەڵ، دەڕوانێــت حەمــەی برای لەو دوورەوە راوەســتاوە و هــەر دەڕوانێتە دەواری پاشــادا.. دەقیرێنێت: حەمە... حەمە ئەوە بۆ راوەستاوی!؟

حەمــەش هــەر بە قیرە وەڵامی دەداتەوە: کوڕە چۆن بێم. نێرەکەرە ســپی دیار نییە و پاشــا ناڕواتە ژێری...

لێزانیی مەحمود پاشا و دڕایەتی بوو بە هۆی بەهێزبوونی عەشیرەتی جاف. لە مەحمود پاشا بیستراوە: دەتوانم لە ماوەیەکی یەکجار کەمدا یانی ((تاقێک))دا چوار پێنج هەزار سواری چەکداری جاف کۆبکەمەوە.

دیــارە چ حەمەپاشــا و چ مەحمود پاشــاش بیر و رایان لەگەڵ نیشــتەجێبوونی عەشــیرەتی جافدا نەبووە و ئەو گەرمیان و کوێســتانەیان بە ئالیەتێکی بەردەوامی دەســەڵات و هاوبەستەگی هۆزەکەیــان زانیوە. میرزا مەحمودخانی ئیحتیشــام و لســەلتەنە کە بۆ خۆی والی ســنە بووە لە یاداشتەکانیدا دەڵێت:

((تیرەکانــی جاف تا نزیکی شــاری ســنە دێن و ئــەوی بیانەوێ دەیکەن و هیچ دەســەڵاتێک ناتوانێــت بەرەنگاریــان بێتەوە، هەر لەم رووەوە لە (تأریخی مردوخ، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٢٣٠)) دا باسی کراوە..

ســەیر لەوەدایــە کە خەڵک و خــوا دەکەونە شــکات و نامەکانیان دەگاتە دەربــاری قاجاری و دەربــار دەکەوێتە سەرزەنشــتی والی ســنە و رەخنەلێگرتن، ئەویش لــە وەڵامدا دەڵێت: بە لای ئێمەوە فەوجی ســوارەی زەفەر گوایە نێردراوە بۆ پاراســتنی ســنوور و ئارامی دەڤەرەکە کەچی ســەربازەکانی ئــەم فەوجە کاریان بووەتــە ئەوەی چیلکە بۆ ئاگر و ئالیکــی ئاژەڵەکانی جاف کۆ دەکەنەوە من بە چی بەرگری لەم هۆزە بکەم...؟

پیرەمێرد، لە رۆژنامەی (ژیان) ژ ـ ٤٩٩ ساڵی ١٩٣٦دا دەڵێت: ئەو کاتەی جاف، مەحمود پاشا ســەرۆکیان بوو خاوەنی دەســەڵات و مەکنەت و دەبدەبەیەکی بڵاو بوون، لە دەوروبەری شاری ((سنە)) دەڕۆیشتن ((تەگرمە و بەرانان)) لەبەر پایاندا دەلەرزی، والی کرماشان کە بۆ خۆی سەر بە بنەماڵەی شازادەکان بوو، داری سووتەمەنی بە دیاری بۆ مەحمود پاشا دەنارد بۆ شێروانە و کانی چەقەڵ. دکتۆر شاکر خصباک لە کتێبی (الاکراد)دا لە ل٣٧دا دەڵێت:

((هێز و توانای هۆزی جاف و ئەمیرەکەیان ئەوەندە بەربڵاو بووە، دەوڵەتی عوسمانی و ئێران پەیوەستە لە نەوازش و دڵدانەوەی ئومەرای جافدا بوونە)).

مەحمود پاشــا، ســەرەڕای نازناوی پاشــایەتی نازنــاوی ((خان))ی لە دەربــاری قاجارییەوە پێشکەش کراوە، لەگەڵ دیاریی گرانبەهای جۆراوجۆردا، یەکێک لەو دیارییانە، شمشێرێکی زێڕی جەواهیری نیشان بووە کە تا ئەم دوا دوایانەش هەر مابوویەوە.

کەسایەتی مەحموود پاشا، سەرنجڕاکێشە، هەمیشە دەکۆشا جاف جیرەخوراو و سەرشۆڕی هیچ دەسەڵاتێک نەبێت.

بەپێــی ئەو بەڵگانەی بە دەســتمانەوەیە ئەوە روون بووەتەوە کە چاپانەکان باپیرە و پشــتی کۆنتــری جاوانییەکانــن.. بەڵگــەی باوەڕپێکــراوی زۆریش بە دەســتەوەیە کە جاپانــەکان هۆز و هێزێکی سەرەکی سەردەمی زنجیرە دەسەڵاتی ساسانییەکان بوونە، ((پلازەری)) لە لاپەڕەی ٢٤٠ کتێبەکەیدا دەڵێت: ((وأتی الیه، فخرج الیه جاپان عظیم العجم))

عارەبی ئەوسـا و ئێسـتاش بە غەیری عـارەب دەڵێن (عەجەم یان ئەعجەمـی)) لەم رووەوە (ئیمام ئەبولحەسەنی بلازەری) لە کتێبی (فتوح البلدان)دا لە لاپەڕەکانی ٢٤٠، ٢٤٧، ٢٩٦دا باس لە مەزنی و چۆنیەتی دەسەڵاتی جابانی ئەعجەمی دەکات.

دیارە عارەبی ئیسـلام، کە پەلاماری ((سـواد العراق)) دەدەن، ئەوی بەرهەڵسـتیان کردوون هۆزی جاپان و سەرکردەی جاپان بووە، وە واش دەردەکەوێت جاپانەکان شەڕی سەر و ماڵیان کرووە و بەرگرییان لە شـوێن و جێگە و زێدی خۆیان کردووە، دیارە لەو کاتانەدا (جابانییەکان، گاوانییەکان، جاوانییەکان) زۆربەی زۆری خوارەوەی دۆڵی ((رافیدەین))یان بە دەسـتەوە بووە و لە عارەبیشـەوە نزیک بوونە، بۆیە یەکێکیان بە هاواڵ و هاودینی پەیامبەری خودا ناسـراوە، کە ناوی (ئیبنولجابانی ئەلکوردی) وەک لە کتێبی (الاصحابة في تميز الاصحابة و تەفسیری ئایە (١٦) سورة الفتح).

کە ئیسـلام بە تەواوی لەو دەڤەرانەیدا سـەردەکەوێت و دەبنە خاوەنی سـەر و ماڵی خەڵکە رەگەزەکە، ئەوی هەیان بووە دابەش دەکرێت، وەک لێرەدا چۆنیەتی مامەڵەکە روون و ئاشکرایە و دەڵێت (أصفى عمر بن الخطاب من السـواد من قتل في الحرب وارهنى من هرب وكل ارض كسـرى وكل ارض لإهل بيته وكل مفيظي ماء كل دير يزيد وكل صافية أصطافاها كسـرى). هەر لەوێدا دەڵێت: (وارض من قتل في المعركة وارض من هرب).

هەروەها دەڵێت: (ولم يزل ذلك ثابتاً حتى أحرف الديوان أيام الحجاج بن يوسف فأخذ كل قوم مايليهم) بڕوانە (الامام أبوالحسن البلاذري فتوح البلدان ص ٢٦٨، ٢٨٩، ٢٩٣).

ئەگـەر بنواڕینە سـەرچاوەکانی وەک: مروج الذهب و طبري و بـلاذری، بۆمان دەردەکەوێت زۆربەی زۆری دۆڵی رافیدەین کورد بوونە و لە هۆزی ((جابان، جاوان)) بوونە.

جێگەی داخە، نە ئەوسا و نە ئێستاش مێژوونووسانی کوردمان نەیانتوانیوە باس لە مێژووی هۆزەکانـی کـورد بکـەن، وە ئەگەر باسـیانیش کردبێـت، تەنها پەنایـان بردۆتە بەر سـەرچاوە عەرەبییەکان، بۆ نموونە ئەمیر شـەرەفخانی بەتلیسـی، ناوی هۆزێکی وا بە دەسەڵات ((جاوانی)) نەکردووە.. ئەمین زەکی بەگ بە ((جوانی)) ناویانی هێناوە. لە (مروج الذهب)دا بە (جاوان) ناویان هاتـووە، مەسـعودی کردوویانیەتە تیـرە عارەبێک و رەگەزیانی بردۆتە سـەر ((رەبیعەی کوڕی نەزار))...

سەد رەحمەت لە مێژوونووسی عارەب، دکتۆر مستەفا جەواد بە وردی مێژووی جاوانییەکانی روون کردۆتەوە لە پەرتووکی (جاوان القبيلة الكوردية المنسية ومشاهير الجاوانيين).

ئـەوی راسـتەقینەی هۆزی جاوانە لە نیوەی سـەدەی چوارەمی کۆچیـدا بەناوبانگترین و بە دەسەڵاتترین هۆزی کورد بوونە.

مێژوونووسـی گەورە ((عیمادی ئەسفەهانی)) لە باسی بڕێک لە ئەمیرەکانی هۆزی (جاوان)دا لە کتێبی (خريده الصقر ـ نوسخەی پاریس)دا دەڵێت:

((ئەمیر ئەبوشـوجاعی کوڕی عاسـمی کوڕی ئەبـی نەجمی کوردی یەکێک بـووە لە گەورە دەسەڵاتدارانی سەردەمی خۆی..)) هەر لەم رووەوە فەیرۆز ئابادی دەڵێت:

((جاوان هۆزێکی بە دەسەڵاتی کوردن لە شاری حللەدا نیشتەجێن)).

ئیبن بەتووتە، دەڵێت:

خەڵکی شاری حیلە هەموویان دوانزە ئیمامین، دوو تایفەن یەکێکیان ((کورد)) رەگەزن، ئەوی تریان بە ((جامعین)) ناو دەبرێن پەیوەستە شەڕ و شۆڕ و ناکۆکی لە نێوانیاندایە.

دیارە لەو سەردەمەدا جاوانییەکان شیعە مەزهەب بوونە...

# هۆزی جاف پاشماوەی جاپانەکانن

لە کتێبی ((ئاڤێستای نەورۆز))ی خوالێخۆشبوو مامۆستا ((عەبدولخالق سەرسام))دا لە لاپەڕە ١٢٠دا هاتووە وەستاکارانە رازاندوویەتیەوە و دەڵێت:

لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانییە بۆ پاڵپشتی لێکۆڵینەوەی ئەنتروپۆلۆجی و مێژوویی و ئەرکۆلۆجی و پاشـماوەکانی و بیروڕای ((فیلجیڤسـکی)) لەسەر گوتی و فراسـیونی جافەکانی هۆزی جاف و جاپانی کوردی.

کابیان، کاویان، گاڤ یان ((جافی گاوان رودی)) جاڤ، جاو، گاڤ، گاو، گاوان، گاڤانە، گایانت، گودی، جود، جودی، گوتی، گاوە، گاوانی، کاوە، کاوانی.

هەموویان یەک مانا و مەدلوولن بە نووسینی ((کوردی، فارسی، عارەبی) هەروەها بە زمانی

سـۆمەریش، غود، گـود، گودا، بڕوانەی (یوسـف الحوراني ـ البنية الذهينة الحضارية في الشـرق المتوسطي، الآسيوي القديم ل ٧١، دارالنهر للنشر). ئەو سی و شەشە بە هەمان مانا دێن و مانای، گاو، گاوانییە، گاو کە نیشـانەی بەهێزی و ئازایەتییە و لەو سەردەمەشـدا داسـتانی کەڵەگامێشی (گلگامێـش) بەسـەر زمانەوە بووە. ئەوەندە ئازا و بەهێز بـووە زۆرانبازی لەگەڵ گادا کردووە و بەزاندوویەتی.

دیـارە هەمان وشـە بە کـوردی گامێش و بە عارەبی جاموس دێـت. وە لەبەر نەبوونی پیتی ((گ)) لە عارەبیدا بە ((ج)) دەنووسرێت، ئەگینا. گاموس هەر ((گاموش))ە.

گامێش وەک. ئاسووری ـ ئاشوورییە ـ ((س)) و ((ش)) جێگۆڕکێ دەکات.

گاپانانی، جاپانی، با بزانین چۆن جافەکانی پاشـماوەی گاوانییەکانن، کە کاتی خۆی بەشـێک بوونە لە گووتییەکان.

((مینورسـکی)) لـەم رووەوە دواوە و دەڵێـت: گاوانییـەکان باپیرە گـەورە جافەکانن (کۆڕی زانیاری کورد بەرگی ٢ی ساڵی ١٩٧٤ز لە دائیرەتولمەعاریفی ئیسلامی).

دەرکەوتووە و سەلمێنراوە، گاوانییەکان پاشماوەی گوتییەکانن وە لە ((بين النهرين))دا ژیاون، کە دەکاتە نزیکی سـۆمەرییەکان زیاتر لە سـەد سـاڵ فەرمانڕەوایی وڵاتی سۆمەرییان کردووە، دەرکەوتـووە جێگـە و شـوێنی گوتییەکان هەمان جێگە و شـوێنی جافەکانی ئێسـتایە و لەوەش دڵنیاین، هۆزی جاف پاشماوەی (گاوانییەکانن ـ جاوانییەکان) یەکێکن لە رەسەنترین هۆزی کورد و بە رەسەنیش ماونەتەوە.

دەرکەوتووە گاوانییەکان زۆرتر گا و مانگایان بەخێو کردووە، بە پێچەوانەوە، سۆمەرییەکان کـە پێسـتەی مەڕ و بزنیان لەبـەر دەکرد، بەڵام گاوانییەکان زۆرتر پێسـتەی گایان بەکار دەبرد، ئەوەش روونە کە هەوارگەی سەرەتایی هۆزی جاف دەڤەری ((جوان رود)) بووە، جوانڕۆ خاکی باو باپیرانیان بووە، بێ شـک ((جوان)) لە ((گوان و گاوان))ەوە هاتووە ((رود)) بە فارسـی یانی ((رووبار))، ((جاف)) لە گاوانرودەوە هاتووە...

مینورسکی بێ یەک و دوو دەڵێت: (جافەکان گاوانین، جاوانی، یانی جافەکان جاوانین ـ گاوانی و لە بنەڕەتیشدا گاپان).

عەبدولخالـق سەرسـام دەڵێت: هۆزی جاف یەکێکە لە هۆزە هـەرە گەورەکانی کورد و زۆر تیـرەی لەخـۆ گرتـووە، زیاد لە شـەش تیـرە[1].. ئەو هـۆزە گەورەیە کاری گـەورە و مەزنی لە مێژوودا ئەنجام داوە، وەک پاڵپشتی ئیمپراتۆریەتی ساسانی و دەسەڵاتی گوتی و لە دەوروبەری پایتەختی ساسـانییەکاندا دەژیان ((تیسـفون)) وە پێش قەرەوڵی سوپا و سانی ساسانییان بوونە و باوەڕپێکراوی ئەو دەسەڵاتە بوونە بە ناوی ((گاردی جاویدان)) یانی پارێزەرانی هەمیشەیی و بە گاپانەکان ناسراو بوونە..

(١) جاف پتر لە پەنجا تیرە دەبن.

# سەرهەڵدانی هۆزی جاف

مێژووی هۆزی جاف، وەک هەر هۆزێکی دیکەی کورد، دووچاری گێچەڵی رەگەزپەرستانی عارەب و تورک و عەجەم هاتووە و ئەوی راستییە تووڕیان داوەتە لاوە و بە ئارەزووی خۆیان بڕیویانە و دووریانە. بڕێک جافیان بە عارەب لە قەڵەم داوە و بڕێکی دیکەیان بە سەید و شێخ و عەشایەرە عەرەبە کۆنەکانی سەردەمی سەرەتای ئیسلام، تا گەیشتووەتە ئەمەوییەکان و حەزرەتی عوسمان، مێژوونووسانی عەجەم دان بەوەدا دەنێن کە هۆزی جاف، هۆزێکی ئێرانی رەگەزە و لە کوردستان دوور نەکەوتوونەتەوە، بەڵام ناڕۆنە ژێر باری ئەوەی، کە هۆزی جاف لە رووداوەکاندا دەوریان هەبووە و زۆر لە کاروبار و شەڕ و شۆڕی رۆژئاوای ئێراندا دەستێکی باڵایان هەبووە، بەڵکو لێرە و لەوێ، وردە باسیان لێکراوە، سا بڕێکیان وەک ئاژاوەچی، یان زیانبەخش، یا گێرەشێوێن و چەپاوکەر و دز.. بە تایبەت لە سەردەمی دوو زلهێزی سەردەمدا، دەوڵەتی سەفەوی شیعە مەزهەب و دەوڵەتی عوسمانی جاف لە کوردستانی باکووردا ناژین، بەڵام بڕێک سەرچاوەی عوسمانی دانی بە دەوری شەڕ و لەشکرکێشی هۆزی جافدا ناوە و نازناوی ((جافی مورادی))یشی بەخشیوە بەم هۆزە هەر لەبەر ئەوەی لە پەلامارەکەی سوڵتان مورادی چوارەمی عوسمانی (١٦٣٨ز) بۆ سەر بەغدا و گرتنی شاری ناوبراو ئەو نازناوە ((جافی مورادی))یە بە شانازییەکی گەورە لە قەڵەم دەدرا.

ئێستا لە بنکەی بەڵگەنامەکانی عوسمانی و تورکیای ئێستادا هەزاران و ملیۆنەها بەڵگەی دەست بەسەرداگیراودا لەوێ کۆمەڵ کراوە، داخۆ لەو ملیۆنەها دیکۆمێنتانە و بەڵگەی مێژووییانە چەندی دەربارەی کورد و هۆزی ((جاف)) بێت....؟ ئەو بەڵگەنامانە کەی ئازاد دەکرێن؟ کەی دەبنە موڵکی بەشەرییەت؟

ئەمە پرسیارگەلێکە ئەورۆ نا سبەی مرۆڤی نەوەی داهاتوو دەسەڵاتی ئایندەی دەوڵەتی تورکیای دوور لە دەمارگرژی و رەگەزپەرستی دەتوانێت وەڵامی بداتەوە. رەنگە ئەورۆ ئێمەی کورد برێک رووداو و گۆڕانکاری بە خەون دابنێین، بەڵام ئەوەی لە پێش وڵاتی تورکیادایە رەنگە لەوە خەونتر نەبێت کە دنیا و دەوڵەتی زلهێزی یەکێتی سۆڤێت بەو هەموو دەسەڵاتەوە سەری تەعزیمی لە بەرانبەر داخوازی گەلاندا دانواندووە و ناوێک بەو ناوە ((یەکێتی سۆڤێت)) لەسەر نەخشەی جیهان ئەورۆکە نابینرێت..

بەندە لەوە دڵنیام مرۆڤی داهاتوو و تەقەڵلای ئینسانی سبەینێ لە بواری زانست و زانیندا دەگاتە پلە و پایەیەکی وا مۆری پوچەڵکردنەوە لەسەر زۆر باوەڕ و لاپەڕەکانی مێژوودا دەدا و لاپەڕەی راستەقینەی رابردووی مرۆڤ دەخاتە روو. پێم وایە، مێژووی ئێمەی کوردیش بەشێک دەبێت لەو دووبارە نووسینەوەی مێژووەوە، بەندە لەوە دڵنیام، بەڵام ئەمە هیچ لە کەمتەرخەمی و دەتوانم بڵێم تاوانی مێژوونووسانی کورد کەم ناکاتەوە، کە چەند بەرانبەر مێژوو و رابردووی گەلەکەیان کردوویانە یان لە رووی نەزانینەوە هەستیان پێ نەکردووە، یان بێ ئەملا و ئەولای تەسلیمی بیر و رای چوار تەنیشت بوونە و دانیان بە هەروەها بووندا ـ ناوە..!!

هەروەک لەم رووەوە، شاعیری گەورە شێخ رەزای تاڵەبانی بێ یەک و دوو دەڵێت: عەرەب ئینکاری فەزڵتان ناکەین ئەفزەڵن

کام فەزڵ و کام ئەفزەڵی..؟

ئەگەر ئەو ئەفزەڵیەتە لە رووی دینەوە بێت و قورئان.. قورئان قورئانی خودایە، بە هەر زمانێکی تریش بایە هەر پیرۆز دەبوو.. ئایا فەزڵەکەیان بۆ تاڵان و بڕۆ و داگیرکردن و ژن و کچی خەڵک فڕاندن و بە جاریە و کۆیلەکردن، فەزڵە؟. رەنگە یەکێک بڵێت: ئەو ئەفزەڵیەتەی شێخ رەزایە، چ پۆ و پەیوەندی بە کیمیابارانی هەڵەبجە و ئەنفالکردنی کوردەوە هەیە...؟

بەندە دەڵێم: هەیە و زۆرتریش، ئەم جۆرە رەوشتە لە کۆنەوە پیشەیان بووە و ئەنفالی ئەوسا بووە بۆ نەسلی ئێمە دووبارە کراوەتەوە و لە هەر کاتێکدا دەستیان بڕوا و بە چاکی بزانن، سەر و ماڵی ئێمەی کورد بە لای زۆربەیانەوە حەڵاڵە و رەوا..

جا پێم ناڵێی کام ئەفزەڵیەت؟!

هەموومان دان بەوەیدا دەنێین دنیای دوێنێ لەگەڵ ئەورۆدا گەلێک جیاوازە، بەتایبەت بۆ ئێمەی کوردی بێ ئەستێرە، کە دەست رەسیمان بە هیچ نەبووە وەک قوتابییەکی تەمەڵ تەنها روانیمانەتە رووداوەکاندا و گوێگری لێکدانەوەی خەڵکانێک بووینە لە سیفاتی زالودا بوون. بە تەواوی توانایانەوە کۆشاون ئەوی باسە و ئەوی بەڵگەیە و ئەوی حەقیقەتە دەربارەی میللەتەکەمان یا لە ناوی بدەن یان بیگۆڕن یان چەواشە باسی لێ بکەن. ئەگەر بە گوێرەی لێکدانەوەی ئەو باسانە بێت ئێمەی کورد نە خاوەنی رەگەزین و نە خاوەنی وڵات، وەک میوان بین و لە هوتێلدا

بین. بنواڕه باس و لێدوانیان دەربارەی هۆزەکانی کورد، یان بنەماڵە ناسراوەکانی کورد، زۆربەی زۆریان بە هەزار فێڵ و تەڵەکەوە گێلانە بردوویانەتە سەر ڕەگەزەکانی دیکە.

ئیـدی عـارەب، یا عەجەم، یان تـورک.. عارەب بە ئایینەوە قوتمـان دەدا، عەجەمیش بە ناوی ئاریایی بوونەوە دەیەوێت وەک شەکەری ناو ئاو ئەوی کوردە و ناوی کوردە بیتاوێنێتەوە...

لە بیرمە دوای نەمانی شـا و دروستبوونی جمهوریەتێکی ئیسلامییەوە پەلاماری شاری سنە لە لایەن پاسـدارانی جمهوریەتی ئیسـلامییەوە ئەو دەم بەندە وەک پەنابەرێک لە شـاری لەندەندا دەژیام تۆزێکیش پەیوەندیم لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی ئێرانیدا هەبوو، لە ڕۆژنامەی ((کیهان))ی لەندەنیدا وتارێکم نووسـی دەرباری مێژووی کورد و چۆنیەتی تێفکرینی سـەرجەم دەسەڵاتدارانی ئێرانی لە کۆنەوە تا سەر شاری دەرکراو و جمهوریەتی ئیسلامی و دروشمی پڕوپووچی ئاریایی بوون و لـە ژێـر ئـەو خەیمە پڕ لە زوڵم و زۆرەدا ژیانی کورد و پێشـێلکردنی مافـە ڕەواکانی کوردی کوردسـتانی ڕۆژهەڵات هەر لەو ڕۆژنامەیەدا داستانی دابەشکردنی میراتی دووبرام هێنابوویەوە کە:

پیاوێـک دەمرێـت و دوو کـوڕی هەبووە برا گـەورە دەڵێت برا وا باوکمان مـردو با دارایی باوکمان دابەش بکەین برای بچووک دەڵێت: دەی کاکە فەرموو دابەشی بکە..

برا گەورە دەڵێت: ئەو ئەسپە گوێ لەقە لەش ڕەقە و چەقە مەقاودارە .. بۆ من..

ئەو سـەگە هەوشـارە چوارپـەل قەوییە، کەڵپە زلە کـە دەوەڕێت دەڵێی ئەشـکەوتە و دەنگ دەداتەوە بۆ تۆ.

ئەو مانگا شـاخ شـکاوە بێ شـیرە کلک رووتە.. بۆ من. ئەو پشـیلە چاوزەردە، سمێڵ درێژە سوور و سپییە بۆ تۆ..

ئەم خانووە کە تیایداین لە زەوییەوە تا سـەربانی بۆ من. لە سـەربانەوە تا حەوت تەبەقەی ئاسمان .. بۆ تۆ...

برا فارسـەکانمان دوو هەزار و پێنج سـەد ساڵە برا گەورەمانن، دەسەڵات، سامان، ئاوەدانی، پایتەخت نشینی هی ئەوانە..

ئـەوی وێرانـە و بەدبەختی و هەژاری و نـەداری و نەخوێندەوارییە بۆ کورد بووە. تا ئێرە و بـەس، بـرا گەورە بیت بۆ خۆت بیت و لە منیش گەڕێ و ئەم (ئاریایی) بوونەش موبارەکی خۆت بێت.. ئێمەی کورد نامانەوێ..!!

ئەو مەقالەیەم هەرای گەورەی نایەوە، بە دواییدا زیاتر لە بیست و چوار مەقالە لەم ڕووەوە نووسرا..

کەواتە بە لای عارەب و عەجەم و تورکەوە ئێمەی کورد قوربانیین، هەر یەکەیان بە نەوعێک دەمان برژێنن وەک خەیام دەفەرموێت:

فارسی:

**با بط میگفت ماهی ماهی درتب و تاب**
**باش که بچوی رفته باز آید آب**
**گفتا چو من و تو هردوو گشتیم کباب**
**دنیا پس مرگ ماچه درياچه سراب**

کوردییەکەی:

**ماسییەکی لابرژاو وتییە مراوی**
**سەیری مردن کە چۆن کەوتینەتە داوی**
**وتی: جا ئەگەر برژان بێتە بەشمان**
**خوا بکا کاول بێت ئەم جیهانە بە تەواوی**

هەر بە هۆزی ((جاف))دا بنوارە، دەمێک کراون بە ((سەید)) دەمێک بە ((عەنزە)) و دەمێک بە ((شەمەر)) و کوردەکەش بە جنۆکە..

لام وایە ئەم سەردەمانە و ئەو جۆرە مامەڵانە ئەوڕۆکە بە ئاسان ناوترێت و ناچێتە سەر. مرۆڤی ئەمڕۆ بێ بەڵگە و دیکۆمێنتی باوەڕپێکراو، بێ لۆژیکێکی بەهێز ئاسان نایسەلمێنێت. زەبر و زۆر و تۆقیان و نان برانیش کاتی بەسەرچووە.. وەک وتراوە: ئیمڕۆ تۆپەکە لە گۆڕەپانی خۆماندایە. جێگەی داخە وەک زۆر بواری تر، کەم نەفەسین، بێ دەربەستین، بەتایبەت ئەرکێکی زۆر گەورە و گرنگ کەوتووەتە سەر و ئەستۆی مێژوونووسانمان تا مێژووی میللەتەکەمان بە وردی ساغ بکەینەوە لە موعادەلەی ((رەنگە)) وابێت یان واکرابێت دوورخەینەوە..

یان برادەرانی ئاسەوارناسانمان، ئەوانیش ئەرکی گەورەیان لەسەر شانە. لەم کوردستانەدا هەزاران جێگە و شوێنی رابردووی میللەتانی تێدایە، هەزاران تەپۆڵکە و گرد و بنەڕەت و تل و دەوەنی داتاشراوی نەزانراوی تیا نمایانە، بڕێکیانی بە زۆرەملێ خاوەنی بۆ پەیدا بووە، بڕێکی تری هێشتا بێ خێو و خاوەنە و خاوەنی نەناسراوە و داپۆشراوە.

پرسیارێکە، ئایا ئێمەی کورد لە ئاسمان داباریوین؟!

ئایا لە چەند هەزار ساڵ لە پێش هێرشی عارەبی جەزیرە ئێمەی کورد لە کوردستاندا نەژیاوین؟ هەزار ساڵ، دوو هەزار ساڵ یان بە گوێرەی لێکدانەوەی دەمارگرژەکانی عارەب و تورک و عەجەم لەم دوا دوایانەدا دزەمان کردۆتە ناو کوردستان؟!

با زۆر دوور نەڕۆین، تۆزێک لە چۆنیەتی پێکهاتنی دەوڵەت و دەسەڵاتی عوسمانییەکان بدوێین.. ئەو دەسەڵاتە سەرەتا لە کۆمەڵێک چەکداری کۆچەری پێکهاتوون کە لە زۆر جێگە و شوێن راونراو بوونە و جێگەیان لە هیچ کوێ نەبووەتەوە و لە ئاشوفتە بازاڕی و هەل و مەرجی بێ دەسەڵاتی نازانم کاری دەوڵەتی ناوەندی ئەو دەمەدا توانییان وردە وردە شوێن پای خۆیان پتەو کەنەوە و لێهاتوویی عوسمانی سەرکردەیان بوو بە هۆی بەربڵاوی دەسەڵاتیان و سەرئەنجام پێکهێنانی دەوڵەتی زلهێزی عوسمانی و داگیرکردنی سەرەتا کوردستانی باکوور و بە دوایدا باشوور و رۆژئاوا و بەشێکی زۆری کوردستانی رۆژهەڵات و ئەو دەسەڵاتە چەندین سەدە بەردەوام بووە و سەرئەنجام لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە ناو رۆیشتووە و بە دوایدا دەوڵەتی ئێستای تورکیا لە لایەن ئەتاتورکەوە پێکهاتووە.. دەمارگرژیی ئەتاتورکیش ئەوی توانیویە دژایەتی کوردی کردووە و تا بە ئەوڕۆیش ئاش هەمان ئاشە و ئەوی مێژوو، جوگرافیا،

رابــردوو، هەیــە دانی پیا نانەن و وەک وابێت رەگەزێک، گەلێک بە ناوی کورد لەو وڵاتەدا نەبووە و نە هەشە.. خۆ هەر ئەتاتورکیش وا نییە وا تێدەفکرێت، عارەب و عەجەم لەوان باشتر نین..

تــا بتوانــن ئەوی بــۆ پەیوەندی بە کــوردەوە بێت شــاردوویانەتەوە و دانیان پێــدا نەناوە و توانیویانە بۆ زەمانێک راســتییەکان هەڵە و چەواشــە راگەیەنن، ئەگەر باســیان کردبێت یان بنبڕ هەر باسیان نەکردووە..!

با بڕۆینە لای بڕێک لەو سەرچاوانەوە، تا بزانین دەربارەی کورد و ((جاف)) چییان وتووە:

دکتۆر مستەفا جەواد، لە نووسراوی ((جاوان))دا، لە لاپەڕەی ((١٧))دا، دەربارەی دوو تیرەی جاف ((گلالی و هارونی)) دواوە، کە لە ســەدەی حەوتەم و هەشــتەمی کۆچیدا دەوریان بووە و ناویان هاتووە..

لە بڕێکی کەی کتێبە ئایینیەکانی ئەهلی حەقدا، بڕێک لە پەیامبەرانیان لە هۆزی ((جاف)) بوونە وەک ((عابدینی جاف)) و ((ئیبراهیم جاف))

شــەرەفخانی بەدلیســی ((١٥٩٦ز)) لە شەرەفنامەدا باسی لە ((جاف)) نەکردووە، لە پێشدا لەو بارەوە دواوین..

مێژوونووســی عــارەب ((عەباس عــەزاوی)) دەڵێت: بۆ یەکەم جار باســی ((جاف)) هاتووەتە نێوانەوە بە هۆی رێککەوتننامەی ((زەهاو)) بووە کە لە نێوان سوڵتان مورادی چوارەمی عوسمانی و شا عەباسی سەفەویدا تۆمار کراوە. ١٦٣٩ز.

رێککەوتننامــەی ناوبــراو ((زەهاو)) بووەتە هۆی دابەشــکردنی ناوچــە و تەبار و هەوارگەی هــۆزی جــاف و بە گوێرەی ئــەو رێککەوتننامەیە، ئەم هۆزە گەورەیە کراونەتە دوو بەشــەوە، تا بەرگری لە گەرمیان و کوێستانی جاف بکەن، کە هەردوو دەسەڵات لایان وابووە، هاتووچۆی ئەو هۆزە بەهێزە بووەتە هۆی ئاژاوە و ناکۆکیی ناوچەکان. لە لایەکەوە ســەرەئەنجام ناکۆکی نێوان هەردوو دەوڵەت لە لایەکی ترەوە..

کەواتــە مامۆســتا ((عەزاوی)) باشــی بــەراورد و هەڵنەســەنگاندووە کەوا هــۆزی جاف بۆ یەکەمجار ناوی برابێت.. هۆزێک دوو دەوڵەتی زلهێزی بە یەک دوژمن ناچار بکات پێکەوە دانیشن و رێککەوتننامــە تۆمــار بکەن دژ بە جووڵانەوەی ((جاف)) ئــەوە دەگەیەنێت کەوا ئەو هۆزە زۆر لەوەی بەهێزتر و بەناوبانگتر بوونە. وا مامۆستا ((عەباس عەزاوی)) لێی دەدوێت. سەیر لەوەدایە، ئــەو دوو دەوڵەتە بەهێــزە نەیانتوانیوە بەرگری لە هاتوچۆی هۆزی جــاف بکەن، بە زۆرەملێ و رەزایەتیش بووبێت، جاف لە کوێســتان و گەرمیانی خۆیاندا ئازادانە هەر ســاڵە رێچکەی خۆیان گرتووەتەبەر..

دیسان ئەو دوو دەوڵەتە ناچاری رێککەوتننامەی تر بوون، وەک پەیمانی (ئەرزەڕۆم)) ١٨٤٧ز. کە بە توندی بەرگری لە هاتوچۆی هۆزی جاف بگرن و بە تەواوی توانایانەوە بۆ ئەو مەبەســتە کۆشاون، بەڵام سەرنەکەوتوون...

د. فوئاد حەمە خورشــید دەڵێت: تا ســاڵی ١٧١٨ز بەگزادەکانی جاف راستەوخۆ دەسەڵاتیان بەسەر تیرەکانی هۆزی جافدا بووە و کەس نەیتوانیوە لە قسەیان دەرچێت و هەر ئەو دەسەڵات و هێــز و توانایــە بووەتە هۆی مەترســی ئیمارەتــی ئەردەڵانییەکان و ناکۆکــی و دووبەرەکی و دوژمنایەتی نێوانیان...

ئاوا دەسـەڵاتێک لە پڕ نەهاتووەتە کایەوە، هۆزێکی وا گەورە لە ساڵانی ١٧١٨زدا ببێتە هۆی مەترسـیی دەسـەڵاتێکی وەک ئیمارەتی ئەردەڵان، کە هێز و توانای دەوڵەتی سـەفەویان لە پشت بووە و نیوە دەوڵەتێکی سـەربەخۆ بوونە بە لەشـکر و سـوپا و سـانەوە، ئەوە دەگەیەنێت چ لە بارەی ژمارە و چ لە بارەی دەسـەڵاتەوە ((هۆزی جاف)) زۆر لەوە لە مێژتر خاوەنی دەسـەڵاتی خۆیـان بوونە، هەرچەندە دەسـەڵاتی ئـەردەڵان لە پێش ئـەو مێژووەیشـەوە ((١٧٠٠ز)) چاوی تەماحیـان بڕیبـووە دەڤەرەکانی جاف، کە زۆر بە پیت و بەرەکەت بووە، بۆ بەدەسـتهێنانی جێگە و شـوێنی جاف پەیوەسـتە بۆ هەل گەڕاون و لە فرسەتێکدا ئەو پەلامارەی دەدەن و لەو شەڕەدا سەرۆکی هۆزی جاف دەکوژرێت و کوڕ و برایەکی سەرۆک هۆزیشی بە دیل دەگرن و بە دیلی دەیانکـوژن. ئـەم رووداوە بووەتە هۆی کۆچکردنی برێک لە میر و ناودارانی جاف بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میرنشینی بابان. برێکی کەی هۆز هەر لە جێگەی خۆیان مانەوە..

لە بیرمە لە خزمەتی باوکمدا بووم ((حەمەسەعید بەگی جاف)) لەگەڵ حوسێن بەگی جوانڕۆدا پێکەوە دانیشـتبوون لە زۆر رووەوە دەدوان، حوسـەین بەگی جوانڕۆ وتی: ئێوەی خزمانی ئێمە دوای پەلامارەکـەی ئەردەڵانییـەکان بۆ سـەر جاف و دەڤەری ((جوانـڕۆ)) ١٧٠٠ز، باوباپیرانتان خۆیان پێ رانەگیراوە لە ترسا جوانڕۆیان بەجێهێڵاوە. بابم وەڵامی دایەوە: نەخێر حوسەین بەگ وانییـە. باوباپیرانـی ئێمە وەک باوباپیرانـی ئێوە نەیانتوانی زوڵـم و زۆری ئەردەڵانییەکان قبوڵ بکـەن، جوانڕۆیـان بەجێهێڵا، باوباپیرانی ئێوە ئەو زوڵم و زۆرەیان قبـوڵ کرد و مانەوە.. نابینی دیسـان ئێمـە بەرەو ئێران هاتینەوە، زوڵم و زۆری ئێراقی عارەبمـان قبوڵ نەکردووە، وا دەبینی لێرەداین...

(ئـەم وتوویـژە لـە سـاڵی ١٩٧٧ز لـە شـاری تارانـدا روویـداوە بەنـدە گوێـم لـێ بـووە ((نووسەر))...

لە سـاڵانی ١٧٤٧ز سـەردەمی نادرشای ئەفشار، هۆزی جاف رۆڵی گەورە و شایانیان بووە، هەتاوەکو پەلامارەکەی نادر شا، بۆ گرتنی هندوستان بەشدارییان کردووە.. (رەحمان بەگ ناوێک لە تیرەی هاروونی ناسراو بووە بە رەحمان هندوستانی، دیارە لەو شەڕانەدا ئازایی نواندووە لە گەڕانەوەیدا نازناوی هندوستانییان پێ داوە).

لە دواییدا، یانی دوای کوشـتنی نادرشـا و دامەزراندنی دەسـەڵاتی کەریم خانی زەند (وکیل الرعایا) ١٧٦٣ ـ ١٩٧٤ز هۆزی جاف بۆ خۆی قودرەت و دەسەڵاتێکی بەربڵاویان هەبووە.

دوای پەلامارەکەی ئەردەڵانییەکان، بۆ سەر جوانڕۆ و هەوارگەکانی هۆزی جاف و کۆچکردنی. برێک لە بەگزادەکانی جاف و برێکی زۆری تیرەکانی جاف بۆ کوردستانی باشوور لە سەردەمی سەرۆکایەتی زایەر بەگی جافدا، دەسەڵاتی هۆزی جاف بە بەربڵاوی پەرەی سەندووە و تەواوی شـارەزووریان لە ژێر دەسـتدا بووە و رۆژ بە رۆژ بەرەو خوارتر و ((گەرمیان)) رۆیشـتوون. بێگومان هەروا بە بێ شـەڕ و کێشـە و بەرانبەرکێ نەبووە، لەگەڵ تیرە و هۆزەکانی تردا کە لە مێژدا نیشـتەجێ بوون پەیوەسـتە لە شـەڕ و پەلاماردا بوون، لە لایەکی ترەوە ئەو بەرەو خوار بوونەوە لەسـەر داوای میری بابان بووە، وەک کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمەپاشـای جاف لەم رووەوە فەرموویەتی: ناوچەکانی دزیاریش، پێواز، بانی خێڵان، بووبووە مەکۆ و هەوارگەی رێگر و پیاوخـراپ و گەردەنەگیـر و جەردە، کە زۆرتر لە ئێرانەوە دەهاتن و لەوێڕا دادەبەزین و ئەوی بیانویسـتایە دەیانکرد، میری بابان توانای دوورخسـتنەوەیانی نەبوو، بۆیە داوای لە زایەر بەگی

جاف کردووە، تا ئەو ناوچانە لەو پیاوخراپانە پاک کاتەوە، زایەر بەگ بە چوار سەد سوارەوە دەڕواتە ئەو ناوچە ناوبراوانە، لە پاداشتی ئەو کارەدا تەواوی زەوی و زاری دزیایش و بانی خێلان و پێواز دەبەخشێتە زایەر بەگ، بۆچوونی دیکەش هەیە، کە ژمارەی جاف زۆر بووە و جێگە و شوێنی باو باپیرانیان بە گوێرەی ژمارەیان بچووک بووەتەوە، وەک رەوشتی هەر هۆز و ئێلێکی ئەو سەردەمە پەلیان بەرەو ناوچە و دەڤەری تر کوتاوە، کە سوڵتان موڕادی چوارەم پەلاماری بەغدا دەدا، بە چاکیان زانیوە لەو شەڕەیدا بەشداری بکەن و هەر وایان کردووە و ئازایەتی زۆریان نواندووە و نازناوی (جافی مورادی)یان پێ بەخشراوە ١٦٣٤ز.

((ئدموندس)) دەڵێ: لە پێش هاتنی زایەر بەگ بۆ ناوچەی شارەزوور ئەو ناوچەیە جێگە و شوێنی تیرەکانی وەک: گلاڵی، شێخ سمایلی، بیسەری، چوچانی، بووە.. کە پەنجا ساڵ لە پێش هاتنی زایەر بەگەوە لەوێڕا نیشتەجێ بوونە.

میرزا مەهدی خانی ئستراباذی، کە سکرتێری نادرشای ئەفشار بووە، دوای کوشتنی نادر شا، داوای یارمەتی لە هۆزەکانی کوردی کوردستانی رۆژهەڵات دەکات هیچ یەک لە هۆزەکان نارۆنە یارمەتییەوە، جگە لە هۆزی جاف و مەنگوڕ نەبێت.

((مێژووی نادر شا ـ مینورسکی ـ وەرگێڕانی رەشیدی یاسەمی ـ تاران، ١٣١٣، لا٨٧)).

٢ ـ لە سەدەی حەوتەم و هەشتەمی کۆچیدا، لە کتێبی ((ئایینی یارسان))ی ئەهلی حەقدا، ناوی جاف هاتووە، دایکی سوڵتان ((اسحاق ـ سهاک)) کە یەکێک لە پەیامبەرانی ناوداری ئەو ئایینە بووە، ناوی ((خاتوو دایراک)) و کچی حوسێن بەگی جاف بووە، بڕێکی کەی چاوساقان و لێهاتووانی کەی ئەهلی حەق لە هۆزی جاف بوون وەک (ئێل بەگی جاف، عابدینی جاف، لە سەردەمی دەسەڵاتی سەفەوییە و ئەفشارییەکاندا (٦٨٨ ـ ١١٦٦ ـ ١٧٤٧).

٣ ـ بڕێک لایان وایە ناوی (عەبابەیلێ) لە ناوی عەبدوڵلای ئەنسارییەوە وەرگیراوە، گوایە لە سەردەمی حەزرەتی عومەردا سوپای ئیسلام کە بەرەو کوردستان دێن و دەست بە پەلاماردان دەکەن، کورد بەرانبەریان رادەوەستێ و عەبدوڵلای ئەنساری دەکوژرێت و لەوێڕا دەینێژن ساڵی هەژدەی کۆچی . لەم رووەوە هیچ بەڵگە و دیکۆمێنتێک بە دەستەوە نییە، نە عارەبی و نە عەجەمی، تەنها ئەو باوەڕە لە رووی لە یەک نزیکبوونی ناوەکانەوەیە و بەس. دەربارەی ناوی (عەبابەیلێ) بڕێک لایان وایە لە ناوی پەلەوەری ((ئەبابیل))ەوە هاتووە، شەڕی خاوەن فیلەکان، کە ئەبرەهەی حەبەشی پەلاماری کابەی داوە و لە لایەن ئەو پەلەوەرانەوە داڕزاون.. هەر لەو مەقالانەیدا ناوی ((جاف)) هاتووە کە بە زمانی عارەبی نووسراون، بەندە هەر وەک خۆی بڵاوم کردوونەتەوە و بۆ کوردی وەرم گێڕاون.

بەندە وا نازانم سوپای ئیسلام توانیبێتی بە ئاسانی گەیشتبێتە بناری هەورامان و لەوێڕا ((عەبدوڵلای ئەنساری)) کوژرابێت و دێی ((عەبابەیلێ)) بە ناوی ئەوەوە نرابێت، وەک زانراوە ئیسلام بە هەر کوێ گەیشتووبێت زۆرتر ئەو دەڤەرەی بە زۆری شمشێر کردووەتە ئیسلام، بەڵام ئەوی روونە لە سەدەی حەوتەم و هەشتەمی کۆچیدا ئەو بناری داڵەهۆیە بە شارەزوورەوە پەیڕەوی ئایینی ((یارسان ـ ئەهلی حەق)) بوونە و لە سەرەتای ئیسلامەوە بڕێک ناوچە و دەڤەری سەختی چیایی سوپای ئیسلام نەیتوانیوە داگیری بکات و دەڤەری داڵەهۆ و شارەزوور و بناری

هەورامان و دامێنی چیای شنگار و شێخان ئەو دەڤەرانەن تەسلیمی پەلاماری ئیسلام نەبوونە و لەسەر بیر و رای ئاییینی خۆیان ماونەتەوە.

عەبدولخالق سەرسام دەڵێت:

زۆربەی زۆری هۆزی ((جاف)) دەگەڕێتەوە سەر گاوانییەکان، جاوانییەکان. گاوان رود، جاوان رود، جوانڕۆ...

ئەو دەڤەرە ((جوانڕۆ)) لە بنەمادا شوێن و هەوارگەی هۆزی گەورە و بە دەسەڵاتی ((گاوانییەکان - جاوانییەکان)) بە واتای جافەکان، یانی باپیرە هەرە گەورەکانیان گوتییەکان بووە، هەروەها مامۆستا عەبدولخالق سەرسام دەڵێت:

رستەی ((گاوان رود)) (أرهن أسلامنهم في جوانرو) ئەوە دەسەلمێنێت کە جافەکان ((گاوان)) رودین، کەواتە گاوانین ((جاوانین)) بڕوانە ((ل٧٩)) اگاش، العشائر الكوردية - فوئاد حەمەخورشید) جگە لە تیرەی میکائیلی کە لە رۆژئاوای رووباری سیرواندا دەژیان، کفری و دەوروبەری، ئەو تیرانە هەر هەموو کۆچەری بوونە و ئەم هۆزە تا دەوروبەری قزرابات ((سەعدیە)) دەڕۆیشتن و لە هاویندا بە لیلاغ سەرەو ژوور دەبوونەوە بۆ کوێستانەکانی رۆژهەڵاتی شاری سنە و دەوروبەری سەقز و هوبەتو کە ناکۆکی لە نێوان دەسەڵاتی ئیمارەتی ئەردەڵان و هۆزی جافدا روودەدات، لە پڕ هەڵمەت دەبەنە سەر هەوارگە و شوێن و هەوار و ئیلاخەکانی هۆزی جاف. لەو شەڕە کوتوپڕیەدا کە هۆزی جاف ئامادەی ئەو پەلامارە نەبوونە، سەرۆکی هۆزی جاف دەکوژرێت و بڕێک لە تیرەکانی جاف لەگەڵ سەرۆکەکانیاندا کە بە بەگزادەی جاف دەناسران، جوانڕۆ بەجێ دێڵن و دەگوێزنەوە بۆ ئیمارەتی بابان، بڕێکی کەیان لە تیرەکانی جاف دەمێننەوە وەکو: وەڵەدبەگی، قوبادی، باوەجانی و جوانڕۆیی و بەگزادەکانی جوانڕۆ..

دیارە ئەو هاتنە لە سەردەمی ئەحمەد پاشای باباندا بووە و کە سەرۆکی ئەو دەمەی هۆزی جاف (زایەر بەگی جاف)) بووە.

مێژوونووسی رووسی (ی - ئی ڤاسیلیەڤا)، جافی کردووە بە دوو بەشی سەرەکییەوە:

١ - جافی جوانڕۆیی یانی ئێرانی
٢ - جافی مورادی یان عوسمانی

سەیر لەوەدایە ئەم ترس و تۆقینانە و دڵەڕاوکێیە کە دەسەڵاتدارانی ئەردەڵان بەرانبەر بە توانایی و ئازایەتی و زۆربوونی هۆزی جاف بوویانە، بابانەکانیش بە هەمان شێوە ئەو ترس و چەکەرەیان لە دڵدا هەبووە.

میرەکانی بابان لە هەر فرسەت و هەلێکدا بیانتوانیبا دەستیان دەخستە نێو کاروباری جاف و دەسەڵاتدارانی ناو جاف، ئەگەرچی جاوربار یان بۆ سەردەمێک نێوانی پاشاکانی ئەردەڵان و میرەکانی جاف بە کێشە و هەرا هاوکارییان لەگەڵ دەسەڵاتی باباندا کردووە، بە تایبەت لە سەردەمی سەرۆکایەتی سلێمان بەگی کوڕی قادر بەگی کوڕی زایەر بەگی جافدا، بەڵام دوای کوژرانی عەبدوڵڵا بەگی کوڕی کەیخوسرەو بەگ، ئەو پەیوەندییە پتەوە دووڵی و گومان جێگەی گرتەوە. زانراوە لە شەڕی قەرەگوڵدا کە بە شەڕی (گردە گریوی) ناسراوە، چووەتە یارمەتی سلێمان پاشای بابان دژ بە مەحمود پاشای بابان..

بڕوانە مێژووی سلێمانییە، ئەمین زەکی بەگ..

عەبدوڵـڵا بەگ لەو شـەڕەدا بە لایەنگیری میری بابان شـەڕێکی قارەمانانەی کردووە و لەو شـەڕەدا بریندار بـووە و لە دواییدا هەواڵ بڵاوبووەوە کە لە لایـەن میرەکانی بابانەوە زامەکەی ژەهرڕێژ کراوە، بڕوانە ((ڕۆمانی پاشایان کوشت، خوسرەو جاف))

لـە لایەکـی ترەوە، میرەکانی بابان زۆرتر وایان پێ باش بووە سـەرۆکایەتی هۆزی جاف بە دەسـت کەسـێکەوە بێت بێ یەک و دوو فەرمانی ئەوان جێبەجێ بکات ئەوەش بە لای میرەکانی جافەوە نەشیاو بووە، لە لایەکی ترەوە ترس و تۆقیان لە دەسەڵاتی هۆزی جاف، میرەکانی بابانی نیگەران و پەشێو کردووە لەم ڕووەوە، گەڕیدە و ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی ((کلودیوس ریچ)) لەم ڕووەوە دەڵێـت: ((هـۆزی جاف بە کەمترین کات دەتوانێ هەزار سـواری چەکدار و چوار هەزار چەکداری پیادە کۆ بکاتەوە. بەسـەر ئەو ژمارە زۆرەدا، ئەم هۆزە تا بڵێی ئازا و پەلاماردەرن و ئازاترین شەڕکەری کوردن)).

لە لایەکی ترەوە، دەسەڵاتی بابان تەوح و نەفەسیان زۆرتر بووە بۆ بەگزادەکانی وەلەدبەگی جاف، کە خاڵوانیان بوون ((ریچ)) لە کتێبەکەیدا باسی ڕاکردنی ((حەسەن بەگی بابان)) دەکات بۆ شاری بەغدا و پەنای بردۆتە داود پاشا، بۆ خۆی ئەو حەسەن بەگە، برای مەحمود پاشای بابان و خوشکەزای وەلەدبەگی جاف بووە (گەشتی ریچ لە ئێراقدا، ١٨٢٠ز، ل٩٠).

ئاشکرایە هەم ئەردەڵان و هەم بابان کۆشاون، توانا و دەسەڵاتی جاف لە بەرژەوەندی خۆیان بەکار ببەن.

محەمـەد ئەمین کولسـتانە لـە کتێبی (مجمـل التواريخ ئەفشـاريە و زەنديە) لـە لاپەڕە ٣٠٠ دەڵێت:

عەبدوڵڵای پاشـا سەرپەرشتی کاروباری عوسـمانییەکان کە ئەو دەم فەرمانڕەوای ناوچەی زەهاو بووە، کە سـەر بە دەسـەڵاتی عوسـمانی بووە و لەگەڵ (محەمەد خانی زەند)دا تێکدەچێت (محەمەد خانی زەند) یەکێک بووە لە فەرماندەکانی دەسەڵاتی کەریم خانی زەند. پەلاماری ناوچەی زەهـاو دەدا، ((عەبدوڵڵا پاشـا)) داوای یارمەتی لە هۆزی جـاف دەکات، کە ئەو دەم ((قادر بەگی جاف)) سەرۆکایەتی جافی کردووە.

جاف دەڕواتە هاواری ئەو داواوە و ناوچەکە لە دەستی زەندەکان دەستێنێتەوە.

پەیوەندی نێوان دەسـەڵاتی بابان و میرەکانی جاف پەیوەندی بە ڕووداوەکان و مەزاجییەت و ترسەوە بووە.

کەیخوسـرەو بەگی گەورەی جاف و باوکی حەمەپاشـای جاف لـەوە دەچێ مەیانەی لەگەڵ مەحمود پاشـای باباندا باش نەبوو و دۆسـتایەتی لەگەڵ عەبدوڵڵا پاشای باباندا پتەوتر بووە دژ بە مەحمود پاشای بابان، ئەو دۆستی و ناڕێکییە لە شەڕی ((قەرەگوڵ))دا بە جوانی دەرکەوتووە ١٨٢١ز کە لە نێوان مەحمود پاشای بابان بە هاوکاری داود پاشای بەغدا لە لایەکەوە و عەبدوڵڵا پاشـای بابـان بە یارمەتی ((محمـد علی میرزا وەلیعەهدی ئێران)) لە لایەکی ترەوە، لەو شـەڕەدا مەحمود پاشا بووەتە فەرمانڕەوای دەسەڵاتی بابان، بڕوانە (السليمانية في نواحيها المختلفة، جمال بابان، ص٣٨٥).

بـەو ڕووداوانەدا دەردەکەوێت، دوو دەسـەڵاتی گەورەی غەیرە کورد ((ئێران ـ عوسـمانی)) پەیوەستە دەستیان لە ناو کوردستاندا لە کار بووە و لە پێش ئەوانیشدا ((قاجاریە)) و دەسەڵاتی

سەفەوی، هەمان شێوەیان بەکاربردووە، بەتایبەت دوای شەڕی ((چاڵدێران))، ئەو دوو دەسەڵاتە داگیرکەرە، کوردستانیان کردۆتە گۆڕەپانی ململانێی خوێناوی نێوانیان و چەند سەد ساڵ ئەو ململانێیە درێژەی کێشاوە. سمی ئەسپی ئەو دوو لەشکرە خوێنخوارە لە کوردستاندا، لە تەواوی دەڤەرەکانیدا نیشانەی تاڵان و کوشتن و بڕینی نەخشاندووە و ئومەرا و دەمڕاستی کوردیش بوونەتە دوو بەشەوە، بڕێک جیرەخواری سەفەوییە و بڕێکی تریان خزمەتگوزاری ئالی عوسمان بوون، لەم رووەوە ((ئەمین زەکی بەگ)) دەڵێت: ((ئەگەرچی میرەکانی بابان زۆرتر سیاسەتێکی دووڕووانەیان بەکار بردووە، بەڵام دیارە لە وردەکارییانەوە بووە، ناچاری هەلومەرجی ئەو زەمانە بوونە، ئەگەر بە پێچەوانەوە رەفتاریان کردبا، تووشی کێشەی گەورە دەهاتن، بەسەر ئەوەشدا، بڕێک لە میرەکانی ((بەبە)) هیچ مولاحەزەی دەسەڵاتی خۆیان و بەرژەوەندی میللەتەکەیان نەکردووە، بڕوانە (گۆڤاری ژیان، ساڵی ١٠، ژمارە ٤٥٠. یان- العراق الحديث من سنة ١٩٠٠- ١٩٥٥م، المترجم طه سليم التكريتي بغداد ١٩٨١م).

چەند ئەمڕۆ لە دوێنێ دەچێ، هێشتا ئێمەی کورد و سیاسەت و زانای کورد دووچاری هەمان گرفتین، هێشتا دەسەڵاتی ((رۆم و عەجەم)) بە داخەوە عارەبیشی هاتۆتە پاڵێ، لە زۆربەی کاروباری کوردستاندا دەست تێوەردانیان نمایانە.. ئەگەر بە وردی لەو بارەوە بدوێین، ئەو دەست تێوەردانە و ئەو سایە لە خۆڕا نەبووە و هاندەریان بووە، بەڵگەیان بە دەستەوە بووە، سەیری ئەم بەزمە بکە. عەبدوڵڵا پاشا لەگەڵ مەحمود پاشای باباندا ناکۆک بووە، هەروەها مەحمود پاشای بابان لەگەڵ حەسەن بەگ و سلێمان بەگی برایدا ناکۆک بووە، یان ناکۆکی مەحمود پاشای بابان لەگەڵ پاشای کوێرەی رەواندوزدا یان تێکچوونی مەحمود پاشا لەگەڵ کەیخوسرەو بەگی جافدا، ئەوانە هەمووی بەڵگە و هۆ بوونە بۆ دەخالەتکردنی بیانییەکان، ئەویش لە سەردەمی دوو دەسەڵاتی ناتەوان و ماندوو و پەککەوتوودا وەک قاجارییە و عوسمانی..

ئیدی لەو کێشە کێشەیەدا، کەیخوسرەو بەگی سەرۆکی جاف لە تەمەنی ٤٤ ساڵیدا مردووە و لە سەید سادق نێژراوە.

لە دوای مردنی کەیخوسرەو بەگ، کوڕە مێرد منداڵەکەی محەمەد بەگ لە تەمەنی ١٤ ساڵیدا بووە بە سەرۆکی جاف و لە دواییدا ئەو حەمە بەگە (١٧١٤ _ ١٧) دەبێتە پاشایەکی ئازا و لێهاتووی زەمانی خۆی.. دوای مردنی ناوەختی کەیخوسرەو بەگ، لە ((محەمەد بەگی)) مێردمنداڵی زیاتر کوڕ و برای بۆ نەماوەتەوە..

سەرۆک تیرەکانی جاف بە چاولێکەری مەغۆلەکان ئەنجومەنێک پێکدێنن ((کوریتای)) بۆ پاراستنی مافی سەرۆکایەتی کوڕە مێردمنداڵەکەی کەیخوسرەو بەگ لە لایەکەوە و بەرگری لە دەست تێوەردانی دەسەڵاتەکانی دەوروبەری هۆزی جاف لە کاروباریاندا. بە تایبەت لەو دەمەیدا ئەحمەد پاشای بابان بە تەواوی توانایەوە ویستوویەتی ((ئەحمەد بەگی وەلەدبەگ)) کە خاڵۆی بووە بکرێتە سەرۆکی جاف و لەو رووەوە زۆری هەوڵ داوە. (حەمە بەگی جافی)) دەعوەت کردووە بۆ سلێمانی تا بیگرێت و زیندانی بکات، ((محەمەد بەگ)) نەڕۆیشتووە، پەی بە پلانەکە بردووە، چەند خزمێکی ناردووە، ئەو خزمانەی زیندانی کردووە (بڕوانە رۆمانی پاشایان کوشت، خوسرەو جاف)، محەمەد بەگ بەرامبەر ئەو کردەوەیە، وەلەدبەگی خاڵۆی ئەحمەد پاشای دەستگیر کردووە و لەگەڵ زۆربەی تیرەکانی جافدا کۆچ دەکەن و روو دەکەنە کوردستانی رۆژهەڵات ((دەسەڵاتی ئەردەڵان)) لە بەدبەختی ((حەمەبەگی جاف)) وەلەدبەگی جاف خزمایەتییەکی پتەوی

لەگەڵ والی ئەردەڵاندا هەبووە، ئیتر محەمەد بەگ و جاف، ناتوانن لەو دەڤەرانەدا زۆر بمێننەوە و بە ناچاری دەگەڕێنەوە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و لە ناوچەی دەوروبەری خانەقین و قزرەبات ((سەعدیە))ی ئێستا لەوێدا دادەبەزن و حەمەبەگ پەیوەندی لەگەڵ والی بەغدادا دەکا و دەڕوا بۆ دیتنی و زۆر ڕێزی لێ دەگرێت، سەرئەنجام ئەحمەد پاشای بابان بە چاک دەزانێت ئەوەندە لەگەڵ محەمەد بەگی جافدا دوژمنایەتی بەردەوام نەکات چاکترە، دەکەوێتە دڵدانەوەی، دوای سێ ساڵ ناکۆکی ئاشت دەبنەوە و حەمەپاشا دەگەڕێتەوە ناوچەی شارەزوور (بڕوانە گۆڤاری ئێرانی، ژمارە ٢٧٦٧، د.حەسەن جاف).

ئەمین زەکی بەگ دەڵێت: ساڵی ١٨٥١ز کە لەشکری نەجیب پاشای والی بەغدا دەڕواتە سەر دەسەڵاتی بابان (ئەحمەد پاشای بابان). حەمە پاشای جاف ناڕواتە هانای ئەحمەد پاشای بابانەوە، بەڵام بەپێی ئەو دیکۆمێنتانەی بە دەست بنەماڵەی بەگزادەی جافەوە ماوە، حەمەپاشای جاف هەرچەندە لە ئەحمەد پاشای بابان زویر بووە، کە ئەحمەد پاشا لێی دەقەومێ روودەکاتە ناو هۆزی جاف و حەمەپاشای جاف لەشکرێکی بۆ کۆدەکاتەوە و دەیخاتە تەکی، بەڵام لەبەر تۆکمەیی لەشکری نەجیب پاشا نەیانتوانیوە بەرگری لێ بکەن و میرنشینی بابان لە ناو دەچێت لە ساڵی ١٨٥١ز.

دیارە دوای ئەو شەڕە، عەبدوڵڵا پاشای برای ئەحمەد پاشا بۆ ماوەیەک لە سولەیمانیدا کراوەتە قایمقام و لەوە دوا نێوانی عەبدوڵڵا پاشا و محەمەد پاشای جاف خۆش بووە، زۆر ناکێشێ ئەفسەرێکی گەورەی تورک بە پلەی ((لیوا)) دەکرێتە حوکمڕانی سولەیمانی.

د. عەبدولعەزیز سلیمان، لە کتێبی (تاریخ العراق الحدیث فی نهایة حكم داود پاشا الی نهایة حكم مدحت پاشا) چاپی قاهیرە، ١٩٦٨، لاپەڕە ٨٠دا دەڵێت:
عەشایەری جاف لە دوای نەمانی دەسەڵاتی بابان دیارە گرفتاری و کێشەی زۆری بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروستکردووە لەبەر دڵنەوازی محەمەدبەگی جاف، نازناوی پاشایەتی داوە بە محەمەد بەگی جاف، بەڵام بەخشینی ئەو نازناوە، هەوا و هەوەسی سەربەخۆیی لە بیر و ئەندێشەی محەمەد پاشای جافدا دوور ناخاتەوە، لە راستیدا حەمەپاشای جاف دوای لەناوچوونی دەسەڵاتی بەبە کۆشاوە جێگەی ئەو دەسەڵاتە بگرێتەوە، وردە وردە دەستی لە پێکهێنانی مەرجەکانی فەرمانڕەوایی کردووە، لە ساڵی ١٨٢٣ز قەڵایەکی سەخت و رازاوەی بەسەر گردی شێروانەوە سازاندووە وەک زستانەهەوار، ئەو قەڵایە هێشتا فەخر و شانازی دەفرۆشێتە رۆژگار.. سەیر لەوەدایە برێک وردە چەپگەرای کرج وکاڵ لایان خۆشە ئەو قەڵایە هی محەمەد پاشای جاف و کوردێک نەبێت و لایان خۆشە هی تورک و تەتەر و عەجەمێک بێت باشترە، کەچی لە نێو میللەتانی زیندووی ئەمڕۆدا ئەو قەڵا و ئاسەوارانەی لە دەسەڵاتدارانی هەزارجار خوێنڕێژتر لە حەمەپاشا جاف میللەتی ئەوڕۆ شانازی پێوە دەکەن. بە هیوای ئەو رۆژەی گەلی کورد ئەمڕۆکە تێفکرێت و بۆچوونی حیزبایەتی و ئایدۆلۆژی توندڕەوانە و دەمارگرژی خێڵەکییانە تووڕ بدەنە لاوە و بەرەو سازندەگی سەردەم هەنگاو بنێن..

ئەوی روون و ئاشکرایە حەمەپاشای جاف بە ئاسانی نەدەڕۆیشتە ژێر فەرامێنی عوسمانییەکانەوە، بەتایبەتی لە سەردەمی والیگەری عومەر پاشای والی بەغداوە..

والی بەغدا گوشـــار دەخاتە ســـەر محەمەد پاشای جاف تا زەوی و زاری شارەزوور و جێگە و شـــوێنی تر بگرێت و هۆزی جاف لە کۆچەری و گەرمیان و کوێســـتان بکەون، ئەو داوایە زۆر حەمەپاشـــای جـــاف قەرس و تووڕە دەکات لە وەڵامی والی بەغـــدادا دەڵێت: ئەو داوایەی بۆ ئێمە نەشیاوە، ئێمە جاف وەک بازی سەر پۆپەکانین لە هەر کوێدا بمانەوێت دەنیشینەوە، چ ئەودیو چ ئێرە، بە موڵکی خۆمانی دەزانین، نیشتەجێبوون مەحاڵە.

ئەم وەڵامەی محەمەد پاشای جافە، عومەر پاشا تووڕە و ئاڵۆزتر دەکات و دەکەوێتە خولیای ئازاردانی هۆزی جاف.
حەمەپاشـــا دەزانێت عومەر پاشـــا خەیاڵی خراوە و دەیەوێت دەســـتی لێ بوەشـــێنێت، لەگەڵ گشـــت تیرەکانی جافدا روو دەکەنە ئێران، جگە لە کەرەم وەیســـی نەبێت، کە بەرەبابێکن لە تیرەی شاتری جاف بوونە لەوێرا جوانڕۆ دەکاتە هاوینەهەواری و زستانانیش زەهاوی دەکردە هەوارگە، دەوڵەتـــی ئێـــران رۆڵ و دەستڕۆیشـــتنی حەمەپاشـــا و هۆزی جافی لا ئاشـــکرا بـــووە، بەوپەڕی توانایانەوە رێز لە حەمەپاشا دەگرن و نازناوی ((خان))ی لە لایەن ناسرودین شای قاجارەوە پێ بەخشـــێنراوە. فەرمانڕەوایی دەڤەری زەهاوی پێ دراوە و بووە بە ســـنووورداری رۆژئاوای ئێران (بڕوانە: مشاهير الاكراد، ج الثاني، ص٢٥٨). عوسمان بەگی کوڕی دەکرێتە حاکمی جوانڕۆ.

ســـەرجەم محەمەد پاشـــا جاف و تیرەکانی جاف ســـێ ســـاڵ لە ئێراندا دەمێننەوە، دەوڵەت و دەسەڵاتێکی یەکجار زۆر بەدەست دێنن، تیرەکانی جاف زوڵم و زۆرێکی زۆر لە خەڵکی ناوچەکان دەکەن، هەروەها دەســـتدرێژی دەکەنە ســـەر ناوچەکانی ژێردەســـتەی عوسمانی و فەرماندەرانی عوسمانی تەنگەتاو دەبن و هەرچی دەکەن دەستیان ناگاتە دەسەڵاتی حەمەپاشا.
ســـەردەمدارانی عوســـمانی ئەوەی دەزانن بۆیـــان دەردەکەوێ کە هیچ توانـــا و قودرەتێکیان بەســـەر جـــاف و حەمەپاشـــادا نییە، ناچار پەنـــا دەبەنە بـــەر کاروباری دیبلۆماســـی و بابولعالی و وەزارەتـــی دەرەوەی عوســـمانلی، ئـــەو نامانەم بە دەســـت هێناوە و لە بەشـــێکی ســـەربەخۆدا تـــەواوی ئـــەو پەیوەندییانـــە بڵاو دەکەمەوە، هەروەها لە یادداشـــتەکانی ((میـــرزا ملکم خان))دا لە گۆڤـــاری ((برســـیهای تاريخی)) ژمارەی یەکـــەم ١٩٧٠ز بڵاو کراوەتەوە. کە دەوڵەتی عوســـمانی داوای تەسلیمکردنی حەمەپاشای جاف دەکات.

بێشـــک، ئاوا دەســـەڵاتێکی بە لای کاربەدەســـتانی ئێرانەوە دەبێتە مایەی نیگەرانی و ئاڵۆزی، بەتایبەت بە لای (موعتەمەدولدەولە فەرهاد میرزاوە) کە مامی ناســـرودین شـــای ئێران بووە. کە ئەو دەم والی سنە بووە (١٢٨٤ ـ ١٢٩١ك). فەرهاد میرزا داوا لە حەمەپاشا دەکات تا هۆزی جاف نیشـــتەجێ بن و ناســـنامەی ئێرانی وەربگرن و بەرگری لە تیرەکانی جاف بکات، تا دەســـتدرێژی نەکەنە سەر سنوورەکان، ئیدی رێگەی کوێستان و گەرمیانی خێڵەکان نادات تا بێتە ناو ئێرانەوە.
وەک زانـــراوە حەمەپاشـــا بـــە تەواوی هێزەوە بەرگری لە نیشـــتەجێبوونی جافـــی کردووە و لای وابـــووە هێـــز و توانای هـــۆزی جاف بەو گەرمیان و کوێســـتانەوەیە، جا نەڕۆیشـــتۆتە ژێر باری فەرمانی دەوڵەتی ئێرانەوە، هەر بەو هۆیەوە شەڕێکی خوێناوی قورس و گەورە و گران لە نێوان جاف و دەوڵەتی ئێراندا روویداوە و لەو شەڕەدا جاف بە خراپی دەشکێن و شپرزە دەکرێن..

فەرهاد میرزا، بەوەوە راناوەســـتێت و نامە هەڕەشـــەیەک دەنێرێتە سەر حەمەپاشا و ئەوەش دەزانـــێ کـــە حەبیبوڵلاخانی باوەجانی خۆشەویســـتی حەمەپاشـــایە دەیگرێـــت و زیندانی دەکات،

هەرچی حەمەپاشــا دەکۆشــێت، حەبیبوڵڵاخان رزگار بکات ((فەرهاد میرزا)) ناڕواتە ژێر و دەڵێت ئامــادەم هەزار تمەن پێشــکەش بدەم بە مەرجێک حەبیبوڵڵاخــان رزگار بکرێت، وا دەردەکەوێت، فەرهاد میرزا بە نامەیەکی کاکە ئەحمەدی شێخ بەرەڵای دەکات.

بــەو شــێوەیە ((فەرهــاد میرزا)) چــواردەوری حەمەپاشــا و هــۆزی جاف دەچنێــت، ناچار حەمەپاشای جاف دەکەوێتە تەقەڵلای گەڕانەوەی بۆ کوردستانی باشوور و ناوچە و دەڤەرەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی و دەکەوێتە پەیوەندی لەگەڵ ناسراوەکانیدا لە ناو دەسەڵاتی عوسمانیدا ئەو دەم ((تەحســین پاشــا))ی والی بەغدا یەکێک بووە لە دۆستانی حەمەپاشا، یەک دوو جار مەحمود بەگی کوڕی گەورەی حەمەپاشا دەڕواتە لای والی بەغدا، سەرئەنجام حەمەپاشا دەگەڕێتەوە خاکی عوسمانی (بڕوانە مێژووی سلێمانی، ل١٨٣). والی بەغدا رێزێکی زۆر لە حەمەپاشا دەگرێت..

ئەگــەر ئێمــە بــە وردی لــەو کەینوبەینەی ئــەو دوو دەســەڵاتە ورد ببینــەوە، دەڕوانین ئەو دوو دەســەڵاتە بەو هەموو خوێن رشــتنەی نێوانیانەوە (ســەفەویە، قاجاریە، عوســمانی) کەچی لــە داپڵۆســینی کورددا نەک رێــک و تەبا بوون، بەڵکو برایانە پێکەوە تــا توانیویانە قەڵاچۆکردنی کوردیــان بــە لاوە پیرۆز بووە و پێکەوە ئــەو کارەیان کردووە، چەند ئــەوڕۆ لە دوێنێ دەچێت.. دوای ســەدان ســاڵ هێشتا ئاش هەمان ئاش و بۆ قەیرانی کورد و کاولکردنی کوردستان، تورک، عەجەم و عارەبیش هاتوونەتە پاڵیان ئەوڕۆکە درێغی ناکەن، ئەوەی بتوانن دەیکەن، شــتێکە هەر ئەوەندەیان پێ دەکرێ کە دەیکەن.

کاربەدەســتانی دەوڵەتــی عوســمانی رق و کینەیەکــی یەکجار زۆریان لە دڵدایــە، زۆریان لە حەمەپاشــای جاف کۆمەڵ کردبوو، راستەوخۆ دەیانەویست و نەیان دەتوانیش هەڵکوتنە سەری، کەوتنە پیلان نانەوە و بە دوای هەلدا دەگەڕان..

کە حەمەپاشــا دەگەڕێتەوە، ســەرەتا دەیکەن بە جێنشــینی موتەسەڕیفی ســلێمانی ١٢٩٤ک، بەڵام وادیارە پاشــا بەو جێگەیە خۆشــنوود نەبووە، قایمقامی هەڵەبجەی بەلاوە چاکتر بووە، کە راســتەوخۆ لە ناو هۆزەکەی خۆیدا بێت، لە غەیبەتی حەمەپاشــادا و نیشتەجێبوونی ئەو و هۆزی جاف لە دیوی ئێراندا، عوسمانییەکان کۆشابوون بڕێک لە تیرەی جاف لە حەمەپاشا دابڕن و هەر لە سەرەتاشــەوە، تیرەی کەرەم وەیســی کە بەرەبابێکی نێو تیرەی شاترین، لەگەڵ حەمە پاشای جافدا نەڕۆیشــتن و لە شــارەزوور نیشتەجێ بوون و دەوڵەتی عوسمانی زەوی و زارێکی زۆری خســتبووە ژێر دەستیانەوە، کەرەم وەیســییەکان لە ناو جافدا شورەتی ئازایەتی و پەلاماردانیان دیاری بووە و ســەرۆکی ئەو دەمەیان ((عەزیز شــاوەیس)) یەکێک بووە لە دەمڕاســانی زەمانی خۆی، هەروەها بە گوێرەی لێزانینی ئەو کاتە توانیویە راستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ کاربەدەستانی عوســمانیدا ببەســتێت و ببێتە جێگەی متمانەیان و لە دێی ((بەشارەت)) کە نزیکی هەڵەبجە دەبێت لەوێرا هێندە گوێ نادەنە حەمەپاشــا و دەســەڵاتەکەی و قایمقامەتییەکەی.. حەمەپاشــا دەنێرێتە دوایــدا نــاڕوات، تا دەنێرێت و دەیگــرن و دەیهێنن بۆ هەڵەبجە و دەیخاتــە زیندانەوە، لە زینداندا بە نەخۆشــی (زاتولریئە) دەمرێت، مەرگی عەزیزی شــاوەیس دەبێتە هۆیەکی ســەرەکی هاندانی ئەو تیرەیە و دوژمنانی حەمەپاشــا و کاربەدەســتانی عوســمانی بە خزمانی (عەزیزی شاوەیس) دەسەلمێنن کەوا بە مەرگی خوا و نەخۆشی نەمردووە، بەڵکو دەرمان خوارد کراوە..

ئیدی کەرەم وەیسییەکان، بە دوای هەلدا دەگەڕێن، کاتێک حەمەپاشا بۆ راو دەڕوا بۆ ناوچەی ((چیمەنی برایم سەمین) کە دەکەوێتە نزیکی شاری کفری، فرسەتی لێ دێنن و دەیکوژن ١٢٩٩ک..

بە دوای کوشتنی حەمەپاشادا ئەم کۆمەڵە خۆیان دەگەیەننە لای سەرۆکی ئازای هۆزی هەمەوەند، وەک مامۆستا عەلائەددین سەجادی لە (خواشخواندا، ل ١٢٤)دا دەڵێت:

هەمەوەندەکان لەسەر کوشتنی ((خولەپەزە، کینەیەکی پەنهانیان لە دڵدا چەسپابوو، بەڵام نەک بەو ئەندازەیە کە بکەونە شەڕی سەر و ماڵییەوە لەگەڵ هۆزی جافدا، خوالێخۆشبوو مستەفا بەگی کەریم بەگی جاف، لەم رووەوە وتوویەتی: جوامێر هەمەوەند لە ماڵدا نابێت کاتێک کەرەم وەیسییەکان پەنای بۆ دەبەن، دەرویێشی برای دەنێرێتەوە و دەڵێت: ئەگەر دیت پەناهێنەرەکان نەگەیشتوونەتە ماڵ دەست بە یەخەیانەوە بنێ، با لە ئێمە دوورکەونەوە، ئەگەر لە ماڵا بوون ئەوا هیچ و شەڕەو یەخەی پێ گرتووین. دەرویێش کە دەگاتە هەوارگە دەبینێت قاتیلەکان لە دیوەخانەکەی جوامێردا دانیشتوون.

ئیدی جوامێر هەمەوەندی ئازا و لێزانی شەڕ، ئەوەی لا مەعلوومە تووشی شەڕێکی گەورە و گران و درێژخایان هاتووە، ئەوەش دەزانێ لەو ناوچەیەدا بەرگەی ئەو شەڕە ناگرێت ناچار کۆچ و بار رێک دەخات و لەگەڵ بکوژەکانی حەمەپاشادا بەرەو ئێران دەکەونە رێ، چەندین شەڕ لە نێوان جاف و هەمەوەندا روودەدات ئەوە باسێکی دیکەیە..

دەوڵەتی قاجاری، رقی لە حەمەپاشای جاف دەبێت و بە چاکیشی دەزانێت ببێتە پاڵپشتی هۆزێکی شەڕکەری وەک هەمەوەند و کەسێکی ئازای وەک ((جوامێر)) بگرێتە خۆی و لە پێویستدا بەکاری بهێنێت، هەر واشی کرد. دەسەڵاتێکی زۆری خستە ژێر دەستی جوامێرەوە، زۆر کار و کردەوەی پێ سپارد، وەک هەمیشە کە کاریان پێ نەما سەدان گۆبەنیان بۆ نایەوە و سەرئەنجام بە نامەردی دەستگیریان کرد و کوشتیان.

قاجاری و عوسمانی، لە زۆر لایەنەوە ناکۆک بوون، بەڵام بۆ لەناوبردنی کورد بە چەشنی برا بوون، بەتایبەت دوای پەیمانی ئەرزەڕۆمی دووەم کە لە ساڵی ١٨٤٧زدا ئیمزا کراوە لە نێوان دوو دەسەڵاتدا، وەک مێژوونووس (منـذر الموصلي) لە لاپەڕەی ١٩٢ی کتێبی (عرب، کرد)دا سەلماندوویەتی..

بەپێی برێک لە سەرچاوەکان و گێڕانەوەی سنگ بە سنگ دوای لەناوبردنی ئیمارەتی بابان لە لایەن دەسەڵاتی عوسمانییەوە حەمەپاشای جاف، کەوتبووە کەڵکەڵەی جێ کردنەوەیان، با وەک هەردوو دەوڵەت ((قاجاری و عوسمانی)) دەسەڵات و توانایان بە هۆی شەڕ وشۆڕی میللەتانی دوور و نزیکەوە ماندوو بووبوون، گوڕ و گرمەی پەلاماری ئەملا و ئەولایان پێوە نەمابوو، حەمەپاشا ئەوەی زانیبوو، بەڵام لە بەختی رەشی پاشای جافدا، ئەو دوو دەوڵەتە لەو سەردەمەیدا زۆر لە یەکەوە نزیک بوون، بەتایبەتی بە هەردوولادا دەکۆشان هەر دەسەڵاتێکی کوردزمان بیەوێت بێتە مەیدانەوە لە ناوی بەرن و بە تەئکید کوژرانی حەمەپاشای جاف پلانێکی داڕێژراوی عوسمانلی ناوی ویلایەتەکانی ژێردەستەی عوسمانلی بووە بەتایبەت ولایەتی بەغدا.

هەر بە کوشتنی جوامێر هەمەوەند ئەو هاوکارییەی دەرکەوتووە لەشکری ئێران بە فەرماندەیی ((حوسام الملک)) و لە لایەن عوسمانییەوە (قورت سمایل پاشای دیاربەکری)) مەئمور کرابوو کە پیاوانی وەک جوامێر هەمەوەند لەناوبەرن و هەرواشـیان کرد، چۆنیەتی کوشـتنی بە چەند شێوە دەگێڕنەوە: بڕێک دەڵێن بانگیان کردووە بۆ گفتوگۆ و خراوەتە ناو داوەوە و کوژراوە. بڕێک دەڵێن تیرۆر کراوە، بەڵام لە راسـتیدا لە شـەڕدا ئەسپەکەی دەکوژرێت و دەکەوێتە ناو خێڵی دوژمنەوە و دەیکوژن و سەریشی دەبڕن و بەوەشەوە راناوەستن سەرەکەی دەکەنە نووکی رمەوە..

دوای کوشـتنی محەمەد پاشـای جاف و لە لایەن مەحمود پاشای کوڕی حەمەپاشای جاف و کوڕەکانی و ئێڵ و جاری جاف بۆ تۆڵەسـەندنەوەی حەمەپاشـا، ئەوە بۆ خۆی داستانێکە (بڕوانە پاشایان کوشت، خوسرەو جاف). زیرەکی و لێهاتوویی مەحمود پاشای کوڕە گەورەی حەمەپاشا توانی بە باشـی جێگەی باوکی بگرێتەوە، با وەک ئێران و عوسـمانی دەسـتیان لەکاردا بووە بۆ ئاشـوفتەگی نێو هۆزی جاف، حەمەپاشـا میری جاف کوژرابوو ئاشـوفتە بازاڕی خەریک دەبوو لە ناو هۆزەکانی جافدا وەدەردەکەوت، بەڵام کارزانی مەحمود پاشـا و ئاگاداربوونی لە ئەوزاعی سیاسـی نێو دەوڵەتی عوسـمانی و بەرەجۆراو جۆرەکانی نێو دەسەڵاتی عوسمانی کارێکی وای کرد مەحمود پاشای جاف بە وردی بتوانێت تەواوی تیرە و هۆزەکانی جاف یەکبخات و بێ یەک و دوو فەرامێنی جێبەجێبکەن، لەم رووەوە ((باسیل نیکیتین)) مێژوونووسی رووسی دەڵێت: (لەوەی دەڕوا لە ناو هۆزەکانی کوردا تەنها ئالیەت و سیستەمی هۆزی جاف بەو ئەندازەی بەهێزبووە کە نەتوانراوە پەیوەستەگی بە عەشیرەتەوە بهەژێتەوە و لە ناوخۆدا ناکۆک بن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کارزانی و ژیریی سەرۆکەکانیان (الاکراد، باسیل نیکیتین، ص١٦٧ ـ ١٦٩).

وەک زانراوە سـەرۆکەکانی جاف زۆر بە هێمنی و سـەبر و حەوسەڵەوە رەفتاریان کردووە، لەگـەڵ هۆزەکەیاندا. دەگێڕنـەوە کابرایەکی جاف ژنەکەی لەبـەر دەدا و دەیبات بۆ لای مەحمود پاشا بۆ شکات

پاشا دەڵێت: دەی بزانم چیتانە و کێ زوڵمی لێ کردوون؟

جافە دەڵێت: قوربان من لە دەست ئەم ژنەم هاتوومە شکات..

پاشا دەڵێت: بۆ، مەگەر ژنەت چی کردووە، چی لێ قەوماوە؟

جافە دەڵێت: پاشا، ئەم ژنی منە لێلما دروست ناوێت.

پاشـا بە ژنە دەڵێت: بەپێی شـەریعەت گوناحت دەگا، ئەوە مێردی تۆیە و حەقی بەسـەرتەوە هەیە..

ژنـە دەڵێت: پاشـا وەهەرچـی ((قورحان)) هەیە درۆ ئـەکا، من ئەرکـی ژن و مێردی وەجێ دێنم..

جافە قسەی پاشا دەبڕێ و دەڵێت: پاشا. پاشا، وەو قورحانە وا تۆ لێت خوندووە، ئەو گانەی ئەو ژنە ئەیداتە من تۆ وە سەگە رەشەکەی بەر کەلەوەرەکەتی نادەی..

بڕوانە ئەمە نموونەی خەروارێکە...

وردە وردە هەسـتی نەتەوایەتـی لـە نێـو میللەتی کوردا هاتبـووە جوڵان، لە نێـو تورکیا و رۆشـنبیرانی گەلانـی ژێردەسـتەی عوسـمانی و هەتاوەکـو سـوپاکانی عوسـمانی جوڵانەوەی ئازادیخوازیی ژیان دوور لە دیکتاتۆریەت، هەم سانی بووبووە دروشم.

فەرمانەکانـی سـوڵتانی عوسـمانی، ئیتر وەک ئایاتی ئاسـمانی رێز و پەیـڕەوی لێ نەدەکرا.

ئەنجوومەن و کۆمەڵەی جۆراوجۆر هاتبووە کایەوە، سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی کەوتبووە گیروداوی بەربڵاو، بەگوێرەی توانا میللەتە ئازادیخوازەکانی سەرکوت دەکرد.
((مونــزر موســڵی)) دەڵێــت: ســوڵتان عەبدولحەمیــد کوردی دژ بــە مەســیحییەکان، زۆرتر ئەرمەنییەکان هان دەدا و دەبووە پاڵپشــتیان، لەولاشەوە ئەگەر کتێبێک بە زمانی کوردی لە چاپ درابا قەدەغە دەکرا و کۆ دەکرایەوە، وەک لە کتێبی ((الاکراد))ی ((باســیل نیکیتین))دا لە لاپەڕەی ١٩٥دا نووسراوە.

مەحمود پاشا، پەیوەندی زۆری لەگەڵ کۆمەڵگا و چینەکانی نێو دەسەڵاتی عوسمانیدا هەبووە، ئــاگاداری تەواوی جوڵانەوەی ئازادیخوازانەی گەلان و کەســایتییەکانی ناو دەوڵەتی عوســمانی بوو، دەزگا و دەوڵەتییەکانی عوسمانی ئاگاداری ئەو پەیوەندییەی مەحموود پاشا بوونە، درەنگی کاتێــک بــە چاوی گومانــەوە جوڵانەوەکانیان خســتبووە ژێر چاودێری و بە عەرزی ســوڵتانیان گەیاندبوو کەوا مەحموود پاشا هەستی نەتەوایەتی کەوتووەتە خولیایەوە.

لــەم رووەوە ئەمیــن زەکی بەگ لە کتێبی (مشــاهیر الکرد و کردســتان) ح٢، ص١٨١، ســاڵی ١٩٤٧ز) دەڵێت:
((مەحموود پاشا، بە تۆمەتی کوردایەتی دڵی دەوڵەتی عوسمانی لێ زویر بووە))، لەو دەمانەدا ســوڵتان عەبدولحەمید هێزێکی سوارەی بۆ داپڵۆسینی گەلانی ژێردەستە دروستکردبوو بە ناوی ((ســوارەی حەمیــدی)) ئەو هێزە بووبووە جێگەی مەترســی لە دڵی خەڵک و زۆربەی ســەرۆک عەشــیرەتە کوردەکاندا، وەک: عەشــایەری پشــدەر، هەمەوەند، جاف و عەشــایەری کوردستانی باکوریش هەروا تێدەفکران..

لەم رووەوە، رۆژهەڵاتناسی رووسی، لازەریف دەڵێت: مەبەست لەو هێزە تۆقاندنی دراوسێی لای راستی بووە، بەڵام وڵاتەکەی تا دەبوو بەرەو ئاژاوە و هەرا و ناسەقامگیری دەڕۆیشت (لای راستی مەبەستی ئێرانە)..

فەریق نامیق پاشا، سەردانی هەڵەبجە دەکات. مەحمود پاشا رێزی زۆر لێ ناگرێت و دەزانێت ســەفەرەکەی بــێ مەڵامــەت نییە، بەڵام لەو رووەوە هیچ ناڵێت، لە ناو قســەکردنا مەحمود پاشــا دەڵێت:
ئێمــە جاف، کۆچەرین پەیوەســتە لە هاتوچۆداین، ســوڵتان عەبدولحەمیــد ئەملاکی (دەلین و موان) زۆری جێگەی شارەزووری کردۆتە ناوی خۆیەوە، ئەو جێگانەش لە ژێر پای ماڵ و حاڵی جافدان، سبەی لەو هاتوچوانەدا تەواوی ئەو کشتوکاڵ و حاڵی خەڵک هەیە دەبێتە ژێر پای ئاژەڵی تیرەکانی جافەوە گرفتاریمان بۆ دروســت دەبێ، واچاکە ســوڵتان ئــەو ناوچانە بداتەوە ((جاف)) سوڵتان سوڵتانی ئیمپراتۆریەتێکە چ نیازی بەو چەند پارچە موڵکانەیە؟

هەر لە جێیەیدا وەک دەزانی قزرابات ـ سعدیە ـ ی ئێستا، موڵکی ئێمەیە، ئەوێی تەقدیم دەکەین با دەست لێرە هەڵگرێت.
نامیق پاشا بۆ هەڵەبجە هاتبوو، تا لە نزیکەوە بیر و فکری مەحمود پاشای جاف بخوێنێتەوە. لەم قسەیەی مەحمود پاشا زویر دەبێت. ئەو دەم عوسمان پاشای برای مەحمود پاشا لە ناو جافدا دەبێت، نامیق پاشــا دەڕوات بۆ لای عوســمان پاشــا، رێز و تەقدیرێکی زۆری لێ دەنێت و کاتێک

دەڕواتەوە هەزار لیرەی زێڕی پێشــکەش دەکات، لە گەڕانەوەی نامیق پاشادا راپۆرتێکی سەختی توندوتیژ دژ بە مەحمود پاشا دەنووسێت و دەیدا بە سوڵتان، یەکێک لەو تۆمەتانە کە بە مەحمود پاشــادا دەیــکات، کەوا دیوەخانەکەی پڕە لــە زومرەی کوردانی دژ بە خەلافــەت و لەبەر ئەوەی لە جێگە و شــوێنی ترەوە دیســان دژ بە مەحمود پاشا راپۆرتی جۆراوجۆر گەیشتبووە سوڵتان، فەرمان دەردەکات، مەحمود پاشــا لە تەواوی سیمەتەکانی لادەدا و عوسمان پاشای برای دەکاتە قائیمقامی هەڵەبجە و سەرۆکی جاف.

عوســمان پاشــا لە رووی پەیوەندی تایبەتەوە توانیبووی والی ســنە وا لێ بکات پەیوەســتە نامەی ناڕەزایەتی دژ بە مەحموود پاشــا بنووســێت بۆ وەزارەتی دەرەوە و ســەرۆک وەزیرانی وەخت، کەوا چاوگەی تەواوی گرفتاری سەر سنوور دەگەڕێتەوە بۆ کار و کردەوەکانی مەحمود پاشــا. داوا لە ســەرۆک وەزیران دەکات، داوا لە دەوڵەتی عوســمانی بکات، تا مەحمود پاشــا لە سەرۆکایەتی جاف بخرێت و عوسمان پاشای برای بکرێتە سەرۆکی جاف. دیارە ئەو داوای ئێرانە گەیشتبووە سوڵتان عەبدولحەمید، فەرمان درا بە لابردنی.

محەمەد ئەمین زەکی بەگ، لە کتێبی (مشاهیر الکرد، ج٢، ص١٨١) دەڵێت:
((بــە لابردنی مەحمود پاشــا لــە قائیمقامیەتی هەڵەبجەوە دەکرێتە موتەســەڕیفی ((ئورفە)) و نازناوی ((بەگلەر بەگی))یشــی پێ دەدرێت، دیارە ئەم نازناوە ـ بەگی بەگەکان ـ زۆر گرنگ بووە لە سەرتاسەری ئێراقدا تەنها بە چوار کەس دراوە:

١ ـ ئەحمەد پاشای بابان.
٢ ـ عەبدولقادر پاشای دیاربەکری.
٣ ـ مەحمود پاشای جاف.
٤ ـ ئیبراهیم پاشا، بەڕێوەبەری ئەملاکی سنیە..

مەحمود پاشا لەو فەرمانی سوڵتانە، سەرپێچی دەکا و ناڕوات بۆ ((ئورفە))، بۆ دروستکردنی کاروباری بۆ ئەستەنبوڵ دەڕوات.

وەک دەرکەوتووە مەحمود پاشای جاف، هاوپەیمانی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری و شۆڕشەکەی بووە ١٨٨٠ز، وەک نووســەری کورد ((جەلیلی جەلیل)) باســی لێ دەکا و د. کاوس قەفتان ســاڵی ١٩٨٧ز کردوویەتی بە کوردی. ل١٢٥.
بە گەیشــتنی مەحمود پاشــا بۆ ئەســتەمول، دەستبەســەر دەکرێت، مەحمود پاشا دەکەوێتە خولیای هەڵهاتن و هەر واش دەکات.

دوای دوو ســاڵ دەستبەسەری لە رێگەی قەفقاسیا و ئێرانەوە دەگاتەوە ناو هۆزەکەی، بەڵام لە پێش هەڵهاتنەکەیدا نامەیەکی توندوتیژ بۆ ســوڵتان عەبدولحەمید دەنووســێت بەم شــێوەیەی خوارەوە:
ئەوەم لا روونە ســتەمکاریت کردووەتە پیشــە، تۆ خوێنڕێژی، تۆ زەڕەیەک پەیوەندیت لەگەڵ خــودادا نییە، تــۆ توخمی باوکی خۆت نیت و زەڕەیەک پەیوەندت بــە عەبدولمەجیدەوە نییە، تۆ ســوڵتانی جائیری، بەپێی شەرع ســوڵتانی جائیر ((واجب الاطاعة)) نییە، کابرایەکی پیری وەک تۆ

٣٠٠ ژنی هەیە، ئاخر هەی حەرامزادە کام شەرع رەوای ئەو بەزمەیە..؟
دیارە مەحمود پاشـا توانیویە ئەو نامەیە بخاتە سـەرمێزی سوڵتان. سوڵتان بۆ خۆی نامەکە دەکاتەوە و دەیخوێنێتەوە، فەرمان دەدا ئەوی نازناوی پێدراوە لێی وەرگرنەوە و ناوی ((راکردوو)) ی بۆ بەکار ببەن و لە هەر کوێ توانییان بیگرن..

پیرەمێردی شاعیر، لە رۆژنامەی ((ژیان))دا ژمارەی ـ ٤٩٧ ـ ساڵی ١٩٣٦ز دەڵێت:
((هەر سـەبارەت بە کورد و ئەو کۆنگرانەی بۆ دەستخسـتنی مەوجودیەتێک بۆی بەستراوە، کۆبوونەوە گەورەکەی کەناری ((زەڵم)) هەوڵی مەردانەی مەحموود پاشام دێتەوە بیر.

سـاڵی ١٨٨٧ز تا ئەیلوولی ١٨٨٩ز لە هەڵەبجە لەسـەر ئەرازی سەنیە بووم، زۆرتر محەبەتی مەحمـوود پاشـام بـوو، ئەگەرچی وەسـمان پاشـا قائیمقام بـوو، مەحموود پاشـایان کردبووە موتەسەڕیفی ((ئورفە)) نیازی نەبوو بچێ، تا شەوێکی ٢٥ی مانگی رەمەزانی ١٣٠٥ک لە کەناری زەڵم مەحمود پاشـام ئیقناع کرد بۆ ئەسـتەموڵ بچێ. ئەو شەوە سـوار بوو رۆیشت، چەند ساڵ دوای ئەمە گەڕایەوە، بە بەری ((باکو))دا هاتەوە، دنیای تەجروبە کرد، لە ١٥ی شـەوالی ١٣٠٨ک چـووەوە، ئەمجـا بە عەفـو ئیعادەی روتبە و نیشـانەوە، لـە دەورەی جمـادی الاول ١٣١٢ک دا هاتەوە..)).

مەحمود پاشا کە لە ئەستەموڵ بوو، شارەزای پشێوی ئەستەموڵ و وڵاتی عوسمانی بوو، کە سـاڵی شـەش مانگ مانگانەی کاربەدەستانی دەوڵەت نەدەدرا، ئەیزانی هێزێکیان بۆ هیچ شوێنێک پـێ نانێـررێ، جا بەو خولیاوە سـاڵێکیان هەرچی پیـاوی ناوداری ئەم خاکە هــەن هەموویان لە سەرچاوەی زەڵم کۆ ئەکاتەوە وەک:

١ ـ شێخ محەمەدی موفتی سولەیمانی.
٢ ـ ئەحمەدی باشچاوش.
٣ ـ سەید ئەحمەدی بابا رەسوڵ
٤ ـ ئەوڕەحمان ئاغای عەبدوڵڵا ئاغا.
٥ ـ فەقێ سەعید لە زەهاو.
٦ ـ داودخانی کەلهوڕ و زۆربەی سەرۆک عەشیرەتەکانی ئەو دەڤەرە.
٧ ـ سمایل بەگی داودە.
٨ ـ مەجید پاشا.
٩ ـ شێخ محەمەد رەئوف
١٠ ـ شێخ عەلی.

بــە کورتــی ئەو زەڵمە پڕ بوو، چەند گفتوگۆ و تەرتیبات کـرا منیش لە خزمەت نەقیبدا بووم، بەقــەدەر رەئی عمومــی هیوایان بە قەڵەمی من بوو، منیش قەلەندەرانە بەو هەموو ماڵە بەگزادەدا ئەسـوڕامەوە، رۆژێک پاشـا لە ماڵی کەیخوسـرەو بەگی کوڕی خۆی و نەقیـب بانگیان کردم و وتیان:
خوا رێکی خست، قەڵەمی خۆت تیژ بکە، دەستووری ئیدارە و بەیاننامەت بنووسە..
منیش شێتانە هاتمە زوبان و وتم:

پاشا به خۆڕایی خۆم ماندوو ناکەم.

پاشا، ئەمەندە تووڕە بوو، سێ جار هەڵسا و خۆی دایەوە سەر دۆشەکەکەیدا وتی: بەڕاست ئەوە چی ئێژی؟

منیش بە جەسارەتەوە وتم: پاشا ئەگەر تووڕە ببی دەنگ ناکەم، ئەگەر عاجز بی دەیلێم.

فەرمووی: بێژە..

وتم پاشا وانەبووە، بەلاّم تۆ وەزعی خۆمان و کەللەڕەقی و خۆبەبلّندزانینی ئەهلی ئەم خاکە لێک بدەرەوە، لەمە حالّی بووم لە شـارباژێڕ دێیەک هەیە بە ناوی ((کەناروو)) سـلێمانی رەسوڵ ئاغـای تیا بوو. لەو دێیەدا سـێ کوێخـا بوو، کوێخا ئەحمەد، کوێخا سـمایل و کوێخا حەمە. ئەم کوێخایانە هەریەکە خۆی بە ئاغایەک دەزانی، جا پاشا ئەگەر تۆ حوکمداریت دا بە نەقیب، لە حەقی خۆت چاوت پۆشی، سایەری روئەسای تیرەکان بە حوکمداری قبوڵیان نییە، ئەڵێن پاشای باوکت لە سـلێمانی موتەسـەڕیف بوو توانا و هێزێکی زۆری بەدەسـتەوە بوو، چوو دوای مانگێک جێی هێشت. بڕوا ناکەم رەسوڵ ئاغای ترش فرۆش و مەحمود ئاغای چۆغەرەسی میراودەلی یا فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە ئەگەر بەشیان دەوێت چۆن دەبنە حوکمدار..؟

مەحمود پاشا پیر بووبوو، بەلاّم بیر و فکری گەیشتبووە ئاستی نەتەوایەتی، بەتایبەتی لە دوا دوایی دەسـەلاّتی سـەلاّتینی عوسمانیدا، زۆر رێکخراوی دژ بە دەسەلاّت، ئازادیخوازانەی میللەتە ژێردەسـتەکانی عوسـمانی پێک هاتبوو حیزبی ((ئیتحاد و تەرەقی)) کە دەسـەلاّتیان بە دەستەوە گـرت توندوتیژییـان دژ بـە میللەتی کـورد لە عوسـمانییەکان زۆرتر بوو، وتەیەکـی بەناوبانگی مەحموود پاشای جاف هەیە، کە لە پیریدا دەربارەی کوردایەتی وتوویەتی:

**کاتێک کە توانیم نەمزانی**
**ئەو کات کە زانیم نەمتوانی**

# بیروڕای عەلی ئەکبەری وەقایع نیگار

عەلـی ئەکبـەری وەقایع نیـگار، خاوەنی نازناوی ((صادق الملک)) ناسـراو بە ((ئەفسـەر)) .
لە سـەردەمی ناسـرودین شـای قاجاردا سـاڵی ١٢٦٤ک، کتابچەیەکی دەسـتخەتی نووسیوە بە زمانی فارسـی بە ناوی (عشـایر و ایلات و طوائف کرد). ئەم نووسـەرە کوڕی میرزا عەبدوڵڵای مونشـی باشـی نازناوی ((ڕەونەق))ی هەبووە، ئامۆزای شەرەف خانم ناسراو بە ((مەستورە))ی کوردستانییە و لە بنەماڵەی قادریی شاری سنەیە..
ئـەم مامۆسـتایە ((وقائع نگار))ە، کتێبی ((حدیقە ناصریە))ی نووسـیوە لەگـەڵ کتێبی ((مرآة الظفر))دا.

لە کتێبێکی دەستنووسـدا کە لە کتێبخانەی زانکۆی تاراندا پارێزراوە سـەرجەم پەنجا و یەک پەڕەیـە، ئـەو زۆر باس و بابەتی دەربارەی تیرەکانی هۆزی جافی تیادا نووسـیوە، وادیارە وەک هەمیشـە ئەو تەقەڵلایەی وەقائیع نیگار کردوویەتی پێشـکەش بە شای سەردەم ناسرودینی شای قاجاری کردووە.

بە تەئکید نووسەرانی ئەو دەمە بۆ خوا نەیاندەتوانی بەرهەمەکانیان بڵاو بکەنەوە، ئەو دەمەش چاپ و چاپخانە و توانای بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن هەر نەبووە، هەر دەبوا دەسەڵاتداران پاڵپشتی نووسـەران و شـاعیران بکەن، فیردەوسی شانامەی پێشـکەش بە مەحمودی غەزنەوی کردووە،

شاعیران و لێهاتووانی دیکەش هەروا، مامۆستا ((وەقایع نیگار))یش هەر وایکردووە. بەندە ئەوەی وەقایع نیگار نووسیویەتی هەر وەک خۆی لێرەدا باسی دەکەم، دیارە مامۆستای ناوبراو تەنها باسی ئەو تیرانەی کردووە، وا لە کوردستانی رۆژهەلاتدا ژیابوون، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت تیرەکانی جاف زۆر لە مێژدا لە کوردستانی خوارووی نیشتەجێ بوونە، یان هاتوچۆیان کردووە، تەنها لە سەردەمی زایەر بەگی جافدا، نەڕۆیشتوونەتە ئەو دیودا، با ئەوەش بڵێم. جگە لە بیر و ڕا و نووسینەکەی وەقایع نیگار، بەندە رای خۆم و بۆچوونی خۆم دەڵێم و توێژینەوەیەکی پڕ لە وردەکاری دەخەمە روو، بەگوێرەی واقیعیەتی حاڵ، یانی ئێستای ئەو تیرانە. لە بیرت نەچێت لە نێوان نووسینەکەی خوالێخۆشبوو وەقایع نیگار و لێکدانەوەی بەندەدا سەد و بیست ساڵ نێوانیانە..

مامۆستا وەقایع نیگار، وەنەبێت تەنها دەربارەی تیرەکانی جافی نووسیبێت، بەڵکو باسی لە تەواوی عەشایەری رۆژئاوای ئێرانی کردووە، بەتایبەت ئەوانەی کوردن، چەند سەرچاوەیەکیش باسی کردووە، دەربارەی رەگەزی کورد و جوگرافیای کوردستان.

با ئەویشە بڵێین دام و دەستگای پەیوەندار بە دەسەڵاتی ئەردەڵان وەک میرەکانیان بە چاوی گومان و کەمتەرخەمییەوە نواڕیویانەتە هۆزی ((جاف)) و میرەکانی جافدا هەتاوەکو شاعیر و مێژوونووسی سەردەمی خۆی ((مەستوورە)) خانمی ئەردەڵان پەیوەستە وشەی ((ئەشرار))ی کردووەتە پاشوەندی ناوی جاف لە باسەکانیدا.

## تیرەی ئیناخی

ئەم تیرەیە لە دەڤەری جوانڕۆدا دەژین، زۆر چالاک و چاپوکن، زۆربەی زۆریان بەگزادەن و خۆیان بە رەعیەت نازانن، خاوەنی رەز و باخاتی جۆراوجۆرن لە دەڤەری پاوە کە سەر بە جوانڕۆیە. هاوینان دەڕۆنە چیای شاهۆ کە چیایەکی بەرز و بڵندە، زستانیش دەگەڕێنەوە ((مەرخێڵ)).

## بۆرەکەیی

سەد و پەنجا خێزان دەبن و سەرجەم شەش سەد کەسێکن. کوێستان و گەرمیان دەکەن، زستانان دەڕۆنە دەڤەری زەهاو، لە هاوین دەگەڕێنەوە بۆ دەڤەرەکانی سنە. بەتایبەت ئسفەندئاباد و زنجیرە چیای ریمج..

ئەم تیرەیە بەشێکن لە تیرەی ((مەنمی)) سەد ساڵ لەمەوبەر لە ناو خۆیاندا ((مەنمی)) ناکۆک دەبـن و لـە مەنمییەکان جویٚ دەبنەوە، ئەم تیرەیە سـەرەتا لە نەتەوەی پیاوێـک بوونە بە ناوی ((بەبـرەک)) و ئەو ناوە لە زمانی کوردیـدا گۆڕاوە و بووە بە ((بۆرەک))، برا گەورەیان ئەوڕۆکە ((بوداق))ی ناوە و تەواوی خزمەکانی فەرمانی لیٚ دەبەن.

# کلاشی

نیوەی ئەم تیرەیە ئێستاکە لە دێی دلومەم، بیخویٚ و قەڵای جوانڕۆ و ترخان دەژین.
ئەوانەی وا کۆچەرن لەگەڵ هۆزی باوەجانیدا پایز و زستان بەرەو زەهاو دەڕۆن و هاوینانیش دەگەڕێنـەوە بـۆ ئیلاخەکانی چیای ماکوان، بڕێکیان لە ترخاندا کشـتوکاڵ دەکـەن، بڕێکی تریان کەوتوونەتە ناو شـاری کرماشان و هەروەها شـارەزووری عوسمانی، لە ناو ئەم هۆزەدا زانیار و هوشـیاری زۆری تیادا هەڵکەوتووە و لە دەڤەری جوانڕۆدا وەک پێشـنوێژ و چاوسـاق دەست بەکارن، هەر لەم سەردەمەیدا ((مەلا عەلی سەرپەرشتی مەوقوفاتی کوردستانە لەم هۆزەیە)).

وەک دەردەکەوێـت نـاوی ئـەم تیرەیە لەبەر ئەوەی ناوچەکەیان پڕە لـە نێچیر و ئاژەڵ راو، یەکێـک لە دەسـەڵاتدارانی حوکمڕانی کوردسـتان ڕێگەی دەکەوێتە ناو ئەو هـۆزە، لەبەر بەفر و سـەهۆڵبەندان نەیتوانیوە بە ڕێگەی خۆیەوە بڕوا. لە ناو ئەو هۆزەدا دەمێنێتەوە. ئێوارە و بەیانی چێشتی گۆشتی مەڕ و بزنی کێوی پیٚ دەدەن، ئیدی لەو ڕۆژەوە ئەو تیرەیە ناونراون تیرەی (کەڵ ئاش)) لە دواییدا بە کڵاشی گۆڕاوە.

# تیرەی رووتە

ئـەم تیرەیە لە سـەرەتاوە دەوڵەمەند و خـاوەن ئاژەڵ و دارا بوونە. بـەڵام لە دواییدا هەژار کەوتوونە....
زسـتانان دەڕۆنە سـەر سـیروان لە نێوان جوانڕۆ و هەوراماندا. هاوینان دەڕۆنە نێو چیای شاهۆ ئەم تیرەیە لەسەر وەلەدبەگی دەژمێردرێن، بەڵام لە لایەن ئیناخییەکانەوە بەڕێوەدەبرێن.

# تیرەی تاری موڕادی

دیـارە باپیـرە گەورەیان ناوی ((تـاری موراد)) بووە و لەسـەر هۆزی مەنمـی دەژمێررێن، لەبەر ئەوەی لەگەڵ مەنمییەکاندا، ناکۆکی کەوتووەتە نێوانیان ((چل سـاڵ لەمەوبەر)) لە مەنمییان جیابوونەتەوە.

(ئەم باسە سەد و بیست ساڵ لەمەوپێش نووسراوە بەگوێرەی وتەی نووسەر، چل ساڵی تری بخەیتە سەر یانی سەد و شەست ساڵ لەمەوپێش تاری موڕادی لە هۆزی مەنمی جوێ بووەتەوە – نووسەر).

گوێزایانەتەوە دەڤەری کوردستان ((سنە)) ناوچەی ئیلاخی نەقارەخان، کانی درێژ، کوێخاکەیان ناوی محەمەدە...

# تیرەی ڕەحمان بەگی

ئەم هۆزە چوار بەشن:

یەکەم: مستەفایی، دووەم: دوروویی، سێهەم: بێسەری.

مستەفاییەکان گەورەکەیان بەو ناوەوە بووە، بۆیە ناونراون مستەفایی.

بڕێکی تریان لە دورودی نزیکی جوانڕۆدا ژیاون و هەر لەوێدا کوێستان و گەرمیانیان کردووە و ناونراون دووروویی.

بڕێکی تریان لە نەتەوەی ((بەیان)) ناوێک بوونە و بە ناوی باپیریانەوە ناسراون بە ((بیانی))

ئەو بەشەکەیان لە ناوخۆدا نەیانتوانیوە براگەورەیەک هەڵبژێرن

ناسراون بە ((بێ سەری))، ئەم چوار بەشە کە سەرەتا برا و خوێشی یەکتر بوونە سەرەتا لە سەردەمی حوکمڕانی ئیبراهیم بەگی وەکیلی جوانڕۆدا لەسەر جوانڕۆ ژمێراون.

بەڵام لەم دوا دواییەدا بڵاوەیان لێ کردووە بڕێکیان ڕۆیشتوونەتە ناوچەی ڕەوانسەر، بڕێکی تریان گەیشتوونەتە مایدەشی کرماشان. بێ سەرییەکان ڕۆیشتوونەتە ناو هۆزی کەشکی.. وەک لە سەرەتاوە باسم کردووە، ئەم دەستخەتە سەد و بیست ساڵ لەمەوبەر نووسراوە نووسەرەکەی لەم دەستخەتەیدا دەڵێت ئەم چوار کۆمەڵە سەد و پەنجا ساڵ لەمەوبەر لەسەر جوانڕۆ دەژمێردران، سەرجەم دەکاتە دووسەد و حەفتا ساڵ لەمەوبەر و لە سەردەمی ئیبراهیم بەگی وەکیلی جوانڕۆدا هۆزی ((مستەفایی)) دوروویی، بیانی و بێ سەری لەسەر جوانڕۆ دەژمێردران.

# ئیمامی

دیارە ئەم تیرەیە باپیرە گەورەیان ناوی ئیمام بووە، سەرەتا لەسەر تیرەی یەزدان بەخشی ژمێراون. کە یەزدان بەخشییەکان گوازتویانەتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی عوسمانی لەگەڵیاندا نەڕۆیشتوونە و لە دەڤەری جوانڕۆدا ماونەتەوە، گەورەکەیان ناوی (محەمەد بەگی مەحمود بەگە) هەوارگەیان چیای ((مێکوری دڵان))ە، زستانیش ((دەلەدرە)) دەکەنە هەوارگە.

# زەردویی

لەبەر ئەوەی باپیرە گەورەیان تووشی نەخۆشی زەردویی هاتووە، ئەم تایفە نەوە و نەتیجەکانی بە ناوی ئەو نەخۆشییەوە ناسراون ((زەردویی)) بووە بە ((زەردویی)) ئەم تیرەیە بووە بە چوار بەشەوە وە هەر بەشێک ناوی تایبەتمەندی خۆی هەیە:

١ ـ ساتیاری: باپیرە گەورەی ئەم بەشە لەو دەمانەدا سەعاتی هەبووە وە ئەو دەم هەر کەسێک سەعاتی هەبووایە شتێکی سەرسام ئاوەر بووە، سەعاتداری بووەتە سایتاری..

٢ ـ کەوانگەر یا کەمانگەر:

زۆر بنەماڵە لە ناو شاری سنەدا ناسراون بە کەمانگەر، هەروەها لە دێهاتی کوردستاندا کەمانگەرەکان زۆرن لەبەر زیرەکی پەیوەستە بە لای دەسەڵاتدارانەوە نزیک بوونە ((مەلا ئەحمەد)) یێکیان تیا هەڵکەوتووە بووە بە خەلیفەی ڕێبازی نەقشبەندی و خانەقایەکی لە دێی ((کولەسارە)) دروستکردووە.

ئەوڕۆ پەیڕەوانی زۆری لێ کۆبۆتەوە و کوڕەکانی جێگەیان گرتۆتەوە.

٣ ـ ڕەوانی: لەبەر ئەوەی نیشتەجێی دێی ((ڕەوان))ی دەڤەری جوانڕۆ بوونە بەو ناوەوە ناسراون، وە ڕەز و باخی زۆریان هەیە.

٤ ـ شاقوایی: بە ناوی باپیرە گەورەیانەوە ناونراون، زەردوییەکان، لە فەیزئابادی گەڕەکی کرماشان زۆرن و خەریکی کار و کردەوەی بازرگانین.

لە شارەزووردا زۆرن و خەریکی کشتوکاڵن هەروەها لە دەڤەری جوانڕۆدا زۆرن و ڕەوەندن، لە هاوین و بەهاردا هەوارگەیان ((سەردەخانی، ویراش، تین، دوزەجوچ، دەرتیان))دان.

بە زستانانیش دەڕۆنە سەر سیروان لە دەڤەری ئەنجیرەک و ڕەوان دادەنیشن.

# شاقوایی

ئەم تیرەیە بەشێک بوونە لە هۆزی زەردویی زۆربەیان لە جوانڕۆدا دەژین، تاوەکو ئەمڕۆ کەسێکی ناوداریان تێدا هەڵنەکەوتووە.

# مەنوچەهری

ئەم تیرەیەش وەک مستەفابەگی بەشێکن لە قوایەکان و لە لایەن سەرۆکی قوایەوە سەرپەرشتی دەکرێن.
زۆرتر لە جوانرۆدان، گەرمیان و کوێستان دەکەن، لە نێوان سەریاس و زەهاودا، لەبەر ئەوەی لە نەوەی (مەنوچەهر بەگی کوڕی سەیدای ئەحمەد بەگ)ن بە مەنوچەهری دەناسرێن.

# مستەفا بەگی

ئەم تیرەیە لەسەر هۆزی قوایی یان قوبادی دەژمێردرێن، سەرۆکەکەیان پەیوەستە لە بەگزادەکانی قوبادی بووە.
بڵاویان لێ کردووە، زۆرتر لە کرماشان و ناوچەی شارەزووردان و بڕێکی دیکەیان لە ناوچەی جوانرۆدان لە دێی ((زلان))دا دەژین.

# مەنمی

ئەم هۆزە لە ئێراندا دوو تایفەن، یانی بوونەتە دوو تایفە:

١ ـ محەمەدی مورادی . کە دەکاتە باپیرە گەورەیان، کە ناوی محەمەدی مورادی بووە.
٢ ـ تاری مورادی: ئەورۆ گەورەکەیان ناوی ((گەنج محەمەد بەگە))، ئەم هۆزە بە ژمارە زۆرن، کۆچەرن، گەرمیان و کوێستان دەکەن، زستانانیش دەڕۆنە دەڤەری زەهاو و شارەزوور. بیست و دوو ساڵ لەمەوبەر هۆزی مەنمی و گەلاڵی دەبێتە شەڕیان، حەوت کەس لە هۆزی مەنمی دەکوژرێت، یەکێک لە کوژراوەکان برای گەنج محەمەد بەگ بووە و بە سەرۆکی خێڵ ژمێردراوە. زۆری نەکێشاوە مەنمییەکان خۆیان کۆ دەکەنەوە و پەلاماری گەلاڵی دەدەن و چەند

کەسێکیان لێ دەکوژن. دوژمنایەتی دەکەوێتە نێوانیانەوە، بەگزادەکانی جاف دەکەونە نێوانیانەوە وە بۆ ماوەیەک مەنمییەکان گەرمەسێر رۆیشتن تەرک دەکەن و نیشتەجێی دەڤەری حوسێن ئاباد دەبن، پیاوماقوولانی مەنمی چەندین پارچە موڵکی چاک دەکڕن وەک: ســەرانی عولیاوە، ســەرانی سوفلا، کەلورئاباد، پشت تەنگ و دەست بە کشتوکاڵ کردن دەکەن و زستانان هەر لە دەرەوەیدا دەژین لە ((پیرمحەمەد)).

بە داخەوە دیســان لە ناو خۆیاندا بە شــەڕ دێن، بەتایبەت مەنمییەکان دژ بە تایفەی محەمەد مورادییــەوە و تاری مــورادی و تایفەی تاری مورادی کە بۆ خۆیان لەســەر مەنمی دەژمێررێن، لــە مەنمی جیا دەبنەوە و دەگوێزنەوە دەڤەری گروس ((بیجار)) کە دوا ســنووری والی گەورەی سنەیە لە دێهاتی قرخلو، کانی درێژدا دەگیرسێنەوە.

زۆرتر لە سێ سەد خێزان لەم تیرەیە لە بازیان و سەرچاوەی سلێمانیدا دەژین.

# نەدری

ئــەم تیرەیە زۆرتر لەســەر زەردوییەکان دەژمێررێن لە هاویندا لە دێی میرگەســار و کەژی ئەبدالاندا دەژین.

زستانانیش لە دەوروبەری جوانڕۆدا ئاژەڵ دەلەوەڕێنن و دەڕۆنە مایدەشت.

ئەمانە لە نەوەی ((نەدمحەمەد)) ناوێک بوونە و پیاوێکی هەڵکەوتوویان تیادایە بە ناوی کوێخا محەمەد.

# کۆکۆیی

لە ناو ئەم تیرەدا بە زەحمەت سەرۆک و کوێخا لە ناو خۆیاندا هەڵدەبژێرن. زۆرتر کوێخاکانیان لــە بەگزادەکانــی ئیناخــی بە برا گەورەی خۆیــان دەکەن. لە مێژدا ئەم تیرەیە زۆر بە دەســەڵات بوونە، بەڵام بێ شک ئەمانە لەسەر هۆزی جاف دەژمێردرێن.

هاوینــان دەڕۆنــە دامێنــی چیــای ماکــوان و گویلە و لەوێــدا دادەبــەزن. بــە هاوینانیش لە ((سمرەساوەند و گوریگەبر))دا دادەبەزن. لەبەر ئەوەی ئاژەڵدار بوونە چیا بە چیا کێو بە کێویان کردووە بە دوای لەوەڕگادا گەڕاون، بۆیە بە کۆکۆئی ناسراون.

# قوایی

ئەم تیرەیە لە نەتەوەی ((کاکەگیان)) ناوێک بووە کە زۆر دەروێش سـفەت و پیاوچاک بووە و باپیرەگەورەیـان بـە ناوی ((قوباد بەگ)) بووە.. کە بکاتـە باپیرە گەورەی ((کاکەجان))، بۆیە بە قوبادی یا قوایی ناسراون.
سەرۆکی ئەم هۆزە و هۆزەکانی تر ئەوڕۆکە ((حەبیب بەگە)) (دیارە حەبیبوڵڵاخانی باوەجانی مەبەستە ـ نووسەر).

ئیلاخی ئەم تیرە چیاکانی (نەبی گز، مەزارەی بازان، ناراو)ە، کە بەشـێکە لە جوانڕۆ، پایز و زستانیش بەرەو خوار دەبنەوە بۆ زەهاو و شێخان.
پیاوی دەمڕاسـت و ناسـراویان تیادایە، بەتایبەت ((ئەحمەدبەگ)) ناوێکیان تیا هەڵکەوتووە لە ئازایەتیدا بەناوبانگە. (دیارە یەشـتا خانای قوبادی شـاعیری دنیای شیعر و ئەدەبیاتی کوردی بە دنیا نەهاتبوو ـ نووسەر).

# شێخ سمایلی

حاجی میرزا ئەحمەدی کوردستانی لە سەردەمی سەڵتەنەتی فەتح عەلی شادا لە دارولخەلافەتدا ((داروغـە دەفتـەر)) بـووە، ((میرزا بنـووس)) دێی ((دیـزەج))ی دەڤەری کوردسـتانی کڕیوە کە کەوتووەتە ئسـفەند ئاباد تیرەی شـێخ سـمایلی کە رەعیەتی بەغدا و دەسەڵاتی عوسمانی بوون ئەوانـەی رازی کـردووە و هێناونیانەتـە ئەو دەڤەرە و لەوێڕا نیشـتەجێی کردوون و گەرمیان و کوێسـتانیان کـردووە، زسـتانان تا زەهاو و دەوروبەری لوڕسـتانیش دەڕۆن و ئـەو تیرە دوو کوێخایان هەیە:

١ ـ کوێخا میرزا موراد
٢ ـ کوێخا حوسەین عەلی

ناوی شێخ ((سمایلی)) لەوەوە هاتووە کە باپیرە گەورەیان چاوساقی شێخ سمایلی بەرزنجی بووە، کە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بووە.
هێشـتا زۆر لـەم تیرەیـە لە بەغدا دەژیـن و بڕێکی تریان لە دەڤەری سـلێمانیدان، بە تایبەت ناوچەی شارەزوور و بە جاف دەژمێردرێن...

# وشەی جاف

د. محەمەد عەلی لە کتاوی (ایلات وطوائف کرماشاهان)دا دەڵێت: ((هۆزی جاف دوای لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی ساسانی و دروستبوونی دەسەڵاتی ئیسلام و عارەب بە ((جاوانی)) ناسراون و لە پێش ئیسلامدا بە چاپانی دەناسران و پەیوەند و بەستەگییەکی راستەوخۆیان وەک یەک هۆز و خوێش و خزمایەتی لەگەڵ سەردار و فەرماندەری بەناوبانگی دەسەڵاتی ساسانی ((جاپان))یان، هەبووە. لەو بارەوە ((ئیبنولئەسیر لە (ر ـ ک ـ الکامل ج٢، ل١٠٩)دا بە درێژی باسی کردووە. ئەو قارەمانە لەگەڵ براکەیدا ((مەردان شا))دا لە شەڕی ((ئەلیس))دا و دوای شەڕی وەلجە شەهید کراوە. هەر لەو بابەتەوە لە (د ـ ک ـ ایران در عهد باسگان، ل٤٧٤)دا ئاماژەی بۆ کراوە...

هەروەها د. محەمەد عەلی سوڵتانی، دەڵێت:

((بە گوێرەی زەمان و قۆناغەکانی، زمان و زمانەوانی ((جاو)) بووە بە ((جاوی))، وەلەبەر توندخۆیی و سەختگیری لە کار و کردەوەیاندا بووە بە ((جافی))، یانی جەفا پیشە و دڕ رەفتار. وە لەو رووەوە لە یادداشتەکانی دمرگاندا (ر ک ـ جغرافیای غرب ایران، ل٩٦) دیسان هەر لەم رووەوە زۆر لە زانیاران باوەڕیان وایە کە وشەی (جافی) بە گوێرەی زەمان بووەتە ((جاف)).

# تاڵانکردنی جاف

یەکێک لە هۆیە سەرەکییەکانی بەجێهێڵانی ناوچەی جوانرۆ لە لایەن برێک لە بەگزادەکانی جاف و تیرەکانی جاف و هاتنیان بۆ ژێر دەسەڵاتی بابانەکان، رەفتاری خوێناوی و کار و کردەوەی پڕ لە توند و تیژی میر ئەمانوڵلاخانی ئەردەڵان بووە، کە بە تەواوی هێز و توانای دەسەڵاتی ئەردەڵان و کۆکردنەوەی هێزە چەکدارەکانی عەشایەری دیکە پەلاماری هۆزی جافیان داوە.

لەم رووەوە ((مەستورە)) ژنە شاعیری بەتوانای کورد و میرزادەی بنەماڵەی ئەردەڵان لە کتێبی ((مێژووی ئەردەڵان))دا دەڵێت:

ئەو دەم خێڵەکانی هۆزی جاف لەسەر سنوور و جێگە ئێلاخەکان بزێو بووبوون و مەڕ و ماڵاتیان دەلەوەڕاند، پایان لە بەڕەی خۆیان زیاتر نابوو و بووبوونە هۆی ئاژاوە و دەردەسەری خەڵکە نیشتەجێبووەکە، والی هەرچی دەکۆشا چاو لەو کارەی بپۆشێت پێی نەدەکرا، بڕیاری تاڵان

و چەپاو و کوشــتاریانی دا و هەرواشــی کرد و ئەو تالان و برۆیە بوو بە مایەی دەســتکەوتنی زۆرتــر لــە پەنجــا هەزار تمەن و هەر بەو بگرە و بەردە و هەیتوهووتەشــەوە، بەســەر مەریوان و شــارەزووردا گەیشتنە سلێمانی، کە مەڵبەندی پاشــاکانی بابانە. ئەم سەربەندە (مەحمود پاشا) میری بابان بوو. مەحمود پاشــا و پیاو ماقوولان و بازرگانانی شــار، شاریان بەجێهێلا و چۆڵیان کرد، ئیدی ئەوی ماڵ و حاڵ بووە، لە ماڵ و مزگەوت و دیوەخانان و تەکیەکاندا بوو هەر هەمووی لە لایەن لەشکری ئەمانوڵلاخانەوە تالان کرا.

وەلەد بەگی جاف، کە یەکێک بووە لە هەرە پیاوماقوڵلانی زەمانی خۆی، بە دیل گیرا و لەگەڵ میر بۆ شاری سنەیان برد.

رۆســتەم بەگی کوڕی لەگەڵ حەبیب بەگی کوڕیدا لە قەڵای قســڵان بە فەرمانی ئەمانوڵلاخان زیندانی کران، ئەو رووداوە خوێناوییە، ئەم پەلامارە دڕندانە تەنها بۆ ئەدەبکردن و چاوترساندنی عەشیرەتی جاف نەبووە، وە نەبێت هۆزی جاف، لە پڕ گەیشتبوونە ئەو دەڤەر و ناوچانە، ئەو جێگە و شوێن و هەوارگانە مەڵبەند و زێدی سەدان ساڵەی هۆزی جاف بووە، لەگەڵ دەوروبەردا خزم و خوێــش و ژن و ژنخــواز بوونە، تێکەڵاوییان لەگەڵ هۆزەکانی تردا هەبووە، ئیدی ئەو پەلامارە بۆ بەو چەشــنە؟ بۆ بەو لە ناکاو پەلاماردان و کوشــتارە؟ . دەرکەوتووە کە میرەکانی ئەردەڵان پەیوەستە تەماحگیری ناوچەی جوانڕۆ بوونە، هەروەها دەوڵەمەندی و دارایی هۆزی جاف بوونە بە بەڵگە و بێ بەڵگە بۆ هەلێک گەڕاون تا بە خاوەنی ناوچەکە بن و مەڕ و ماڵاتیان داگیر بکەن.

لە لایەکی ترەوە لە ســەردەمی ئەمانەوڵلاخاندا خەزێنەی دەسەڵاتی ئەردەڵان کەوگیر درابوو لە بنی قازان و نیازی بە زەڕ و پارە پەیدا کردبوو، وەک کورد واتەنی ((شەڕ لە بەتاڵی چاکترە))!، ئەو پەلامارەی ئەمانوڵلاخانە و بە شێوە زۆرتر لەبەر تالان و دەستکەوت بووە نەک چاوترساندن و یاســا پاراســتن. لەو رووەوە وەک هەمیشە ((مەســتوورە)) خانزادی ئەردەڵانی دەمارگرژی بۆ لای کەس و خوێشانی خۆی بە زەقی پێوە دیارە....

هەروەها لە هەمان سەرچاوەدا ((مەستوورە)) خانم دەفەرمێت:

دوای گەڕانەوەی عەلی قولی خان بۆ کوردستان، لەبەر ئەوەی گەلێک بەدخوو و رەفتار توند و تیژ و جنێوفرۆش بووە، خزم و خوێشــانی پاڵ دەدەن بە (حوســەین بەگی مامی)یەوە و عەلی قولــی خــان راو دەنێن و دەڕوا لە بۆ قەڵای ((پاڵنگان)) لەوێڕا قەڵاداری دەکا و پەناش دەباتە لای ((خانە پاشــا))ی بابان، ئەویش ((رۆســتەم بەگی جاف)) و زۆر لە هۆزی جاف دەنێرێتە هانایەوە و بڕیاری شەڕکردن دەدەن.

دیــارە نەک تەنها ئەردەڵانەکان، بەڵکو بابانەکانیش پەیوەســتە نیازمەندی توان و دەســەڵاتی هۆزی جاف بوونە و لە رووداوەکاندا سوودیان لە دەسەڵاتی جاف وەرگرتووە. (باسیل نیکیتین) هەر لەم رووەوە دەڵێ:

((هۆی ســەرەکی پەلاماری میرەکانی ئەردەڵان بۆ سەر دەڤەری جوانڕۆی جاف، تەنها لەبەر داگیرکردنــی ئــەو ناوچە پڕ لە خێر و بەرەکەتە بووە و لە لایەکی ترەوە ترســیان لە دەســەڵاتی هۆزی جاف بووە..))

# داستانی حەزرەتی ئیبراهیم

خۆشەویستان، سەرەتا دەربارەی حەزرەتی ((ئادەم)) دەدوێم لە کوێ نیشتەجێ بووە و لەگەڵ ژنەکەیدا ((حەوا)) لە چی دێیەکدا ژیاوە، کە پێی وتراوە ((بەهەشتی زەوی)) و باوکی بەشەرییەت لــە کوێدا نێژراوە، دەربــارەی منداڵەکانی کە چۆن ((هابیل)) کــوژراوە گۆڕەکەی لە کوێدایە و بە دوایــدا دەربــارەی حەزرەتی ((نوح)) دەدوێــم هەروەها دەربارەی ((تۆفان)) و ســەرەتا لە کوێڕا دەستی پێکردووە و چەند درێژەی کێشاوە و چەند کەسی لەگەڵدا نەخنکاون و رزگاریان بوو، لە کوێڕا نیشتەجێ بووە و کەشتییەکەی لە کوێدا لەنگەری خستووە، بەسەر چ چیاکەوە ماوەتەوە.. و ((نوح)) لە کوێڕا ژیاوە و لە کوێندەرێ مردووە و ناوی ئەو دێیەی گۆڕەکەی نوحی تیادایە چییە. هەروەها دەربارەی حەزرەتی ((ئیبراهیم)) دەدوێم و لە کوێڕا نامەی پەیامبەری پێ گەیشــتووە و چۆن بتی شــکاندووە و لە کوێ ویستوویانە بیسووتێنن، دوای رزگاربوونی ((بە فەرمانی خودا)) چۆن لە باوکی و هۆزەکەی تەبەڕا بووە و دوور کەوتۆتەوە، وە ناوی ئەو جێگە چی بووە دوای راکردنی حەزرەتی ((ئیبراهیم)) تیادا نیشــتەجێ بووە، هەروەها دەربارەی ژنەکانی، منداڵەکانی و ژنی کوڕەکانی و ناوی هۆزەکەی چی بووە.. بە چی زمانێک دواون؟.

هەروەهــا دەربارەی ((الفرقان))، خوا حەز بکا دەربارەی حەزرەتی مەســیح دەدوێم ((عیســا کوڕی مەریەم)) دەربارەی هۆزەکەی و چی بەسەر هاتووە دوای لە خاچ کێشان و کوشتنی.

بەڵێ، کوشــتنی و لە خاچ کێشــانی، بەڵام ئەوی لەو دەچوو و گۆڕەکەی لە کوێدایە و لە چی دێیەکدایــە (ئەمــە لەبەر بێ تاوانی یەهوودییەکان ناڵێم، نەخێر هەزار نەخێر، ئەوانە تاوانباری لای خەڵک و خوا و مەلائیکەن).

لــە دواییدا مژدەی ســەرکەوتنی خوداتان پــێ رادەگەیەنم ئەی ئیمانــداران (**وأنذر الذين كفروا والمشــركين ان صاحب الفرقان والتوراة والانجيل والقرآن المجيد هو الله الواحد الأحد الصمد لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفواً أحد عزيز ذو أنتقالم**).

برا و ئازیزانم وا من قســەتان لەگەڵ دەکەم.. ســەرەتا عەرشــی خوداوەند بەسەر ئاوا بووە، مەلائیکەکانی لە دەور بووە دوای ئەوەی کەون و زەوی لە شەو و رۆژدا بە ئەمری خودا دروست بووە، تیایدا ئەوی دار و درەخت و ئاژەڵ و دڕندە و قوڕسازیدا ئادەمیش لە خۆڵ و روحی پوتێکدا، بۆ ئاگاداریتان لەو خۆڵە لە ســەرەوەی ئێراق ((کوردســتان)) لە چیای هەڵگورد هێنراوە و لەشــی حەزرەتی ئادەمی پێ دروستکراوە، لە دواییدا خودا ناوی زۆری بە حەزرەتی ((ئادەم)) ناساندووە لەشەیتانیش هۆشیاری کردووە، کە شەیتانی لە پێش ئەودا لە ئاگر سازاندووە و داوای لە تەواوی مەلائیکەکانــی کــرد تا کڕنۆشــی بۆ بەرن (بۆ حەزرەتــی ئادەم) هەر هەموویان ئــەو فەرمانەیان ئەنجام دا جگە لە شــەیتان کە لە رەگەزی جنۆکە بووە و بە لایەوە بە نەشــیاوی زانیوە کڕنۆش بۆ گیانلەبەرێکی پێست سپی قژ زەردی چاو شین ببات. بەڵام ئادەم ئامۆژگارییەکەی خوداوەندی فەرامــۆش کرد بە گوێی شــەیتانی کرد، ئەوەش دیارە لەســەر فەرمانــی خوداوەند بووە تا هەوا و هــەوەس نەبێتــە بەڵگەی خەڵکی بەرانبەر پەروەردگار، جا لەســەر ئەو نافەرمانییە پەروەردگار ((ئادەم و حەوا))ی لە بەهەشت وەدەرنا، کە لە قووڵایی ئاسماندا بووە و هەناردوویەتە سەر زەوی تا لەوێڕا بژی و لەوێشــدا بمرێت و لەوێشــەوە دووبارە زیندوو دەبنەوە و ژیانی دنیای هەوەس و تاقیکردنەوەیە تا رۆژی دواحیســاو و دواکیتاو، ئەوی خاوەن شــتی چاک و لەزەت بەخشــی، ئــەوی کوێرکوێرانــە رەفتــار و کرداری کردبێت لەوێشــدا هەر بە کوێری و ژیانــی پڕ لە ئازار و چەرمەسەری دەگوزەرێنێت، ئیدی حەزرەتی ئادەم و خانمەکەی ((حەوا)) بەسەر زەوییەوە ژیانی هاوسەرییان دەست پێ کرد و بنمیچێکی قوڕینیان سازاند، حەوا باردار بوو زۆری نەکێشا سکێکی دووانــەی هێنایە دنیاوە ((کوڕ و کچێــک)) پێکەوە، کوڕەکەی ناو نا ((قابیل))، بە ئەمری خودا ئەو دوو منداڵە ســوور و ســپی و قژ زەرد بوون، لە سکی دووەمدا دایکە ((حەوا)) دیسان دووانەیەک دیکەی هێنایە دنیاوە، دیسان کوڕ و کچ بوون، بەڵام پرچ رەش و پێست رەش و چاوڕەش بوون، کوڕە ناونرا ((هابیل)) کە گەورەبوون بە فەرمانی خودا بڕیار درا، قابیل خوشــکە دووانەی هابیل بهێنێــت و ((هابیل))یش هاولفەکەی قابیل، بەڵام قابیل لەســەر هاندانی شــەیتان بە جوانیی خۆیدا دەنازی نەڕۆیشــتە ژێر فەرمانی خوداوە و دەیگوت: دەبێت هەر یەکەو هاولفی خۆی مارە بکات. تکایە مەپرسە بۆ قابیل ئەو نافەرمانییەی کردووە، بەندە ئەم ئایەتەتان بۆ دەخەمە روو:

**(يا أيها الذين آمنوا لاتَسْألوا عَن أشياءَ إن تُبْدَ لَكُمْ تَسوْكم... المائدة:١٠١)، (إِنَّا أنزَلْنَاهُ قُرْآناً عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ. يوســف:٢)، (اللهُ خالِقُ كُلِّ شَيٍْ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَــيٍْ وَكِيلٌ. الزمر: ٦٢)**، ئەو جێگەی حەزرەتی ئادەمــی تیــا ژیا و هەر لەوێشــدا مردووە ((دێی ســەلام))ە لە ســەرەوەی عێراق ((کوردســتان)) کەوتووەتە باشــووری ((گەلاڵە))وە، کە لە بندەســتیدا کانیاوی ((زەلاڵی)) تیادا بووە و بۆســتان و باغچەی پڕ لە گوڵ و گوڵزاری تێدا رواوە، وەک مێژوونووسان لە سەرچاوەی (ئەسفاری پیرۆز) و بەڵگە کۆنەکان بە دەســتیان هێناوە و باســیان لە (بەهەشــتی ســەر زەوی و باخچەی عەدەن) کردووە. هەر ئەو وشــانە بە بەڵگەنامە ئینگلیزییەکەوە نووســراوە کە (حدیکی جوان) یانی (حدیقە

جمیله) شتێکه پیتی (ق) گۆڕاوەتە سەر پیتی (ک) کە بە دەم بۆ بڕێک ڕەگەز پیتی (ق) ئاسان ناوترێت، بۆیە ئەو وشانە بە کوردی نووسراوبوون))

دەگەڕێمەوە لای یەکەمین شەهیدی بەشەرییەت ((هابیل)) و ئەو دوو برایە، مەڕ و ماڵاتیان دەلەوەڕاند، لە دەوروبەری ماڵی خۆیاندا، ڕۆژێک لە ڕۆژانی وەرزی بەهار دیسان بە کاروباری خۆیانەوە خەریک ببوون، برا بچووک ((هابیل)) بە برای گەورەی گوت: من ماندووم تۆزێک لە ژێر ئەو درەختەدا دەنووم، هەروایکرد، بەڵام ((قابیل))ی برا گەورە شەیتان دڵی پڕ لە کینە کردبوو، بڕیاری کوشتنی براکەی دابوو، هەر کە چاوی چووە خەو بەردێکی بە هەردوو دەستی هەڵگرت و دای بە سەر ((هابیل))ی نووستوودا، بەو شێوەیە قابیل هابیلی برای کوشت، کە بینی وا براکەی کوشتووە، ئاشوفتە بوو نەیدەزانی چی لە تەرمەکەی بکات. چیرۆکی دوو قەلەڕەشەکە دەزانین. قابیل چاڵێکی هەڵکەند، تەرمی هابیلی تێدا شاردەوە، هەر ئەو دەمە پەشیمانی دایگرت، ئەو جێگە و شوێنە تا بە ئەوڕۆ ماوە و بەسەر گردێکەوەیە لە نێوان (قسرین و لنزی)دا، کە بکاتە ڕۆژهەڵاتی دێی سەلام و ڕێبوار لەوێڕا دەگوزەرێ ((فاتیحا)) دەخوێنن.. نازانن هی کام کەس و ناسراوە بە ((باوە گەورە)). ڕەنگە یەکێک دەربارەی ناوی ((حەوا)) بپرسێت، لە ڕاستیدا ناوی ((عایشە)) بووە و ناوی ((حەوا)) حەزرەتی ئادەم لە خۆشەویستی ئەو ناوەی لێ ناوە.

ئەو ناوەش هەروا تا بە ئەمڕۆ ماوەتەوە تا بە ئەوڕۆ، وە بۆ زۆرکردنی زانیاریتان دەربارەی گەورەی پەروەردگار دەمەوێت دەربارەی تۆفانی نوح بدوێم، لە حەقیقەتدا ئەو تۆفانە ڕوویداوە.

سەرەتا لە شاری ((الرس))دا دەستی پێ کردووە (هۆزی نوح و برادەرانی ڕەس) کە ئەوڕۆکە کەوتووەتە خواری، ئەهواز و ڕۆژئاوای شاری ناسرییەوە لە ئێراقدا، پەروەردگار ویستوویەتی زەوی و دەریا لەق بکا، ئەو دەم زەوی یەک پارچە بووە بە شێوەی سێ گۆشە کە نووکە تیژەکەی سەر بەرەو خوار بووە، ئەو دەمەیش سەروخوار زەوی پڕ بووە لە بەفر و بەستەڵەک و ڕچاو و سەهۆڵبەندان بووە، ئەوی بۆ ژیان شیاوە ناوچەکانی ناوەڕاستی زەوی بووە کە ئەوڕۆ بۆ ژیانی شیاوە ناوچەکانی ناوەڕاستی زەوی بووە کە ئەوڕۆ پێی دەوترێت هێڵی ئیستیوا، یانی سەر و خواری ئەو هێڵە تەنها بۆ بووژاندنەوە و ژیان دەشیا، بەڵگە و هۆ زۆرە بۆ پێکهاتنی ئەو تۆفانە، زۆرتر ناپاکی و بت پەرستی و کافری هۆزی نوح بووەتە هۆی سەرەکی ئەو تۆفانە، بۆیە پەروەردگار بڕیاری داوە سەر زەوی لەو بۆگەنکاری خەڵکی ئەو سەردەمە بشۆرێتەوە (کن، فیکون) خودا پەیامی بە نوح دا تا کەشتییەک بسازێنێت، ئەو دەم حەزرەتی نوح لە شارێکدا دەژیا رووباری دیجلە و فوراتی لێوە نزیک بووە، دەڕژانە نێو دەریاوە، ئەو شارە ناوی ((ئوور)) یان ((أورلا))یە، ئەو کاتە لە چەپەوە بۆ ڕاست دەخوێنرایەوە پێی دەوترا ((روێو)) یانی ((رووی ئاو)) کە لە شاری ناسریەی ئێستاوە ٢٥ کیلۆمەتر دوور بووە. کە فەرمانی خودا گەیشت (تەنوور دەستی بە کوڵان کرد) یان گڕکان کە شاری ((سرەس))ی وێران کرد و زەوی شاری هەللوش و شاری ((ڕەس)) لە ئوورەوە ٣٠ کیلۆمەتر دوور بووە، تۆفان لە ١٣ی مانگی ئازاردا دەستی پێ کردووە، ڕۆژی شەمو بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ و هەشت شەوی کێشاوە، بەسەر هەمان چیاوە کەشتییەکەی نوح نیشتووەتەوە کە لە خۆڵەکەی ئادەم دروست کراوە کە بکاتە چیای هەڵگورد و ڕەنگە یەکێک بپرسێت بۆ هەڵگورد و چیای ((جوودی)) نەبێت، لە وەڵامدا دەڵێم بە کوردی ناوی ((هەڵگور))ە، یانی چیای ((هەڵگر))، یان ئەو چیایەی هەڵیگرتووە، هەر ئەو چیایە بووە کە کەشتی نوحی بەسەرەوە نیشتووەتەوە...

پیتی ((گ)) لە زمانی کوردیدا دەنووسـرێت و بە باشـی دەوترێت بەڵام لە عەرەبیدا دەگۆڕێتە سـەر پیتـی ((ج)) وەک پـەروەردگار دەفەرموێت: (ولاجنـاح علیها)) بە کـوردی ((جەناح)) دەبێتە ((گونـاح)) یانی ((تـاوان)).. ئەوانەی لە خنکان رزگاریان بوو یانزە کەس بوون شـەش ئافرەت و پێنج پیاو، یەکێکیان کوڕی ((نوح)) بووە، دوای ئەوەی پایان کەوتە سەر وشکایی لە مێژووی ٣/٢١ ئازاردا (نەورۆز) دەسـتیان بە سـووتاندنی تەختە و داری کەشتییەکەیان کرد (من ((نووسەر)) لە دایکبووی شـەوی نەورۆزم) وە ئەورۆ ئەو زنجیرە چیایە بە نەواژین ناسـراوە، کە ئاماژەیە بۆ نـاوی حەزرەتـی ((نوح)) کوردەکانـی پێی دەڵێن ((باوەنو))، ئەوەش راسـتە کە حەزرەتی نوح بە باوەگەورەی دووەمی بەشەرییەت دەناسرێت، ئەڵبەتە دوای حەزرەتی ئادەم. لەو رۆژەوە خەڵکی ناو کوردستان لە هەمان رۆژدا ئاگر دەکەنەوە بە ناوی نەورۆز، یانی رۆژی تازە و نوێ، ((نوح)) و هاوەڵەکانـی لـە جێگەیەکدا نیشـتەجێ بوون بە نـاوی ((خەلاف)) کە دەکاتـە بەرانبەر ناحیەی ((رایات))ی ئێستا کە لە چیای هەڵگوردەوە شەش کیلۆمەتر دوور دەبێت.

کە خەڵکەکە دووبارە زۆر دەبن و هۆز و عەشـیرەتی جۆراوجۆر پێکدێت ئەوانەی کە کورد بوونە خۆیان بە نزیکتر لە حەزرەتی نوح زانیوە. وە حەزرەتی نوح بە دە پشت دەگاتە حەزرەتی ئادەم وەکو دیش هەر بەو ناوەوە ناسـراو بوون کە ((نوح)) کوڕی دەهەمینی ئادەم بووە. ((کوڕ + دە = کوردە .. با راستگۆ بم لەگەڵتاندا ئەوی دەربارەی (سام، حام، خام) وتراوە هیچی بەسەر هیچەوە نییە و درۆیە. ئەوە درۆ و دەڵەسەیەکە جوولەکەکان بڵاویان کردۆتەوە تا بەسەر شانی خەڵکانێکی ترەوە سـەر وەدەربهێنن، وەنەبێت وشـەی ((سام)) نەشیاو بێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە یانی ئازایی و پەلامار، کورد بۆ خۆی نازناوی ئازایەتییان بۆ حەزرەتی موسا دابڕیوە.

برادەرانی ئازیز:

هەر خودی ((هابیل)) بوو دووبارە لە شـێوەی عیسای مەسیحدا هاتووەتەوە، تەنها لە رووی نـاوەوە جیاوازییان هەیە، هەر ئەویش دەبێتە (موحەمەدی مەهدی) چاوەڕوانکراو، خوداوەندگارە زیندووکەرەوەی مردووان و دووبارە مراندن کە بە شـێوەی عیسـا مەسیح دووبارە زیندوویەوە بۆ خۆی یەکێک بووە لە نەوەکانی حەزرەتی ((خدر)) لە بەرەی دایکییەوە، وە عیسـاش هەروەکو حەزرەتی ئادەم بە فەرمانی خودا خولقاوە، چۆن ئادەم لە توخمی هیچ باوکێک نەبووە، حەزرەتی ((عیسا))ش هەروا. جوولەکەکان دڵنیابوون لەوەی کە حەزرەتی ((عیسا)) پەیامبەرە، بەڵام کینە و بوغزی حەزرەتی ((خدر)) لە دڵیاندا لە باوەڕەکەیان زۆرتر بووە، بۆیە دژ بە عیسا و رێبازەکەی کۆشـاون. ئەوان ئەوەیان لە بیر ناچێت کە حەزرەتی ((خدر)) تەواوی پەرسـتگا و دەسـەڵاتیانی لەناوبردووە، هەیکەلی سـلێمانی هەرووژاندووە، خوداوەند حەزرەتی سـلێمانی بەسـەر کورسی دەسـەڵاتەوە رۆحی شـانی دادابوویە سـەر گاڵۆکەکەیەوە. کەسـێک لە یاران و پەیڕەوانی زاتی ئەوەیـان نەبـوو لێـی نزیک ببنـەوە تا مۆریانـە لە ئاخـردا گاڵۆکەکەی خوارد و سـلێمان کەوتە خـوارەوە، تا جوولەکەکان گەورەیی خوداوەندیان بۆ دەرکەوێت ((خدر)) ئەوی بۆنی دەسـەڵاتی جوولەکەی لێبوو سووتاندنی و بەسەر شانی خودی یەهوودییەکان و ئاژەڵەکانیانەوە باری کرد و تووڕی دایە نێو دەریاچەی ((مەیت)) هوە، ئەوی مابوونەوە بە دیل گرتنی و هەتاوەکو پەیامبەری ئەو دەمەیان ((عەزیر)) پەیامبەریش کۆچی پێ کردن بەرەو شاری ((بابل)) و بڕێکی تریان بۆ ناو وڵاتی ئێران، تا هێندە دەم لە گەورەیی خۆیان نەدەن و راستەقینەی ((تەورات و فرقان)) بە خەڵکی بڵێنەوە و فەرمان دا تا تەورات بە کوردی سـۆرانی بنووسـنەوە، فەرمووبووی: (وتنی شەکەری) یانی شـێوەزاری خاوێن و شـرین و هەر لە وشەی (وتنی شەکەری)) سانسکریتیدا هاتووە کە لە

بنەماوە ئەو زمان و نووسینە ئەوسا نەناسراو بووە، ئەم رووداوە لە ساڵانی (٦١٥–٦١٧ پ.ز) بووە، یانی لە پێش مردنی حەزرەتی ((خدر))دا، کە وەسیەتی فەرمووبوو لە نێو هۆزەکەیدا بینێژن ((هۆزی جاف)) لە نزیکی شاری هەڵەبجەی ئێستاوە هەر ((خدر)) بووە، چووەتە هانای کەعبەوە و بە ئەمری خودا پەلەوەری ئەبابیلی سازاندووە فیل و لەشکری ئەبرەهەی هەلا هەلا کردووە رووپۆشی کەعبەی لە رەشەوە کردۆتە سەوز و هەر لەبەر ئەو رووداوەش بووە گۆڕ و مەزارەکەی ناونراوە ((ئەبابەیلێ)) کە لە نزیکی شاری هەڵەبجەی ئەورۆیە. هەر لەبەر زۆری کینە و بوغزی یەهوودی دەربارەی ((خدر)) کە نازناوی ((نبی بخن نصر) حەزرەتی (خدر) بووە یانی پەیامبەری بەخت و سەرکەوتن. وە جوولەکەکان ئەو ناوەیان گۆڕیوە و کردوویانە بە (نەبوخودنەسر)، یانی درۆ و کوفر، ئەو حەزرەتە قۆڵبەندی ((تەلەسم))ی لە باڵدا بووە، وەک کوردەکان پێی دەڵێن ((بازیبەند)).

تا خوداوەند لە هێزە شەیتانییەکان بیپارێزێت، وە بەسەر ئەو بازیبەنەوە خاچی هەڵگەڕاوەی بەسەرەوە نەخشاو بووە، وەک دروشمی تایبەت وە هەمان ئارم و دروشمی هیتلەری نازی کردیە دروشمی دەسەڵاتی نازیسم، بەسەر سینگییەوە باڵندەی ((شاهین))ی کێشابوو، کە نیشانەی سەرکەوتنە. ئاسەوارناسانی بەریتانیا، ئەو شاهینەیان دۆزییەوە کە بە ئەندازەی گەورە لە برۆنز دروستکرابوو، ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانیادا پارێزراوە. ئەو باڵندەیە بەسەر دەروازەی کۆش و دەرباری ((خدر))ەوە دانرابوو. بەتایبەت بەسەر دەروازەکەیەوە دادەنرا کە ناوی دەروازەی سەرکەوتن بووە. وشەی یاستار شان بە شانی ئەو باڵندەیە نەخشابوو ئەورۆ وشەی یاستان گۆڕاوە سەر وشەی عەشتار. بەڵام یاسا و مەملەکەی حەموڕابی کە بەسەر بەردی بازلتەوە بەندەکانی هەڵکۆڵراوە، ئەو یاسایانە لە ناو فرقان و تەوراتدا لە مێژدا نووسرابوو وە راستیەکەی ((هەموڕابی)) یان هەمووان فێر دەبن و دەزانن.

برایان، دەزانم لاتان خۆشە زانیاری دەربارەی حەزرەتی مەسیح و مەهدی چاوەڕوانکراو ((صاحب الزمان)) بزانن، باوەڕ بکەن ئەو ((مەهدی))یەش وەک ئێمە چاوەڕوانە! بەڵام خوا لەگەڵ سەبر زۆرەکاندایە.

باش بزانن حەزرەتی ((ئیبراهیم)) نە جوولەکە بووە نە مەسیحی، ئیماندارێکی خوداوەندی بووە، لە کوردستانی ئێراقی ئێستادا هاتۆتە دنیاوە (١٩٥٠ پ.ز) لە هۆزی ((جاف)) بووە، ئەڵبەتە لە پێش ئەوەی بکرێتە پەیامبەر کە کراوەتە پەیامبەر تازە ژنی هێنابوو ژنەکەی ناوی ((سارە)) بووە و لە هۆزی هەورامییەکان بووە و لە ناوچەی ((پاوە)). بەڵام بۆ خۆی لەگەڵ ژنەکەیدا لە ((تەوێڵە)) ژیاون، باوکی سارە بە توانا و دەسەڵات و دەوڵەمەند بووە.

حەزرەتی ئیبراهیم هەر لە منداڵییەوە زیرەک و زرنگ بووە، تێفکراوە هۆزەکەی بۆ بت دەپەرستن. شتێک دەپەرستن خۆیان لە دار و بەرد دروستی دەکەن و دەیپەرستن، خۆیان لە دار و بەرد دروستی دەکەن و دەیپەرستن و بە فەرمانی خودا بڕیاری دا بیشکێنێت. هەر وایکرد، بڕیاریان دا لە ناو ئاگردا بیسووتێنن، بە ئەمری خودا لە ناو ئاگردا بە سەلامەتی دەرچوو، لەبەر دەسەڵاتی باوکی ژنەکەی دووبارە بڕیاری مەرگیان نەدا و تەنیا بەوە رازی بوون کە لە شاری دەری بکەن و لەگەڵ ((سارە))ی ژنیدا کە کچە دەسەڵاتدار بووە، هەروەها کوڕی خوشکەکەی حەزرەتی ((لوط)) شاربەدەریان کرد و بەپێی فەرمانی خودا بڕیار درا بۆ سەر زەوی

((کەنعان)) بڕوات لەگەڵ عارەبدا تێکەڵ ببێت. سەرەتا بەرەو وڵاتی سوریا ڕۆیشتووە و لە دۆڵێکدا گیرساوەتەوە بە ناوی ((هەران)) یانی ئەوانەی ڕاونراون و ئەوڕۆکە ئەو دۆڵە لە سوریەدا بە هەمان ناو ماوەتەوە (حران).

خوداوەند ئەمری بە حەزرەتی ئیبراهیم کردووە نێوانی هۆزەکانی (هەرکی، مزووری، زازا، مسروی، حەکاری، حەق سور) چاک بکاتەوە (مێژوونووسان پێیان دەڵێن ((هکسوس))، ئەو دەم پەیوەستە لە ناو ئەو هۆزانەدا شەڕ و کوشتار بووە، حەزرەت کەوتۆتە نێوانیانەوە، وشەی ((حەق سور)) یانی هاتنی حەق و حەزرەت توانی لە ناویاندا ئاشتی و برایەتی پێک بهێنێت و لەو دەمەوە وشەی ((برایی)) بووەتە نازناوی حەزرەتی ئیبراهیم، یانی ئەوانەی پەیڕەوی ڕێبازی برایەتین.

هیچ جیاوازییەک نەبووە لە نێوان کۆیلە و ئاغا و ڕەگەزە جۆراوجۆرەکاندا، یان تیرە و هۆزەکان و لەو دەمەوە ناوی ((سەفا))ی پێ نەوتراوە. وە ئەوی ئاشکرایە کە چۆن لەسەر داوای ((سارە)) کە منداڵی نەدەبوو هاجەری مارە کرد و هەر ((سارەش)) وڕکی گرت تا هاجەر و کوڕەکەی دوور بخاتەوە، کە ئەو کارە لە لایەن حەزرەتەوە ئەنجام درا هاجەر دەپاڕێتەوە کە لەو چۆڵەوانیەدا بەجێیان نەهێڵێت، هەرچی دەڵێت: ((سەفا مەڕۆ)) ئێمە تەنهاین نە ئاوێک نە خەڵکێک، حەزرەت وەڵامی ناداتەوە. مەترسە خواوەند و مەلائیکەت لەگەڵدایە. (نووسەر چەند بەیتێک شیعری بڵاوکردۆتەوە گوایە کوردییە و گفتوگۆی نێوان سەفا و هاجەرە)) بەڵام بەڕاستی من نەمتوانی ئەو بەیتانە ساغ بکەمەوە وا هەر وەک خۆی بڵاوی دەکەمەوە، بەڵکو جەنابت بتوانی بیخوێنیتەوە)

نووسەر لێرەدا دەڵێت: حەزرەت پێی دەڵێت بە لەهجەی جافی مەلائیکە ((ژەمێ)) ئاوت بۆ دێنێت. بەڵام هاجەر حەوت جار بە دوای حەزرەتدا دەڕوا و دەڵێت: سەفا مەڕۆ و واژەی ((ژەمێ)) بووەتە ((زەمێ)) و زەمی بووە بە ((زەم)) و لە دواییدا بووە بە ((زەم زەم)). وشەی ((زەم)) لە زمانی عەرەبیدا هیچ مانایەک نادات. حەزرەتی ئیبراهیم دووسەد ساڵ ژیاوە، کە خوداوەند مژدەی پێ داوە کە لە ((سارە)) کوڕێکی دەبێت، ئەو دەم تەمەنی حەفتا ساڵ بووە... بۆ ئاگاداریتان هۆزی هەورامی هێشتان ماون، کە ((سارە)) لەوان بووە، دەبێت ئەوەش بڵێم کە ((فرقان)) بۆ حەزرەتی ئیبراهیم نێردراوە لەهجەی سۆرانی بووە و تەورات زۆری لە فیرکان وەرگرتووە، جوولەکەکان گۆڕیویانە سۆرانی گۆڕاوەتە سریانی.

حەزرەتی موسا پەیامی لە ساڵی ١٦٦٠ - ١٦٠٠ پ.ز بۆ هاتۆتە خوارەوە و لە سەردەمی ((موسا))دا کچی برا و خوشک حەڵاڵ بووە، بە پێچەوانەی سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم.

ناوی تەورات بە زاراوەی هەورامی ((تا)) یانی ((هەتاو)) ((ورات)) یانی تیشک تا خەڵکی لە تاریکییەوە بگەیەنێتە ڕۆشنایی و حەزرەتی موسا زۆر زانیار بووە، زمانی زۆر زانیوە، بە تایبەت هی ئەو هۆز و میللەتانەی ئیمانیان پێ هێناوە وەک: مزووری، حەکاری، هەرکی، سورەمیری، مسوری، جاف...

ئەگەر لە زمانی جوولەکە ورد بینەوە پڕە لە وشە و واژەی ئەو هۆزانە. هەورامی گۆڕاوەتە سەر ئارامی و وشەی ((هیسترۆ)) بە لای مەسیحییەکانەوە نزانان چ مانایەک دەدا، لە ڕاستیدا

((هێســـتر))ی کوردییە، بەڵام کە ورد دەبینەوە ئەو ناوە ناوی هەمان هێســـترە وا حەزرەتی عیسا سواری بووە، ئەو هێسترەش لە رۆژی لە خاچکێشانی عیسا مەسیحدا جوولەکەکان سەریان بڕی و خواردیان.

یەهوودییەکان دەیانزانی عیسا مەسیح لە دایکەوە دەگەڕێتەوە سەر ((خدر)) بە هەلیان زانیوە تـا کینــە و تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، قەینا نەیانتوانیوە دەربارەی خدر هیچ بکەن، بەڵام خۆ دەتوانن دەربارەی نەوەکەی ئەوەی دەیانەوێ بیکەن ئەوەبوو توانییان بە فەرمانڕەوایانی رۆمان بسەلمێنن دادگاییەکی ســـەرپێیی بۆ عیســـا مەســـیح بســـازێنن و بڕیاری مەرگیان بۆ دەرکرد و خاچیان دا بەســـەر شـــانیدا بەرەو دەرەوەی شـــار بردیان، بەســـەر خاچدا چوارمێخەکێشـــانی و بەسەر ئەو خاچەیدا درێژەیان پێ کێشـــا و کەوتنە بەســـتنەوەی کە یەکەمین بزماریان لە ناو لەپی دا. عیســـا مەســـیح هاواری کرد (ئای باوکەڕۆ) کە بە کوردی ســـۆرانی وتویەتی و بە لای زۆربەی زۆریی مەســـیحییەکانەوە لەو وشـــەیە تێنەگەیشـــتوون، بەڵام با بە وردی لە دوا وشەی حەزرەتی عیسا وردبینەوە کە چی وتووە. کە بە دەم ئازار و ئێشـــەوە ســـێ جاراران وتوویەتی: (ئیلاهی، ئیلاهی، ســـەیرکە چیم پێ دەکەن) بە کوردی پەتی و بە لەهجەی ســـۆرانی و تا ئێســـتا بڕێک لە پەیڕەوانی ((کاسۆلیک)) بە هەمان وشە و واژە دەیڵێنەوە. بێ ئەوەی لێی تێبگەن.

کە شەو دادێت بە فەرمانی خودا لەشەکەی لە گۆڕ دەردەکەن و روحی دووبارە بۆ دەگەڕێتەوە، دایکـی و کەســـوکاری لە هۆزی جـاف تەرمەکەی دەگێڕنـــەوە بۆ (ئاوایی حـــەوش کوڕی) کە لە دەڤەری خانەقینی ئەوڕۆ بووە. تاکو ئەمڕۆش هەر بەو ناوە ماوەتەوە لە ناوچەی ((قۆرەتوو)).

ئەوانەی ناســـراو بوون بە حەواریوون زۆربەیان لە خزم و خوێشـــی حەزرەت بوون، بەڵام لە ترســـی زەبر و زۆر و کوشـــتنی رۆمەکاندا زۆربەی ئەو حەوارییانە بەرەو دەڤەری هورێن و شـــێخان کۆچیان کرد - وشـــەی ((هورێن)) وشـــەیەکی زۆرتر لە ناو تیرەی تایشەیی هۆزی جافدا بـــەکار دەبرێت، بەڵام ئەو بیرکانە لە خزم و خوێشـــی حەزرەتـــی مریەم کە لە هۆزی جاف بوون هەر لە فەلەستین و سوریا و لوبناندا مانەتەوە.

ئەم زانیارییە لە لایەن تایەرە سوورەوە پێمگەیشتووە..ماڵی ئاوا...

# تیرەکانی هۆزی جاف

هۆزی جاف لە چەندین تیرەی سەرەکی پێکهاتووە.
ئــەم هــۆزە بەگوێرەی زەمان و ڕۆژ بە ڕۆژ لە پەرەســەندن و بەربڵاویدایە، ئەوەش جەبری زەمان و نیازەکانی خودی ژیانە کە بارودۆخی ئابووری یان جوگرافی یان هەتاوەکو توندوتیژی سیاسەت لە جێبەجێبوونی تیرەیەک لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر لەکاردا بووە، ئەو ئالیەتە بۆ زۆر لە عەشیرەتەکانی غەیری جافیش هەروا بووە شتێکە زۆر عەشیرەتی جاف سەر زەوییەکی گەلێـک پـان و پـۆڕی بە خۆیەوە گرتووە کە ئەوڕۆ لە نـاو دوو دەوڵەتدا جێگەی خۆی هەیە، وە جگە لەوانەش بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان عەشیرەتی جاف تەنها لە ڕووی ژمارەوە ئاماژەی بۆ ناکرێت، بەڵکو یەکێکە لە کۆنترین عەشایەری کورد و ڕەگ و ریشە و تەواجودیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش ئیسلام و دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ساسانی.

ئێمە لە ڕووی مێژووییەوە باســمان لە ســەرەتای هۆزی جاف کردووە، ئیدی هیچ نیازێک بە دووبارەکردنــەوەی نییە ئەم بەشــەمان تەرخان کردووە بۆ نــاوی تیرەکانی جاف وە لەگەڵ ناوە مێژووییەکانیانــدا، وە هــەر تیرەیەک لــە کوێرا هەن و لە کوێرا بوونە و ئێســتا لە کوێن و ئەوی بەستەگی هەبێت بەو تیرەیە.

هۆزی گەورەی جاف بەگوێرەی زەمان و ڕووداوەکان کراونەتە ســێ بەشــەوە. ســێ بەشی سەرەکی:

١ ـ جافی جوانڕۆ
٢ ـ جافی مورادی
٣ ـ جافی گۆران

١ ـ جافی جوانڕۆ
وەک لــە مێژدا باســمان لێ کــردووە دەڤەرەکانی جوانڕۆ بە مەڵبەند و هەوارگەی ســەرەکی جاف دەژمێردرێن هەر نەبێت بۆ زۆرتر لە حەوت ســەد ســاڵ وە لەوێرا برێک لە تیرەکانی جاف هەرگیــز دەڤەرەکانــی جوانڕۆیان بەجێ نەهێــڵاوە و لەگەڵ بۆنەهات و پەلامارەکاندا یا بە شــەڕ هاتــوون یا سازشــیان کردووە، ئەوڕۆکە ئەو تیــرە ململانکەرانە ژمارەیان زۆر بووە و بەرەبابی

تریان لێ پێک هاتووە و ئەورۆ خۆیان بە تیرەیەکی سەربەخۆ دادەنێن، وەنەبێت ئەو ئیدیعایە بە شتێکی تازەبابەت بدرێت لە قەڵەم لە مێژدا هەرواوبووە هەروا دەبێت یەک تیرە چەندین تیرەی لێ جوێ بووەتەوە و لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر کۆچ و باریان کردووە.

## جافی جوانڕۆیی

١. جوانڕۆیی
٢. وەڵەدبەگی
٣. باوەجانی
٤. ئیناخی
٥. ئیمامی
٦. زەردویی
٧. پیرخدری
٨. ڕۆسەم بەگی
٩. بیونی
١٠. ساتیاری
١١. مەنوچەهری
١٢. خێڵی شاواز
١٣. مەنسوور ئاقایی
١٤. قوری قڵایی
١٥. شوانکارە
١٦. یارەیی
١٧. کورەئی
١٨. سپێ بەرگی
١٩. لوراوەیی
٢٠. شەروینەیی
٢١. دوێ تویی
٢٢. هۆزی خلە
٢٣. خێڵی پیری باوا
٢٤. نەدری
٢٥. عەلی کەریم
٢٦. عەلی ئاباد ساسلی
٢٧. نەوەیی
٢٨. زیرانی
٢٩. بێوەکی
٣٠. بلەیی

٣١. لوراوەیی
٣٢. نوخائی
٣٣. بزورەیی
٣٤. کەلواخی
٣٥. مزیری
٣٦. کڵاشی
٣٧. تاوگۆزی
٣٨. بایگانی
٣٩. قوبادی
٤٠. دەلەژیری
٤١. میرەبەگی
٤٢. دلەتازەیی
٤٣. نمداربەگی
٤٤. کەمانگەر

## ٢- جافی گۆران

١. قادرمیروەیسی
٢. تایشەیی
٣. قەڵخانچەک
٤. یوسف یارئەحمەدی
٥. کویک
٦. نیرجی
٧. گورگ کوژ
٨. گاخوری
٩. کەشکی
١٠. عەلیاخەیی
١١. کویک
١٢. گوی کوڕی
١٣. گود
١٤. مەزیری
١٥. بیویانی
١٦. تین
١٧. ئەلیاسی

## ٣ ـ جافی موڕادی

١. مکەیاڵی
٢. گەڵاڵی
٣. هاروونی
٤. شاتری
٥. روغزایی
٦. تەرخانی
٧. یەزدان بەخشی
٨. کەماڵەیی
٩. نەورولّی
١٠. باشکی
١١. تیلەکۆ
١٢. سەدانی
١٣. عەمەڵە
١٤. تاووگوزی
١٥. بەیداخی
١٦. یاروەیی
١٧. شیخ سمایلی
١٨. ئیسایی
١٩. سوفی وەن
٢٠. بی سەری
٢١. یوسوجانی
٢٢. پشت ماڵە
٢٣. ئاغەسووری
٢٤. سمایل عوزێری
٢٥. وەڵی
٢٦. نەژوییبنی
٢٧. مەسویی
٢٨. میراولی
٢٩. چوچانی
٣٠. کۆکۆیی
٣١. مامۆیی

# تیرەی مکەیاڵی

ئەم تیرەیە لە ژمارەدا لە هەرچی تیرەی جاف هەیە زۆرترن، رەنگە نیوەی جافی کوردستانی باشـــوور لەم تیرەیەن، ئێمە لە دواییدا دێینە ســـەر باســـی مێژووی ئەم تیرەیە، جێگە و شـــوێن و رووداوەکانی ناو ئەم تیرەیە. بەڵام لە پێشـــدا با بزانین ناوی ئەم تیرەیە لە چییەوە هاتووە و بۆ بەم ناوە ناسراوە؟

نـــاوی مکەیاڵی: لەوە دڵنیام ئەم ناوە لە ناوی پیاوێکەوە هاتووە ناوی ((میکائیل)) بووە، بەڵام کام میکائیل؟ لە چی کات و ســـەردەمێکدا ئەو میکایلە ناســـراو بووە بە ((پیرمیکاییل)) یەکێک بووە لە پیاوچاکانی ســـەردەمی خۆی کە بکاتە سەردەمی دەسەڵاتی سەلجووقییەکان، پیرخدری شاهۆ و پیرمیکاییـــل ((هەردووکیان)) برا بوونە، پەیوەندی پتەو و راســـتەوخۆیان لەگەڵ باوەخوشـــیندا هەبووە، وە بۆ ســـەلماندنی ئەوەی ناوی چەندین پیاوچاک و پیر و چاوســـاقی ئەهلی حەق دەبەم کە لە تیرە جۆراوجۆرەکانی جاف بوونە و لە ناو تایفەی ئەهلی حەقدا بە پیری گەورە و خاوەنی پەیام و کەرامات تاکو ئەمرۆ ناو دەبرێن:

١- ئێڵ بەگی جاف
٢- عابدینی جاف

٣- تحولی شاهۆیی
٤- ئەحمەد جاف
٥- پیرمیکاییلی جاف
٦- بابا نائوسی جاف
٧- پیرزریانی شاهۆیی
٨- درزیانی شاهۆیی
٩- لیزا خانمی جاف
١٠- مەلا غەفووری شارەزووری
١١- مەلا نەسووری شارەزووری
١٢- پیرئیبراهیمی جاف
١٣- پیر بنیامینی شاهۆیی

لە سەردەمی بەربڵاوی دەسەڵاتی پیرەکانی ئەهلی حەقدا زۆربەی رۆژئاوای ئێران بە لوڕستانیشەوە لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەهلی هەقدا بوونە و بەرهەڵستی هێزێکی دڕ و خوێنڕێژی و شاڵاوی مەغۆلیان کردووە، داڵەهۆ و زۆربەی زۆری دەڤەرەکانی هۆزی (جاف ـ جاوان ـ جاپان) پەیڕەوی ئەو دەسەڵات و بۆچوونە ئایینیە بوونە و ئەو دەسەڵاتە شارەزوور تاکو دەوروبەری شارباژێڕیشی گرتۆتەوە و بە بەرزنجە و پێنجوێن و لە خوارەوەش تا خانەقین و مەندەلی و دەوروبەری بەغدا، ئێستاش چەندین مەزاری ((ئەهلی حەق)) لە ناو شاری بەغدادا دیارین و پەیڕەوانی ئەو ئایینە دەڕۆنە زیارەتی، بەگوێرەی زەمان گۆڕانکاری ئایینی و خێڵەکی بنەڕەتی لە دەڤەرەکاندا روویداوە و بڕێک بوونەتە شیعە مەزهەب و بڕێکی تر ئەهلی سونەت و لێرە و لەوێش بڕێک لەسەر ئایینە کۆنەکە ماونەتەوە، تاکو ئەمڕۆش لە زۆربەی زۆری دەڤەرەکانی گەرمیان و شارەزووردا زۆر جێگە و شوێن و مەزار بە ((باوە)) ناودەبرێت، وەک ((باوە مەحموو، باوەخوشین، باوەپڵاوی، شێخ باوە، باوەکوچەک.. هتد))

سەرەتای خێڵی مکەیالی، لە شەش سەد ساڵ کەمتر نییە، ئەگەر لە پیرەمیکاییلی یەکەمەوە حیسابی بکەین، پیر میکایلی دووهەم و سێهەمیش هەیە، کە هەرسێکیان بە کەڵە ناوداری زەمانی خۆیان دەژمێردرێن.

تیرەی مکەیالی، بەتایبەت ((ئالی بەگی)) لەگەڵ بەگزادەکانی جافدا دەگەڕێنەوە سەر یەک بەرەباب (پیر خدری شاهۆ و پیرمیکاییل) برا بوونە و وەک دەرکەوتووە (بەگزادەکانی جاف، بەرەبابی ئالی بەگی، تاوگۆزی، قوبادی، باوەجانی، وەڵەدبەگی، جوانڕۆ) بەشێک لە ئیناخی، ئەوانە هەموو لەو دووبرا کەوتوونەتەوە ((پیرخدری شاهۆ و پیرمیکاییل)).

وەک وتمان تیرەی مکەیالی لە بارەی ژمارەوە بە بەشێکی زۆری هۆزی جاف دەژمێردرێن و زۆرتر لە تیرەکانی تری ناو جاف لە تیرەی کەمالەیی و شاتریەوە نزیکن. گوایە لە سێ کەس بە ناوی (میکاییل، کەمال، ساتر). ئەو سێ تیرە پێکهاتوونە و هەرسێکیان دەگەڕێنەوە سەر یەک بەرەباب، بەندە لە باوەڕێکدام نەک تەنها ئەو سێ تیرەیە، بەڵکو تەواوی تیرەکانی جاف خوێشاوەندی یەکتر بوونە، ئەگینا چ هێز و هەستیارییەک ئەوەندە بەهێز بووە بەو هەموو رووداوی خوێناوی و بگرە و بەردەی رۆژانەی ناو تیرەکان و بەربڵاوی رووبەری جوگرافیای

هۆزی جاف کە دوو بەشی گەورەی کوردستانی گرتۆتەوە ئەگەر هەستیاری خزمایەتی نەبووایە لە نێوانیاندا کە تا ئەوڕۆش بەردەوامە، تیرەکانی ناو جاف پشت و پەنای یەکتر نەدەبوون.

لــەو رۆژگارانــەدا لەســەر وتەیەک، کوشــتنی ســەگێک، کلک بڕینی ئەســپێک، گــوێ بڕینی گوێدرێژێک چەندین کەس کوژراون و لەگەڵ ئەو رووداوە هەمیشەییانەدا وا دەبینین لەم دەور و ســەردەمەدا کە ســەرەتای سەدەی بیست و یەکەمە بیر و رای خێڵەکی و دەمارگرژی عەشیرەتی لــە نــاو تیرەکانی جافدا پتەو و بەربــڵاوە، ئەگەرچی ئالیەتی ژیان لە نێــو تیرەکانی ((جاف))دا بە جەبــری زەمان گــۆڕاوە و دنیای هۆزەکان و کوردەواری تێکــڕا چۆنیەتی ژیانیان لە قۆناغێکەوە بــۆ قۆناغێکی تر رۆیشــتووە، ئەوڕۆکە کوڕان و کچانی نێــو تیرەکانی جاف مامەڵە لەگەڵ ئامێرە داهاتووەکانی سەردەمدا دەکەن وەکو: کۆمپیوتەر، ئەنتەرنێت، ئەمیل، فەیسبووک و فاکس .. هتد. زانکــۆکان، پەیمانگاکانــە مافی مرۆڤە بەرەنگاربوونەوەی تونــد و تیژی دژ بە ژنان، دژ بە ئاژەڵ، سروشت پاراستن، خاوێن راگرتنی ژینگە، پاراستنی سروشت..

بەنــدە خۆشــحاڵی ئــەوەم ئەم هۆزە رەوەندە کە جگە لە ســەد ســاڵی ئاخــر نەبێت تەواوی ژیانیان بە کۆچەری بەســەر بردووە، خۆیان بە بازی ســەر پۆپەی چیاکان زانیوە، لە هەر دۆڵ و دەربەندێکی پڕ لە ئاو و شینابیدا بەزیون، ئەوڕۆکە ژمارەیەکی زۆری هەڵگری بەڵگەنامەی زانکۆ جۆراوجۆرەکان (دکتۆرا، ماجستێر، بەکالۆریۆس، دبلۆمی بەرز) وەدەست هێنراون. وەنەبێت بەو سیستەمی کۆچەریشەوە هۆزی جاف بایەخی بە خوێندەواری و کتێب و زانیاری نەدابێت.

((کلودیوس ریچ)) گەڕیدەی بەناوبانگی ئینگلیزی لە گەشــتەکەیدا بۆ ناو کوردســتان ١٨٢٠ز دەڕواتە هەوارگەی کەیخوسرەو بەگی جاف، کە بە سەرۆکی سەرتاسەری تیرەکانی جافی ئەودەم دەژمێردرا.

لە دەوارە بیســت و چوار ســتوونەکەیدا چاوی بە ریزێ کتێب دەکەوێت، بۆ خۆی دەڵێت: پێم سەیرە بۆ ئەو کتاوە جۆراوجۆرانە وا بە ریز لە ژێر ئەو دەوارەدایە..

خۆ تیرەی مکەیالی کە لە پیاوی ناوداری هەرگەورەیان تیادا هەڵکەوتووە. ((ئیل بەگی جاف)) ئــەو شــیعرە پاراوانە ئەو پێشــبینیە زەریفانە پڕ لە وردەکارییانە کە زەمــان نەیتوانیوە لە بیریان کا، ئەو چاوساقە پڕ لە دنیای عیرفانە هێندە پایەبەرز بووە، زۆر لە ئایین و مەزاهبی جۆراوجۆر شــانازی پێــوە دەکەن و بــە یەکێ: لە پەیامبەرانی خۆیانی دادەنێــن. ((ئەهلی حەق ـ بەهائییەکان ـ زەردەشــتییەکان)) بەندە لە گەرما و گەرمی شــەڕی نێوان ((عێراق و ئێران))دا ١٩٨٦ز لە یانەی ((العلویــە))ی ناو شــاری بەغــدادا بە عەرەبی کۆڕێکم لەســەر ((ئیل بەگی جــاف)) گێڕا و لەگەڵ پێشبینیکەرە بەناوبانگەکەی ئەوروپادا ((نوستراداموس)) بەراوردم کرد و هەڵمسەنگاند، ئەو کۆڕە گیروگرفتــی گــەورەی بۆم نایەوە، دوای یەک مانگ بگرە و بــەردەی ((ئەمنی عام و موخابەراتی عیراقی)) بە فەلاکەت رزگارم بوو..

یان مەولانا خالیدی نەقشبەندی، ئەو کەڵە پیاوەی دنیای عیشق و حیکمەت و مەعریفەتە، ئەو خواناسە پڕ لە وردەکارییە داهێنەرە، ئەو چاوساقە گەورە و سەرفرازە، ئەو عاشقە شەیدا سیفەتە پڕ لە رازە، وەک هەورێکی بەربڵاوی ئاســمانگیر جیهانی دنیای تەســەوفی گرتەوە. بە شێوەیەکی پاراو و نوێ رازەکانی هەڵهێنا و بەرپای تاریکی چەواشەبووەکانی رۆشن کردەوە.

مەولانا تەنها مەولای سـۆفیانی کوردزبان نەبوو، ئەو وەک تۆفانێکی هەڵکردوو ئەوی مەرز و سـنوور و رەگەز هەیە رایماڵی و خسـتییە ژێر رکێفی ڕێبازەکەیەوە، مەولانا مەولای میللەتانە، مەولانا چاوساقی هەمووانە، مەولانا کاکڵەی حەق و حەقیقەتی ویژدانە...

کەڵەپیاوێکـی وا لـە خزمە ئالی بەگەکانمانەوە هاتۆتە کایەوە، بووە بە دیاردەی میللەتان نەک منی ((جاف)) بەڵکو گەلانی دوور و نزیک، شانازی بە کەسایەتییەکەیەوە دەکەن.

خۆ ئەگەر بێینە سـەر باسـی زەرافەتی شـیعر و ئەدەب و هەڵبەست و خولقاندنی پانۆڕاما لە بیرنەچووەکان، خۆ ئەگەر لە دنیای مەعریفە و وردەکاریدا ئاماژە بۆ هەر کەڵە شـاعیرێک بکرێت ئەوا ((حەزرەتی نالی)) سـەربن نشینی دنیای عاشـقانە، دیوەخانداری وشە و واژەی هەستیار و نەزم و بەزم و داڕشتنە، ئەو توانیویە بە ئیلهامێکی خودایی، رەهایی لە رەوشتێکی ئەدەبی دامەزراو بە دەسـت بهێنێت و شاسـوارانە رەخشی نەزم و هەڵبەسـتی خۆی پڕتاو بە دەربەندی داهێناندا بگوزەرێنێت. (نالی) رچەشکێن، نالی داهێنەر، نالی عاشقی حەبیبە و ئەوانەی خاوەن ئازیز بوونە. ئەو کەڵە شـاعیرە، ئەو گەوهەرە گومبووەی ناو خاک و خۆڵ کەوتە سـەر لاگەردنی نازداران و شـۆخ و پەیکەران و بوو بە هاوڕای سـنگ و مەمکی خرپنی عاشـقان، ئەو گەوهەرە دەگمەنە بە جقەی شـاکانی دنیای ئەدەبیاتەوە تا بە ئەوڕۆ دەبریسکێتەوە، ئەو شەیدا دڵسۆزەی دنیای زەوق و شـەوقی ئەدەبیـات لە هۆزی جافـەوە لە تیرەی مکەیالییەوە لە بەرەبابی ((ئالی بەگییە)). سـەد خۆزگـەم بـە ئالی بەگییەکان کەوا هەنگاوێک لە ((نالی)) هەمیشـە زیندووەوە نزیکترن، دەبا رۆح رەوانی ئەو هەمیشە زیندووە شاد و بەرزەفڕ بێت....

دە توخوا بڵێ ئامین....

بـا راسـتگۆیانە رایگەیەنم، کاتێک ناوی ((نالی)) دەبیسـم، کاتێک هەڵبەسـتێکی دەخوێنمەوە، تووشـی سەرسـامی و بەخۆداچوونەوە دێم و دەمگەیەنێتە خەڵوەتگای عیشـق و لەخۆبوردن و دووبارە بێ ئاگا لە خۆ سەری تەعزیم دانواندنەوە، سۆزێکی تێکەڵ بە ئاشوفتەگی پەیتا پەیتا گڕ و کڵپە و بڵێسەی بۆکرووزی دەروونم دەگەیەنێتە کەپووی فریشتە ئاوارەکانی هەلهەلەی ئاسمان و ئەو دەم دیسان سەری کڕنۆش دادەنوێنمەوە و دەکەومەوە ستایش و لە دنیای سەرسوپوردەگیدا تۆماری وەفا بۆ بلیمەتی ((نالی)) پەنجەمۆر دەکەم.

بەندە لام وایە تا رادەیەک و بڕێک لە کۆڵانەکانی حەوت شـاری عیشـقی نالیم پێواوە، دوای شانزە ساڵ غوربەت و دوور وڵاتی یادی بەخێر گەیشتمە خزمەتی ئەندیشمەندی گەورەی کورد ((مەسـعود محەمـەد)) و شـکاتی دەردی دڵ و بڕێـک بۆچوونی کرچ و کاڵی چەند نووسـەرێکم گەیاندە خزمەتی، لە وەڵامدا فەرمووی: کەس نییە بە ئەندازەی من جنێو و ناو و ناتۆری نەشیاوی پێ وترابێت، وەرە با ئەم بەیتە شیعرەی نالیەت بۆ بخوێنمەوە بزانم ماناکەی دەزانی:

**نالی چیە میسلی چوغەل خەریکی شیاکەی**
**خۆ تۆ بە حیسابێک وەکو پەروانە شەمت بوو**

وتی: دەزانی مانای چییە؟

وتم: نەخێر نازانم....

وتــی: نالی دەڵێت: نالی ئەوە چییە وەکــو قالۆنچە خەریکی گوگلینی، بە لای خۆتەوە تۆ وەک مۆمێکی هەڵگیرساو وایت و پەپوولەکان بە دەوری گڕەکەتدا دەچەرخێن و باڵیان دەسووتێت، جا کاکە خوســرەو: ئەوانەی دژ بە بەرهەمەکانت دەنووســن دوو سوود دەکەن.. یەکەم ئەوەیە کە لە تۆیان نووسیوە، تۆ لە سوودی. دووەم مەحروومیان کە و پیاو چاکبە وەڵامی کەس مەدەرەوە.

ئەوە ساڵانی ١٩٨٤ز بوو، ئەلحەق و وەلئینساف تا بە ئەمڕۆ بە چاک و خراپ وەڵامی کەسم نەداوەتەوە و لاشم وایە بەرهەمێک گەیشتە ناو کتێبخانەی کوردی دەبێتە موڵکی خەڵک و لە ناو خەڵکیشدا پەیڕەوانی ڕەوا و ناڕەوا زۆرە.

با بێینەوە ســەر ئەم تیرە ڕەســەنەی ناو هۆزی جافە کە (مکەیالی)یە ئەم تیرەیە بە شــەرەفە چەندین بەرەبابی ســەرەکین و بەگوێرەی زەمان پەیوەســتە زۆرتر دەبن و وا بڕوات کە دەڕوات بەرەبابــی تریــان لێ جــوێ دەبێتەوە و لە ســنووری تیرەکــەدا ئازادییەکی تایبەتمەند بەدەســت دێنن..

## بەرەبابە سەرەکییەکانی ناو مکەیالی:

١ ـ ئالی بەگ
٢ ـ شوانکارە
٣ ـ ڕەش و بۆری
٤ ـ چەتاڵی

لەو چوار بەرەبابە سەرەکییانە چەندین بەرەبابی تر جوێ بوونەوەتەوە وەک:

١ ـ مام یەحیایی لە کۆیە و دەوروبەری
٢ ـ عەلی محەمەد وەیسی لە شارەزوور
٣ ـ پیرەباوی لە هەولێر و دەوروبەری

أ ـ بەرەبابی ئالی بەگ، لە زۆر دەڤەران هەن و بڵاون لە (سوورداش، دۆڵی جافایەتی، بیسانە سووری شارەزوور)
ب ـ بەرەبابی (شوانکارە، لە ناو شاری سلێمانی و دەوروبەریدا)
ج ـ چەتاڵی (لە چەمچەماڵ و سەنگاو)
د ـ ڕەش و بۆری لە (شارەزوور ـ قەرەداغ و دەوروبەرەکەی).

لێرە و لەوێ بڕێک لادێیی مکەیالی نشین کە لە دەڤەری خۆیان جوێ بوونەتەوە، دەمارگرژی مکەیالی بوونیان زۆرە، بەتایبەت لە ســیدەکان ـ برادۆســت ـ سۆران ـ هەوارە بەرزەکانی دەڤەری

بارزان.

ئەو لادێیانەی لە دەڤەری سـەرەکی مکەیالـی دوورکەوتوونەتەوە، ئەمانەی خوارەوەن کە لە دەڤەری بادینانن:
شـەرمین، سوسنێ، سماقوک، هەزارجون، جووجەلێ، گەورە و بچووک، بەردەڕەش، گوندی خێلۆکان.
زیاتر لە سێ سەد خێزانی مکەیالی لە ناو شاری موسڵدا دەژین کە بە بەرەبابی ((مەلا موسا)) ناسـراون، لێرە و لەوێ لە شـارە عارەبەکاندا بڕێک بنەماڵەی ناسـراو هەن یان بە عارەبی قسـە دەکەن، یان بە تورکی، بە رەگەز مکەیالین وەک:

- بنەماڵەی نائیب ئوغلیەکانی کەرکووک
- عالەم زادەکانی ناو شاری حیلە
- لە ولایەتی وان لە قەزای ((ئوزاب))
- مەلا جامیعەکانی دەوروبەری شاری سابڵاغ

بەڵام جێگەی سەرەکی نیشتەجێبوونی تیرەی مکەیالی زۆرتر لەم دەڤەرانەدا بوونە و هەن:
شـارەزوور، ناحیـەی عەربەت، قەزای هەڵەبجە، تانجەڕۆ، وارمـاوە، قەزای قەرەداغ، ناحیەی سەنگاو، قەزای کەلار و سموود، دەربەندیخان، چەمچەماڵ، ئاخجەلەر، ناحیەی تاسڵوجە، گەڕەکی خەباتی ناو شـاری سلێمانی، بەکرەجۆ، سەرچنار، ناحیەی وارماوە، ناحیەی سووورداش، ناحیەی پیرەمەگروون، چوارقوڕنە و حاجی ئاوای رانیە.

لە کوردسـتانی رۆژهەڵاتدا لە زۆر جێگە و شـوێن تیرەی مکەیالی تیادایە وەک: بانە، سـەقز، دیواندەرە، سەردەشت، کرماشان، قروە، کامیران، سنە، جوانرۆ ... زۆرتر لە گوندی ((دوان))دان.
ئەمانـەش ناوی بڕێک لە سـەرۆک تیرەی مکەیالین، هەروەها ناوی کەسـایەتی ناو ئەم تیرە گـەورەی ((جـاف))ە، وەلەبەر بەربڵاوی و ژمارەی زۆری ئەم تیرەیە رەنگە ئاسـان نەبێت، تەنها کەسـێک ئـەورۆ بتوانێت بە تەنها ئوموری تیرەیەکی وا گـەورەی جافە بەڕێوە ببات. بۆیە لێرە و لەوێ کەسایەتی ناو بەرەبابەکانی ناو تیرەی مکەیالی زۆرن و بەڵام ئەوی بە دەستەوەیە...

ئیل بەگی جاف، مەولانا خالید و حەزرەتی ((نالی)) لە بەرەبابی ((ئالی وەگی))ین.
لێرەدا باسـەکەمان نەکشێتە باری دەمارگرژییەوە، ئەو سێ کەسایەتییە تەنها لەسەر مکەیالی و جاف ناژمێردرێن، بەڵکو مایەی شـانازی گەلی کوردن، ئەگەر هی سەرتاسـەری بەشـەریەت نەبن...

١ ـ حەسـەنی حاجی قادری ئەحمەدی شاسـوار: کەسـایەتییەکی بەناوبانگی تیرەی مکەیالی بـووە. لە سـاڵی ١٩٣٠زدا کۆچـی دوایی کردووە، یەکێک بـووە لە پیاوە هـەرە دیارییەکانی ناو جاف.
٢ ـ روسەمی حەسەنی حاجی قادر: دەگێڕنەوە ئازا و سەخی و ناندەر بووە لە ساڵی ١٩٧٥ز مردووە.
٣ ـ حەمومینی کوڕی روسەمی حەسەن (١٩٠٩ ـ ١٩٨٦ز) پیاوێکی دیاری و ناسراوی سەردەمی

خۆی بووە شیعری جوانی نووسیوە.

٤ ـ تۆفیقی حاجی فەرەج: تا بڵێی خۆش تەبع و بە زەوق و خۆشەویست بووە. من لەگەڵیدا لە سەردەمی پێشمەرگایەتی ١٩٦٣ز زۆر تێکەڵ بووم و خوا لێی خۆشبێ پیاوی دین و دنیا بوو.

٥ ـ حەمەتالیبی فەرەج: بە راستی پیاوێکی لێهاتوو و سەخی تەبع و میوان دۆست بوو، لە سەردەمی پێشمەرگایەتیدا بۆ پشوودان لە گەرمیانەوە ١٩٦٣ز دەهاتم بۆ دەوری نەمەڵ و قەرەداغ سکمان دەخووساند و تامەزرۆیی لە ماڵی حاجی حەمە تالیبدا دەشکاند. بە راستی میوان دۆست بوو.

٦ ـ حاجی جەزا حەمە تالیب: ئەم حاجییە ئێسک سووکە تا مابوو بە لای زۆر کەسەوە خۆشەویست بوو، هاوتەمەن بووین، هاوپێشمەرگە بووین و ئیدی تا وەفاتی کرد پەیوەندیمان بەردەوام بوو، لە بەغدا کاتێک وەفاتی کرد بەرپاسەرییەوە بووم.

٧ ـ محەمەدی مارفی مستەفا.
٨ ـ حەمەی کەریمی فەرەجی فەقێ خدر
٩ ـ سەعدوڵڵا وەیسی رەمەزان شاسوار
١٠ ـ داود باوەنور مەولود حەیدەر
١١ ـ مەحموی ئاخەکەول سمایلی روسەم
١٢ ـ ئەحمەدی ئاخەکەول سمایل روسەم
١٣ ـ سمایلی حاجی وەسین
١٤ ـ حەمەی ئەلماسی مەولود حەیدەر
١٥ ـ حاجی مستەفای ئەلاوەیسی باوەیس
١٦ ـ حاجی قادی محەمەدی عەبدوڵڵا
١٧ ـ حەمەی گورن شاسوار محەمەدی روسەم
١٨ ـ حاجی مارفی مستەفا
١٩ ـ فەتاحی محەمەدی یەعقوب
٢٠ ـ حەمەی شاسوار روستەم
٢١ ـ شاسواری خاڵەی رۆستەم
٢٢ ـ حەمەی فەتاح سمایل
٢٣ ـ ئەحمەدی حەمەی چەتاڵ
٢٤ ـ فەقێ عەلی عەبدولکەریم
٢٥ ـ ئەحمەد محەمەد
٢٦ ـ حاجی محەمەدی سەید خولاوەیس
٢٧ ـ حاجی محەمەدی قادر هەمزە
٢٨ ـ حاجی کەریم حسین قادر هەمزە
٢٩ ـ محەمەدی مستەفای مرید
٣٠ ـ فەقێ عەلی عەبدولکەریم حەمە ئەحمەد
٣١ ـ حەمەڕەشید حەسەنی حاجی
٣٢ ـ حەمە ئەمینی حەسەنی حاجی قادر
٣٤ ـ عەبدولڕەحمانی حەسەنی حاجی قادر
٣٥ ـ مەلا ساڵحی حەسەن

ئەم تیرەیە وەک تیرەکانی کەی جاف، لە گەرمیان و کوێستاندا بوونە و تا پەنجا ساڵی پێشوو بڕێک لەم تیرەیە دەستبەرداری ژیانی کۆچەری نەبوونە و لە هاتوچۆی گەرمیان و کوێستاندا بەردەوام بوونە، ئەمەش ناوی بڕێک لە هەوارگەی گەرمیان و کوێستانی ئەم تیرەیەیە، کە لە دواییدا ئەوانەی گەرمیانیان بووە بە هەوارگەی هەمیشەیی نیشتەجێبوونیان:

## هەوارگەی کوێستانی تیرەی مکەیالی:

پیرانە کۆن ـ دەڕەمەڕ ـ سیاناو ـ وەیسە ـ کاڵ ـ ریخەڵان ـ شیتانەجو ـ سیوەتاڵە ـ شلێر و بناری کۆنە ـ شلێر ـ دڕەزیارەت ـ هەرمێ دۆڵ ـ باینجان ـ کاوە مەلا ـ کیواکە ـ خەوشەن ـ ناوەی مەریوان ـ سیکوخان ـ تیرەمەڕان ـ بناری کونەڕەش ـ وەلەژێر ـ نەی

## هەوارگەی گەرمیانی مکەیالی:

خاک و خۆڵ ـ نەمەڵ ـ قەرەگوڵ ـ عەینکە ـ پێنج ئەنگوست ـ کاریزەی دەلو ـ تیلەکوی دەربەندبازیان ـ قەڵبەزە ڕەش ـ فانکە ـ تەتەعارەب ـ حەسەن کەنوش ـ باخان تەتەسی ـ کەلەڕەش ـ کفری ـ داڵەی سەروو ـ داڵەی خواروو ـ بیستانەسوور ـ هەشەزینی ـ قەرەهەنجیر ـ عەربەت ـ قەراڵە ـ فەرەج ئاوا ـ ناوگردان ـ موان ـ زرگوێزی گەورە ـ هەڵەبجەی تازە ـ هەیاس ـ گردەنازێ ـ دێ کۆن ـ ژاڵە ـ کانی سیق ـ توتمان ـ تازەدێ ـ دەروەرگان ـ بانی بنوک ـ چنارە ـ بەردەبەل ـ هوشیاری ـ باخی ـ بەردەمێو ـ ئەسیل ـ ولیان ـ سویرئاوا ـ سەیسوێنان ـ جامرێز ـ زنانە ـ دەرزیلە ـ کانی بەیتەش ـ کانی سارد ـ کەلار ـ حەسەن محە.. هەروەها لەم شارانەشدا نیشتەجێن: کەرکووک ـ هەولێر ـ بەغا ـ چەمچەماڵ ـ سلێمانی ـ دووکان و گوندەکانی: سوغاغ ـ سیدەر ـ هەڵەدن ـ یاخیان ـ پیرەمەگروون.. لە هەوارگەکانی گەرمیان بە گوێرەی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و شێوەی ژیانی خەڵک و گیروگرفتی سیاسی نێو دەوڵەتی نێوان ئێران و عوسمانی و سەرئەنجام دەوڵەتی دروستکراوی ئێراق ١٩٢٠ز زۆر لە تیرەکانی جاف ناچاری نیشتەجێبوون کراون و هەوارگە گەرمەسێرەکانیان بووەتە جێگەی هەمیشەییان ـ بەڵام لە سەردەمی رەوەندییاندا لە ناوچەی سەنگاویش دەگوزەران.

رێگە و رێچکەی خێڵ، ئەوانەی لە سەنگا و و خواری ئەو ناوچەیە بوونە سەرەوژوور دەبوونەوە بۆ کوێستان بە رێچکەی سەگرمە، جافەراندا دەگوزەران، تلەزەیت، دارەڕەش، چەمی تانجەڕۆ، چاڵەی مەرجان، چوارتاق، عەربەت، بەرزنجە، حاجی مامام، کانی دزان، کوتەڕەش، باکوری شلێر، دەڤەری بانە...

ئەو خێلانەی لە گەرمیانی لای سیروان و هەردەکانی دوای زنجیرە چیای قەرەداغدا هەوارگەری زستانیان بەجێ دەهێشت بەرەو کوێستان بەڕێ دەکەوتن، لەبەر ئەوەی خێڵێکی زۆر

کۆدەبوونەوە و هەر هەموو ئەو رەشماڵ و عەشامات و هەزاران سەر مەڕ و ماڵاتە هەر دەبووایە لە کەلی پەیکوڵیەوە بگوازرانا، زۆر جار لەسەر تێپەڕبوونی بەو کەلە تەنگەبەرەدا دەبووە شەڕ و هەرا، بۆ ئەوەی ئیدی ئاژاوە و هەرا روونەدا چاوساغی سەرۆکی جاف، مەحموود پاشا جاف لەو تەنگەبەرەیەدا نیشتەجێ دەبوون، یەکەم بۆ بەرگری لە ئاژاوە و شەڕ و رووداو و بە نەزم تێپەڕبوونیش. هەروەها بۆ سەرانە وەرگرتن، کە رەسمێکی عەشایەری ئەو دەمە بوو، هەم بۆ دەوڵەتی عوسمانی و هەم بۆ سەرۆکی جاف، ئێستاش ئەو «مەخفەر»ە لەو کەلەدا هێشتا ماوەتەوە (بەندە ساڵی ١٩٦٣ لەو کەلەدا پێشمەرگە بووم و چەندین جار لە باران و تۆف و زریاندا پەنام بۆ ئەو مەخفەرە بردووە..).

# پیاوە ناودارەکانی بەرەبابی ئالی بەگی مکەیالی

سێ کەڵەپیاوی گەورەی ناو ئەم بەرەبابە نەک تەنیا شانازی بن بۆ ئەوان و سەرتاسەری جاف، بەڵکو شانازین بۆ هەموو کوردێک:

١- عیل بەگی جاف
٢- مەولانا خالید
٣- نالی

بە تەئکید هەر یەک لەوانە بەندە لە بەشەکانی داهاتوودا بە درێژی باسیان لێدەکەم...

٤- مەلا وەیسی: پیاوێکی دیاری ناو بەرەبابی ئالی وەگی بووە، لەوە دەڕوا لەگەڵ دەسەڵاتی باباندا ناکۆک بووبێت، عاشقی کچە جوولەکەیەک دەبێت و مارەی دەکات، دیارە بابانەکان دەکۆشن

دەستی لێ بوەشێنن، بەڵام زایەر بەگی جاف کە ئەو دەم سەرۆکی جاف بووە، دەڕواتە هانایەوە و بەرگری لەو پەلامارەی دەگرێت.

٥- حاجی کاکەوڵای قازی.

٦- فەقێ عەلی قاسمی کەریمی قەرەوەیس (١٨٦٩-١٩٢٢)، گوندی بویستانە سوور لە لایەن فەقێ عەلییەوە ئاوەدان کراوەتەوە.

٧- حەمەساڵحی کەریم قەرەوەیس: خاوەنی قورئانێکی بەناوبانگە، ئێستاش خەڵکەکە سوێند بەو قورئانە دەخۆن.

٨- حەمە ساڵحی حاجی نادر

٩- عومەری فەقێ عەلی قاسم، پیاوێکی خەباتگێڕ و دڵسۆزی میللەتەکەی بووە، لە ساڵی ١٩٦٥، کۆچی دوایی کردووە.

١٠- مستەفا حاجی کاکەولا، لە شەڕی نێوان «ئالی بەگی» و «روغزاییی»دا دەورێکی شایانی هەبووە، لە ساڵی ١٩٩٥ کۆچی دوایی کردووە.

١١- ئەبوبەکر عومەر فەقێ عەلی کەریم، (١٩٤٩-٢٠٠٨)، ئەم پیاوە خوێندەوار و چاو ساق و لێهاتوو بووە، لەناو بەرەبابەکەیدا خۆشەویست و دیار بووە، لە دنیای شیعر و ئەدەبیاتدا خۆی تاقیکردۆتەوە و نەزم و بەیتی ئەدەبی زۆری نووسیوە.. ئەورۆ (ئەسکەندەری کوڕی ئەبوبەکری عومەر) چاو ساق و بە براگەورەی بەرەبابەکەی خۆی دەناسرێت و جێگەی متمانەی خەڵکێکی زۆری بەرەبابی (ئالی وەگی)یە.



رۆستەمی حەسەن حاجی قادر
١٩٧٦-١٨٩٧

رۆســتەمی حەســەنی حاجی قادر ســەرۆکی ئەو دەمە و براگەورەی تیرەی مکەیاڵی بووە لە دێــی (خــاک و خۆل)دا کۆچی دوایی کــردووە هەمان دێی حەزرەتی (نالی) مــەزاری ئەم زاتە لە گۆڕستانی قڕاڵی دایە.



حەمە ئەمینی روستەم
١٩٨٦-١٩٠٧

حەمەئەمین روســتەم کوڕی حەســەنی حاجی قادر یەکێک بووە لە کەســایەتییە ناودارەکانی مکەیالی جاف لە شاری عەربەتدا کۆچی دوایی کردووە، مەزارەکەی لە گوندی قیڕالیە.

## روونکردنەوەیەک

زۆر کەس لای وانییە عەشیرەتی جاف لە دەڤەرەکانی بادیناندا هەبن و نیشتەجێ بن، بۆئەوەی بە خەڵکی و خوێنەوارانی بڵێم کەوا هۆزی جاف لە زۆر جێگە و شوێن و هەتاوەکو وڵاتانی کەیشدا هەن و بە سەرفرازییەوە دەژین، لە کوردستانی باکوور، لە لوڕستانی رۆژئاوا خۆ کوردستانی رۆژهەڵات هەوارگە و مەڵبەندی سەرەکی هۆزی جاف بووە.

لەم کتاوەیدا کۆشاوم وێنەی زیندووانی تیرەکانی تیادا بڵاونەکەمەوە، بەڵام بۆ سەلماندن و وەک دیکۆمێنت وێنەی برێک لە کەسایەتی زیندووی جافی دەڤەری بادینان دەخەمە بەرچاو و دیارە زۆربەی ئەو جافانە لە تیرەی مکەیالین و بەرەبابی ئالی بەگین.



کۆمەڵێک جافی دەڤەری بادینان
لە راستەوە:
١- میر محەمەدی دەرکەلی
٢- محەمەد عەلی ئاغای جوندیان
٣- میر ئەسعەدی روستای
٤- قاو ئاغای سەرۆکی تایفەی دۆڵی روست
٥- مستەفا ئاغای رواندزی



مەلا شوکر عەزیز ئیبراهیم
ئەم زاتە لە جافەکانی کوردستانی باکوورە و لە تیرەی مکەیالییە لە دەڤەری (دیاربەکر)دا دەژیا.



حاجی محەمەد خورشید
تیرەی مکەیالیە لە دێی چوچەنی گەورەدا دەژی لە قەزای بەردەڕەش.



حاجی حەمە شەریف
دەڤەری بادینان، دێی چوچەن تیرەی مکەیالییە.



حاجی عەبدولعەیز
دەڤەری بادینان تیرەی مکەیالی لە بەردەڕەش دەژی.



حاجی شوکری سەعدی سەلیم
دانیشتووی گوندی سماقول، ناحیەی گردەڕەشی ئاکرێ، مکەیالییە و بەرەبابی ئالی بەگییە.



حاجی غەفور حەسەن ئەفەندی لە دێی کەندهولاندا دەژی، دەڤەری سیدەکان تیرەی مکەیالییە و لە بەرەبابی ئالی بەگی.



حاجی عەلی ئیبراهیم
لەجافەکانی بادینانە.



حاجی ئیبراهیم خدر
لە جافەکانی بادینانە.



عەبدولواحید حاجی تاهیر
لە گوندی سـماقول ناحیەی گردەشـین قەزای ئاکرێ دا دەژی.



رەمەزان عەبدوڵڵا سەلیم
لە تیرەی مکەیالییە و لە دێی سوسنی سەر بە گردەشینی قەزای ئاکرێ دەژی، لە سورداشەوە هاتوونەتە بادینان



مەلا عەبدولحەمید مەلا عەبدولمەجید
ئەم مامۆستایە لە باب و باپیریەوە هەر بە مەلایی و کەلازادەیی هاتونەتە خوارەوە، لە دەڤەری بادیناندا بنەماڵە و تەکیەکەیان ناسراوە.



مەلا ئەحمەدی کوڕی عەبدولڕەحمان دانیشتووی (ئاکرێ)یە و زانایەکی لێهاتووە و لە تیرەی مکەیالییە.



بابەکر حەمزە رەسول
مکەیالییە و لە بەرەبابی هەوارە بەرزەکانە



حاجی حەمە حوسەین عەبدوڵڵا
لە مەسیفی سەڵاحەدیندا دژی، مکەیالییە و لە
بەرەبابی ئالی بەگی.



قادر سـمایل عەبدولڕەحمان لە هۆزی جافە و بەرەبابی
ئالی بەگییە، ناسراوە بە قادر کلێتەیی لە کۆیە دەژی.



حاجی خەلیل ئیبراهیم سەمیس
لە سورداشەوە رۆیشتونەتە حەویجە، لە هۆزی
جافە و تیرەی مکەیالی.



محەمەد شەوکەت
لە تیرەی مکەیالییە، جافی دەڤەری بادینانە
ئاکرێ
ئەم پیاوە بە نامەردی شەهید کراوە.



حاجی محەمەدی کوڕی فەقێ حەسەن
لە تیرەی مکەیالییە و بەرەبابی ئالی بەگی
لە ئاوەهوکی دەشتی کۆیەدا دەژی.



مەلا ئاوارەی مەلا عەبدولکەریم



ڕەسول فەقێ حەسەن
تیرەی مکەیالی بەرەبابی ئالی بەگی
باب و باپیری سەرۆکی جافەکانی دەڤەری کۆیە بوونە.



حاجی فەقێ حەسەن
تیرەی مکەیالی، بەرەبابی ئالی بەگی
سەرۆکی جافی کۆیە و بتوێن بووە.



حاجی عەبدولسەمەدی عەبدوڵڵا
لە قەزای بەردەڕەش کەچی لە بەرەبابی ئالی بەگی.



سەدرەدین حاجی عەلی
لە تیرەی مکەیالییە و لە ناحیەی گردەشین دا دەژی.



عەلی شاوەیس
تیرەی مکەیالی لە هەڵەبجەدا دەژی



حاجی کەریم ئەمین ئەحمەد
١٨٨٠-١٩٨٠
تیرەی مکەیالییە



یاوەر جاف
لە تیرەی مکەیالییە



حاجی تۆفیق چوخ ماخ
تیرەی مکەیالی، بەرەبابی ئالی بەگی
لە دۆڵی جافایەتیدا دەژیا لەگەڵ شێخ مەحموودا هاوکاری کردووە.



سالّح خدر پیرداود
تیرەی مکەیالی، بەرەبابی ئالی بەگی
یەکێک لە پێشمەرگە ئازاکانی شۆڕشی ئەیلول بووە.



حاجی رەشید ئالّەیی
تیرەی مکەیالییە لە گوندی ئالیەی سەر بە ئاکرێ دا دەژیا.



حەمە ئەمین ئەحمەد
ناسراو بوو بە حاجی حەمە سوور
تیرەی مکەیالی
بەرەبابی ئالی بەگی
١٨٨٤-١٩٧٦



حاجی ساڵح حاجی حەمە سووری سوسمانی ناسراوە بە باوکی تایەرە سوور، تیرەی مکەیالی بەرەبابی ئالی بەگی



تاهیر ساڵح
ناسراوە بە
تاهیرە سوور

ئەم کەسە لەم کیتاوەیدا زۆر لای یارمەتی دام و لە بارەی هۆزی جاف بە تایبەت تیری مکەیالی، کە بۆخۆی یەکێکە لە قسە لێبیسراوەکانی ئەم تیرەی جافەیە و خاوەنی قەڵەمێکی رەوان و لە جافایەتیشدا دڵگەرم و بوێر و دەمارگرژ، خۆزگە لە تیرەکانی کەی هۆزی جافدا نمونەی (تاهیر سوور) زۆر دەبوو. من وەک نووسەری ئەم کیتاوە «خوسرەو جاف» سوپاسی دەکەم.



دیوالی محەمەد سەعید
تیرەی مکەیالی
بەرەبابی ئالی بەگی
لە دەڤەری سماقولدا دەژی.



مێدین حاجی ئەخوەرە فەندی
تیرەی کەیالی
لە دەڤەری سۆراندا دەژی.



زیرار رەسول فەقێ حەسەن
تیرەی مکەیالی
بەرەبابی ئالی بەگی
لە قەزای کۆیەدا دەژی.



حەمەئەمین حاجی ئیبراهیم
لە تیرەی مکەیالی
لەناو شاری کۆیەدا دەژی.



قاسم عەبدولسەمەد عەبدوڵڵا
تیرەی مکەیالی
لە جافەکانی بادینانە و لەبەردەڕەشدا دەژی زۆر خەریکی خوێندن و سەواد و زانکۆیە.




# نالی 1797-1855ز

شاسواری دنیای زەرافەت و وشە و واژەی جوان و هەڵبەستی رەنگاورەنگی هەمیشە زیندوو، ماندوونەناسـی رێبازی دارشـتنی فکری پەسەند و شیاو، پیاوسالاری زەواری عەقڵی مەوزوونی دنیای شـاد و مەحزوونی عاشـقانی ئاشوفتە دەروونی هەوارگە نشـینانی عیشق و عاشقی، نالی هەرەگەورە.

ئەو عاشـقە سـینە سـافە، ئەو شاسـواری خێڵی جافە، ئەو دنیا پڕ لە باسـە، ئەو سۆفییە بە ئیخلاسە ناوی خدری کوڕی ئەحمەد شاوەیسە و ناسراوە بە نالی.

ئەلحەقو و ئینساف نالینەکانی نالی چنگی لە دڵ و دەروونی خەڵکە زۆرەکەدا گیر کردووە. بە درێژایی زەمان زمانی (نالی) زیندووە و کەس زاتی نییە بڵێت (بزیسکەیەک بوو هاتوچۆ و ئەوڕۆ مردووە..)

نالی لە دێی (خاک و خۆڵ)دا هاتووەتە دنیاوە، شێوەی زمان و عیشقی نالی ریشویی لە خاک و خۆڵی وڵاتدا بۆ ئەزەل داکوتاوە.

نالی عاشق، نالی خاوەن رێباز، نالی دنیای پڕ لە راز، نالی عاشقی حەبیبە) لە تیرەی مکەیالیە و لە بەرەبابی عالی بەگییە، هەزار سڵاو و رەحمەت لە رۆح و رەوانی.. ئامین.

# مەولانا خالید 1193-1242ک



ئــەم زاتــە لە تیرەی مکەیالــی جافە، بەرەبابی ئالی بەگی، لە ســاڵی ١٨٢٦ز هاتۆتە دنیاوە، بە توانایەکی زۆرەوە توانیویە بیروڕای ســۆفیگەرانەی ڕێبازی نەقشبەندی لە کوردستاندا ڕەواج پێ بدا و لە سەرتاسەری کوردستاندا پەیڕەوانی بۆ پەیدا بکات.

ئەم زاتە ناوی خالیدی کوڕی ئەحمەدی ئەحمەد حەســەنە، ســەرەتا هەر لە دۆڵی قەرەداخدا دەست بە خوێندن دەکا و وەک هەر فەقێیەکی ئەو دەمە بە دوای فێربووندا شار بە شار و مزگەوت بە مزگەوت دەگەڕێت و لەسەر دەستی لەلای زائد (ئیبن ئادەم) و (شێخ محەمە تەسلیم) لە شاری ســنە خوێندن تەواو دەکات، بە دوای ئەوەدا دەگەڕێتەوەی شــاری سلێمانی بۆ لای مامۆستاکەی

(شـێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی) لەوێرا بە دەرس وتنەوە دەسـت بەکاردەبێت، دەڕوات بۆ حەج و دەگەڕێتەوە، دووبارە کاری مامۆسـتایی دەسـت پێ دەکاتەوە، عیشقی زانیاری و شەیدابوونی بە ئایین گڕی تێبەردەدا و بەرەو وڵاتی هیندستان بە دوای عیشقی خوداییدا دەشت و دەر لەبەر دەگرێت، لە وڵاتی هیندسـتاندا لە ڕێبازی نەقشـبەندیدا قووڵ دەبێتەوە و بە لای مامۆسـتای ئەو ڕێبازە (شـێخ عەبدوڵڵای حەرارە)وە بەڵگەنامەی مامۆستایی وەردەگرێت و دەگەڕێتەوە وڵات، لە شـاری سلێمانیدا نیشـتەجێ دەبێت و دەکەوێتە تەقەڵڵای بڵاوکردنەوەی ڕێبازی نەقشبەندی، ئەو تەقەڵلایانـەی دەبێتـە هۆی نیگەرانی مەشـایەخی ڕێبازی قادری و پاشـای بابانی ئەو دەمەی لێ هان دەدەن و ناچاری سـلێمانی بە جێهێڵانی دەکەن و دەڕوا بۆ شـاری بەغدا، لەوێدا نیشـتەجێ دەبێت..

دیارە مەولانا، بەغداشی زۆرلا بە دڵ نابێت، بەغدا بەجێ دەهێڵێ و دەڕوات بۆ شاری دیمەشق، لەوێدا بە بڵاوکردنەوەی ڕێبازی تەسـەوفی نەقشـبەندییەوە خەریک دەبێت، دیارە لەو شارەدا بە نەخۆشـی چاوەقولە دەمرێت لە ساڵی ١٢٤٢ک. لەدوای خۆی گەلێک زانیارییان، بیروڕای سلوکی سـۆفییانەی مەولانایان کردۆتـە بەر و تاکو ئەمڕۆش ئەو ڕێبازە یەکێکە لە ڕێبازە پەسـندەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

مەولانا جگە لە پایە بڵندی و سەرقەتاری ڕێبازی نەقشبەندی، لە ئەدەبیاتی فارسی، کوردی و عارەبیدا دەستی باڵای هەبووە ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی بەو سێ زمانە.

فارسی

ئەم پارچە هەڵبەستەی دوای گەڕانەوەی لە حەج دارِشتووە.

وا حسرتا ، جداشدم أزخانهء خدا — أزغصه وقت گشته شود دل زتن جـدا

مرانبود خواهش رفتن زکوی‌دوست — أماچو أمـر أوست زسـر میکنم بـا

أهل صفا بداغ غم مـبرده مرده‌اند — من شاد چون زیم که شدم دوور أزصفا

حجرو مقام وزمزمو أرکانو ملتـزم — گویند بـازگـرد کجا میـروی کجـا

دامان دل‌گرفته برندم کشان کشـان — حنانه روضه منبرو محـرابو مصطفی

أز اشتیاق یثرب و درد فـراق بیت — کاهی‌است دل‌فتاده میـان‌دوو کهربـا

«خالد»چودوست درهمه‌جا جلوه‌گربود — پس غم مخور زخانهء اوگر شدی جدا

کوردی

ئەم هەڵبەستە کوردییە دیارە لە شاری مەدینەی عارەبستاندا وتویەتی:

وە ئەوداڵ نەکەم ... وە ئەوداڵ نەکەم
تاکەی خۆم چون قەیس وە ئەوداڵ نەکەم
بازووی دەروێشیم پڕ خڕخاڵ نەکەم
پۆشاکی جەلۆنگ شا دەسماڵ نەکەم
چەنی دەیری‌یان ماڵ بە چۆڵ نەکەم
تەحصیلی ڕۆزی بە کەشکۆڵ نەکەم
فەنایم بە خاك سەحرای بەڕ نەکەم
بەو کانی‌و سێلاو دیدەم تەڕ نەکەم
بێخ ڕیشەی نەخل زەوقم پەی نەکەم
چار گۆشەی جیهان مەسکەن تەی نەکەم
پەری بەختوێم خاك وەسەر نەکەم
یا من هووپەی سەدسکەندەر نەکەم
جە قەوم‌و عەشرەت خۆم بێزار نەکەم
عەزم وەی کابل قەندەهار نەکەم
خالید، بێ ڕەفیق ڕۆژ وەشەو نەکەم
چون تاف ئاوان تەرك خەو نەکەم:

عارەبی

ئەمەش نموونەیەکی هەڵبەستی عارەبی مەولانایە

خفالله يا بدر برج الكرامة … وأطف الفؤاد الحريق اضطرامة

اكنت ترى في الخلوص اعوجاجا … فلم تعدل القوس في الاستقامة

خلاف العهود وترك الوفاليد … س أمرأ قمينآ بأهل الفخامة

وكم ارتحلتم بدون استذانى … دعوت لرجعاكم بالسلامة

وليل الى الصبح قد احرقتنى … حرارة نار الجوى باستدامة

ولو كنت ما اخطرن ببالك … فؤادى لذكراك دار الاقامة

فما بال بال عن الحب خال … وماذا الزجاجة لولا المدامة

ولو أن علمت لكم خلف وعد ٠ … لما اوقعن قلبي في ذا الغرامة

فقد صرت خليتكم بعد هذا … فسوف نرى مانرى في القيامة

الى مَ الام ؟ وحتى متى ؟ … يكسر قلبي بصخر الملامة

فلا أبصر منك الا خداعا … يراه الورى ظاهرى العلامة

فلا أبكين بعد في هجركم … ولا أسكب الدمع مثل الغمامة

ندمت لما قد مضى بيننا … ولكنه ليس يجدى الندامة

صلوة الاله على جدكم … وأحبابه وهو خير الختامة٠

# عێڵ بەگی

بە سێ زمان شیعری وتووە، داخەکەم تەنیا شیعرە بەناوبانگەکەی (هەر وایە و هەروا بووە)



ی بەدەستەوە ماوە، ئەویش ئەگەر پەیڕەوانی ئایینی (ئەهلی حەق) و بەهاییەکان نەبوایە کە هەردووی ئەو ئایینە ئەو زاتەیان بە پەیامبەرێک داناوە و سەیر لەوەدایە زۆری پێشبینییەکانی هاتوونەتە دی..

ئەوەیان حاشا هەڵنەگرە (عێڵ بەگی) بە رەگەز جاف بووە و وا پەیدایە لە تیرەی مکەیالی و بەرەبابی ئالی بەگی بووبێت، بەڵام لەم رووەوە هیچ بەڵگەیەکی نووسراومان بە دەستەوە نییە، خوا بکات لە داهاتوودا خوێنەوارانی کورد بتوانن زۆر کار و کردەوەی نەزانراو و داپۆشراو و دزراوی نێو میللەتەکەمان ئەوڕۆکە بەکەڵکە و داخەکەم ئەوڕۆ هی خەڵکە بخەنەوە روو و بیگێڕنەوە بۆ ناو باوانی حەقیقی و راستەقینە، بە ئومێدی ئەو رۆژەی.

ئەمەش چەند بەیتێکی فارسی عێل بەگی مەزنە:

این چە شورست کە درد دووری میهر بنیم همە آفاق پر از فتنە شرمی بینم

همە دختران جەنگ مستو جدال باپدر ومادر همە پسررا بدخواهی پدرمی‌بینم

هیچ رحمی پدر با پسر هیچ شفقتی پسر با پدر نمی بینم •

هەڵبەستی (هەروایە و هەر وابووە) پڕە لە پێشبینی، پڕە لە حیکمەت، پڕە لە تێڕامان و تەئەمول، پڕە لە تێفکرین بە کوردی پەتی وتراوە..

دایکە ئەچم بۆ دالەهۆ کوێری ئەکەم باوانی تۆ
ڕەفیقی گاورانو جوو کەی بۆ من مسەلەم مەبوو

هەروایەو هەروائەبێ

کێ بە قەولی کێ ئەکا من بە قەولی گاوران ئەکەم
ئیطاعەتی دەوران ئەکەم سەرم پڕ لە سەودا ئەکەم
ڕوو لە تووری سینا ئەکەم ئەوسا نیگای دونیا ئەکەم
ئێران پڕ لە دەعوا ئەبێ حوکمی سوڵتان نادر ئەبێ
موڵکی ئێران باهیر ئەبێ دەوران دەوری نادر ئەبێ
لەپەی نادر دەعوا ئەبێ ئێران پڕ لە غەوغا ئەبێ
خاسان وەبێ کفن ئەبێ شاهان دوور لە وەتەن ئەبێ

هەروایەو هەروائەبێ

مورغان دوور لە چەمەن ئەبێ خێڵی شاهان فانی ئەبێ
شاهی ئێران وەزەند ئەبێ حوکمی مستەمەند ئەبێ
حوکمی کەریمی زەند ئەبێ دونیا بێقسەوباس ئەبێ
لەدوای کەریم بەدتر ئەبێ ئەوسا دەوری قەجەر ئەبێ

تەیمور لەخەو خەبەر ئەبێ سەری ئێران بێسەر ئەبێ

هەروایەو هەروائەبێ

گەل بانگی مەهجوری ئەبێ بازاڕ هەموو بلووری ئەبێ
ئەوسا سیر ئاشکار ئەبێ خەڵکی جیهان هوشیار ئەبێ
ڕەونەق و زینت بسیار ئەبێ یاران بەبێ ویقار ئەبێ

هەروایەو هەروائەبێ

دەوری ئێران قـــڕان ئـەبێ    سەر لـەمەیـدان فـڕان ئەبێ
بۆ قەحطی هەرسێکیان یەك ئەبێ    خەیلێ مـردوم فـانی ئـەبێ
شـۆڕش لەهەموو جیهان ئەبێ    هەم سـەرجۆشی گرانی ئەبێ

هـەروایـەو هـەروائـەبێ

دەوران دەوری پەهلەو ئـەبێ    شێخان هەموو تەقلیـد ئـەبێ
ئەوســـا دەوری ڕەزا ئـەبێ    غـەزای ڕۆمەڵخـەزان ئـەبێ
دەوران دەوری ئیجبـار ئـەبێ    ژن لـە مێردی بێزار ئـــەبێ
کوڕان لە بابی خۆی هار ئەبێ    بابیـان لابـێ بـەهـا ئـەبـێ

هـەروایـەو هـەروائـەبێ

هەر لەڕاستی خیلاف ئەکەن    مەردی مەیدان گەزاف ئەکەن
حەرزان بەتەل غوراف ئەکـەن    چابوك سواران لـەنگ ئەکەن
دونیا لە خەڵکی تەنگ ئەکـەن    خەیاڵی دڵ وا تەنگ ئـەدەن
سـەدای تۆپ و تفەنگ ئـەبێ    دونیا لـە مەردوم تەنگ ئەبێ

دەنگی سـەرباز وەشەنگ ئەبێ    ئێران هەروەك فەرەنگ ئەبێ

هـەروایـەو هـەروائـەبێ

بـەرقی یە لە ئـەوروپا ئـەبـێ    کوڕان و کچان قەشەنگ ئەبێ
ئەسپی ئـاسـن دەوان ئـەبـێ    وە ڕووی زەمین ڕەوان ئەبێ
دوو کەڵ لە قنگی تـوند ئەبـێ    چابك سـواران قرخن ئـەبێ
تەیارەچون ڕەعدو بەرق ئەبێ    وە ڕووی هەوا مۆلـەق ئەبێ
بەرقی برقی وە فـەرق ئـەبێ    هەر سـەعاتی سەدجار ئەبێ

هـەروایـەو هـەروائـەبێ

نیوەی ئێران وە ڕووس ئەبـێ    عەهدو پەیمان شـکس ئـەبێ
سکەی زێڕیان وە مس ئەبـێ    لەکول دەوڵەت شـکس ئەبێ
جار جار عەزمی قەهـار ئەبـێ    دونیا نەقشـ و نیگـار ئەبێ

هـەروایـەو هـەروائـەبێ

هەر کەس وە مەیلی خۆی ئەبێ　　دەوران دەوری قـاوقیل ئەبێ
دەوران دەوری فەرەنگ ئەبێ　　گەورە بێ ناوو نەنگ ئـەبێ
مایل بە شـۆخ و شەنگ ئەبێ　　کاری مەردان نامـەرد ئـەبێ
لە هەردو سـەر جیهـاد ئەبـێ　　کردەی خێریان ناکـرد ئەبێ

هـەروایـەو هـەروائـەبێ

مـاهی ڕوویـانی دەوڵـەتـی　　بـادە نۆشـانی خەڵـشوەتـی
کـۆتا لیبـاس و سـەربـەتی　　جامـە سـفیدو خـەت خـەتی

پـەی خانەدان ناحەق ئـەبـێ　　دەوران پشێو پشێو ئـەبـێ

هـەروایـەو هـەروائـەبێ

عێلی بـەگی زنجیـر ئـەبـێ　　دوو کەس قەولیان یەکگیر ئەبێ
بابیـان نـەوەڕوسـ ئـەبـێ　　خوێن ڕێژیـان وەقیس ئەبـێ
غەوغانێکی بەرپـا ئـەکـەن　　قیلەو میحراب ئاگـا ئەکـەن
ڕەخشی ڕۆسەم بەکـار ئەکەن　　دوڵدوڵ سـوار ئێزهار ئەکەن

هـەروایـەو هـەروائـەبێ

دەنگی ئەزانی بیلال ئـەبـێ　　بـانگی یـاران زوڵاڵ ئـەبـێ
ئەوسا زاڵـم پـەیمال ئـەبـێ　　جیهان پەی ڕووی سامال ئەبێ
عیلی بەگی جلـوە ئـەکـا　　لە هەردووسەر نیگـا ئەکـا
نیگـای ڕاستی بـەقـا ئـەکـا　　ڕۆحی بە جەننەت شـاد ئەکا

هـەروایـەو هـەروائـەبێ

# ڕەش و بۆری

تیرەی مکەیاڵی بە گەورەترین و زۆرترین تیرەی سەرتاسەری عەشیرەتی جاف دەژمێردرێن، زۆربەی زۆریان لەسەر جافی مورادی لەقەڵەم دەدرێن و جێگە و شوێن و هەوارگە سەرەکییەکانیان لە دەڤەرەکانی شـارەزوور و دۆڵی قەرەداغ و چەمچەماڵ و سـەنگاو و هەروەها زۆربەی شار و شارۆچکەکانی کوردستانی رۆژئاوایدا هەن و بەربڵاون، هەتا وەکو ژمارەیەکی زۆریان لە دەڤەرە جۆراوجۆرەکانی بادینان و کوردستانی باکووریشدا بەربڵاون.

ڕەش و بـۆری بە بەشـێکی یەکجار گرنگی ئەم تیرە گـەورە جافەی دەژمێردرێن و ئەمانیش وەک خزمە جافەکانی تریان کۆچەری بوونە و خاوەنی مەڕ و ماڵاتی زۆر و لەچاو تیرەکانی تردا دەوڵەمەنتر و خاوەن ماڵاتی زۆرتر بوونە.

کەریم بەگی جاف، لە کتاوەکەیدا «تەئریخی جاف»دا دەڵێت: لە سـاڵانی بیستدا رۆیشتمە ناو تیرەی مکەیاڵی ئەو دەم بەفەرمی سـەرۆکی عەشـیرەتی جاف بووە.. ئەم تیرەیە خاوەنی دارایی و دیوەخان و مەکنەتی خۆیانن، کە بە پۆشـتەیی دەسـت رۆیشـتنەی وەدیم کردن، بوونە مایەی شادمانی و سەرفرازیم.

زۆربەی زۆری ڕەش و بۆری، کە بە بەشێکی زۆر و گرنگی عەشیرەتی مکەیاڵی دەژمێردرێن زۆرتر نیشتەجێی دەڤەری سەنگاون..

# ناوی ڕەش و بۆری

لــە ناو ژیانی کۆچەریدا، ناوەکان یا لــە ڕووداوەکان وەرگیراوە، یان پەیوەندی بە جێگەیەکی ژینگەیــی یــان جوگرافــی یان لە ناوی کەســایەتییەکەوە وەرگیــراوە، کە دەمڕاســت و لێهاتووی سەردەمی خۆی بووە..

ڕەش و بۆرییەکان بۆ خۆیان لایان وایە، باوە گەورەی ئەم تیرەیە سەرەتا لە ناوی دووکەسەوە هاتووە، بە ناوی (حەمە ڕەشــید و حەمە بۆر)، بە درێژی زەمان گۆڕانکاری هاتووەتە ســەر ئەم دوو ناوەیدا، چۆن محەمەد بووە بە حەمە و عەلی بووە بە عەلە و ئیتر هەروا، ڕەشــیدەکە بووە بــە ڕەش و حەمەکــەش بە گوێری زەمان بە لا خراوە و بۆرەکە ماوەتەوە و ســەرەئەنجام بووە بە (ڕەش و بۆری)، ئەمە لە لۆژیکی سیســتەمی عەشــایەرییەوە نزیکە، بە تایبەت لە عەقڵییەت و تێفکرین و چۆنیەتی ژیانی عەشیرەتێکی ڕەوەندی وەک جاف.

ئەم بەشە بەشێکی گرنگی تیرەی مکەیالیە، کە ناسراون بە ڕەش و بۆری، ئەوڕۆکە ژمارەیان لە بیست هەزار کەس کەمتر نین، ئەم تیرەیە وەک زۆربەی تیرەکانی کەی جاف تەسلیمی جەبری زەمان بوونە و وردەوردە ژیانی کۆچەرییان خســتووەتە لاوە و نیشــتەجێبوونیان هەڵبژاردووە،

لەبەر ئەوەی لە باری داراییەوە بە توانا بوونە، کە دەستیان خستۆتە قوڕ و لەژێر ڕەشماڵ وەردەرهاتوون و خانوویان دروست کردووە، لە بیری مزگەوت و مەلاشدا بوونە، لە سالآنی سی دا بۆ یەکەمجار ڕەش و بۆرییەکان مزگەوتیان دروست کردووە، مەلاشیان بۆ هێناوە، یەکەمین مەلای ناو مزگەوتی ڕەش و بۆری، مەلایەک بووە بە ناوی (فەقێ قادر) لە دێی کەلاندا، بەرنوێژیانی بۆ کردووە، منداڵی خەڵکەکەشی فێری نووسین کردووە، بە دوای ئەو فەقێ قادرەوە مزگەوتی کەلان گەورەتر کراوەتەوە و مەلایەکی تر بە ناوی (مەلا محەمەدی حاجی قادر)، بووە بە مەلای ئەو مزگەوتەی (١٩٥٤ز)، ئەو مەلایە چەندین فەقێی هەبووە و دەرسی پێ وتوون، لە دواییدا ئەو فەقێیانە بوونە مەلای دوانزە عیلم و ناسراون، وەک:

١- مەلا ڕەزای تەکیە.
٢- مەلا نووری حاجی عەبدولکەریمی قاراوە.
٣- شێخ محەمەدی تەکیە.
٤- مەلا تەقی بانگول.
٥- مەلا نەجمەدینی بانگول.
٦- مەلا محەمەدی عەبدوڵڵای سەرقەڵا.
٧- مەلا ئەحمەدی قادری حوسێن.
٨- مەلا محەمەدی عەبدولکەریمی حارس.
٩- مەلا غەریب حەمە ئەمین.
١٠- مەلا عەزیزی کاکی.
١١- مەلا عوسمانی هەرگینە.

داخۆ دەبێ ئەو مەلا ناوبراوانە چەندین بێ سەوادیان خوێندەوار کردبێ، چەندین گرفتاری کۆمەڵایەتی، ئاینی، ناکۆکی، دووبەرەکی لە خەڵکیان ئاسان کردبێت (ماڵیان ئاوابێت). وەک زانراوە ژیان گۆڕاوە، ئالیەت و سیستەمی ئەوڕۆی ژیان و خەڵکی ئێستا لەگەڵ دوێنێدا جیاوازە، ئەمە هیچ لە ڕێزی مەلای مزگەوت و ئاینی پیرۆزی ئیسلام کەم نەکردۆتەوە و ئەوڕۆکە لە ناو تیرەی ڕەش و بۆریدا سەدان و بگەرە هەزاران خوێندەواری قەڵەم بەدەست و هەڵگری بڕوانامەی پەیمانگەکان و کۆلێژەکان و بەکالۆریۆس و ماجستێر و دوکتۆراش وەدی دەکرێن، ئەمە مایەی ئومێد و خۆشحاڵی کەسێکی وەک من و هەموو کوردێکە (خەرمان بەرەکەت).

# پیاوە ناودارەکانی ڕەش و بۆری

١- کەرەم وەیس ئالی وەیس.
٢- قاسمی کەرەم وەیس ئالی وەیس.
٣- سەعدون ساڵحی ئالی وەیس (١٨٩٨-١٩٦٩).
٤- حاجی قادری کاکە خان (١٩٠٦-١٩٧٢).
٥- فەقێ قادری کەرەم وەیس (١٨٩٦-١٩٦٥).
٦- فەتاح محەمەدی کەرەم وەیس (١٨٩٠-١٩٦٧).
٧- حارسی عەزیز زالواو.
٨- تۆفیق حارس زالواو.
٩- مەجید مەردان عزەت زالواو.
١٠- ڕەشید مەردان گوێژە.
١١- حەمە خان سلێمان سەرقەڵا.
١٢- عەبدولکەریمی نەریمان تەپە عارەب.
١٣- قادر تەها قادر ئاواو.
١٤- حاجی حەمە حەسەنی کەریم میران سەرقەڵا.
١٥- حاجی عەلی ئەحل دووپەلان.
١٦- شەریف ساڵح بونگلە.
١٧- حاجی عەبدولکەریم شەریف قادر ئاوا.
١٨- حاجی حەسەن فەقێ قادر.
١٩- مستەفای ئەحمەد فارس ئاغای بەردەکەڕی.

# مەلا ناودارەکانی ڕەش و بۆری

١- مەلا محەمەدی کەلانی.
٢- مەلا فەرەجی سەعدون.
٣- مەلا حوسێنی کەلانی.
٤- مەلا حەمومینی عەبدوڵڵا.

٥- مەلا غەریبی حەمومین.
٦- مەلا محەمەدی عەبدوڵلای سەرقەڵا.
٧- مەلا سامان عوسمان سەرقەڵا.
٨- مەلا فاروق محەمەد.
٩- مەلا نەوزاد فەرەج.
١٠- مەلا ئەحمەدی خەلیفە وادی.

بە تەئکید جگە لە ناوی ئەم مامۆستایانە مەلای دیکە لە ناو رەش و بۆریدا زۆر بووە و هەن، شتێکە ناویان بە من نەگەیشتووە. داوای لێبوردنیان لێدەکەم..

# ژنە ناودارەکانی رەش و بۆری

ژن رۆڵی خۆی هەبووە و هەیە، ئەم نەخش و رۆڵانە بە پێی مەرجەکانی کۆمەڵایەتی هەر میللەتێک لەگەڵ ئەوی تردا جیاوازە، ئێمە با زۆر دوور نەڕۆین و نەکەوینە باسی گەلانی دوور و نزیکەوە، لەم دۆڵەی دوور ناکەوینەوە، کە ناسراوە بە دۆڵی دوو رووبار، یان میزۆپۆتامیا، ئێستاش پێی دەوترێ «ئێراق». ئەم ناوە نەگبەتە بوو بە چەن و کەوتە گەردەنی ئێمەی کوردەوە، سەیر لەوەدایە بە ناوی «ئێراق»ەوە، رازی نابین و دەمارگرژە عارەبەکانی وشەی «عەزیم»یش دەخەنە پاشوەندی ئێراق، قەدەری ئێمەی کوردیش ئەمەیە کەوا بە کوردستانەوە بەشێکین لەو ئێراقە هەر نەبێت تا ئێستا...

دەگەڕێمەوە بۆ ساڵی ١٨٢٠ز، کاتێک گەڕیدەی ئینگلیزی کلودیوس ریچ، گەشتە بەناوبانگەکەی لە بەغداوە دەست پێدەکات بەناو هەموو عەشایەری عەرەب و کوردەواریدا دەگوزەرێ، دەگاتە ناو هۆزی جاف، دەبێتە میوانی کەیخوسرەو بەگی جاف، باوکی حەمە پاشای جاف، لە یاداشتەکەیدا دەڵێت:

«کاتێک گەیشتمە ناو هۆزی جاف، تەواوی ژنانی ئەو هۆزە بێ پەچە و بێ عەبا و بێ خۆشاردنەوە بوون، کاتێک لەگەڵ کەیخوسرەو بەگی جافدا، لە ژێر دەوارێکدا بووین، ئافرەتەکان لەگەڵماندا دانیشتبوون، زۆر سەربەستانە گفتوگۆیان لەگەڵماندا دەکرد، لە کاتێکدا لە بەغدا بەدەرهاتین بە ناو ئەو هەموو عەشایەریەدا هاتبووین ژنێکمان وەبەرچاو نەکەوتبوو».

ئەوانە قسەی (کلودیوس ریچ)ە لە کیتاوەکەیدا...

رەنگە من ناوی تەواوی ئافرەتە دیارەکانی ناو رەش و بۆریم پێ نەگەیشتبێت، ئەمانە برێک لە ژنە دیارەکانی ناو ئەو تیرەیەن:

١- حەلاوەی حاجی مارف، خێزانی وادی حارس ١٩٠٦-١٩٧٥.
٢- حاجی رەعنای ساڵحان، خێزانی تۆفیق حارس ١٩٠٥-١٩٩٠.

٣- جەمین ساڵح ئالی وەیس، خێزانی حاجی قادر کاکەوەیس ١٩٠٤-١٩٧٥.
٤- پیرۆز محەمەد وەیس، خێزانی حەمومین عەزیز ١٨٩٧-١٩٧٠.
٥- حەلاوەی ئەحمەد کەرەم وەیس، خێزانی فەتاح محەمەد کەرەم وەیس.
٦- فەهیمەی سەعدون خێزانی حاجی عەبدولکەریم نەریمان ١٩٢٠-١٩٩١.
٧- نازیف حاجی کاکەولا، خێزانی حەمەی حاجی ئەحمەد قاسم.
٨- شەمسـە خانمی خێزانی مەلا حوسـێن فەقێ کەلانی، ئەم خانمە لە ساڵی ١٩٤٧ز، یەکەمین مەکینەی دوورمانی بردۆتە ناوچەی سەنگاو.
٩- حاجی نەجمە وادی، خێزانی حاجی کاکەولا حاجی قادری کاکە خان.

# سەرۆکەکانی رەش و بۆری

١- حاجی عەزیزی حەمە خانی سلێمان.
٢- تۆفیق حارس.
٣- لـە ئێسـتادا «محەمـەد ئەحمـەدی قاسـم» بە برا گـەورەی ئـەم تیرەیە ناسـراوە و لە زۆربەی رووداوەکاندا پرسـی پێکراوە و ماڵەکەشی بە رووی مێوانانی ناسراو و نەناسراوانیشدا دیوەخانەکەی کراوەیە.
٤- هەروەهـا چەندین کەسـایەتی تر لە ناو ئەم تیرەیەدا پەنجەیان بـۆ درێژ دەکەن و لە ناو خەڵکدا بە دەمڕاست و قسە بیستراو دەناسرێن، وەک ئیبراهیم فارس فەقێ قادر.

ئەم تیرە جافە لە پێشمەرگایەتیدا بەشدارییەکی زۆریان هەبووە و لە کارەساتەکانی رەشەکوژیی ئەنفالـدا زیاتر لە پێنج سـەد کەسـیان بێ سەروشـوێنە.. لێرەدا زۆر سوپاسـی ئـەم برادەرانەی خوارەوە دەکەم، کە لەم باسەیدا وەک زانیاری یارمەتییان داوم، ئەگەر ناوێک لەبیرچووبێت، بەش بە حاڵی خۆم داوای لێبوردن دەکەم.

١- کاکە حەمەی ئەحمەد قاسم.
٢- کاک ئازاد محەمەد قادر، یاریدەدەری پزیشکی.
٣- نەجمەدین محەمەد قادر، ئەندازیار.
٤- یونس محەمەد قادر، ئەندازیار.
٥- یونس حوسێن فەقێ قادر، بازرگان.



حەمەی ئەحمەد قاسم



تۆفیق حارس عەزیز فەتاح
١٩١٢-١٩٨٧
مکەیالی
رەش و بۆری



شەهید حوسێنی تۆفیق فارس
١٩٥٠-١٩٧٧

لە تەواوی رووداوە شۆڕشگێڕییەکاندا بەشداری کردووە، هەمیشە لە پەلامارەکاندا وەک فەرماندەیەک لە پێشەوەی پێشمەرگەکانەوە بووە، بە پلەی بەرپرسی هەرێمی حەمرین گەیشتووە تەشەرەفی شەهادەت، ئەمەش یەک دوو بەیت شیعری ئاواتی کورپەی کە بۆ شەهید حوسێنی باوکی وتوویەتی:

**ساڕێژ نابێتەوە زامی دڵم جەستەم پێوە دەتلێتەوە**
**هەموو ساڵێک لەم رۆژەدا برینەکەم دەکولێتەوە**



حاجی محەمەد مارف رەمەزان
مکەیالی



فەقێ حوسێن
شوانکارە



قادر جاف
شوانکارە



حاجی کاکە محەمەد ئەمین
١٩٠٩-١٩٨٤
شوانکارە



حەمەی کەریم فەرەج



حاجی تۆفیقی سەریاسی سەرەوە
شوانکارە



سەعید ناسر
شوانکارە



حاجی فەقێ عەلی
١٩١٦-؟؟؟؟
تیرەی مکەیالی- بەرەبابی شوانکارە

لە ساڵی (١٩١٦) لە ناوچەی گەرمیان لەدایک بووە، لە عەشیرەتی مکەیاڵییە تیرەی (شوانکارە).

پیاوێکی ئایینی و نیشتمانپەروەر بووە، لە سەرەتای (١٩٣٨) پەیوەندی دەکات بە پارتی رزگاری کورد و تاوەکو دامەزراندنی (پارتی دیموکراتی کوردستان) ساڵی ١٩٤٦ وەک کادیرێکی چالاکی ئەو سەردەمەی پارتی کاری کردووە لە ناوچەی گەرمیان و رێگر دەبێت لە خەڵکانی جاف بچنە ریزی حیزبی شیوعی عێراقەوە.

لە سەرەتای ساڵی (١٩٦٠) لە لایەن رژێمەوە دەستگیر دەکرێت لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی ناوچەکە وەک (مستەفا بەگ جاف- حاجی فەقێ محەمەد سەعاتچی- حەیدەر حاجی رۆستەم- حاجی فارس قاڵ قاڵی)، پاش ئازادکردنیان پەیوەندی دەکەن بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە شۆڕشی ئەیلوول و ماوەیەکی زۆر پێشمەرگە بووە.

چەند جارێک زیارەتی (بارزانی نەمر)ی کردووە.

قوربانی زۆری داوە لە پێناو رزگاری نیشتمان لەوانە دوو کوڕی خۆی (شەهید قاسم و شەهید ئازاد) هەروەها دوو برازای (شەهید حەمید و شەهید کەریم)، جگە لەوەش چەندین جار زیندانی کراوە بە کاڵ و منداڵ، هەروەها چەند جارێک تاڵان کراوە، زۆرجاریش ئاوارە و دربەدەر بووە لەگەڵ خانەوادەکەی.

# ناوی روغزایی

لـەوەی دڵنیـام ناوی ئەم تیرەیە لە ناوی کابرایەکـەوە هاتووە بە ناوی (رۆخزاد) ئەم ناوەش ناوێکی گەلێک کۆنە و زۆرتر لە سـەردەمی دەسـەڵاتی ساسـانییەکاندا ئەو جۆرە ناوە باو بووە، وەک: شـێرزاد، فەرەح زاد، میرزاد، روخ زاد.. هتد و عەشـیرەتی (جاف- جاوان- جاپان) کە هەر سێ ناوەکە بە گوێرەی زەمان هەر ناوی عەشـیرەتی جاف بووە و وشـەی (زاد) کە پاشوەندی ناوێکە و ناوەکە بۆ خۆی مورەکەبە ئێمە ئەگەر مانای ئەو ناوانە لە یەکدەینەوە بۆمان دەردەکەوێ پاشوەندی (زاد) ئاماژەیە بۆ نەوعییەت و چۆنییەت.

شێرزاد، بە مانای لە شێرکەوتووە یان لە نەتەوەی شێران.
فەرەح زاد، زادەی شادی و خۆشی.
فەروخ زاد، زادەی بەخت و بوهات و شادمانی.
رخ..ی فارسی یانی هەڵۆیەکی هەرەگەورەی ئەفسانەیی
رخزاد. یانی هەڵۆزادە تەشبیهە بە هەڵۆ و لە هەڵۆبوو و بە گوێرەی زەمان و زمانی کوردی رخزاد بووە بە (روغزاد) و سەرئەنجام روغزایی کە هەمان ناوی (روغزاد)ە کە ئەو ناوە لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی ساسـانیدا زۆر باو بووە و لەبەر ئەوەی هۆزەکانی جاف. دەچنە سـەر جاوان و جاوانەکانیش دەچنەوە سـەر چاپانەکان کە بۆ خۆیان یانی هۆزی (جاپان): بە هێزی هێرشـبەری سـوپای ساسـانییەکان دەژمێردران لەو رووەوە بەڵگە و دیکۆمێنتی جۆراوجۆر بە دەسـتەوەیە، لە شـەڕی نێوان ئیسـلام و سوپای ساساندا (قادسیە) یاریدەدەری فەرماندەی لەشکری ساسانی (جاپان)ی ناو بووە و لە هۆزی جاپانی ئەوسـا جاپان و جاوان و جافی ئێسـتا بووە. و یەکێک لە سەحابەی پەیامبەری خودا دیسان لە هۆزی جاپان بووە و ناسراو بووە بە (جاپان الکوردي).

# روغزایی

ئـەم تیرەیە لـە دوا هیجرەتەکەی عەشـیرەتی جافدا کـە دوای شـەڕە خوێناوییەکەی نێوان ئیمارەتـی ئەردەلان و عەشـیرەتی جافدا روویداوە و لەو شـەڕەدا سـەرۆکی عەشـیرەتی جاف کـوژراوە و چەندیـن تیـرەی جاف بە سـەرۆکایەتی (زایەر بەگی جاف)، جوانـڕۆ بەجێدەهێڵن و دەپەڕنەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی بابان و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و تیرەی روغزایی یەکێک بووە لەو تیرانەی وا لەگەڵ زایەر بەگدا جوانڕۆیان بە جێهێلاوە.

تیرەی روغزایی یەکێکە لە تیرەی ئازا و نەترس و پەلاماردەری ناو هۆزی جاف و لە تەواوی رووداو و شـەڕەکانی جافدا هەمیشـە جێگەی دەسـتیان دیار بووە و بەوەشـەوە رانەوەستاون و جاروبـار لە ناو خودی تیرەکانی جافیشـدا شـەڕ و رووداویان خوڵقانـدووە. لە گەرمیان و لە کوێسـتاندا هەوارگـەی تایبەتمەندی خۆیان هەبـووە. تیرەکانی دیکەی جاف توخنی سـنووریان نەکەوتوون، جارەو باریش لەسەر لەوەڕگا و مەڕومالآت لە نێوان (روغزایی) و تیرەکانی دیکەی جافدا وردە شـەڕ دەقەوما و ئەگەر بە سـەرۆک تیرەکان چارەسەر نەکرایە گرفتارییەکە دەخرایە بەردەسـتی بەگزادەکانـی جاف، کە بە سـەرۆکی تێکڕای جاف دەژمێـردران. بە گوێرەی جەبری زەمان و گۆڕینی شـێوەی ژیان زۆربەی عەشـایەری جاف لە گەرمیان و کوێستان کەوتن و لەو

ناوچە نیشتەجێ بوونە، تیرەی (روغزایی) جێگە و شوێنێکی زۆریان داگیر کرووە لە کوردستانی رۆژهەڵاتــەوە بیگرە بە رێچکەی خێڵدا دەڤەر و ناوچەی زۆریان خســتووتە ژێر رکێفیانەوە، ئەم تیرەیــە بە گوێرەی ســەرژمێرییان یەکێکن لە تیرەگەورەکانی عەشــیرەتی جاف و لە ناوچەکانی جافدا لە زۆربەی زۆریدا هەن، بەڵام برێک لە لادێ و دەڤەریش تایبەتمەندی خۆیانە، ئەمەش ناوی برێک لەو دێهاتانەی وا روغزایی نشینن.

ســێ خڕان، گوڵــە جۆی حاجی تەها، وارگەلارە، ئەحمەد ئاوا، ناوە، ســەر نــاوە، گۆمەزەرد، گامەخەل، ســەرکەلی عەزیزی ئەحمەد، ســەرکەلی حاجی خەسرەو، سەرکەلی مارف، سەی بەیی خــان، رازیانــە، زەینەل، هۆمەر ئاغاجان، گلاڵ کەوە، تولەنی، کەلاری کۆن، قڕژالە، قوچی حەمەی هەواس، ئەسێڵی سەروو، عەلی ئاوا، سەیارە، زەڕایەن، قاڵی حەمە جۆی سەروو، کاژاوی حاجی حەمە ساڵح، هۆزی خواجە، کورە بچووک، بەردەکەر،...

لــە کوردســتانی رۆژهەڵاتیش زۆر لە دێهاتی جاف نشیســن هەن، لە تیــرەی روغزایین، لەم دێهاتانەیــدا هــەن و برێــک لەو دێهاتانەش ســەنەد و قەواڵەیــان بە ناوی ســەرخێڵەکانی تیرەی روغزاییەوە و ئەو قەواڵانە بووتە هۆی کێشــەی سیاســی لە نێوان دەوڵەتی قاجاری و دەوڵەتی رەزا شــاهی لە لایەکەوە و دەوڵەتی عوســمانی دوای دروســتبوونی حکومەتی ئێراقی ١٩٢٠ز، لە لایەکــی دیکــەوە ئەگەر بنواڕینە زۆربەی فەرمان و نامە فەرمییەکانی نێوان وەزارەتی خارجییەی ئەو دوو وڵاتەدا، باسەکان وەک گرفتێک خۆیان دەنوێنن.

تیرەی روغزایی لەم دێهاتانەیدا نیشتەجێن کە بەسەر سنوورەوەن:

میشاو، شەیان، نەرمەلاس، سپی کانی، شیرە، سیرسان...

دێهاتی روغزایی نشــین لە کوردســتانی رۆژهەڵاتدا قادرئاوا، مماسپەر، دەڕەهوان، قالەوازە، وەزمان، دەرەشــێخان، ئیسحاق ئاوا، قامی شەلەن دەڕەتفی، دەرەوبان، بیستانە، کانامەن، ئەمەش برێکی دیکەی ناوی دێهاتی روغزایی نشینن:

تەپە گەروس، قەڵا، کللەران، چیا چەرمووی ســەرەوە، تورەجای حەمەجان، عومەر ئاغاجانی عەلی حەســەن، موانی کۆن، ســێ قڵانی خــوارەوە، زەردەلیکاو، کوردەمیــر، دەرواری خوارەوە، حەســەن کاری، کوردەمیری حەکمەو ئەمین خەرامان، قولە ســووتاو، گەرمکی داویە،بانی خێڵان، دێی بارخ، تورجاری خوارەوە، براوگەل، دەروای سەرەوە، سێ قڵان، سماق، هەوارقوڵە، تەپەسپی، مەمۆیــی مامەداد، مەســۆیی بچووک، مەســۆیی بەرگەچ، ژاڵان، پەڵەوشــک، کونەکۆتــر، کاکەبرا، هەوارگە رەقە، شێخ تەوێڵ، تەپە کەرەم، موانی کاکە حەمە، موانی میرزا، وانی حەمەی عەبدوڵڵا، مچەکوێر، بڵکان، کوڵەجۆ، کانی پانکە، گڵە زەردە، کەلۆشــی، دیوانە، گومەزەر، زەردە، چەمەرگە، دووکان چاڵکە، دوکەروو، کولە جۆ.

تیرەی روغزایی بریتین لە هەشت بەرەبابی سەرەکی، بە گوێرەی زەمان و مەرجەکانی ژیان و زاد و وەڵەد و هەروەها بەرژەوەندی ئابووری و شێوەی ژیان و جوگرافیا و ململانێی سیاسی و (منم منم)یش لە لایەکی دیکەوە، ئەو هەشــت بەرەبابە دابەش بووەتە ســەر چەندین گرووپ و بنەماڵە جۆراوجۆرەکاندا کە تێکڕا لە بنەچەدا هەر هەموویان خزم و خوێشی یەکترن و بە تیرەی روغزایی ناو دەبرێن.

## بەرەبابە سەرەکییەکانی ناو تیرەی روغزایی ئەمانەی خوارەوەن:

١- حەمە جانی. ٢- وەیس وەیس. ٣- شاوەیس. ٤- سمایلی. ٥- سەرحەدی.
٦- زۆراو (شەڕە). ٧- روغزاد. ٨- قادر وەیس.

١- حەمە جانی:
دیارە ئەم بەرەبابە لە رووی ژمارەوە لە بەرەبابەکانی کەی تیرەی روغزایی زیاترن و دوای ئەوەی دەستیان لە گەرمیان و کوێستان هەڵگرت و لەم دێهاتی خوارەوە نیشتەجێ بوونە، سەرجەم لە هەزار ماڵ زیاترن.
(زڕایەن، کوڕەی گەورە، ناحیەی تانجەڕۆ)
(سەیان، مێشاو، سپی کانی، سیرسان- قەزای پێنجوێن)
(هەردەی مارفی سەبیە- سەرکەلەکان- ناحیەی پێواز)
(خەڵوە، قرژاڵە، خەلوەکان، تولەبی، کوڵەجۆ، سیخڕان، هۆمەر مل، چوار شاخ لە ناحیەی سەرقەڵا).

لە شەستەکاندا، کاتێ پێشمەرگە بووم، سەرۆکی ئەم بەرەبابە خوالێخۆشبوو، ئەحمەدی رۆستەم بوو، لە ناو خەڵک و خوا و لێپرسراوانی پێشمەرگەدا قسەی دەڕۆیشت و جارەو بار هێزی عەشایەری کۆدەکردەوە و دەیناردە هانای شەڕەکانی پێشمەرگەوە.

لە سەردەمی کۆچەریشدا، رۆستەمی حەمەی مەحموود، بووە، ئێستاش (مەلا حەسەنی ئەحمەد رۆستەم) دەمچەرمووی ئەم بەرەبابەیە و لە ناو خەڵکیدا و هەروەها سەرتاسەری هۆزی (جاف)دا قسەی بیستراوە و رێزلێگیراوە..

٢- وەیس وەیس:
ئەم بەرەبابەی تیرەی روغزایی لە چوار سەد ماڵ کەمترن، لە م دێهاتانەیدا نیشتەجێ بوونە (لە شارەزوور: موانی حەسەن قادر، موانە کۆن، کانی میل) و لە سەرقەڵا (میل قاسم، هەوارەبەرزە) (ئەحمەداوا، کانی هەنجیر، کانی هەمزە، سێتەلان)، لە تانجەڕۆ: بەڵخە. لە قەرەداخ.
سەرخێڵی ئەم بەرەبابە لە مێژدا (قادری شێخەی ئەلی وەیسی) بووە و بە دوای ئەودا (مەلا عەزیزی کاکی، مەلا محەمەد، ئەحمەد شاسوار، حاجی سلێنا) بوونە، ئێستاش چەند کەسێک لە ناو ئەو بەرەبابەیدا قسە بیسراون وەک: نەجمەدینی کوڕی مەلا محەمەد و مامۆستا عەزیز، حەمە ساڵحی حاجی سلێمان.

٣- شاوەیس:
ئەم بەرەبابە تێکرا شەش سەد خێزان دەبن لەم گوندانە دادەنیشن: لە شارەزوور: (موانە کۆن، سیتەلانی، خواروو، ئاوەکەڵە).. لە ناحیەی پێواز (تەپەگەروس، هومەر ئاغاجان، قەڵای تەپەگەورس،

براوگەل، دەرواری سەروو، کەلەکەران، چیاچەرموو، تورەجار، کوردە میری حەمەی سلێمان). لە شەستەکاندا، حەمەی تۆفیقی حەمەی شاوەیسی پاڵپشتێکی بەهێز بوو بۆ پێشمەرگە و ماڵەکەشی بۆ مێوانداری ئاواڵە بوو... بۆخۆم لە پێشمەرگایەتیدا لەو ماڵەی زۆر حەساومەتەوە، حەمەی تۆفیق پیاو بوو، دەم سپیان، رەسولی حەمەی تۆفیق و حەمە ساڵحی حاجی نەسرەدینە.

٤- سمایەل:

حەوسەد و پەنجا خێزان دەبن، لە شارەزووردا لەم دێهاتەنەی خوارەوە نیشتەجێن: (بنگردی موان، مەحموود خانی خوارەوە، مەحموود خانی سەرەوە) لە دەڤەری قەرەداغدا (بلکان، دووکان، دوکەڕوو، کوڵەجۆ، چالکە، مچە کوێرەی گەورە) لە ناوچەی سەرقەڵادا (هەوارە رەقە، کاکە برا، ژاڵان، کونە کۆتر، پەڵە وشک، تەپی کەرەم، موانی مرزا)

براگەورەیان روبتەنی رۆستەمی حەمەی فەتاحە. و ئەیوب فەتاح یەکێکی کەی دەمڕاستی ئەم بەرەبابەیە.

٥- سەرحەدی:

سەرجەم سەد و سی خێزان دەبن، لەم دێهاتانەی خوارەوە دەژین: لە شارەزوور (دسکەرە، دێی بالول) و لە ناوچەی پێواز (قولیجانی سەرحەد).

ئەم بەرەبابە (سەرحەد) بە براگەورە دەزانن.

٦- زۆراو (شەڕە):

سەرجەم لە دووسەد خێزان زۆرترن، لەم جێگانەدا نیشتەجێن: لە دەڤەری قەرەداخ (کەلوش، مەسۆیی، گۆمەزەرد). لە دەربەندیخان (دیوانە، چەرمەرگە، کانی سارد) لە ناحیەی سەر قەڵا، سێ دێن بە ناوی (زەردەکان) و لە دەڤەری سەنگاو (بانی مورد) و لە زۆربەی شار و شارۆچکەکانی دەوروبەری سلێمانیدا ئەم بەرەبابە ئارەزووی خوێندەواری و بەدەستهێنانی بەڵگەنامەی زانکۆیی بە گوێرەی ژمارەیان لە بەرەبابەکانی کەی تیرەی روغزایی زۆرترە، لە شۆڕشی کورددا بە تەواوی توانایانەوە لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدابوونە. بەندە لەبیرمە ساڵانی ١٩٦٣-١٩٦٤ز لە کەلی پەیکولێدا سەرلق بووم، بنکەی سەرەکیمان لەوێدا بوو (حاجی عەبدوڵڵای کەلۆش) جاروبار سەردانی دەکردین و دەعوەتی دەکردین.

لەو رۆژگارە پڕ لە تراژیدی و برسێتیدا کە دەهات بە جلوبەرگی خاوێن و ریشی تاشراوی دوو سمێڵی پیاوانەی پێکەوتووەوە هەیبەتێکی نیشان دەدا، ئەشهەدو ماڵ و حاڵی بۆ خزمەتی کوردەواری کراوە بوو، وەک (رم) لە کوردایەتیدا راست بوو، لە شەڕەکانیشدا بۆخۆی بەشداری دەکرد، ئەم بەرەبابە شەهیدی سەنگەریان زۆر تێدایە. ئەوڕۆکە براگەورەیان (عەلی کوڕی حاجی عەبدوڵڵا)یە.

٧- روغزاد:
ژمارەی ئەم بەرەبابە دەگەنە شەش سەد خێزان، لە شارەزوور لە (زیڕین جو)دا دەژین.
لــە پیــواز (لە کوردەمیری) و لە ســەنگاو (لە مەســۆیەکاندا) نیشــتەجێن (مەســۆیی بەرگەچ، مەســۆیی حەمەی فەرەج، مەســۆیی ئەحمەد رەحیم). لە سەر قەڵا (هەوار قوڵە، سماق، تەپەسپی، بەرودار) دەم سپییان، موسای عیسای خەسرەو بووە، ئێستا رۆستەمی حاجی ئەحمەدە، لە کۆنا میر ئەحمەد ئەولای خەسرەوە دیوەخاندار بووە.

٨- قادر وەیسی:
سەرژمێری تەواو نەکراون، بەڵام ئەم بەرەبابە لە دوو سەد خێزان کەمتر نین، لەم گوندانەدا دەژین: لە شارەزوور (کاژاو). لە پێواز (خاڵە مەردو، زەینەل، رازیانە، سەری باینجان)، براگەورەی ئەوڕۆیــان قــادری حاجی حەمە ســاڵحی حاجی قــادرە، ئەم بەرەبابە لەســەر حەمــە جانییەکان دەژمێردرێن. زۆر لە خزمانی تیرەی روغزایی پەیوەندییان پێوە کردووم و لە بارەی تیرەکەیانەوە زانیارییــان بۆ ناردووم، ئەو هاوکارییانە نیشــانەی دڵســۆزییانە، یەکــەم تیرەکەیان، هەروەها بۆ مێــژووی هــۆزی جاف، کە بەشــێکی گرنگی ئەم میللەتەن، جێگەی داخە تابــە ئەمڕۆ زۆر لە تیرە و عەشــایەری ئەم میللەتە مێژوویەکی راســتەقینەی نووســراوی بۆ نەنووســراوە، ئەگەر لێرەو لەوێش شــتێک نووسرابێت زۆرتر غەیرە کورد نووسیویەتی و لە واقیعیەتی مێژووییەوە دوورە، بــە ئــارەزووی خۆیان زۆربەی زۆری رەگــەزی هۆزە کوردەکانیان بردووتەوە ســەر عارەب و کردوونیان بە (ســەید)، یا بە عەجەم و تورک و تەتەر. قەڵەم بە دەســت دوژمنانەوە بووە، راستە کــورد دەڵێــت: پیاو لە ماڵ نەبێت ژنی بە شــوو دەدەن. ئێمەش تا بە ئەمڕۆ نەمانتوانیوە مێژووی تازە و کۆنی میللەتەکەمان بنووســینەوە و لەو هەڵە زەقانەی دەرحەق بە گەلەکەمان کراون بژار و خاوێنی بکەینەوە.
من نازانم کێ بەرپرســیارە؟ هەرکەســێ بێــت کاتی ئەوە هاتووە مێژووی راســتەقینەی ئەم میللەتە چەوساوەی هەزاران ساڵە بنووسرێتەوە، ئەگەر تۆ مێژووی راستەقینەی هۆزەکەی خۆت بنووســیتەوە، ئەگەر من مێژووی راســتەقینەی هۆزەکەی خۆم بنووســم، ئەویش دەست لەسەر دەســت دانانــێ و دەکەوێتــە تەقەڵلای مێژووی تیرە و هۆزەکەی خۆی. ئــەو دەم دەبینە خاوەنی بنەمایەکــی راســتەقینەی مێژوویــی. ئەم پرۆژەیە هەر دەبێــت بکرێت کەی؟ نازانــم.. لێبگەڕێ با بکرێت ســبەی چاوساقان بە شــێوەیەکی ئەکادیمییانە پاک و باسی دەکەن، بژارێکی لۆژیکییانەی پابەنــدی دیکۆمێنتــی عەقلانی یــان دیکۆمێنتی (مەلموس) کۆ دەبێتەوە و دووبارە بە شــێوەیەکی راستەقینە دوور لە هەوا و هەوەس و دەمارگرژی خێڵەکی یان مەزهەبی یان ڕەگەزایەتی مێژوو دەنووسینەوە...

ئــەوەی کە خوێنتەوە و شــاردەی تیــرەی (روغزایی) جافە، بەڵام برێک لــە خوێنەوارانی ئەم تیرەیە نووســراوی جۆراوجۆریان لە بارەی تیرەی روغزایی بۆ ناردووم، بەندە هەر وەک خۆی دەیکەمە پاشــبەندی ئەم نووســینە، ئەگەر گلەیی و گازاندەیەک لەم رووەوە کرا نووســەرەکەی بەرپرسیارە و تا رادەیەکیش بەندە.



روغزایی:
فەتاح ڕۆستەم محەمەد فەتاح



ڕۆستەمی حەمەی فەتاح





لە راستەوە:
حاجی حەمەجانی حاجی تەها- مەلا مەحموودی ئەحمەدی شاسوار- حەمە تۆفیقی شاوەیس




مەلا مەحموودی ئەحمەد شاوەیس ١٩٢٥-١٩٧٩ ئەحمەد رۆستەم ١٩١٥-١٩٨٢ حەمە سەعی حەمە عەلی ١٩٢١-٢٠٠٣



فەتاحی لالە ڕۆستەم
١٩٨٣-١٩٣٢
لە تیرەی روغزادی



ڕۆستەمی حەمەی فەتاح
١٩٦٧-١٨٩٥
لە تیرەی روغزادی



حەسەن قادر زولفەقار



مەلا محەمەدی ئەحمەد شاسوار
١٩٢٨-١٩٢٥



مەلا عەزیزی کاکی حەسەن
١٩٩٧-١٩٣٣



حاجی حەمە فەرجی ئەحمەدی مەنسوور
١٩٩٤-١٩٠٨



عبدالقادر مرادخان
١٩٩٢-١٩١٧



عەبدوڵڵای فەقێ محەمەد
١٩٨٦-١٩٢٥



شەهید حەمە کەریم ئەحمەد مەحموود موراد
ناسراو بە شاهۆ



حوسێن مرادخان ١٨٧٠-١٩٦٥



ئەم وێنەیە چەندین سەرۆک عەشیرەت و سەر تیرەی کوردی ئێرانی تیادایە سێیەمین کەسی سەلمان خانی روغزایی یەکێکە لە سەرۆک تیرەی روغزایی



حاجی محەمەدی مەحموودی
عەزیز روغزایی
١٩٢٠-١٩٧٩



حاجی نەجم فەتاح عوسمان
١٩٢٦-١٩٨٣
تیرەی روغزایی



سەعید محەمەد مەحموود
١٩٤٩-١٩٩١
روغزایی



عەبولکەریم حەمە عەلی
روغزایی
١٩٢٥-١٩٧٨

## بڕێک لە کەسایەتییەکانی ئەوڕۆی روغزایی

١- مەلا حەسەنی ئەحمەدی رۆستەم
٢- سەرحەدی خەلیفە یونس
٣- مەلا سەبار
٤- ئەیوب فەتاح رۆستەم
٥- حەمە ساڵح سلێمان
٦- رۆسەمی حاجی ئەحمەد
٧- رەسووڵی حەمەی تۆفیق
٨- حەمە ساڵحی حاجی نەسرین

## چەند کەسایەتییەکی تیرەی روغزایی

١- ساڵح کاکەخان ١٨٥٠-١٩٢٨
٢- رۆبیتەن کاکە خان
٣- حەمەی فەتاح
٤- لالە برای مچە کوێر
٥- حاجی محەمەد فەرەج ١٩١٩-١٩٩٦
٦- حاجی محەمە شەریفی کوڵەجۆ ١٩١٦-١٩٨٩
٧- کاکە حەمەی ژاڵە
٨- حاجی حەمەساڵح حوسێن
٩- فەتاح رۆستەم محەمەد
١٠- بارام ئەحمەد خدر
١١- فەتاح حەمەی فەتاح
١٢- عەزیز سەلمان
١٣- حەمەی شامار
١٤- قەیتوولی مەردان
١٥- حاجی مەحموودی کوڵەجۆ

هۆزی روغزایی
- کامەرانی خوسرەو ١٩١٤
- قەیتەرانی خوسرەو
- هەیەری عەزیزی قەیتوول ١٩٢٠

**شەهیدانی شۆڕش:**
١- شەهید ئەبوبەکری حاجی مووسا
٢- شەهید عەزیزی حاجی رۆستەم
٣- شەهید حەمە شەریف حاجی ئەحمەدی روغزایی
٤- شەهید ئەحمەدی محەمەدی کامەران
٥- شەهید عەزیزی حەمە سەعی هادی
٦- شەهید عومەر عەلی عەبدولقادر
٧- شەهید حەمەڕەشید ئەحمەد ئەمین

روغزایی
میر ئەحمەدی ئەولای خەسرەو
موراد خان
ئەمیرخان
فەتاح موراد خان
ئەحمەدی فەتاح
عەلی موراد خان
مەحموودی موراد خان
حەمە کەریمی ئەحمەدی موراد خان
***

عەلی ئەمیر خان ١٨٨٧-١٩٦٠
محەمەدی ئەمیر خان
حوسێن موراد خان ١٨٧٠-١٩٦٥ز (پیاوێکی دیاری دیوەخاندار بووە)
حەسەن موراد خان
عەبدولقادر حوسێن ١٩١٧-١٩٩٢
عەبدوڵڵا حوسێن ١٩١٩- ١٩٨٥ز
***

نەجمەدین مەلا محەمەد

# (هۆزی چکنی)

ئەم عەشیرەتە یەکێکن لە هۆزە گەورەکانی کورد و لە درەنگ زەمانەوە دەسەڵات و جێگە و شوێنی خۆیان هەبووە. لە رووداوە مێژووییەکاندا حیسابی تایبەتییان بۆ کراوە و رۆڵی تایبەتییان نوواندووە، لە پێش ئەوەی باس لە رۆڵ و دەوری ئەم عەشیرەتە بکەین با لە ناوەکەی بدوێین:

ناوی ئەم عەشیرەتە دێرینە وەک زۆربەی ناوی عەشیرەت و هۆزەکانی دیکە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. ناوی (چەکەنی، چوکنی، شا جەنگیزی، چنگی)

تەواوی ئەو ناوانە بەم عەشیرەتە وتراوە، هۆی گۆڕانکاری ناوی زۆربەی عەشیرەتە کوردەکان دەگەڕێتەوە بۆ هۆی زمانەوانی، وەک زانراوە بە درێژایی هەشت سەد ساڵ، یان هەزار ساڵ هۆزە کوردەکان لە ژێر فەرمانی دەسەڵاتدارانی گەورەی تورک و عەجەم و عارەبدا بوونە و کاربەدەستانی ئەو دەسەڵاتانە لە نامەکانیاندا، لە پەیوەندییەکانیاندا یان فەرامێن و رووداوەکاندا بە گوێرەی زمانی خۆیان وشە و واژە و ناوی کوردییان بە زماندا هاتووە و ئەو نەتوانینە بە هەڵە بە زمان هێنانە بووەتە هۆی گۆڕانکاری زۆر لە ناوەکان، بۆ نموونە لە ناو هۆزی جافدا ناوی زۆر لە تیرەکان لەو نامە نووسراوانەدا گۆڕاوە وەک (تاوگۆزی، بووەتە تاوجوزی، یان سەدانی، بووە بە زیائودینی، گەڵاڵی- جەلالی. هتد).

## بەشێک لە مێژووی چنگی

لە ناو ئەم هۆزەدا پیاوانی ناودار و گەورەیان زۆر تیادایە، لەبەر دەمڕاستی و ئازایەتی ئەم عەشیرەتە پەیوەستە تووشی رووداو و توندوتیژی بوونەتەوە و دەسەڵاتدارانی گەورە جارە و بار دەستدرێژییان کردۆتە سەر ماڵ و موڵک و حاڵیان، ئەو عەشیرەتە بێ دەنگ نەبوونە و بە گوێرەی توانای خۆیان بەرهەڵستی پەلامارەکانیان کردووە، لەسەردەمی دەسەڵاتی (شا تەهماسوبی سەفەوی ٩٣٠-٩٨٤ك) ئەم عەشیرەتە دەکەونە بەر شاڵاوی ئەو شاخوێنڕێژە، لەبەر ئەوەی ئەم عەشیرەتە کوردە لە کوردەکانی خوراسان بوونە و زۆرتر لە سنووری رۆژهەڵاتەوە نزیکتر بوونە پەنا دەبەنە (هەرات) کە ئەو دەم فەرمانڕەوای ئەو دەڤەرە (قوزاق خانی تەکولو) بووە و لە شاتەهماسوب نیگەران و نارەحەت بووە، پەنایان دەدا و رێزوحورمەتێکی زۆریان لێدەگرێت و لە دەڤەری (غەجەرستان)دا کەوتوونەتە نێوان هەرات و کابولی ئێستاوە، لەوێدا نیشتەجێیان دەکا و ماڵ و موڵکی ئەو ناوچەیان پێ دەسپێرێت.

شا تەهماسوب، کە دی هۆزی (چکنی) وا رێزلێگیراوە لەو وڵاتەیدا نیشتەجێبوونە، کەوتە دڵدانەوەیان و بە پێی فەرمانێکی شاهی فەرمانڕەوایی بۆ گێڕانەوە بە ناوی ئەمیرێکیان بە ناوی (بوداق بەگی چگنی). بوداق بەگ کەوتە تەقەلای گەڕانەوەی عەشیرەتەکەی بۆ خوراسان و نێوان دەرباری سەفەوی و عەشیرەتی چگنی هەتاکو دوای نەمانی (تەهماسوب)یش هەر لە پتەویدا بووە. (کە شا عەباسی سەفەوی ٩٨٩-١٠٣٨ك) دێتە سەر کار، ئوزبەگەکان پەلاماری خوراسان و سنوورەکان دەدەن، بە سەرۆکایەتی (عەبدولموئمین خانی ئوزبەگ ١٠٠١ك) بوداق بەگ و عەشیرەتی چگنی مەردانە و ئازایانە بەرگری لەو پەلامارە دەکەن و شا عەباس نازناوی (ئەمیرولئومەرا) بە بوداق بەگ دەدا و پێنج لە کوڕەکانی لە سوپا و لەشکری سەفەویدا دەکاتە فەرماندە و لێپرسراو.

بوداق بەگ، هاوزەمانی میر شەرەف خانی بدلیسی بووە ١٠٠٥ك، لەو کاتەیدا بوداق خاوەنی (ئەمیرولئومەرا)ی بووە.

دەسەڵاتی عەشیرەتی چگنی هەروا بەردەوام بووە و ئومەرای بەناوبانگیان تیا هەڵکەوتووە، وەک:

١- عاشور خانی چگنی، کە کراوەتە حاکمی (مەرو) و (شهیجان).
٢- عەلی سوڵتان خانی چگنی، کە قەڵاداری (وان) بووە و لە لایەن (سوڵتان سلێمان قانونی ٩٢٧-٩٧٤ك) کە سوڵتانی ئەو دەمە بووە ئەو قەڵایە گەمارۆ دراوە و سەرەنجام ئەو قەڵایە دەگرێت و فەرماندەی قەڵاکەش دەستگیر دەکات (٩٥٣ك).
٣- محەمەد سوڵتان چگنی حاکمی قەرەباغ بووە.
ئەم مێژوو و سەرگوزەشتەی عەشیرەتی (چگنی)یە لەم سەرچاوانەدا نووسراوە.

١- تأريخ الدول والامارات الكوردية، ص٤٢٩، ٤٣٠
٢- شەرەفنامەی بەدلیسی. ل٤٢٩-٤٣١.
٣- مشاهير الكورد، ج٢، ل٧٣-١٥٤-١٥٥.

وەک زانراوە رووداو لەناو عەشیرەتەکاندا زۆر روودەدات سا رووداوی گەورە کە دووچاری تێکـڕای هۆزەکە دەبێـت یان رووداوی ناوخۆیی، کە دەبێتە هۆی کـۆچ و پەرتەوازەی بڕێک لەو هۆزە و لە دەڤەر و ناوچەی خۆیان دوور دەکەونەوە. جاف وەک عەشیرەت چەندین جار تووشی پەلامـاری گـەورە و کۆچـی نیوە تێکڕایی هاتـووە و دەڤەری خۆیان بەجێهێڵاوە. ئێسـتاش زۆر لە تیرەگانی جاف پەرتەوازەی دەڤەری زۆر دوور لە وڵات بوونە و گەیشـتوونەتە کوردسـتانی باکوور، یان کوردسـتانی رۆژهەڵات، یان کەلار دەشـتی باکووری ئێران یان هەر لە کوردستانی باشووردا زۆر لە جاف کەوتوونەتە دەڤەری بادینان یان هەولێر..

بێ شـک لە ناو عەشـیرەتی (چنگی)دا ئەو جۆرە کۆچانە روویداوە، یان رووداوی تایبەت لە ناویاندا قەوماوە و لە خوراسانەوە گەڕاونەتەوە بۆ کوردستان و نیشتەجێ بوونە. کەی و چۆن؟ ئەمەیـان هیـچ دیکۆمێنت و بەڵگەیەکمان بە وردی بە دەسـتەوە نییە. بەڵام لـەوەی دەڕوا کاتێک عەلی سـوڵتان خانی چنگی دەکرێتە فەرماندەی (قەڵای وان) زۆر لە عەشـیرەتەکەی لەگەڵ خۆیدا دەگەڕێنێتەوە بۆ کوردسـتان و بە گوێرەی زەمان بڕێکیان تێکەڵ بە عەشـیرەتی جاف دەبن، بە تایبەت لەگەڵ تیرەی رووغزاییدا تێکەڵاو دەبن ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ٣٥٠ ساڵ لەمەوبەر و تیرەی چنگـی ئـەورۆ بە تیرەیەکی موعتەبـەری جاف دەناسـرێت و لە تەواوی رووداوەکاندا قسـەیان بیسراوە و خاوەنی بڕیارن.

چنگی زەمانێکە لەگەڵ تیرەی روغزاییدا تێکەڵاون و لە گەرمیان و کوێسـتاندا خێڵیان تێکەڵاو بووە و لە شەڕەکانیشـدا هەر لەسـەر روغزایی ژمێردراون. داستان و مەلحەمەی (مەیکە چنگی) بەلای زۆر کەسەوە هێشتا وێردی سەر زمانە، ئازایەتی و سوارکاری (مەیکە) لە سەردەمی خۆیدا دوور و نزیک باس دەکرا، تا والی بەغدا بڕیاری لەناوبردنی دەدا و سوارەی حەمیدی بۆ دەنێرێت و بە داخەوە غافڵگیری دەکەن و وەک دەیگێڕنەوە ئەسـپەکەی بەکوشـتی داوە. مەیکە وا غافڵگیر کـراوە هـەر ئەوەندەی بۆ کراوە بە ئەسـپ بـۆی دەرچێت، بەڵام لە بەختی مەیکەدا ئەسـپەکەی دەیباتە ناوەڕاستی چەکدارەکانەوە و دەکوژرێت.

### لە ناو (چنگی)دا پیاوی ئازای زۆریان تیا هەڵکەوتووە وەک:

١- سڵە چنگی
٢- حەمەی شیرین
ئەم تیرەیە لە ساڵی ١٩٢٢ز لە دێی (دەمرکان، عارف ئاوا- فەرەج ئاوا)دا نیشتەجێ بوونە..

## کەسایەتییەکانی ئەوسای چنگی

١- مەیکە چنگی
٢- سڵە چنگی
٣- حەمەی شیرین
٤- رەئووفی مەحموودی حەیدەر
٥- شەفیع رەشید حەیدەر
٦- خەلیفە حەسەن کاکە مەندی حەمە خان
٧- حاجی عەول دەروێش ئەحمەد مەنسوور
٨- فەقێ ئەحمەد عەبدولکەریم

## کەسایەتییەکانی ئەوڕۆی تیرەی چنگی

١- مستەفا دەمرکان
٢- لەتیف دەمرکان
٣- مامۆستا مەحموود عەبدولڕەحمان حاجی ئەحمەد
٤- ساڵحی ئەحمەدی شەریف
٥- حاجی عەلی خەلیفە حەسەنی کاکەمەند
٦- سابیر حەوت برا نەویجان
٧- حاجی محەمەدی حاجی مەلا
٨- حەمە سەعید دەمرکانی

ئەوڕۆ براگەورەی قسە بیسراوی ئەم تیرەیە (عومەر حاجی محەمەد) لە دێی دەمرکان نیشتەجێیە و بە عومەر دەمرکانی ناسراوە. زۆر سوپاسی کاک حەمە سەعی دەمرکانی دەکەم بە دڵسۆزییەوە هاوکاری کردووم و بڕێک زانیاری پێ گەیاندم ماڵی ئاوا..



حاجی محەمەد حەیەر ساڵح چگنی
١٩٨٩-١٩٠٤



شەفیع رەشید هەیەر
١٩٧٦-١٩٢٢



حاجی رەئوف مەحموود حەیدەر چگنی
١٩١٢-١٩٩١



خەلیفە حەسەن کاکە مەند حەمە خان چگنی

# تەرخانی

تیــرەی تەرخانــی، ئەگــەر بەگوێــرەی قۆناغەکانی مێژوو لێــی بدوێین، یەکێکە لــە تیرە تازە ســەربەخۆکانی ناو هۆزی جاف. ئەم تیرەیە کە ئەورۆ تیرەیەکی ســەربەخۆ و دیاری ناو هۆزی جافن، زۆر نییە لە تیرە سەرەکییەکانی (روغزایی) جویێ بوونەتەوە، تا دوادوایی سەدەی نۆزدەهەم هەر بە روغزایی ژمێردراون. من وا دەزانم یەکێکن لە هۆ ســەرەکییەکانی جویێبوونەوەی چەندین بەرەباب لە (روغزایی) ئاکامی شــەڕی (قەڵای خاو) بوو بێت. ئەو شــەڕە لە نێوان تیرەی روغزایی لە لایەکەوە و تیرەکانی (شــاتری، هاروونی، کەماڵەیی، یوســوحانی، نەژوینی، سەرکانی و وەلی) لە لایەکی ترەوە..

لەو شــەڕەدا کوشــتارێکی زۆر دەکرێت. حەوت کەس لە روغزایی و پەنجا و حەوت پیاو و دوو ژن لەو تیرانە کوژراون. بە وردی نەزانراوە شــەڕی (قەڵای خاو) لە چی ســاڵێکدا روویداوە، بەڵام بە تەئکید لە ۱۹۰۰ز بەولاوەتر نەبووە.

دیارە ئەو شــەڕە خوێناوی بووە بە هۆی ناکۆکی ناو بەرەبابەکانی تیرەی روغزایی و وردە وردە ناکۆکییەکە دەبێتە جیابوونەوەی خێڵ و هەوارگە گوێزانەوە و لە یەک دوورکەوتن.

مەحموود پاشــای جاف، ئەو دەم ســەرۆکی سەرتاســەری تیرەکانی جاف بووە و لە بارەی ئەو شەڕە بڕیاری دەرکردووە و بە توانایەوە کۆشاوە ئەو ناکۆکییە کۆتایی پێ بهێنێت. وا دیارە پەرچەمداری شــەڕی (قەڵای خــاو)، (مەحموود نادری زۆڕاو) بووە، مەحموود پاشــا، مەحموود نادری زۆڕاو دەگرێت و دەیخاتە کۆت و بەندەوە، داوای (حەوت خوێن)ی لێ دەکات و (مەحموود نادری زۆڕاو) سەرەتا ناڕواتە ژێر بژاردنی حەوت خوێنەکە، سەرنجام بە فەرمانی مەحوود پاشا رازی دەبێت و (سێ ژن و پارەی خوێنی چوار پیاو) دەبژێرێت...

کچێکی خۆی کە ناوی (خورشــیدە) بووە، بە حەمەمینی ســەلیمە ســووری هاروونی دەدات، کچی دووەمی بە حەمە سووری کەماڵەیی کە ناوی (خانزاد) بووە دەدات. ژنی سێیەم کە برازای بووە دەیدا بە وەلییەکان. دیارە شەڕی (قەڵای خاو) و چۆنیەتی بژاردنی خوێن بە هاوکاریکردن لە

ناو خزمە روغزاییەکاندا بە باشی ئەنجام نەدراوە و چەندین کەسی ناسراوی ناو تیرەی روغزایی لــە خزمانیان پــەڕ دەگرن و جویێ دەبنەوە، وەک هۆزی (ئەلک). هۆزی (حەســەنی) دەڵێ: هۆزی ئالیجان- بەشــێک لە هۆزی زۆراو- ئەو ناوانە هەر یەکەیان دەمڕاســتی زەمانی خۆیان بوونە و خۆیان بە(کیم سەنیک) زانیوە و زۆر ناکێشێ بڕێکی دیکەی روغزایی جویێ دەبنەوە وەک:

- خێڵی حەسەنی حەمە خانی قادری زۆراو.
- عەبدولقادری مەحموود خانی مورادی زۆراو.
- فەقێ محەمەدی حەمە وەیسی زۆراو.
- خێڵی سلێمان کامەران.
- ساڵحی ئەلی رەشەک
- مەحموودی نادری زۆراو.

## ناوی تەرخانی:

ئیــدی شــەڕێکی دی لــە ناو خودی تیــرەی روغزاییــدا روودەدات، بە شــەڕی (داری قەڵان) ناســراوە. کــە دەکەوێتە نێو دۆڵی شــارەزوور، ئەو شــەڕە جیابوونەوەی بڕێکــی زۆر لە تیرەی روغزایی یەکلایی دەکاتەوە..

مەحموود پاشای جاف، بۆی دەردەکەوێت ئەو بەرەبابانە لە یەکەوە دوورن، باشترە لە لایەکی دیکــەوە نایەوێــت ئەو پیاو ناودارانە بەگوێرەی زەمان لــە ناو بەقیەی تیرەکانی جافدا بتوێنەوە و وەجاخیان کوێرەوە بێت، پاڵپشــتییان دەکا و دڵیان دەداتەوە، کەوا لە بڕێک لاوە لەگەڵ تیرەکانی دیکەی جافدا جیاوازن و بە چاوێکی دیکەوە تێیان دەڕوانێت.

لە سەرانە و باجی ساڵانە دەیانبەخشێت و بە گوێرەی وتە و فەرمانی پاشای جاف، تەنیا ئەو فەرمانەیان بۆ تەرخان کراوە، ئەم کۆمەڵە بەخشــراوە بە تەرخانییەکان دەناســرێن و سەرئەنجام تیرەی تەرخانی و ئەو تیرەی هێندە دەمڕاســت و پیاوی پیاوانەیان تیا هەڵکەوتووبوو، بۆ نموونە ســەرۆکی وەختــی هۆزی جــاف، کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشــای جاف کــە بکاتە برازای مەحموود پاشــای جاف ژنی لێهێناون و لەو ژن هێنانە شــاعیری ناســراو (مینە جاف و حەبیبە خانم) دێنە دنیاوە، کوڕ و کوڕە زای ئەو دوو زاتە لە ناو بەگزادەکانی جافدا ئەوڕۆکە زۆرن..

## پیاوە ناسراو و دیارەکانی ناو تیرەی تەرخانی

١- مەحموود نادری زۆراو
٢- حەسەنی حەمە کانی قادری زۆراو
٣- شاسواری ئەلک
٤- محەمەدی حەمە وەیس
٥- سلێمانی کامەرانی
٦- ساڵحی ئەلی رەشەک
٧- دادود رەسوڵی حەمە جان
٨- عەبدولکەریمی حەمە جان
٩- هەواسی رەسولی حەمەجان
١٠- فەقێ محەمەدی هەواس
١١- خەسرەوی رەسولی حەمەجان
١٢- حاجی حەمەساڵحی شامان
١٣- حاجی رەسوڵی رەشیدی سوارە
١٤- حاجی دارای رەشیدی سوارە
١٥- حەمە سەعیدی عەزیزی موراد وەیس
١٦- حاجی حەمەسەعیدی حەمە ساڵح
١٧- حاجی حەمە ئەمینی بەکرە شەل
١٨- فەتاحی ئەحەدی هۆمەر
١٩- حاجی رەفعەت
٢٠- حاجی محەمەدی ئالیجان
٢١- حەمەی شاسوار
٢٢- مەجیدی حەمەلاو
٢٣- عەبدولکەریمی حەمەی شاسوار
٢٤- دەروێش حەسەن
٢٥- قادر وەیسی
٢٦- حەمەی قادر میرزا
٢٧- حەمە ساڵحی حاجی سلێمان
٢٨- ئەحمەدی حاجی حەمە رەشید
٢٩- محەمەد ئەمینی حەمە هەسەن

٣٠- ئەحمەدی حاجی حەمە رەشید

ئـەم تیرەیە وەک تیرەکانـی کەی جاف، کۆچەر بوونە، بەڵام لە دوای (١٩٤٠)ەوە وردە وردە نیشـتەجێ بوونە، چەند خێڵێکیان (خێڵی حاجی رەسوڵی تەرخانی) تا ئەم دوا دواییانەش (١٩٨٠)، لە کۆچکردندا بەردەوام بوون.. لە کوێستاندا هەوارگەکانیان لە شلێر و ناوخوان و لەودیویشەوە مەریوان تا دەوروبەری سـەقز و ئەولاتریش دەڕۆیشـتن، کە نیشـتەجێ بوونە لە شـارەزوور و گەرمیان لەم دێهاتانەدا نیشتەجێ بوون:

دێی حاجی مەحموودی کانی ماران
خڕی کەرکوڵە
تەپە سەوز
گوبان
تەختە نەختە
شێخ تەویل
بێستانە
بەکر بایەف
چەمی شۆر
سێ گردان
ملە سوور
زەردی حەمە
زەردی قادر
پیازە جار
درۆزنەی حەمە شاسوار
درۆزنەی مەجیدی حەمەلاو
فەتاح هۆمەر
بەکرە شەل
سەی چەژنی
وەلی هەیەر
حەسیرە
میلقاسم

**لە شارەزوور:**
کانی کەوە
یەخشی
داری قەلان
کانی توو
زەڕایەن
زەکەرەش

له دۆڵی قەرەداغدا:
هۆمەر قەلا
سەروچاوه
بەڵخه
ئاوه سپی
عەلی یاوه
دیوانه



حاجی فارس عەزیز شاسوار ١٩١٠-٢٠٠٠
ئەبوبەکری ئەکبەری حاجی فارس



حاجی سەعیدی عەولقادر
١٩١٥-٢٠٠٨



فەقێ محەمەدی هەواس
سوپاسی ئەبوبەکری حاجی فارس و نەجمەدینی فەقێ محەمەدی هەواس دەکەم لە بارەی برێک زانیاری یارمەتیان دام، هەروەها یارمەتییەکانی کاکە خانی حاجی دارا، لە رووی زانیاریەوە شایانی سوپاسە.



سەردار فەقێ محەمەد
١٩٩٤-١٩٥٤



ڕەفیقساڵح قاد
١٩٨٠-١٩٥٣



عەبدوڵلای حەمە سەعی
١٩٦٧-١٩٤٣



مەحموود حاجی محەمەد حەسەن
١٩٣٥-١٩٨٨
تەرخانی



حاجی محەمەدی حەسەنی باوەیس
١٩١٥-١٩٧٦



حاجی محەمەدی عەولقادری تەرخانی
١٩١٧-٢٠٠٦



حاجی دارای تەرخانی
١٩٠٨-١٩٨٠

حاجـی دارای رەشـیدی سـوارە یەکێـک بـووە لە پیـاوە ناودارەکانی تیرەی تەرخانی هۆزی جاف خاوەن نـان و خـوان و دیوەخـان بـووە، لـە زۆربەی کێشـە کۆمەڵایەتییەکاندا قسـە لێ بیسراو بووە و لە ناو تیرەی تەرخانیـدا ریـز و تایبەتمەنـدی خۆی هەبـووە، کاتێک (یانەی سـەرکەوتن) لە بەغدا دروست کرا لە ناو هۆزی ناسـراوانای کورددا کەوتنە پیتـاک گێرکردنەوە بۆ ئەو یانەیە، حاجی دارای تەرخانی پەنجا دیناری ئەو دەمەی پێشکەش بەو یانە کردووە، کە ئەو یانەیە لە راستییەکەیدا بە مەکۆی ئازادیخوازانی کورد دەژمێردرا پەنجا دیناری ساڵانی چلەکان پارەیەکی کەم نەبووە.



حەمە خانی حاجی دارا
١٩٥٢-٢٠٠٨

حەمە خان پیاوێکی ئازا و لێهاتوو بوو پەیوەستە میواندار و لەگەڵ خەڵکیدا تێکەڵاو بوو لە لایەن تیرۆرستانەوە شەهید کرا.



حاجی رەسولی تەرخانی
١٩٦-١٩٩١

حاجی رەسـول یەکێکە لەو جافانەی تا مرد دەسـتبەرداری کۆچ و خێڵداری نەبوو، لە بیرمە حەفتاکان لە سـنوور هاتبـووە دیوی ئێران، دەوڵەت و ژاندارم دەسـتگیریان کردبوو، گرفتاریان بـۆ دروسـت کردبوو، هەرچۆنێک بـوو هەواڵی گەیاندە خوالێخۆشـبوو سـەردار جاف، ئەویش خوالێخۆشـبوو سـالار جافی برای ناردبووە سەقز و حاجی رەسولی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ تاران، مـن ئـەو دەم تازە زانکۆم تەواو کردبوو، ئێوارەیەک بە نـاو تارانیدا بە ئۆتۆمبێل گەیاندمە ژوور شـار و عەشـاماتی ناو تارانی، بەلایەوە سـەیر بوو، ئەو پیاوە قسەی خۆشی دەکرد، نموونەیەک بوو لە جافی راستەقینە.

# تیرەی پشتماڵە

بێگومان تیرەی (پشـــتماڵە) بە گوێرەی کۆنی و قووڵایی مێژوویی تیرەکانی کەی جاف نین و ئەم تیرەیە کە ئەورۆ بە تیرەیەکی دیار و ناســراوی ناو جاف دەژمێردرێن لە مێژدا هەڵبژاردەی ناو تەواوی هۆزی جاف بوونە و دانە دانە بە ناو لە ناو تەک تەکی تیرەکانی جافدا لەبەر ئازاییەوە دەمڕاســتی دەستنیشــان کراون و پەیوەســتە وەکو هێزێکی هەمیشــە ئامادە و چاپوک سوار رم بەدەســت پــا لە ئورزەنگی بوونە و پەیوەســتە وەکو ســەری ڕم لە پێش تــەواوی هێزی جافەوە بوونە..

ئەم چاپک ســوارانە وەنەبێت هەر بۆ دوژمنی دەرەکی شمشــێر وەشێن بووبن، نەخێر. ئەگەر کۆمەڵێک تیرەیەک دژ بە یاســاکانی خێڵ یا کلتوورێکی دامەزراوی هۆز، ناڕەواییان کردبێت ئەو هێزەیان بۆ ڕۆیشتووە و ئەو هێزە لە پاشا و میری جاف دوور نەکەوتوونەتەوە پەیوەستە لێیەوە نزیک و دەم ســپییەکەیان بە لای ســەرۆکی گشــتی هۆزی جافەوە قســە بڕۆ و دەمڕاست سەیر کراون..

ئەو مەنزڵە و مەقامە کارێکی وایکردووە لە ناو تەواوی تیرەکانی جافدا حیساب و چەکەریان لــێ کرێــت و لە زۆر ڕووداوەکاندا بۆ ئاســانکاری پەنایان پێ دەبردن و پاشــا و میری گەورەی جافیش قسەی لێیان دەبیست.

دەسەلاتی خێڵ و هۆزە گەورەکانی کورد هەر یەکە بە گوێرەی قەبارە و ژمارەی هێزی چەکدار ناوچەی جوگرافیایی و هەروەها دەوڵەمەندیی ئەو خێڵە حیسابی بۆ دەکرا. هۆزێکی گەورەی وەک جاف لە ناوچە و دەڤەرێکی بەربڵاوی کوردستاندا دەژین و ئەوی ناڕەوایی و دەخەڵی و گەندەڵی دوو دەســەڵاتی زلهێزی وەک ئێران و عوســمانی بە شــێوەی جۆراوجۆر چەوســاندوویانەتەوە، دوای دروستبوونی دەوڵەتی تازە پا گرتووی ئێراق و دەستنیشانکردنی سنوور لە نێوان ئێران و ئێراقدا ئیتر فشار و تەوژمێکی زۆرتر کەوتووەتە سەر ئەم هۆزە ڕەوەندە کە بە گوێرەی سەدان ساڵ لە گەرمیان و کوێستاندا بووە و ژیان و زیندەگییان بەسەر مەڕ و ماڵاتەوە گوزەراوە و بۆ خۆشــیان لەو هاتوچۆیەدا وەنەبێت وەک شەمەندەفەر لە ڕێچکە و هێڵ لایان نەدابێت بەڵکو لەولا و لەوێ زیان و دەستدرێژییان کردۆتە سەر دوور و نزیکدا و بوونەتە هۆی ناکۆکی و هەروەها

سازشـــی دوو دەوڵەتە زلهێزەکە بکات ئێران و عوســـمانی و بە پێی ســـەرچاوە مێژووییەکان ئەم هۆزە لە کەمترین کاتدا توانیویانە پێنج هەزار سواری چەکدار ئامادەی پەلامار بکەن، ئاوا هێزێک هەردوو دەوڵەتی ئەو دەمە حیسابیان بۆ کردووە و دڵیان داوەتەوە، لە لایەکی دیکەوە جارەو بار لە ناو هۆزی جافدا ســـەرەڕۆیی و یاخیبوون روویدەدا دەبووە هۆی پشـــێوی و لەنگی تەرازووی دەسەڵات و بۆ بەرگری لەو ئاشوفتە بازاڕییە پێکهێنانی هێزێکی هەمیشە ئامادەی پا لە ئوزرەنگی یەکێک بووە لە پێویستەکان وەنەبێت هێزی پشتماڵە تەنیا لە ناو جافدا بووبێت بەڵکو لە ناو هۆزە گەورەکانی غەیری کوردیشـــدا هەبووە لەبیرمە ئەو ســـاڵانەی لە ئێران بووین پەیوەندی پتەومان هەبووە لەگەڵ خان و گەورە سەرۆک عەشایری قەشقایی، بەختیاری، لوڕەکان، خانەکانی گۆران و کەلوڕ و ئەمیرەکانی زەنگەنە و کوللیایی زۆر لەو هۆزانە لە مێژەوە هێزی پشتماڵەیان هەبووە، کەواتە پشتماڵە ئالیەت و شمشێری دەسەڵات بووە. بە تەئکید ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکانی ئێران و ئێراقدا هاتووە بنەمای زۆر خەڵکە کۆنە ساڵەکەی هەژاندووە و سەردەم مەرجـی خـۆی ســـەلماندووە و خەڵکەکەش پەنجە مۆری کـردووە. بۆ نموونە بـا دوور نەڕۆین هـــەر ئـــەو هێزە گورج و گۆڵە چەکدارەی پشـــتماڵە ئەوڕۆکە بە تیرەیەکی ســـەربەخۆی ناو جاف دەژمێردرێـــن و لـــە دەڤەرێکی تایبـــەت بە خۆدا ژیانێکی ســـەردەمییانە دەبەنە ســـەر و لەوانەش گوزەشـــتە لەناویاندا کچ و کوڕ ئەوڕۆ هەڵگری بەڵگەنامەی زانکۆیی جۆراوجۆرن، لە پەیمانگاوە بگرە تا بەکالۆریۆس و ماجستێر و دکتۆرا... خەرمان بەرەکەت.

ئەمە خۆی نیشـــانەی ئومێدە کەوا میللەتی کورد پای ناوەتە قۆناغێکی تازە و ســـوورە لەسەر فێربوونی زمانی ئەمڕۆی جیهان و لام وایە بۆ لەمەولا هیچ هێز و دەسەڵاتێکی دەوروبەر و دوور و نزیک ئیدی ناتوانن بە ئاسانی تەماحگیری ژینۆسایدکردنمان بن و دووبارە کارەساتی هەڵەبجە و دیمەنی دڵتەزێنی (عومەری خاوەر) دووبارە بکرێتەوە..

عومەری خاوەر کوڕی ئەم تیرەیە جێگەی داخە ئەو کارەساتە بەو شێوەیە دیمەنی عومەری خاوەریان کردە پرد و بەســـەریا رۆیشـــتن بێ ئەوەی بچووکترین ئاوڕ لە پاشـــماوەی (عومەری خاوەر) و خزمەکانی بدەنەوە.

مـــن لێرەدا سوپاســـی (کاکە حەمەی ئەحمەدی براحەمە) دەکەم کـــەوا توانی لە رووی تیرەی پشتماڵەوە وەک زانیاری یارمەتیم بدات.

ئەحمـــەدی براحەمـــە بـــە راســـتی مەجلیـس ئارا و قســـە خـــۆش و لێزانـــی کار و کردەوەی وردەکارییەکانی بواری کۆمەڵایەتی بوو لە قوتابخانەی ســـەرەتاییدا تا پۆلی چواری خوێندووە و وازی هێناوە، لە ساڵی ١٩٤٦ دەبێتە ئەندامی رێکخراوی هیوا. لە دواییدا دەڕواتە رێزی پارتییەوە، لـــە ســـاڵی ١٩٦٣ دەبێتە پێشـــمەرگە، لە شـــەڕەکەی ژاڵەدا پێکـــەوە بووین-نووســـەر- من و کاک ئەحمـــەد خورشـــید بارزانـــی لە یەک ســـەنگەردا بووین کە شـــەڕ تەواو بوو.. دەمـــەو ئێوارە بوو جەیش بەپەلەقاژێ کشـــایەوە و چەندین تەرمیان لێ بەجێما، شـــەڕێکی سەرکەوتووانە بوو لە پڕ دوو تەیـــارەی هێزی ئاســـمانی ئێراقمان لێ تاین بـــوو و لەو مەتریلۆز تەقینەدا کاک ئەحمەد چەند گوللـــەی بەرکەوت و خورشـــید بارزانی گوللەیەکی بەرکەوت، بەندە ســـالم دەرچووم. بە داخەوە کاک ئەحمەد لە شەڕی براکوژیدا شەهید کراوە.



ئەم وێنەیە گیراوە لە ستۆدیۆ «ئیرشاک» لە بەغداد- کاتژمێر ١٤,٣٠
ریزی پێشەوە کە دانیشتوون
لە راستەوە: ئەنوەر بەگی جاف، حەسەن بەگی جاف
ئەوانەی لە دواوە بە پێوەوە وەستاون
لە راستەوە: کەریم فەتاح، جلەبی خانەقین

# (پشت ماڵە) کێن؟

پێش دامەرزاندنی هێزێک بە ناوی (پشت ماڵە)وە، بە سەرکردایەتی (قادر بەگی زاهیر بەگ) لە ساڵەکانی (١٧٦٠ تا ١٧٧٠ز) عەشیرەتێک یان تیرەیەک بە ناوی (پشت ماڵە)وە نەبووە.

بۆ پارێزگاری لە ئیمارەتە کۆچەرییەکەی (جاف) بیری لەوە کردۆتەوە هێزێکی تۆکمە و ئامادەی هەبێت هەم بۆ پارێزگاری و رووبەڕووبوونەوەی دوژمنی دەرەکی و سەرکوتکردنی هەر کەسێ یان هەر تیرەیەک لە تیرەکانی (جاف) ئەو کات (جاف) (٢٠ تا ٣٠) تیرە بووە.

لە سەرەتای کۆکردنەوەی ئەم هێزە، هەستاوە بە دەستنیشانکردنی هەموو کوڕە ئازاکانی جاف، پاشان کۆی کردوونەتەوە و کردوونی بە هێزێکی (٥٠٠) سواری و پاشان ناوی لێناون (پشت ماڵە) ناوی پشت ماڵە ئەو کاتەش نامۆ نەبووە، هەموو عەشیرەتە زۆرەکان هێزی لەو جۆرەیان هەبووە، هەر بە ناوی پشت ماڵەوە ناویان براوە، بە بۆچوونی من ناوی پشت ماڵە لەوەوە هاتووە وەکو پشتبەستن بە هێزێک، چونکە ئێستاش هەر ئەوە باوە، ئەگەر یەکێک چاونەترس بێت یان قسەی کەس قبووڵ نەکات پێی دڵێن (بابە پشتی هەیە). بۆ پشتبەستن بەو بۆچوونەی خۆم، بڕوانە کتێبەکەی کەریم بەگی جاف، (تەئریخی جاف) دەردەکەوێت کە پشت ماڵە مانای بارەگای

سەرکردایەتی بووە، نەک عەشیرەت، بۆیە لە لاپەڕەی (١٨١)ی (تەئریخی جاف)دا دەڵێت فەتاح بەگی کوڕی حەمە پاشا بە (٧٠) سوارەوە ئەگەڕێتەوە بۆ (پشت ماڵە)، ناڵێت بۆناو پشت ماڵە، بە مانا سەرکردایەتی پاشان بۆ پێنجوێن ئەمانە تا رادەیەک ئەوە روون دەکەنەوە پشت ماڵە وەکو هێزێکی بە زەبر و ئامادەی ئیمارەتی جاف بووە و هێزێکی تا رادەیەک سەربازی و نیزامی بوون. حەمەی ئەحمەد دەڵێت: ئێمەش وەکو هۆزی (مچەی محە) هۆزێکین لە عەشیرەتی هاروونی لە ناوەڕاستی (١٧٠٠)ەکان لە هەموو عەشیرەتەکان داوا کراوە کام هۆز زیاتر ئازان هەڵبژێردراون بۆ ئەم هێزە.

لەو سەردەمەدا (علی وەلی) کە باپیرە گەورەی ئێمەیە بە خۆی و هۆزەکەیەوە هەڵدەبژێردرێن. پاش مردنی (عەلی) کوڕەکەی بەناوی (محی الدین)وە پاش ئەو (مستەفا)ی کوڕی محی الدین ناوبانگ دەردەکات و هۆزەکە گەورە دەبێت تا ئێستاش بەم هۆزە دەڵێن هۆزی (مچەی محە) بە مانای (مستەفای محی الدین) دێت. ئێستاش هۆزی (مچەی محە) لە ناو عەشیرەتەکانی هاروونیدا یەکێکە لە بەرەبابە گەورەکانی هاروونی.

(مستەفای محی الدین) سێ کوڕی دەبێت (فەتاح) و (سلێمان) و (محەمەد)، پاش مردنی فەتاح، دەبێت بە جێگری، سەردەمی فەتاح دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حەمە پاشای جاف لەو سەردەمەدا ئەمیرەکانی جاف وەکو (وەڵەد بەگییەکان، بارام بەگییەکان) و چەند چەکدارێک بۆخۆیان دادەنێن، ناوی لێدەنێن پشت ماڵە، بەڵام ئەو پشت ماڵانە یان ئەو هۆزانە بەردەوام نابن و هەر کەس دەگەڕێتەوە نێو عەشیرەتەکەی خۆی، ئایا بە هۆی کەم دەرامەتی ئەو بەگزادانەوە بووبێت یان هەر شتێکی دیکە.

بەڵام پشت ماڵەی حەمە پاشا یان بڵێین کەیخوسرەو بەگی هەر بەردەوام دەبن (فەتاحی مچەی محەیش) دەکرێ بە سەرۆکی ئەو هێزەی (پشت ماڵە)، پاشان (کەریم فەتاح)ی کوڕی سەرکردایەتی ئەو هێزە دەکات تا ساڵی ١٩٣٥، پاش ئەوەی کەریم کۆچی دوایی دەکات برایەکی بە ناوی (برا حەمە) سەرکردایەتی ئەو هێزە دەکات لەگەڵ ئامۆزایەکی بە ناوی (محەمەد سلێمانی مچە) پاش مردنی ئەو دوو کەسە (ئەحمەدی برا حەمە و مستەفای محەمەدی سلێمان) و (حەمە ئەمین محەمەدی سلێمان) سەرپەرشتیانی دەکرد، ئێستاش ئەم هۆزە سێ گوندیان هەیە، گوندی (قەرەبڵاخی برا حەمە) لە گەرمیان گوندی (قاجر) و گوندی (گردی شەریف) لە شارەزوور، ئەوانی دیکەشیان لە هەڵەبجە و سەیدسادق و سلێمانی و کەلار دادەنیشن.

محەمەد ئەحمەد برا حەمە
٢٠١٠/١٢/٥



له راســتەوە: ١- ســەردار بەگی داود بەگی جاف، ٢- محەمەد ئەمین جاف، ٣- ئەحمەدی برا حەمە، ٤- سالار بەگی داود بەگی جاف.
تاران

ئەحمەدی براحەمە لەدایکبووی (١٩٢٠)ە و لە ســاڵی ١٩٣٠ دەخرێتە بەر خوێندن لە کەلاری کۆن پۆلی چواری سەرەتایی لە کەلار تەواو دەکات پاشان دەچێتە کفری بۆ خوێندن و شەشەمی ســەرەتایی لــە کفری تەواو دەکات پاشــان دەگەڕێتــەوە بۆ کەلار لە ســاڵی ١٩٤١ دەچێتە ریزی حیزبی هیواوە لە ســاڵی ١٩٤٦ لەگەڵ دامەزراندنی پارتی دەبێتە پارتی و لە ســاڵی ١٩٦٣ دەبێتە پێشمەرگەی ئەیلوول لە ١٩٤٦ دەبێ بە حاکمی هێزی قەرەداغ لە ١٩٦٩ شەهید دەکرێ.
سەرچاوە: بیرەوەرییەکانی ژیانم، مستەفا نەریمان.



حاجی حەمەئەمین سلێمان مچە، لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٨ لە گوندی قاجری ناوچەی شارەزوور یەکێک بووە لە سەرپەرشتیارانی هۆزی مچەی محە و پیاوێکی ناوداری ناوچەی شارەزوور بووە.



عومەر حەمە ساڵح ئەحمەد سلێمانی مچە ناسراو بە (عومەری خاوەر) لە هۆزی مچەی محەیە، لە ساڵی ١٩٣٤ لەدایک بووە لە هەڵەبجەی شەهید لەدایک بووە لەبەر کەم دەرامەتی خوێندنی تەواو نەکردووە ١٩٨٨بەری جینۆسایدی کیمیا بارانی هەڵەبجەی شەهید کەوت بە خۆی و خانەوادەکەیەوە.



کەریم فەتاح
ئەم وێنەیە لە ساڵی ١٩١١دا گیراوە و لە وێنەگری (ئەرشاک) لە بەغدا گیراوە.

# بەیداخی

تیرەی بەیداخی یەکێکە لە تیرەکانی هۆزی جاف، بێگومان ناوەکەیان لە وشـــەی (بەیداخ)ەوە هاتـــووە، واتـــا (ئاڵا) رەنگە لە رووداوێکدا لـــە کۆنەوە یەکێک لەو تیرەیە پەرچەمداری هێرشـــێک، پەلامارێک شـــەڕێک، رووداوێک بووە و لەو پیاوە ئاڵا بەدەســـتە تیرەی (بەیداخی) یان (بەیاخی) ئێستا کەوتوونەتەوە.

ئەم تیرەیە وەک تەواوی تیرەکانی جاف، رەوەند بوونە و ران و پەز و ئاژەڵدار بوونە، بەدوای لەوەڕدا گەرمیان و کوێســـتانیان کردووە و لە کوێســـتاندا لە دەڤەری (مەریوان)دا گیرساونەتەوە و لە بندەســـتی تیرەکانی کەی جافدا هەوارگەی تایبەتمەندی خۆیان هەبووە و تا ســـاڵانی ١٩٣٠ز بەو حاڵەتەی ژیاون، لە دوای ١٩٣٠دا بە پێی رووداوە سیاســـییەکان و بەســـتنی سنوور لە لایەن دەوڵەتی وەختی ئێران و دەوڵەتی تازە دروســـتبووی ئێراقەوە و گۆڕانی شـــێوەی ژیان لە لایەکی دیکەوە ئەم تیرەیەش نیشـــتەجێ بوونە، بەڵام تا ئەو دەمە ئەم تیرەیە چەندین خێڵ و ســـەرخێڵی ناســـراویان هەبووە و لە ناو تیرەکانی دیکەدا جێگای رێز و حورمەت بوونە و پیاوانی ناوداریان تیادا هەڵکەوتووە وەک:

١- ئەلماس عەلی محەمەد
٢- کوردەی عیسا
٣- حەمزەی عیسا
٤- حەمە عەلی مورادیان
٥- ئەحمەدی رەحیم
٦- ساڵح مەعرووف

ئـــەم دیاردەیـــەی لە ناو هۆزی گەورەی جافدا هەیە رەنگە لە ناو عەشـــیرەتەکانی دیکەدا کەم وەدی بکرێـــت. ئەویـــش ئەوەیە لە ناو یەک دێدا چەندین تیرەی جاف پێکەوە دەژین و لە شـــەڕ و

خەیری یەكتردا بەشدارن. راستە برێك لە تیرەكانی جاف ئەوانەی زۆر بوونە و دەسەڵاتدار بوونە ناوچەی بەربڵاویان داگیركردووە و ئەو دەڤەرە بە ناوی ئەوانەوە ناوبراوە یان لە كۆنەوە هاوینە هەواری ئەو تیرە بووە، كە نیشـــتەجێی بووە دەواری وەلاوە ناوە و دوای هەزاران ســـاڵ چنگی خستۆتە قوڕ و دیواری خانووی سازداوە، ئیدی ئەو بیروڕایەی كە سەدان و بگرە هەزاران ساڵ كە دەیوت (گورانی گو لە ئاوكەر) خستۆتە لاوە. مەبەست لە (گورانی گو لە ئاوكەر) یانی ئەوانەی نیشـــتەجێ بوونە، ئەوانەی ســـاكنی دێهات بوونە و كشتوكاڵیان كردووە، بە لای بیروڕای خێڵەكی هۆزێكی كۆچەر و رەوەندی وەك جافەوە نیشـــتەجێبوونی بە دوور لە پیاوەتی و ســـواركاری و شـــیاو نەزانیوە، بە تەئكید كاتێك دێ دروســـت بكرێت هەر دەبێت لە بندەســـتی ئاودا بێت و ئەو خەڵكە نیشتەجێبووە بەسەر ئاوەوە دەڕۆنە سەر ئاو و ئەو كارە بە لای بیروڕای كۆچەرییەوە بە كارێكی نەشیاو لە قەڵەم دراوە. ئیدی هۆزی جاف زەمان و چۆنیەتی ژیان ناچاری كردن ئەوانیش وەك (گۆران) یانی ئەوانەی نیشـــتەجێیە لە بندەســـتی ئاودا ببەزن و چنگ بخەنە ناو قوڕ و دیوار و بنمیچ دروست بكەن و ببنە لادێ نشین.

## جێگە و شوێنی بەیداخییەكان

ئەوانەی لە گەرمیاندا نیشـــتەجێ بوونە لە دێهاتی خـــوارەوەدا دەژین وەك: مەیدان، قەرچەم، خوڕخوڕە، باوەنوور، سەید محەمەد، كەلار، كوڵەجۆ-كەلار.

ئەوانەی لە شارەزووردا دەژین:

سەید سادق، گردە نازی، قاجر، بەشارەت.

ئەم تیرەیە زۆر تێكەڵاوی تیرەی شـــاترین وەك وتمان لە ناو ئەم تیرەیەدا پیاوی ناســـراویان تیا هەڵكەوتوو بووە، ئێستاش لەو بەرەبابانە چەندین كەسایەتی ئەم تیرەیە لە ناو خەڵكیدا ناودارن وەك:

١- مەحمـــوی ســـۆفی: ئـــەم پیاوە بە راســـتی پیاوە، لە ســـاڵی ١٩٧٢دا من و خوالێخۆشـــبوو، ســـەردار جـــاف، لە تارانەوە هاتین بۆ ناو شـــۆڕش بۆ دیتنی، چەند برادەرێـــك لەگەڵماندا بوو، تا لـــە گەڕانەوەمانـــدا، یادی بەخێر، خوالێخۆشـــبوو ســـەردار جاف «كێچ» پەرێشـــانی كردبوو، ئەم مەحمووی ســـوۆفییە برێك گەڵای «تەڕو»ی هێنا و وتی: ئەمە دەرمانی كێچە. یانی كێچ بۆنی ئەو گەڵایە بكەن دوور دەكەونەوە.

٢- عەبدوڵڵای محەمەد مارف

٣- عەولە سوور- لە كوڵەجۆ

٤- حەمومین ئەحمەد- لە كەركووك

٥- محەمەدی حەمەمین، لە گوندی داربەڕووڵە، سەیر لەوەدایە ئەم تیرەیە لە گەرمیان زۆرتر تێكەڵی تیرەی شاترین و لە شارەزوور لەگەڵ تیرەی هاروونیدا تێكەڵاون. هەروەها لەگەڵ تیرەی بێسەری و قادرمیرەوییدا فرە كۆكن.

٦- حەمە عەلی وەیسی ١٩٠٧-١٩٨١

٧- رەحیم كەریم وەیسی ١٩٢٧-١٩٩٢

# بسم الله الرحمن الرحيم

عەشـیرەتی بەیداخی تیرەیەکە لە هۆزی جاف، ناوی عەشـیرتی بەیداخی لەوەوە هاتووە کە ئاڵای لەشکری جافیان هەڵگرتووە لەبەر ئەوەی جێگای متمانەی هۆزی جاف بوون.

ئێمە لە کاتی جافداریدا (گەرمیان و کوێستانمان کردووە لە خە تی پێنجوێنەوە چووینە چەمی (کوڵە و دۆزەغەری) مەریوان و لەو دیوەوە بۆ گەرمیان گەڕاینەوە ناوچەکانی (مەیدان و قەرچەم و سەرخێڵی ئەو سەردەمەمان (الماس علی محەمەد) بووە.

سەرخێڵی دووەم (کوردەی عیسا) بووە.

سەرخێڵی سێیەم (ئەحمەد رەحیم) بووە.

سەرخێڵی چوارەم (حەمزەی عیسا) بووە.

سەرخێڵی پێنجەم (حەمەعەلی مرادخان) بووە.

سەرخێڵی شەشەم (سالّح مەعروف) بووە.

لەساڵی (١٩٣٠)دا وازمان لە گەرمیان و کوێستان هێناوە. بەشێکمان لە شارەزوور نیشتەجێ بووین و بەشـێکمان لە ناوچەکانی گەرمیان نیشـتەجێ بوویـن بە تایبەتی ناوچـەی (مەیدان و قەرەچەم و خوڕخوڕ و قەڵاتەپە، بەشی زۆرمان لە ناحیەی باوەنوور نیشتەجێین.

لە نەوەی (ئەلماس عەلی محەمەد) کە ماوە و لێپرسراوی ئێستای خانەوادەکەیەتی (مەحموود سۆفی محەمەد ناسر) لە دانیشتووی ناوچەی باوەنوورە.

لە نەوەی (حەمزە عیسـا) کە ماوە و لێپرسـراوە لە خانەوادەکەی ئێستا (ئەحمەد حەمەساڵح عەلی حەمزە) دانیشتووی باوەنوورە.

لە نەوەی (ساڵح مەعروف) کە ماوە و لێپرسراوە لە خانەوادەکەی (عەبدوڵڵا محەمەد مەعروف) کە لە قەڵاتەپە نێشتەجێیە.

ژمارەی عەشیرەتی بەیداخی لە حاڵی حازردا نزیکەی (٧٠٠) حەوت سەد ماڵ و بەیداخییەکانی ناوچەی شارەزوور نیشتەجێی (سەید سادق و گردە نازی و بەشارەت)ە و بەیداخییەکانی ناوچەی گەرمیان نیشـتەجێی (قەرچەم، خوڕ خوڕ، قەڵاتەپە) ئەم گوندانە لەوبەری سـیروانەوە گوندەکانی ئەم بەری سـیروان سـەید مەحموود، باوەنوور، کەلار، کڵەجۆ (تەهای حەمە جانە) و بەشـێکمان لە کوڵەجۆی زەنگەباتە کە مەشهورن بە خێڵی (عەودە سور) و نزیکەی (١٠٠) ماڵمان نیشتەجێی گوندی (داربەرولەن) سەر بە پارێزگای سلێمانی، کە محەمەد ئەمین برا گەورەیانە.

لـە بارەی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ عەشـیرەتەکانی تردا بە شـێوەی گشـتی لـە گەرمیان بە شـێوەیەکی باش لەگەڵ عەشـیرەتی شـاتری دایە و لە شـارەزوور لەگەڵ عەشـیرەتی هاروونی دایە.

محەمەد ناسر ئاغا ل دایکبووی ١٩٠٧و لە ١٩٨٨ کۆچی دوایی کردووە.

# تیرەی بەیداخی

«وەڵامی خاڵەکانی» خوسرەو جاف

١- تیرەی بیداخی یەکێکە لە تیرەکانی هۆزی جاف، ناوەکەشی لە ئاڵاوە هاتووە، لەبەر ئەوەی لە کاتی خۆیدا لە بۆنەکاندا ئاڵاهەڵگری هۆزی جاف بووە.

٢- ئەم پیاوانەی لای خوارەوە ناوداری تیرەکەن لە کەلار و خانەقین

١- محەمەد عەلی وەیسی عەزیز: لە دایکبووی ساڵی ١٩٠٧، بەرواری کۆچکردن: ١٩٨١

٢- رەحیم کەریم وەیسی لە دایکبووی ١٩٢٧، بەرواری کۆچکردن: ٢٠٠٧

٣- مەحموود محەمەد نادر لە دایکبووی ساڵی ١٩٤٧، بەرواری کۆچکردن ١٩٩٢/٩/١.

٣- تیرەی بەیداخی نزیکەی (      ) ماڵ دەبن و دابەش دەبن بەسەر ناوچەکانی سلێمانی و شارەزوور و باوەنوور و ناوچەکانی تردا.

٤- تیرەی بەیداخی دۆستایەتی لەگەڵ ئەم تیرانەدا هەبووە وەکو تیرەی هاروونی و سەدانی و بێسەری و قادرمیروەیس تێکەڵاو بوون.



ئەلماس عەلی محەمەدی بەیداخی

# شێخ سمایلی

ڕونکردنەوەیەک:

تیــرەی شــێخ ســمایلی یەکێکە لەو تیــرە بەناوبانگانەی جــاف و لــە ڕووداوە مێژووییەکاندا پەیوەســتە دەوری ســەرەکییان هەبووە، جێگەی داخە وەک دەبینی باس و تەحقیق لە بارەی ئەم تیــرە مەزنە لەم کیتاوەدا نییە، لە ڕاســتیدا گەلێک ســەرچاوەی نایابــم دۆزیوەتەوە لە بارەی ئەم تیرەیە، برێکیان دەگەڕێنەوە بۆ سەد و هەشتا ساڵ لەمەوبەر، بۆ دەوڵەمەندکردنی باس و دوان لە بارەی هەر تیرەیەک پەیوەندیم کردووە بە پێی زانیاری خۆیان لە بارەی تیرەکەیانەوە، زانیارییان بــۆ ناردووم، ماڵیان ئاوا تەقەلاکانیان مایەی دڵخۆشــی و دڵگەرمی هەموو دڵســۆزێکی مێژووی میللەتی کوردە.

لە بارەی خزمانی شــێخ ســمایلی پەیوەندیم کرد بە «ســالاری مامەنەســەوە» سەرەتا زۆر ستایشی لەو کارە کرد و وتی: وەختمان بدەرێ تا دەست بەکار بین. ئەوە کارێکە بە هەموو کەس ناکرێت..

باشــە بیســت ڕۆژ، سی ڕۆژ لەســەر ماوەیەک ڕێکەوتین دوای تێپەڕبوونی ماوەی دابینکراو دیســان پەیوەندیم بە کاک «ســالار»ەوە کرد، ئەوەی کە لێم بیست پێم سەیر بوو کاک سالار بە ڕجا و تکایەکی زۆرەوە داواکار بوو کە من لە بارەی شــێخ ســمایلییەوە هیچ نەنووســم. هەرچی بیــرم دەکــردەوە تێی نەدەگەیشــتم ئەو ڕجا و تکایە لەبەرچی. مێــژووی تیرەیەک داخۆ دەبێت چ زەرەر و زیانێک بگەیەنێتە یەک کەس یان خەڵکانێک ئەگەر پێگە و جێگەی ئەو تیرەیە دەوڵەمەند نەکا بە تەئکید خۆ زەرەری نابێت..

ئیتر هەر بە تەلەفۆن زۆر ڕۆیشتە نێوانمانەوە من دەمویست هۆی ئەو سووربوونەی لەسەر نەنووسین بزانم، هەرچی کۆشام پێی نەوتم..!

ســەرەنجام وتی : کاکە ئەگەر لە بارەی «شــێخ ســمایلی» بنووسیت شکاتت لێ دەکەم. ئێمە هەر جاف نین. من لە شــکات ناترســم بەڵام بۆئەوەی نەکا ئەو باســەی کە دەمویســت بینووسم گرفتاری و کێشــە لە ناو خزمانی شــێخ ســمایلیدا دروست بکات، وەعد و بەڵێنم دا بە کاک سالار لەم کتاوەیدا باسی شێخ سمایلی تێدا نەبێت بە تەئکید من ئەوە بە نەقس دەزانم.

بــا وەک لــەم ڕووەوە پێــم وانییە کۆتاییەکە لە من بێت بەســەر ئەوەشــدا داوای لێبوردن لە خزمانی شێخ سمایلی دەکەم بە تایبەت خوێنەوارەکانیان.

ئەم کتاوە وا بە دەستەوەیە چەند جێگەی داخە ئەو دوانەی لە باری «شێخ سمایلی» ئامادەم کردبوو دەبینی تیادا نییە. بە ڕاســتی لەو کۆتاییەی کاک «ســالار» بەرپرســیارە و بۆ پاڵپشــتی قسەکانم چەند کەسێکم لە خزمانی عەشیرەت و هۆز لە داواکەی کاک «سالار» لە وەختی خۆیدا ئاگادار کردبوویەوە چەند دانەیەکیان لە خزمانی شێخ سمایلین.

لەگەڵ داوای لێبوردندا..

**براتان خوسرەو جاف**
**٢٠١٠/٨/٨**

# تیرەی یەزدان بەخشی

یەکێکە لە تیرە دیار و ناسـراوەکانی هۆزی جاف، لەزۆربەی ڕووداوەکاندا دەوریان هەبووە و پەنجەیان بۆ درێژکراوە، ئەم تیرەیە بە ئازایەتی و لێهاتوویی ناسراون، رەنگە بەشێک لە هۆی ئازایەتـی ئـەم تیرەیە بگەڕێتەوە بۆ جێگەکەیان، کە شـوێنەکەیان و جێگـەی تەواجودیان یەکێکە لە سـەختترین و دژوارترین دەڤەری جاف و کوردەواری، وەنەبێت روحی مل نەدان و تەسـلیم نەبوونـی ئـەم تیرەیە لە ئەمڕۆ و دوێنێوە بۆیان مابێتەوە، بەڵکو دانیشـتوانی ئەو دەڤەرە خوو و خەسڵەتی ململانێیان لە سەردەمی ساسانییەکانەوە بۆ ماوەتەوە.

گەورەترین «ئاتەشـگا»ی ئایینی زەردەشـتی لە ناوچەی «روان»دایە بۆخۆی لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتـی ساسـانیدا سـێ ئاگردانی هەرە گـەورە هەبووە، یەکێکیان لـە دەڤەری «فارس» ئێسـتاو «یـەزدا» بووە دووەمیان لە «رەوان»ی ئێسـتادا بووە، کە ئـەو زنجیرە چیایە بۆخۆی پەیوەندە لەگەڵ زنجیرە چیای «شەمیران» و زمناکۆدا.

سـێیەمیان لـە دەڤەری ئازەربایجاندا بووە، وەنەبێـت ئاگردانی جۆراوجۆری تر لێرە و لەوێ نەبووبێـت، بەلام ئەو سـێ جێگەیە بە شـا ئاگردانی هەرە گەورەی ئایینی زەردەشـتی ناسـراو بوونە، سـوپای داگیرکەری عارەب، کە دوای سـەرکەوتنیان لە شـەڕی قادسـیەی نێوان عارەبی ئیسلام و لەشکری ساسانیدا، سەرەتا پەلاماری ئەو شا ئاگردانەیان داوە و بە پاڵپشتی مەعنەوی شـەڕەکانیان زانیوە و کۆشاون ئەو گڕە بڵێسـەدارە بکوژێننەوەو ئاسەواری ئەو ئاگردانە هێشتا هەر ماوە.

مـن لەوە دڵنیام مێـژووی تیرەی یەزدان بەخشـی گەلێک لەوە کۆنترەو لێزانی «ئەنسـاب» دەمارگـرژی عـارەب و عەجەم و تـورک و هەروەها برێک لە مێژوونووسـانی خۆماڵی بە هەڵە هەڵیانسەنگاندووە. وەک لە باسەکانی پێشوودا بە دیکۆمێنت روونمان کردووەتەوە، کەوا مێژووی هـۆزی جـاف و ناوی هـۆزی جاف، بە سـێ قۆناغدا گـوزەراوە (جاپان-جاڤـان، جافان، جاف)،

جاپانـەکان کـە پەیڕەوی ئایینی زەردەشـتی بوونە هێزی پەلاماردەری لەشـکری ساسـانییەکان بوونە و یاریدەری فەرماندەی گشـتی سوپا و لەشـکری دەسەڵاتی ساسانی لە شەڕی قادسیەی نێـوان عارەب و ساسـانیدا «ڕۆسـتەمی فروغزاد» بـووە و یاریدەدەرەکـەی «جاپان» بووە و هەردووکیان لەو شـەڕەدا شـەهید بوونە، بۆیە دەڵێم «شـەهید» ئەوەی لە پێناوی وڵاتی خۆیدا بکوژرێت شـەهیدە، هەر لەو دەمەیدا یەکێک لە سـەحابەکانی پەیامبەری ئیسـلام کابرایەک بووە بـە ناوی «جاپان الكـوردی»، بەندە ئەم زانیارییانە هەر وا لەخۆمەوە نانووسـم، تەواوی ئەوانە پەیوەندە لەگەڵ سـەرچاوەی باوەڕپێکراو و بڕێکیان دوژمنانی کورد نەیانتوانیوە دانی پێدا نەنێن و بیشارنەوە.

## ناوی تیرەی شەمیرانی:

زۆر نییە ئەم تیرەیە بە ناوی شەمیرانەوە ناو دەبرێن، هەمووی ناگاتە حەفتا ساڵێک، لە کتاوی (کەریم بەگی فەتاح بەگ)دا (تەئریخی جاف)، کە بۆ خۆی ئەو دەم سەرۆکی فەرمی سەرتاسەری هۆزی جاف بووە ناوێک لەم تیرەیە بەو ناوە ناهێنێت، بەڵکو بە ناوی «یەزدان بەخشی» ناویان هێناوە و شەمیران دەڤەرە و بە ناوچەیەکی شاخاوی باس دەکات، ناوی یەزدان بەخشی ناوێکی مورەکەبە، لە دوو وشە پێکهاتووە «یەزدان – بەخش» مانای هەردوو وشەکە بە مەفهومی ئەمڕۆ دەکاتە خوا بەخشیو یان خوداداد (یەزدان- ئیزەد، ئیزەدیان- ئاهورامزدا- زەردەشت) ئەو وشەیە و واژانە ئەرکانی ئایینی زەردەشتین، وەک دەبینین تاک و تەراکی تیرەکەی جاف نەبێت ئەو وشە و واژانە ئەوڕۆکە لە ناو هۆز و عەشایری کەی کوردا وەدی ناکرێت. ئەگەر بشکرێت زۆر کەمن. لە لایەکی ترەوە، بۆ ناوی ئەم تیرەیە بە وشەی «یەزدان» دەست پێدەکات، ئەگەر بنەما و بنەڕەتێکی مێژوویی نەبێت؟. هەروەها دەڤەری شـەمیران و روان، لە سـەردەمی دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ساسـانیدا بە دەڤەرێکی ئایینی و گڕی ئاگردانی هەمیشـە بڵێسەداری ئایینی زەردەشتی ناسراوە. لەوانەش گوزەشتە، کەریم بەگی جاف، لە کتاوەکەیدا «تەئریخی جاف»دا دەڵێت:

پاشاکانی جاف لە پێش ئەوانیشدا دەڤەری شەمیران و زمناکۆ و تیرەی «یەزدان بەخشی»یان بە پشـت و پەنای خۆیان و تەواوی عەشـیرەت داناوە، هەمیشە ئەو دەڤەرە جێگەی ململانێی نێو دەسـەڵاتە زلهێزەکان بووە، بە سـنوورێک دانراوە لە نێوان دەسـەڵاتی عوسمانی و سەفەوییە و نادر شایی و زەندییە و قاجارییە.

هەتاکو لەم دوادواییەدا، کاتێک مەحموود پاشـای جاف لە دەسـەڵاتی عوسمانی یاخی دەبێت لە زمناکۆ و شەمیران دوور نەکەوتۆتەوە ئێستاش ئەشکەوتی پاشا هەر بەو ناوە دەناسرێت، کە مەکۆی مەحموود پاشای جاف بووە.

قەڵایەک لەو دەڤەرەدایە ناسـراوە بە قەڵای شەمیران، دیارە ئاسەواری سەردەمی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ساسانییە.

## ناودارانی تیرەی شەمیرانی یان یەزدان بەخشی:

١- وەسمانی خاڵە
٢- مستەفای وەسمان
٣- خالیدی مستەفای وەسمان

٤- میر محەمەدی خالید
٥- سان ئەحمەدی میر ئەحمەد
٦- محەمەدی سان ئەحەد
٧- مەحموود سان ئەحمەد

لێرەدا ناتوانم باسی چەند کەسایەتییەک لەو ناوانە نەکەم، کە بۆ خۆیان لە سەردەمی خۆیاندا دەوریان هەبووە و لە رووداوەکاندا پێش قەرەوڵی لەشکر بوونە:

١- وەسمانی خاڵە: سەرخێڵی یەزدان بەخشی بووە و لە سەردەمی حەمە پاشای جافدا ژیاوە و لە ناو تیرەکەی خۆیدا خۆشەویست بووە و لە ناو تیرەکانی کەی جافدا بە رێزەوە ناوبراوە.
دیارە لەو سەردەمەدا شەڕێک لە نێوان چەند تیرەیەکی جاف و عەشایری گەڵباخی و دەوڵەتی قاجاریدا روودەدا و لەو شەڕەدا لەشکری جاف دەشکێن و زەرەر و زیانێکی زۆریان پێدەگات، ئەو شەڕ و کوشتارە حەمە پاشای جاف سەرۆکی وەختی ئەو دەمە زۆر نیگەران دەکات، لەشکرێک لە ئازا و جەربەزەکانی تیرەی جاف پێک دەهێنێت، دیارە وەسمانی خاڵە، یەکێک بووە لە ناودارانی ئەو لەشکرە و پەلاماری گەڵباخی و ژەندرمەی ئێران دەدەن و لە قەڵایەکدا ئابڵۆقەیان دەدەن، بە ناوی «خاومیراو» زۆر ناکێشێت ئەو قەڵایە دەگرن و لەو شەڕەدا وەسمانی خاڵە پەرچەمدار و پەلاماردەری ئەو لەشکرە دەبێت و لە دوای ئەو شەڕەوە نازناوی «خاڵە»ی دەدرێتێ، هەتاوەکو حەمەپاشای جاف پێیگوتووە «خاڵە».
٢- سان ئەحمەد: یەکێکی دیکەی ناوداری تیرەی یەزدان بەخشییە، لە قۆناغی خۆیدا لە زۆر بواردا پرسی پێکراوە.

٣- حەمەی سان ئەحمەد: دوای مردنی باوکی سەرۆکایەتی تیرەکەی دەگرێتە دەستەوە، زۆر ناخایەنێت لێهاتوویی خۆی لە رووداوەکاندا دەردەخات، لە شەڕ و ململانێی «شێخ مەحموود»دا حەمەی سان ئەحمەد، قارەمانێک بووە بۆ خۆی، مخابن ناو هەر بۆ چەند کەسێک ماوەتەوە و قارەمانە راستەقینەکان بە ئەنقەست فەرامۆش کراون. ئەگینا دەوری حەمەی سان ئەحمەد زۆر لەوانە گرنگتر بووە، کە لە چەند لاوە ناویان هاتووە، ئەم قارەمانە یەکێک لە فڕۆکە جەنگییەکانی دەوڵەتی ئینگلیزی خستووەتە خوارەوە، هەتاکو شایەر و شاعیران لەو رووەوە شیعریان پێدا وتووە.

**حەمەی سان ئەحمەد سمێڵ چەخماخی**
**تەیارە شکێن لە حکومەت یاخی**

٣- مەحموودی حەمەی سان ئەحمەد: من ئەو پیاوەم چەندین جار دیوە، زۆرتر لە دیوەخانی داود بەگی جافدا لە شاری کرماشان. پیاوێکی زانا و لێزان و بە ئەزموون و دنیادیدە و بە ویقاڕ و قسە حەق و قسەخۆش، بڕێک قسەی بە لای (داود بەگی جاف)ەوە دەکرد کەسی دیکە نەیدەکرد. خوالێخۆشبوو «داودبەگی جاف»یش رێزی لە بۆچوونەکانی دەگرت..

١- ئەحمەدی حوسێن، لە دێی توڵەپیدا دەژیا.
٢- عەبدوڵڵای مام رەسول، لە چەمەڕەشدا دەژیا.

٣- محەمەدی ڕۆستەم، لە کوکوی شەمیران دەژیا.
٤- حەمە شەریفی قادر، لە دەنگ گەورەدا دەژیا.
٥- حەمەی مەحموودی هەواس، لە بەشی هاجەدا دەژیا.
٦- حەمەی تۆفیقی میران، لە بەشی پیرگدا دەژیا.
٧- بارامی ئەحمەدی شاوەیس، لە وەرمن دەژیا.
٨- نادری مام بارام، لە زمناکۆ.
٩- محەمە عەبدولڕەحمان یونس بەگ: لە بەشی ئەحمەد بەگ.
١٠- تۆفیق فەرەج، لە دەلەف.
١١- قادری هەجەک، لە مامەشەیی.
١٢- مەحموودی چراغ، لە شەک مەیدان.

حەمە شـــەمیرانی، پێشمەرگەی ئازا و لێهاتوو لە شەڕەکانی پێشمەرگایەتیدا پەنجەی بۆ درێژ دەکرا.

## ناوی شەمیران:

وەک زانراوە شـــەمیران، ناوچەیەکی شاخاویی سەخت و دژوارە، سروشت بە وردەکارییەوە ڕازاندوویەتییەوە، بە وردی هێشـــتا نەزانراوە بنەمای ئەم ناوە لە چییەوە وەرگیراوە، هۆکەشـــی ئاشـــکرا و مەعلوومە ئێمەی کـــورد و مێژووی میللەتەکەمان و مێـــژووی جوگرافیای وڵاتەکەمان لـــە لایەن دوژمنەکانمانەوە نووســـراوەتەوە، ئەگەر نووســـراویش بێت، گەز و قەیچی بە دەســـت دوژمنـــەوە بووە و ناشـــوکری نەبێت بۆ خۆمانیش مێژوونووســـی وامان نەبـــووە، ئەو توانایەی هەبێـــت خۆی بخاتە ژێر ئەم بارە قورســـەوە، بۆیە بـــە داخەوە، تا بە ئەوڕۆ ئێمەی کورد خاوەنی مێژوویەکی چوارچێوەدار نین، هەتاکو مێژووی هۆز و دەڤەرەکانی ناو کوردســـتانمان هێشتا بۆ ســـاغ نەکراوەتەوە، هێشتا مێژووی ڕاستەقینەی عەشیرەتە کوردەکانی ناو کوردستان نەزانراوە، کێ بەرپرســـیارە؟ ئەوە باســـێکی ترە. بەش بە حاڵی خۆم ئەم تەقەڵلایە وەنەبێت تەنیا لە ڕووی دەمارگـــرژی «جافایەتی»یەوە بێ، بەڵکو بە ئەرکی سەرشـــانی خـــۆم زانیوە هەر نەبێت مێژووی چوارسەد ساڵی ڕابردووی «سێ ملیۆن» جاف، کە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشووردا ئەوڕۆ دەژین تۆمار بکەم، ئەمە بۆخۆی بە خزمەتێکی گەورە دەزانم، دەرحەق بە مێژووی میللەتەکەم...

با بگەڕێمەوە ســـەر وشـــەی شـــەمیران، لەم ڕووەوە بیروڕا زۆرە و ئەم ناوەش ناوی ئەمڕۆ نییە و لەبەر ئەوە دەڤەرەکە ناوچەیەکی گرنگی ســـەردەمی دەســـەڵاتی ساســـانییەکان بووە، تا بە ئەمڕۆ ئاســـەواری دەســـەڵاتە وەک ئاگردان، قەڵا، دژ و پرد و ڕێچکە ڕێگەی زۆری تێدایە، من وا دەزانم ناوی شەمیران، ناوێکی گەلێک کۆنە و وشەیەکی پەهلەوییە.

شـــەمیرانییەکان بۆ خۆیان لایان وایە وشەی شـــەمیران لە «شەش میران»ەوە هاتووە بووە بە شەمیران.

ئەوڕۆ برا گەورەی ئەم تیرەیە «حەمە سەعی مەحموودی سان ئەحمەد»ە لە کۆنیشەوە ئەو برا گەورەییەی بۆ ماوەتەوە.

زۆر سوپاسی کاک «حەمە سەعید» و کاک «شەمیران» دەکەم کە وا زانیاری بەکەڵکیان لەو ڕووەوە پێ داوم.



ئەحمەدی سان ئەحمەد
یەزدان بەخشی ۱۹۲۷-۱۹۹۰



حەمە عەلی سان ئەحمەد
۱۹۰۰-۱۹۸۷

# رەحمان بەگ و مستەفا بەگی یەزدان بەخشی

ئەم دوو کەسە، سەر عێلی تیرەی یەزدان بەخشییەکان بوونە، هەردووکیان کۆچەری و دەسەڵاتدار بوونە، زستانان بەرەو سەرقەڵا و جێگیران کۆچیان دەکرد و هاوینان بۆ «مەحالسی سنە». ئەو دوو سەرخێڵە کە دەنواڕن وا تایفەی «جەلیلوەنە» پەرتەوازە کەم دەسەڵات بوونە و ناکۆکی کەوتووتە نێوانیانەوە، با وەک ئەوانیش هەر لەسەر هۆزی جاف دەژمێردران، بەڵام ئەو دوو خێڵە بە سەرۆکایەتی رەحمان بەگ و مستەفا بەگ، پەلاماری «جەلیلوەنە»یان داوە و تەواوی دار و دارایان داگیرکردووە و بۆ هەمیشە ئەوی دەسەڵات و دارایی ئەو تیرە هەبووە لە لایەن یەزدان بەخشییەکانەوە لە ناو بردووە.

ئەم رووداوە، لە سەردەمی دەسەڵاتی نادرشا و کەریم خانی زەندا روویداوە. ئیدی مانەوەی دەسەلاتی عەشایری بە قودرەت و لێهاتوویی سەرکۆمارەکانیان بووە، وردە وردە ئەو خێڵەش دەسەلاتیان کەم دەبێتەوە و تیرەکانی «گودو گاخوری» بە هەردوو پەلاماری ئەو دوو خێڵە دەدەن و توانا و دەسەڵاتیان لە ناو دەبەن، دیارە سەرۆکایەتی ئەو دوو تیرەی بە دەست یەعقووب بەگ گودو سەید خانی گود و قوباد بەگ و لە دێی «درنە»دا قوباد بەگ سەرخێڵی خۆی ئەندام دەدا و پیاوێکی بە دەسەڵات و لێهاتووی تیرەی (گود) بووە.



رەحمان بەگی یەزدان بەخش



مستەفا بەگی یەزدان بەخش

# شاتری

تیرەی شـــاتری یەکێکە لە تیرە ســـەرەکییەکانی هۆزی جاف، لە بنەماڵەی هۆزی جافەوە تا بە ئەوڕۆ دەور و نەخشـــی ســـەرەکییان هەبووە، چ لە شـــەڕدا یان لە ئاشتی ئەم تیرەیە پرس پێکراو بوونە و خاوەنی بۆچوونی تایبەتمەندیی خۆیان بوونە.

ئەم تیرەیە وەک هەر تیرەیەکی سەرەکی لە چەند بەرەباب پێکهاتوون:

١- برایەتی- برایی
٢- میروەیسی
٣- وردە شاتری
٤- یوسوجانی

ئەو چوار بەرەبابە ئەوڕۆکە هەر یەکە لەوانە چەندین بەرەبابی ناســـراویان تێدا هەڵکەوتووە. کاتێـــک ئـــەم تیرەیە زۆربەی زۆریان کۆچەر بوونە، ڕێچکـــە و ڕێگەی تایبەتیی خۆیان هەبووە، چ لە کوێستاندا و چ لە گەرمیاندا هەوارگە و لەوەڕگای تایبەتمەندیی خۆیان هەبووە و هیچ یەک لە تیرەکانی کەی جاف دەستدرێژییان بۆ نەکردووە.

شـــاتری ڕێ. ڕێچکەیەکی ناسراو بووە و بە ناوی خۆیانەوە ناو نراوە، بڕێکی کەی تیرەکانی جاف لە ڕێچکە و ڕێگەی شاترییەوە گەرمیان و کوێستانیان کردووە.

ســـەرەتا کۆمەڵیـــان کردووە و ئیدی بـــەو پێیە بە بەرنامەیەکی داڕێـــژراوی تایبەت بە خێڵ و ماڵاتـــەوە کەوتوونەتە ڕێ، ســـەرەتا بەرەو ملە خرنووک، کانـــی ئەڵڵا، چوار ملان، ملەی پەیکوڵی، شارەزوور، چەقان، چەوتانە، ملەکەوە، دەڤەری پێنجوێن، مەسود، خەڵوزە، لە شلێرەوە دەپەڕینەوە بۆ ناو کوردستانی ڕۆژهەڵات و دەگەنە سوورەقەوان و هەوارگەی لێلاخی هەمیشە گیان کە بکات دۆزەخ دەڕە وە کانی فەرەنگیز لەبەر ئەوەی تیرەی شـــاتری تیرەیەکی دەستڕۆیشتوو و ئاژێڵدار

بوونــە نەیانتوانیوە لە یەک دەڤەردا کۆمەڵ بکەن میروەیســییەکان کــە ئەودەم (حەمەی فەرەجی ئاخــە و قــادری پیروەیس) دەمڕاســت و براگەورەیان بوونە، هەوارگــەی خۆیان هەبووە بەناوی «کەژی سوڵتان ئاخ زەوتی».

وردە شــاترییەکان ئەوانــەش لە هەمان شــاتری ڕێگــەوە گەرمیان و کوێســتانیان کردووە، گەورەی ئەم بەرەبابە (فەرەجی حەمە رەسول و حەمەی خوسرەو، حوسێنی حاجی مەحموود و سلێمانی حەمەی رەسول)ن.

بەشــی چوارەمی ئەم تیرەیە «یوســوجانی»، لە ڕێگەی داری خلەوە کە بەســەر کەژی ســی دارەوەیە دەڕۆنە ناحیەی «وارماوە» و لەوێڕا تێکەڵی شــاڕێگەی خۆیان دەبن، کە بگاتە شــاتری ڕێ.

ئــەم بەرەبابە لە کوێســتاندا لە ریشــوڵە هــەواردا دادەبەزن، کە پانزە ســەعات وڵاخەڕێ لە شاری سنەوە دوور دەبن، تیرەی «وەلی» و نەوژینی و کەروبی، کە ئەورۆ خۆیان بە تیرەیەکی سەربەخۆ دەزانن، ئەو دەم لە ناو شاتریدا هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵدا نەدەکرا.

ئــەم تیرەیە هەتاکو لە ســەردەمی کۆچەریشــدا بڕێکی زۆریان نیشــتەجێ بوونــە، زۆرتر لە شــیروانە و دزی ئایشــدا، کە ســەر بە ناحیەی وارماوەیە، هەروەها لە شــارەزووردا لە ناحیەی خورماڵدا نیشــتەجێن، هەروەها لە کانی چەقەڵ، باوەنوور، کانی ســارد، بانی خێڵان، سویلەمیش، هەیاس.

ئــەم تیرەیە ئەورۆ گەلێک کەســانی هەڵگری بڕوانامــەی زانکۆیان تێدایە و کەمتر لە دێهاتدان زۆرتر لە شــار و شــارۆچکەکانی سەر جادە و ناحیە و قەزاکاندا دەژین. بەو پێیەی زەمان لە ناو ژیانی ئەمڕۆیدا گونجاون و منداڵ و گەنجەکانیان کچ و کوڕ بە خوێندنەوە خەریکن.

لــە نــاو ئەم تیرەیەدا پیاوانی ناســراوی زۆریان تێدا هەڵکەوتووە، جگــە لەو ناوانەی وا باس کراون، کەســایەتی وەک «حاجی قادری شــاتری»یان تێدا هەڵکەوتووە، کــە لە زۆر بارو دۆخدا قسە بیستراو بووە.

حاجی ئیبراهیمی شاتری، شیعری نووسیوە و دیوانێکی لە شیعرەکانی بە چاپ گەیاندووە.
مارفی حەمەی عیلوبی، پیاوێکی ژیر و ئەستێرەناس بووە.
حاجی مەحموودی عەلی، ئازا و لێهاتوو بووە.
حاجی مەحموودی فەرەج.
حاجی خەلیفە عەلی.
ئەحمەدی سۆفی.
سۆفی عەبدولقادری ئەحمەدی حەمەی هەیەر.

زۆر سوپاســی رەفیقــی حاجــی مەحمــوود عەلی دەکەم، کــەوا لە رووی برێــک زانیارییەوە هاوکاری کردم.



نەنەخانمی ژنی حەمە پاشای جاف، لە تیرەی شاتری بووە و دایکی مەحموود پاشای جاف و وەسمان پاشای جاف بووە

# تیرەی نەژوینی

تیـرەی نەژوینی، یەکێکی کەی تیرەکانی عەشـیرەتی جافە وەک تەواوی تیرەکانی تری جاف گەرمیـان و کوێسـتانیان کردووە و بە ماڵـداری و ئاژیل بەخێوکردنەوە خەریـک بوونە، زۆرتر تێکەڵاوی تیرەی شاتری بوونە و لە رووداوەکاندا لەسەر ئەوان حیساب کراون و لە خێر و شەڕدا شەریک بوونە، بەسەر ئەوەشدا لە هەڵسووڕانی تیرەکەیاندا ئازایانە رەفتاریان کردووە و ماوە و مەودایان نەداوە بە دەستێوەردانی کەسانی غەیری تیرەی خۆیان لە کار و کردەوەکانیاندا.

## ناوی نەژوینی:

وەک باوە و بیسـتراوە، گوایە ناوی ئەم تیرەیە لە وشـەی نوێژەوە وەرگیراوە، دیارە ئایین و خواپەرسـتی لـە نـاو ئەم تیرەیـەدا لە تیرەکانی کەی جـاف، بڕێک قایـم و قووڵتر بووە، وەک دەمچەرمووانی ناو نەوژینی دەیگێڕنەوە.

خاڵێکی سـەرژمێری لە کەلی پەیکولیدا لە لایەن دەسـەڵاتی عوسـمانییەوە دروسـت کرابوو، ئێسـتاش ئاسـەواری هێشـتا هەر مـاوە و هەتاوەکو دوای هەروژانی دەسـەڵاتی عوسـمانی و دروسـتبوونی دەوڵەتی ئێراق ١٩٢٠، لەو خاڵەدا پۆلیسـی (قوەی سـەیار) نیشـتەجێ بوونە و لە هاتوچۆی گەرمیان و کوێسـتاندا سـەرانەی ئاژیلیان وەرگرتووە. ئیـدی تیرەکانی جاف بە نۆرە لـەو تەنگەریـەی «کەلـی پەیکولی»دا دەگوزەران و بـە گوێرەی ژمارەی ئاژیـل و مەڕ و ماڵات

سەرانەیان بە دەوڵەت دەدا (بەندەی نووسەر دوو ساڵ لەوێدا پێشمەرگە بووم، پام لە زۆر بەردی هەڵکەوتووە).

نـۆرە دێتە سـەر خێڵـی «نەژوینی» یاسـاوڵ و جەندرمە چـاوەڕوان دەبن و ئـەو خێڵە لە جێگەکەیـدا تۆپەڵیان کردووە و سـەرناکەون، کە دەپرسـن بۆ وا کۆبوونەتـەوە. دەڵێن خەریکی نوێژی نیوەڕۆن. ئیدی لەو ڕۆژەوە خێڵی نەوژینی بەو ناوەوە ناو دەبرێن.

ئـەم تیرەیـە وەک تـەواوی تیرەکانی کەی جـاف کۆچەر و ڕەوەند بوونـە و هەوارگەیان لە کوێسـتاندا لەگەڵ تیرەی شـاتریدا بـووە لە گەرمیاندا جێگەیەکـی تایبەتمەندیان هەبووە بە ناوی «ڕەقەی نەژوینی».

نەژوینـی ئـەوڕۆ وەک هەر تیرەیەکی سـەربەخۆی جـاف بە گوێرەی زەمـان زۆر بوونە و لە چەندین بەرەبابی سـەرەکی پێکهاتوون. لە چەند دێ و شـارۆچکەی گەرمیان و شـارەزووردا پەخـش و بـڵاون، لـە ناو یەکدا هەمیشـە یەکگرتنێکی پتەویـان هەیە و کچ و کـوڕی ئەم تیرەیە ئەوڕۆکە زۆریان زانکۆیان تەواو کردووە و ژیانێکی سەردەمییانەیان پێکهێناوە.

### ناودارانی تیرەی نەژوینی

١- حاجی عیسای پیروەیسی
٢- محەمەدی عیسای پیروەیس
٣- عەتای عیسا پیروەیس
٤- دارای عیسا پیروەیس
٥- کامەران عیسا پیروەیس
٦- موسا پیروەیس عیسا
٧- حاجی مەحموودی ڕەنالیخان
٨- سالحی ئەولکەریم
٩- حاجی حەمە عەزیزی فەقێ سەمین
١٠- عەبدوڵلای حوسێن
١١- ئەولکەریمی عەبدوڵلا
١٢- حەمە ئەمینی حسێن
١٣- مستەفای نەویجان
١٤- عەبدولحەمیدی نەویجان
١٥- فەتاحی نەویجان
١٦- عەبدولقادری نەویجان
١٧- حاجی حەمە سالحی نەویجان
١٨- حەسەنی حەمە جاف
١٩- محەمەدی ڕۆستەمی عەزەم

٢٠- محەمەدی پیروەیس عەلی وەیس
٢١- حەمە ئەمین سەمین
٢٢- خەلیفە زۆراب
٢٣- خەلیفە محەمەدی زۆراب
٢٤- مەلا عەبدوڵڵای حوسێن
٢٥- فەقێ سلێمانی حوسێن
٢٦- محەمەد حوسێن
٢٧- مستەفای حوسین
٢٨- کەریم حوسێن
٢٩- رەسول هەسەن
٣٠- ئەحمەد هەسەن
٣١- ئەمین چەورد
٣٢- مەحموودی محەمەدی ئەمین
٣٣- حەمەی رۆستەم
٣٤- عەلی فەقێ سلێمان
٣٥- سدیقی حەسەن
٣٦- عەلی خەلیفە ئەحمەد
٣٧- مەکودی رۆستەم
٣٨- حەمە ساڵحی حوسێن
٣٩- کەریمی حەسەن
٤٠- ئەحمەد سلێمان

## چەند مەلایەکی بەناوبانگی تیرەی نەژوینی:

- مەلا سەمین.
- مەلا مەحموود، ناسراو بە مەلا رەش.
- مەلا عەبدوڵڵای حوسێن.
- مەلا رەئووفی عومەر.

ئەورۆ ئەحمەدی عیســای پیروەیس لە ناو تیــرەی نەژوینیدا بە برا گەورەیان دانراوە، لە ناو ئەو تیرەیەدا پیاوماقووڵ و دەمچەرمووی زۆرە.

# چەند کەسایەتییەکی ناسراوی تیرەی نەژوینی



مەلا مەحموودی ئەمین عەبدولقادر
١٩١٨-١٩٩٤، ناسراوە بە مەلا مەحموودی گوبان



حەمە کەریمی رۆستەمی حەمە وەلی، ١٩٢٠-٢٠٠٩



حاجی عیسای پیروەیس، ١٩١٢-٢٠٠٣



عەتا عیسا پیروەیس، ١٩٥٣-١٩٩٧



دارا عیسای پیروەیس، ١٩٥٥-١٩٩٧



کامەران عیسا پیروەیس، ١٩٦٨-٢٠٠٥



حاجی نادر حەسەنی عەلی، ١٩١٦-١٩٨٧



حاجی نادر قازی عەلی پیریک، ١٩١٤-١٩٨٨



ئەحمەد سلێمان شاقوان، ١٩٣٠-١٩٩٠



مەحموود سلێمان شاقوان، ١٩٣٢-١٩٩٣



سەلام مەحموود سلێمان، ١٩٦٠-١٩٩٣



ئەولکەریم حەمەی رۆتەم، ١٩٣٦-١٩٨٥



حەمە عەلی خوسرەو، ١٩٣٤-٢٠٠٦



مەحموود ئەحمەد زۆراب، ١٩٤٧-٢٠٠٩



عومەر حوسێن عەلی پیریک، ١٩٢٨-٢٠٠٨
ئەم پیاوە باوکی مەلایەکی زیرەک و دانایە بە ناوی مەلا «رەئووف»



کەریم رەسول حەسەن، ١٩١٢-١٩٧٧



عەبدوڵڵای ئەحمەدی حەسەن، ١٩١٣-٢٠٠١



مەحموود حەسەن ئەحمەد، ١٩٢٥-٢٠٠٨



حەمە ساڵح ئەولکەریم، ١٩٤٠-١٩٩٤



عەزیز سەعید مستەفا، ١٩٥٠-٢٠٠٧



حەمە ساڵح ئەمین، ١٩٣٧-٢٠٠٩



حاجی عەلی حەمە بوری پیروەیس، ١٩١٥-١٩٩٥



ئەحمەد محەمەد پیروەیس، ١٩٢٩-٢٠٠٣



کەریم عەبدوڵڵا حەسەن، ١٩٣٧-٢٠٠٠



حسین عەبدولقادر نەویجان، ١٩١٢-١٩٦٨



مەحموود ساڵح رەسول مستەفا، ١٩٣٧-٢٠٠٧



عەزیز رۆستەم رەسول، ١٩٤٠-٢٠٠١



حەمەی سوفی ساڵح، ١٩٤٢-١٩٩٦



مستەفا حەسەن ئەحمەد، ١٩٢٥-٢٠٠٩



عەزیز ئەحمەد شاوەیس، ١٩١٥-١٩٨٠



محەمەدی خەلیفە زۆراب، ١٩٢٠-١٩٦٦



حەمە ساڵحی حسین حەسەن، ١٩٣٦-١٩٩١



ئەحمەد محەمەد مەحموود، ١٩١٠-٢٠٠٣



حەمە ئەمین حسین حەسەن، ١٩٣٨-١٩٩٦



قادر ئەحمەدی حەسەن، ١٩٢٤-٢٠٠٧

تیرەی نەژوینی لە کۆندا لەسەر شاتری حیساب دەکران، وردە وردە نیشتەجێ بوونە و ژمارەیان زۆرتر بووە، هەستی سەربەخۆیی وەک تیرەیەکی سەرەکی جولاونەتەوە، بە پێی گۆڕانکاری کە لە چۆنیەتی گوزەران و ژیاندا روویداوە و بۆتە هۆی پەخش و بڵاوە کردنیان. ئەوڕۆ براگەورەیان ئەحمەدی حاجی عیسای پیروەیسە.

سوپاسی کاک ئەحمەد حەمە ساڵحی نەویجان دەکەم، لەسەر سەید خەلیل زانیاری پێداوم.

# کۆکۆیی

هیچ تیرەیەک یان عەشیرەتێک لە پڕ و زەمانێکی کورت و کەمدا پێک نەهاتووە، یان لەناونەچووە، لەو دوو حاڵەتەدا چەند هۆیەکی سەرەکی هۆکار بووە وەک: شاڵاو و شەڕ و پەلامار و قاتی و قڕی و نەخۆشی، ئەوانە هۆی لاوازی یان لەناوچوونی عەشیرەتێک بوونە، لە لایەکی ترەوە لێهاتوویی عەقڵ و درایەت و لێزانی و دەوڵەمەندی و ئازایەتی هۆکاری سەرەکی بەربڵاوی هۆزێک بووە یان عەشیرەتێک.

من شەخسەن لە باوەڕێکدام هیچ رەگەزێک بە مەفاهیمێکی نەژادی و رەگەزایەتی زۆر خاوێن نەبووە و نیشە، جەبری زەمان و مەرجەکانی ژیان و ئەو رەگەزەی ناچاری کردووە تا تێکەڵی خەڵکانێکی تر بێت. عەشیرەت و هۆزەکانیش هەروا لەو مەرجانە بە دوور نەبووە. بۆ نموونە دوور نەڕۆین هۆزی جاف لێکدەینەوە. خۆ ناکرێت ئەم عەشیرەتە بەربڵاوە هەر هەموویان کوڕی یەک باوک بن، چەندین تیرە لە ناو هۆزی جافدا هەن ئەوڕۆ لە تەواوی تیرەکانی تر لە رووی جافایەتییەوە دەماگرژترن رۆژگارێک باو و باپیرانیان بە رێکەوت و بەپێی رووداو یان جەبری زەمان لە ناو هۆزی جافدا گیرسانەتەوە و ئەوڕۆ بە تیرەیەکی سەرەکی ئەم عەشیرەتە دەژمێردرێن، ئەمە هیچ لە مەسەلە سەرەکییەکە ناگۆڕێت. ئەوە زەمانە کەفیلە بۆ گۆڕانکاری. بنوارە «با» توانای ئەوەی هەیە کێوێکی سەنگی هەڵوەرێنێ دڵۆپە ئاو بەردێکی خارا کون بکا. لە بیرت نەچێت بە درێژایی زەمان، ساڵێک، دوو دە سەد هەزار یان دوو هەزار، ئەی سەدان ساڵی پێکەوە ژیان لە تاڵی و سوێریدا لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە تێکەڵاوی ژن و ژنخوازیدا لە کۆچ و باردا کەفیل نابێت بۆ یەکسانبوون و هاوخۆشی و هاوسۆزی و دڵسۆزی یەکتر.؟

ئەوەیان موعادەلەیەکی حاشا هەڵنەگرە ئێمە وەک جاف زۆربەی زۆرمان لە کوردستانی رۆژهەڵاتەوە هاتووینەتە گەرمەسێری کوردستانی باشوور رەنگە ئەو هاتوچۆیەمان لەپێش دروستبوونی دەسەڵاتی سەفەوی و عوسمانییەوە بێت، وەک لە بەشی میری جافدا لەم رووەوە دواوم، بەڵام دوای دروستبوونی دوو زلهێزی ناقوولای سەفەوی و عوسمانی و ناکۆکی هەمیشەیی نێوانیان سا لە رووی ململانێی دەسەڵات بووبێت یان ئایینی لە هەردوو بابەتەوە زەرەرمەندی سەرەکی میللەتی کورد بووە و کوردستان لە ژێر ناڵی ئەسپ و لەشکری ئەو دوو هێزە داگیرکەرەیدا پلیشاوەتەوە وێران کراوە، ئەویش نە ساڵێک نە دوو، بەڵکو بە درێژایی

سەدان ساڵ، هەر ئەو شەڕ و شۆڕ و پەلامارانە بوونەتە هۆی زەرەر و زیان و کۆچ و کۆچبار و تاڵان و بڕۆی ناوچەکان، ئەو دەمەش زۆربەی زۆری هۆزی جاف ژیانێکی خێڵەکییان هەبووە و ئاژیلدارییان کردووە بە دوای لەوەڕی ئاژیلدا گەرمیان و کوێستانیان کردووە و ئەویش بە شێوەیەکی ساڵانە بە پێی بەرنامەیەکی زانراوی داڕێژراو هەر تیرەیەک لە تیرەکانی جاف ڕێگە و نەریتی تایبەت بە خۆی هەبووە هەوارگەی دەستنیشانکراوی خۆی هەبووە و لەوەڕگەی ئەو خێڵە خێڵێکی تر دەستدرێژی بۆ نەدەکرد. بەڵام چەندین ڕووداوی گەورە هاتووتە سەر ئەم هۆزە گەورەیەدا کە ناسراوە بە ناوی «جاف» یەکێ لەوانە دوو پەلاماری گەورەی کوتوپڕی میرنشینی «ئەردەلان» بووە بۆ سەر دەڤەری جوانڕۆ وەکو کۆچکردنی بەشێکی زۆری هۆزی جاف بۆ ژێر دەسەڵاتی میرنشیی بابان و عوسمانی بە سەرۆکایەتی «زایەر بەگی جاف» بە تەئکید تیرەی «کۆکۆیی» یەکێک بوونە لەو هیجرەتەیدا بەشدارییان کردووە یان لە دواییدا هاتوون.

## ناوی کۆکۆیی:

وشەی «کۆ + کۆ»ی دوو وشەی پاش وەند و پێش وەندی وەک یەک وان، زۆرتر لەوەی دەڕوا ئەم ناوە لە وشەی «چیا، شاخ، کێو» وەرگیراوە ڕەنگە لەناو ئەم تیرەیەدا ئاشتەوایی، خیبرە و لێزانی کێو کەمەری هەڵکەوتوویان تیادا بووبێت، یان خسڵەتێکی وایان بووبێت هەمیشە هەوارگەکانیان بەسەر لوتکە و بڵندەکانەوە بووبێت سا بۆ ڕۆژی مەبادا و بەرگری لە شاڵاو و پەلامار یان لەترسی باو و باران و تۆف و لافاو، یان لێزان بوونە لە هەڵبژاردنی لەوەڕگای پڕ بەرەکەتی ناو لاپاڵی کێو کەمەری چیاکاندا.

بۆچۆنێکی تریش هەیە کەوا لە ناو ئەم تیرەیەدا هاوبەستەگی و خزم و خوێشی لەناویاندا لە تیرەکانی کەی جاف بتەو و قایم و قووڵتر و بیستراوە دەڵێین چوار کۆکۆیی لەناو سەد کەسدا بن بە لای یەکەوە دادەنیشن و لە یەک دوور ناکەونەوە (خۆزگە هەموو کورد وا بووبایە) وەکو کۆکۆیی کۆدەبنەوە.

## دوای نیشتەجێبوون:

وەک وتمان ئەم تیرەیە وەک تیرەکانی کەی جاف ڕەوەند بوونە و گەرمیان و کوێستانیان کردووە و بەو پێیەی گۆڕانکاری ژیان و برێک لە جەبر و تەوژمی سیاسی و دامەزراندنی دەوڵەتی ئێراق و جەبر و جەبەرووتی دامودەستگای ڕەزا شایی و قایم و قووڵکردنی سنووری نێوان ئێراق و ئێران زۆربەی زۆری تیرەکانی جاف ناچاری نیشتەجێبوون کران، برێک لەو تیرانە لە هەوارگەکانی خۆیاندا لە جویەی ڕەشماڵدا چنگیان خستە قوڕ و خانوو بەرەیان دروست کرد و برێکی کەش لە تیرەکانی جاف نەیانتوانی ببنە خاوەن دەڤەر و ناوچەی تایبەتمەندی خۆیان لە ناو تیرە گەورە و بە دەسەڵاتەکانی کەی جافدا دابەش بوون لە ناو ئەو تیرانەیدا کەوا خزمایەتییان هەبووە و پەیوەندی دۆستایەتی و خوێشایەتییان بەهێزبووە.

دیــارە کۆکۆییــەکان وەک ئیناخــی و ئیمامی و زەردوویی نەیانتوانیوە دەســت لە چیا و دۆڵ و دەربەندەکانیــان هەڵگــرن و بە شــەڕ و بە ئاشــتی بــووە هاوینیان گەیاندۆتــە (کویلە، ماکوان، نمرە ساوەند، شاهو)وە و وەک زستانە هەواریش لە دەوروبەری هەڵەبجە دوورنەکەوتوونەتەوە چەندین سەرچاوە باس لەوەی دەکا کەوا زەردوویی و کۆکۆیی لە بنەچەکدا کوڕی یەک بەرەبابن. خوالێخۆشــبوو کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشــای جاف لە کتاوەکەیدا «تاریخی جاف»دا کە ئەو دەم ئەو کتاوی نووسیوە سەرۆکی فەرمی سەرتاسەری هۆزی جاف بووە ناوی زەردوویی و کۆکۆیی وەک لازم و مەلزووم پێکەوە دێنێت.

کۆکۆیی ئەم دێهاتانەیان ئاوەدانکردۆتەوە (باوەکوچەک، چاوگ، چلنر، نەیجەلە، بوین، کۆکۆیی شەمیران).

## مێژووی کۆکۆیی:

بەنــدە تا بە ئەمڕۆ نە بیســتوومە و نە لە هیچ ســەرچاوەیەکی مێژوییــدا بەرچاوم کەوتووە باس لە «جاف» نەبوونی کۆکۆیی بکات بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆر لەو سەرچاوانە تەئکید لەوەی دەکــەن ئــەم تیرەیــە یەکێکە لە تیرەکانــی جاف و بە گوێــرەی مەرجی مێژوویــی و جوگرافی و ئنتروپۆلۆژی جافێکی خالسن.

کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشا کە ئەودەم سەرۆکی فەرمی هۆزی جاف بووە لە کتاوی «تەئریخــی جــاف»دا دەڵێت: تیرەی زەردوویی و کۆکۆیی هەمیشــە پێکــەوە بوونە و بە بنەچەدا کوڕی یەک بەرەبابن.

مێژوونووسی ســەردەمی دەسەڵاتی «ئەردەلان و قاجاریە» «عەلی ئەکبەری وەقائع نیگار» لە کتاوی عەشایەر و ئیلاتی کوردا کاتێک باسی تیرەی زەردوویی دەکا باس لە ساتیارییەکان و کۆکۆییەکان دەکا کە لەگەڵ زەردووییدا تێکەڵاون.

«مێجەرســۆن» کە بۆ خۆی ماوەیەک لەماڵی وەســمان پاشای جافدا وەک «میرزا بنووس» ژیــاوە و ئــاگاداری هەڵەبجە و دەوروبــەری هەڵەبجە بووە دەڵێت: کۆکۆیــی تیرەیەکن لە هۆزی جاف.

ئەم تیرەیە وەک تیرەکانی کەی جاف ســنووری دەســتکردی نێوان کوردستانی رۆژهەڵات و باکوور بوونەتە دوو بەشەوە بەشێکیان هەر لە دەڤەری جوانڕۆ ماونەتەوە بەشێکی تریان لەگەڵ کۆچەکەی زایەر بەگی جافدا هاتوونەتە ژێر دەسەڵاتی میرنشینی بابانەوە..

لە بنەچەکدا وا دیارە باپیرەگەورەیان بە ناوی «شــاولی» ناســراوە و وەک هەر تیرەیەکی تر دابەش دەبنە سەر چەندین بنەماڵە و بەرەبابدا وەک:

١- شاوەیس
٢- غولام وەیس
٣- موريد وەیس
کە بە جافییەکەی دەوترێ (شاوەیس، خولاوەیس و مری وەیس)
بڕێک لەم تیرەیە لە کوردســتانی رۆژهەڵاتدا لە هەورامانی تەخت نیشــتەجێن (هانەمەفەران، هانەحەمەسوور). جاران ژمارە و دێهاتی تایبەتی تیرە و هۆزەکانی غەیری جاف و جاف دیاری و دەستنیشانکراو بوونە بەڵام بە هۆی بار و دۆخی سیاسییەوە ئەو دەقانە تێکڵاو بوونە و بە زەبر و زۆری دەســەڵاتی بەعســەوە تەواوی دێهاتی کوردســتانیان وێران کردووە یان راگوێزراونەتە جێگە و شوێنی دیاریکراو.

بە شــێوەیەکی تێکڕایی تیرەی کۆکۆیی جگە لە تێکــەڵاوی زەردوویی لەگەڵ ئیناخی، ئیمامی، نەورولّی، شــەمێرانیدا پەیوەندییەکی پتەویان هەیە و لە دەڤەری جوانڕۆدا لەگەڵ باوەجانییەکاندا تێکەڵاون.

ئەم تیرەیە یەکێکە لەو تیرە ئازا و خەباتکەرانەی کە پەیوەســتە چەکی مەردایەتییان لە شــاندا بــووە و لە راپەڕینە نەتەوایەتییەکاندا ئەگەر لە پێشــەوە نەبووبن مەردانە بەشــدارییان کردووە، بــۆ نموونە کاتێک شــاعیری نەتەوایەتی میللەتی کورد (ئەحمــەد موختار جاف) چەکی کوردایەتی هەڵدەگرێت زۆربەی چەکدارەکانی لە تیرەی کۆکۆیی بوونە بە تایبەتی دەور و نەخشــی بڕێکیان لەگەڵ (ئەحمەد موختار جاف)دا سەرەکی بوونە وەک:

١- فەتاحی محەمەدی شاوەیس
٢- حەمە لەتیف
٣- محەمەد شایەری
٤- حەمە ئەمین
٥- ئەحمەدی کاکە سەن

چۆنیەتــی تیرۆرکردنی ئەم شــاعیرە بەرزەی کوردە دوورئەندازەکانی دیارین و لەم باســی ئێمەوە بە دوورە، دوای کوشتنی تەرمەکەی دەگێڕنەوە ناو شاری هەڵەبجە و لەو رووەوە شیوەن و سەربوردەی زۆر وتراوە، ١٩٣٥ و لە دواییدا لە گۆڕستانی عەبابەیلێ دەینێژن. ژنانی جاف بەم شێوەیە شیوەنیان بۆ ئەحمەد بەگ دەگێڕا:

**بڵێین (نەهیەخان)[١] نەکا خەوی خۆش**
**کاکەی کوژراوە بە گوللەی (.....) رەش**
**بڕۆنە سەربان بکەن تەماشا**
**قاڵیان براوە کوڕەکانی پاشا[٢]**

---

(١) نەهیە خانم خوشکی ئەحمەد موختار بووە کچی عوسمان پاشای جاف.
(٢) پاشا لێرەدا مەبەست لە عوسمان پاشای جافە.

بــە پێــی ڕووداوەکان پەیوەنــدی نێوان بەگزادەی جــاف و تیرەی کۆکۆیــی زۆر پتەو بووە، هەروەهــا لــە ڕاپەڕینی جوانڕۆییەکاندا دژ بە دەســەڵاتی پەهلەوی کە ناچــار دەکرێن «جوانڕۆ» بەجێبهێڵن لە ناو تیرەی کۆکۆییدا نیشتەجێ دەبن..

لە شۆڕشەکانی میللەتی کوردا دژ بە دەسەڵاتی عارەبی ئێراق ئەم تیرەیە ژمارەیە کی زۆریان لە ریزی پێشمەرگەدا بوونە و لە شەڕ و بەرگرییەکاندا دەوری سەرەکییان هەبووە و قارەمان و لێپرســراوی زۆریان تێدا هەڵکەوتووە و ژمارەیەکی زۆریش شەهیدی سەنگەریان لە ناودا وەدی دەکرێت، ژمارەیان لە (٥٦) شــەهید زۆرترە، جگە لەوەی لە ئەنفاله خوێناوییەکەشــدا دیســان ئەم تیرەیە ژمارەیەکی زۆریان کراونەتە قوربانی..

لەناو ئەم تیرەیەدا دوای نیشتەجێبوونیان بایەخێکی زۆریان داوە بە مزگەوت و خوێندن، بۆیە هەر لەمێژە مەلای منەوەری زۆریان تیادا بووە، کە ئێستا شێوەی ژیان و زۆرتر سیستەمی خوێندن و ئەکادیمییەت بووە بە باو، ئەم تیرەیە لەو ڕووەشەوە دوانەکەوتوون، ئەوڕۆکە ژمارەیەکی زۆر هەڵگری بڕوانامەی دوکتۆرا و ماجستێر و بەکالوریۆس و دەرچووی پەیمانگاکانیان تێدایە بە پێی زانیاری بەندە (٥٠٤) کەسی دەرچووی زانکۆیان لە کچ و کوڕەوە تێدایە و گەنجەکانیان پەیوەستە لە کۆلیج و زانکۆکاندا بەردەوامن لەم دواییەدا چەند برادەرێکی خوێندەواری تیرەی کۆکۆیی لەم ڕووەوە ئامارێکیان پێدام «ماڵیان ئاوا» منیش هەر وەک خۆی دەینووسمەوە:

هەڵگری بڕوانامە ٥٠٤ کەس
خوێندکاری زانکۆ ١٥٤ کەس
سەروو ناوەندی ٢٥٠
(٦٥) کچــی کۆکۆیــی هەڵگــری بڕوانامــەی ئەکادیمییــە و (١٧٠) کچــی کۆکۆیی مامۆســتای قوتابخانەکانن.

**سوپاس و پێزانین:**

گەلێک سوپاســی ئەم برادەرانەی خوارەوە دەکەم بە ڕاســتی زەحمەتیان کێشاوە و لە بارەی تیــرەی کۆکۆیــی هۆزی جاف زانیاری بە نرخیان پێدام (خوســرەو جاف) وەک خاوەن قەڵەمێکی ئەمڕۆی کورد ئومێدەوارم نموونەیان لە ناو میللەتەکەم و عەشیرەتەکەمدا زۆرتر و زۆرتر بێت.

١- کاک ڕەئووف حاجی فەرەج کۆکۆیی، ئەندامی پەرلەمان، خولی یەکەم.
٢- کاک فارس عەلی عارف کۆکۆیی، مامۆستای قوتابخانە.
٣- سالم عەبدولقادر ئەحمەد «شادی» نووسەر و ڕۆژنامەنووس

## کەسایەتییەکانی ئەوسای تیرەی کۆکۆیی هۆزی جاف



حاجی عەلی عارف



حاجی میرزا عەبدولکەریم ١٩٠٠-١٩٥٩



حاجی فەرەجی زەڕە ١٩١١-١٩٩١



مەلا حامیدی محەمەد خەسرەو ١٩٠٠-١٩٦٣



مستەفا حاجی میرزا عەبدولکەریم



مەلا مستەفای نادر ١٨٩٠-١٩٦٤



مەحموود نادر محەمەد



محەمەد رەشید عەبدولرەحیم ١٩١٤-١٩٧٣



شەهید قادر کۆکۆیی ١٩٤٢-١٩٩٥



محەمەد عەلی حەمە بۆر



حاجی رەشیدی قەوقەو ١٩٢٢-١٩٩٥



مەجیدی مەلا حەمید



کەریم محەمەد مەحموود «کەریم حەجێ»



حاجی واحیدی کاکەمەد ١٩٢٧-٢٠٠٥



چەندین مەلای کۆکۆیی (مەلا عەلی و
مەلا لەتیف)، بامۆکی تیا ناسراوە.



حاجی بارام نادر و خێزانەکەی «رەزیە خانم» ١٩٢٣-٢٠٠٦



خەیریە خانم، خێزانی ئەحمەد نادر کۆکۆیی



مەلا شەفیق کۆکۆیی ١٩١٢-٢٠٠٨



فەقێیەکانی مزگەوتی پاشا ١٩٥١، مەلا محەمەدی خەتیب، مەلا عەلی کۆکۆیی، بەپاوە وەستاوکان



مەلا فارسی عەلی عارف



ئیبراهیم مەلا کەریم

## کەسایەتییەکانی کۆکۆیی کە لە ژیاندا نەماون:

١- حسێن پەرویز نەزەر ١٨٤٥-١٩٠٥
٢- عارف محەمە شاوەیس ١٨٨٦-١٩٥٦
٣- ئەحمەد حسێن پەرویز ١٨٧٠-١٩٢٠
٤- حاجی مەلا حامید محەمەد حسێن ١٩٠-١٩٦٣
٥- حاجی فەرەج نادر ١٩١٢-١٩٩٠
٦- حاجی فەرەج زەرە ١٩١١-١٩٩١
٧- مەلا مستەفا نادر ١٨٩٠-١٩٦٤
٨- ئەحمەد عەبدولکەریم ئامە ١٩١١-١٩٨٦
٩- مەلا شەفیق محەمەد کەیخوسرەو ١٩١٢-٢٠٠٨
١٠- میرزا عەبدولکەریم عارف ١٩٠٠-١٩٥٩
١١- فەتاح حەمەی شوایش ١٩٠٠-١٩٧٠
١٢- مەلا حەکیم عەبدولقادر فەتاح ١٩٢٠-١٩٩٢
١٣- حەمە رەشید ئەورەحیم نەورۆز ١٩١٤-١٩٧٣
١٤- مەلا مستەفا حەمە رەحیم ؟؟؟؟-١٩٦٩
١٥- ئەحمەد عەلی ئەحمەد رەمەزان ١٩٢٩-١٩٩٤
١٦- حاجی محەمەد فەقێ ١٩١٧-١٩٩٨
١٧- عەبدوڵڵا حەمە میرزا ١٩١٢-١٩٩٥
١٨- حاجی رەشید قەو قەو ١٩٢٢-١٩٩٥
١٩- رەمەزان باوەیس عەلی وەیس/ گوندی بۆیی ١٨٩٧-١٩٧٥
٢٠- ساڵح عیسا/ کۆکۆیی تەیجلە
٢١- حاجی بارام نادر ١٩٢٣-٢٠٠٦
٢٢- حاجی رەشید سۆفی حەمەدەمین١٩١٤-١٩٨٤
٢٣- ئەلماس کۆکۆیی شەمێران
٢٤- حەمەی رۆستەم- کۆکۆیی شەمێران
٢٥- حەمە رەحیم حەمە خان/ کۆکۆیی (تین) کوردستانی ئێران
٢٦- حاجی مشیر مستەفا ١٩١٢-٢٠٠٠
٢٧- حاجی واحید کاکەمی ١٩٢٧-٢٠٠٥
٢٨- حەمە ساڵح عەبدولکەریم ١٩١٥-١٩٦٩
٢٩- زێڕین حسێن محەمەد/ ناسراو زەرە ١٨٧٩-١٩٥٩
٣٠- رەوشەن مەولوود پەرویز ١٨٨٠-١٩٨٨
٣١- مینای ئەحمەد عەلی حەمە شەریف/ بۆیی ١٩١٨-١٩٨٨
٣٢- خاتوون نادر سەید محەمەد ١٩٢٧-١٩٩٨
٣٣- عەلی ئەورەحیم نەورۆز ١٩٠٩-١٩٧٤
٣٤- خالید حاجی فەرەج زەرە ١٩٤٣-١٩٦٨
٣٥- قادر کۆکۆیی ١٩٤٢-١٩٩٥

## کەسایەتییەکانی ئێستای کۆکۆیی:

کوێخا ئەحمەد محەمەد نادر
رەئووفی حاجی فەرەج
حاجی قاسمی مەلا مستەفا
حاجی فایق ئەحمەد حەمەدەمین
مەلا عەلی عەبدولڕەحمان
تۆفیق مەولوود کاکە خان
حاجی قادری حاجی میران
ئیبراهیم ئەحمەد ئەمین
حەمە بۆری عەلی
سمکۆ موشیر مستەفا
شەفیق حاجی رەشید قەو قەو
محەمەد عەبدولقادر باوەیس
تاهیر رەشید عەبدولکەریم
حاجی سلێمان محەمەد عینایەت
سلێمان حاجی تۆفیق
ئەفراسیاب رەشید عیسا
سابیر ئەحمەد قادر
حاجی جەلال ساڵح سوبحان
محەمەد عەبدولڕەحمان فەرەج بۆل بۆلی
عەزیز رەحیم قادر
شەریف حاجی مەجید
تۆفیق حەمە رەحیم وەلی



رەئووف حاجی فەرەج کۆکۆیی
ئـەم زاتە لە بارەی کۆکۆیـی و وردەکاری زانیارییەکان زۆر یارمەتی دام، دووبارە سوپاسی دەکەم و هەروەها سوپاسـی ئەو برا ئازیزانەی یارمەتی ئەویان داوە خودا نموونەیان زۆر بکات..

## روونکردنەوە

ئەو حەوت وێنەیە لەگەڵ شاعیری شەهیدی کوردایەتی «ئەحمەد موختار جاف»دا پێشمەرگە بوونــە، لــە تیرەی «کۆکۆیی» جــاف بوونە، بەداخــەوە ناوەکانیانم نەزانیوە، بــە تەئکید خزمانی «کۆکۆیی» دەیانناسنەوە.





# سمایل عوزێری

ئـەم تیرەیـە یەکێکی کەی تیرەکانی هـۆزی گەورەی جافە، وەک هـەر تیرەیەکی تر لە چەند بەرەبابێک پێکهاتووە:

١- گۆمەیی
٢- قەرەوەیسی
٣- میر ئالآیی
٤- سمایل عوزێری

بـە تەئکید ئەم تیرەیـە وەک خزمەکانیان ژیانێکی کۆچەرییان هەبـووە لەگەڵ تیرەکانی کەی هۆزی جافدا گەرمیان و کوێسـتانیان کردووە، وا دیـارە زۆرتر لە تیرەکانی مکەیالییەوە نزیک و تێکەڵاو بوونە و لە ڕێچکە خێڵی ئەوانەوە هاتووچۆیان کردووە لە کوێستاندا هەوارگە و لەوەڕگای تایبەتمەندیی خۆیان هەبووە و لە ڕێچکەی نەکەروزان، کەلی خان، پیرهەورامان، خۆیان گەیاندۆتە کوێستان و لە نێوان شاری سەقز و بانەدا دابەزیون.

لە کورســتانی باشووریشــدا ناوچە و دەڤەری تایبەت بە خۆیان هەیە و زۆرتر لە پارێزگای سلێمانیدان، بە تایبەت لە چەمچەماڵ و سووورداشدا نیشتەجێن.

ئەم تیرەیە لە ئازایەتیدا ناوباو و شـۆرەتی زیادیان بەدەسـت هێناوە، دیارە لە ڕووداوەکاندا هەمیشە جێگەی دەستیان دیار بووە.

کەریم بەگی جاف لە کتاوەکەیدا «تەئریخی جاف»، کە ئەودەم ئەو کتاوەی نووسـیوە، ساڵی ١٩١٤ بووە، دەڵێت:

سـەد سـاڵ لەمەوبـەر، ئەم تیرەیـە لە هۆزی جـاف جیابوونەتـەوە و بە نـاوی «غەوارە» دەناسـرێن و تەواوی کاروبای عەشـایری و دەوڵەتی ئەم تیرەیە کە ڕۆژگارێک لەسـەر هۆزی جاف دەژمێردران، ئەوڕۆکە لە جاف جیابوونەتەوە و بۆ خۆیان ڕاسـتەوخۆ وەک عەشـیرەتێکی سەربەخۆ مامەڵە لەگەڵ دەوڵەت و خەڵکیدا دەکەن.

# تیرەی مامۆیی

لە بارەی ناو، سا جێگە بێت، یان شار، یان عەشیرەت، یان دەڤەر، بۆچوون زۆرە و لە بارەی ناوێـک چەندیـن لێکدانەوەی بۆ کراوە و هیچی لە مەسـەلەکەش نەگۆڕیـوە و ناوەکە وەک خۆی ماوەتـەوە، مەگەر بە گوێرەی درێژی زەمان گۆڕانکاری بەسـەر ئەو نـاوەدا هاتبێت، ئەڵڵاهومما دەسەڵاتێکی دڕ و خوێناوی بە جەبری ترس و تۆقیانەوە، ناوی گۆڕابێت، یان ئایین گۆڕابێت، لەو بابەتەش بینراوە..

بـا هەر دوور نەڕۆین، دەسـەڵاتی بەعسـی لە ئێراقدا نـاوی تەواوی لیواکانی گۆڕی، سـەیر لەوەدایـە دەوڵەتی تازەی ئێراق ناوەکانی نەگێڕایەوە سـەر ناوە کۆنەکانی خۆیان! دەی فەرموو، ئەوە کەرکووک، بە تەئمیم ناو دەبرێ، ئەوە لیوای مووسڵە بە نەینەوا، ئەوە لیوای کووتە، واست، ئەوانی دیکەش هەروا...

یان کاتێک دەوڵەت و دەسـەڵاتی سـەفەوییە لە ئێران پێکهات ئەودەم ٩٠٪ سەرتاسەری ئێران سـونە مەزهـەب بوون، ئەو دەسـەڵاتە دەمارگرژەی پابەندی شـیعە دوانـزە ئیمامییە بە زەبر و شمشێر و کوشتن و بڕین، زۆربەی زۆری ئێرانیان کردە شیعە مەزهەب.

تیـرەی مامۆیـی ئـەوڕۆ بەرەبابێکن لە هۆزی گـەورەی جاف دەژمێردرێـن، و زۆرتر لەگەڵ روغزاییدا تێکەڵاو ژیاون، ئەوڕۆکە بۆ خۆیان بە تیرەیەکی چوارچێوەداری سـەربەخۆ دەدرێن لە قەڵەم، بە لۆژیک بێ هەموو تیرە و عەشـیرەتێک یان لە کەسـێکەوە پێکهاتووە، یان چەند کەسێک، سا بە گوێرەی ڕووداوێک، یان هەلومەرجێکی تایبەت لە جێگەیەکدا گیرساونەتەوە و سەرئەنجام بوونەتـە تیرەیەک، ئەوانـەی ئیمانیان بە یەک خودا و ئایینە پیـرۆزەکان هەیە دان بەوەدا دەنێن، هەتاکو بەشەرییەتیش لە دوو کەسەوە پێکهاتووە (باوە ئادەم و دایە حەوا).

مامۆییەکان بۆخۆیان لایان وایە لە بنەچەکدا دەگەڕێنەوە سەر ئەردەلانییەکان و خۆیان بە کوڕ

ونەوەی (مەئمون بەگی ئەردەلان) دەزانن و لاشیان وایە ناوی «مامۆیی» لە وشەی «مەئمون»ەوە وەرگیراوە، بەندە لام وایە «مامۆیی» لە وشەی «مامە»ەوە وەرگیرابێت، لە سەرەتاوە پیاوێکی رێزدار و ناسراو کە دەوروبەر رێز و حورمەتیان لێگرتووە، لە ناو کوردەواریشدا رێز و پایەبەرزی بۆ دابنرێت، پێی دەڵێن مامە، وەک «مام جەلال»، یان «مام هۆمەر»، «مامە یارە» و «مامە ریشە»، هتد...

مامۆییەکان، کوڕ و کوڕەزا و نەوەی ئەو «مامە»یەن، بۆخۆیان دەڵێن دەگەڕێینەوە سەر ئەردەلانییەکان، ئەمەش لە حەقیقەتەوە دوور نییە، رەنگە وابێت و حەقیقەتی مێژوویی و جوگرافی ئەوە دەسەلمێنێت، کوردستانی گەورە بە پێی مێژوو لە دێرزەمانەوە لەژێر سمی ئەسپی داگیرکەراندا بووە، سا عەجەم و عارەب و مەغۆل و تورک بووبێت، یان وردە داگیرکەر و دەسەڵاتدارانی تر، بە گوێرەی سەدان و هەزاران ساڵ ئەم وڵاتی ئێمە بێگانە داگیری کردووە و هەرگیز دەسەڵات نەبووە، دەسەڵات بڕی هەر کوێی کردبێت ئەوە سنووری بووە...

وەک دەبینن، دوای سەرهەڵدانی دەسەڵاتی عوسمانی کە بە گوێرەی بڕەکەی زەمەنی و قووڵایی مێژوو شەش سەد ساڵ، یان حەوت سەد ساڵ بە زەمەنێکی زۆر ئەسیل لە قەڵەم نادرێت، وەک زانراوە کوردی کوردستانی باکوور هەزاران ساڵە لەو وڵاتەیدا ژیاون، لەبەر بێ دەسەڵاتی دان بە بوونیدا نانرێت، کە ئەو دەسەڵاتە دڕەی عوسمانییە کەوتە تەقەڵلای بەربڵاوی داگیرکردنی زۆرتر بووە، بەڵێ بۆ کورستانی رۆژهەڵات و کوردستانی باکوور کوتا و لەو پەلامارانەیدا بە گوێرەی شەڕەکان مەوقیعیەتی جوگرافی پەیوەستە لە گۆڕانکاریدا بووە، لە نێوان دەسەڵاتی سەفەوی ئێران و هەتاوەکو قاجاریش لەگەڵ دەسەڵاتی عوسمانیدا...

دوو میرنشینی دەسەڵاتداری کوردی لەو کاتانەدا لە دوو لای کوردستاندا هەبوون (ئیمارەتی ئەردەلان و ئیمارەتی بابان). سنوورێکی دیاریکراو لە نێوانیاندا دەستنیشان نەکرابوو و بە گوێرەی دەسەڵات ئەو سنوورانە پەیوەستە لە گۆڕانکاریدا بووە و شەڕ و شۆڕ و پەلامار لە دوو لاوە ئەنجامدراوە، ئەو شەڕانەش یەک رۆژ و دوو رۆژ نەبووە، هەر شەڕ و پەلامارێک گۆڕانکاری لە زۆر شتدا پێکدەهێنا، سا جوگرافی بووە، یان دیموگرافی، کوردستانیش بۆ هەر کوردێک باوان بووە و سا لە کوردستانی رۆژهەڵات یان باشوور یان باکوور، کورد توانیویە بە گوێرەی هەڵکەوت لە هەر بەشێکی کوردستاندا نیشتەجێ ببێت.

جا بۆیە دەڵێم، دوور نییە مامۆییەکان لەگەڵ یەکێک لەو هاتوچۆ سەربازییانەدا جێبەجێ بووبوون و لە ناو جافدا ژیاون، من لێرەدا ناڕۆمە ناو باسی دوور و درێژی ئیمارەتی ئەردەلانەوە، بێ شک زۆر سەرچاوە مێژووییەکان لەو رووەوە زۆریان نووسیوە و سەرچاوەی زۆریش بەدەستەوەیە..

تیرەی مامۆیی، لە ناو خەڵکیدا بە وەفا و پابەندی پەیمان و بەڵێنی خۆیان ناسراون، لە ناو تیرەکانی جافدا رێزلێگیراو بوونە، ئەم بەرەبابە خاوەنی بالای بەرز و دامەزراون، بڕێکی زۆریان ناندەر و خاوەن دیوەخانن، لەزۆربەی ناو تیرەکانی جاف و دەڤەری گەرمیان، شارەزوور، رانیە، قەڵادزە، سلێمانی، بێتواتە، بیتوێن، کەلار، کفری، سنە، موکریان. بەڵام زۆرتر لە شارەزووردا نیشتەجێن.

## پیاوە ناودارەکانی تیرەی مامۆیی:

١- محەمەدی ئەحمەد رەسول یار محەمەد غەفوور، ناسراو بە (حەمە مینا)، پیاوێکی لێهاتوو و دیوەخانـدار بـووە، ئازا بووە، سـوارکار بووە، لە شۆڕشـی کورد و پێشـمەرگایەتیدا خۆی و کوڕەکانـی بەشـدارییان کردووە، ئەوڕۆ لەم پیاوە چەندین کوڕ و نـەوەی خوێندەواریان تیادایە، بڕێکیان توانای نووسـین و خوێندنیان هەیە، حەمەی مینا، لە ناو خەڵکیدا خۆشەویسـت و رێزدار بووە. بەندە (نووسـەر) ئەم پیاوەم لە نزیکەوە ناسـیوە و دەزانم چەند پابەندی وەفا و پەیمان و دۆستایەتی و خزمایەتی بووە. ئەوڕۆ بە براگەورەی خزمانی خۆی لە قەڵەم دەدرێت...

٢- حاجـی ئەحمـەدی رۆسـتەمی حەمەمینی نەزەروەیـس: ئەم پیاوە یەکێک بـووە لە پیاوە دیارەکانی مامۆیی ژمێردراوە، تا لە ژیاندا بووە، بە دەمڕاست و براگەورەی مامۆییەکان ژمێردراوە، زۆر رووداوی سەیری لە ژیاندا بەسەر هاتووە، زۆر دەمڕاست بووە..

٣- حەمەئەمینی سەعدی کەرەم وەیسی.
٤- عەزیزی خەسرەوی عیسا قارەمان.
٥- حاجی قادری حەمە شەریف.
٦- محەمەد خەلیفە عەزەی خەلیفە عومەر.
٧- سۆفی ئەورەحیم سلێمان.
٨- ئەحمەدی عەزیزی خوسرەو.
٩- حەمەی ئەولای هۆمەر.
١٠- حەمەی وەسمان.
١١- عەبدولقادری حەمەی رەسوول.
١٢- مەحموودی نەوی نووری.
١٣- حەمە زۆراب.
١٤- حەمە ئەمین حەمە سەعید.
١٥- مەحموود برا خان باوەیس
١٦- حەمە ساڵحی ئەحمەدی بەراو.
١٧- رەسوولی باوەیس قەواڵ
١٨- حوسێن کەریم جیهان.
١٩- قادر زولفەقار جوامێر.
٢٠- قادر حەمەجان
٢١- قادر سلێمان ئەلی وەیس.

٢٢- یونس عەلی محەمەد.
٢٣- ئەحمەد رەسول عەودە.
٢٤- فارس حوسێن عەلی یەعقووب.
٢٥- عەلی وەسمان حەمەی مەحموود.
٢٦- حاجی سەعدی سیا میوە.
٢٧- عوسمانی سۆفی عەلی.
٢٨- عەبدولڕەحمان سمایل. ئەم پیاوە یەکێکە لە شۆڕشگێڕەکانی دنیای خەباتی گەلی کورد، لەو ڕێگەیەدا بە خوێن و بە گیان کۆشاوە و کوڕ و برای ئەم پیاوە لە پێناوی کوردستاندا شەهید بوونە.
٢٩- حاجی شەریفی سیامیوە.
٣٠- فەتاح ئەحمەد قادر.

**وێنەی پیاوە ناسراوەکانی تیرەی مامۆیی:**



حاجی محەمەدی مینای شارەزوور



عەبدولقادری سۆفی ڕەحیم، ١٩١٧-١٩٨٩



کاکە حەمەی عەزەمی کاکە خان، ١٩٢٧-١٩٩٩



قادر مەحموود مراد خان، ناسراو بە «خەلیفە قادر»، ١٩٢٥-١٩٩٧



عەبدولکەریم فەقێ مەجید، ١٩٢٧-١٩٩١



سلێمانی ئەحمەدی کاکە خان، ١٩١٠-١٩٩٢



محەمەدی شاوەیس، ناسراو بە «حەمەی شاوەیس»، ١٩٠٧-١٩٨٩



عەزیزی خەسرەوی عیسا قارەمان، ١٩٠٧-٢٠٠٠



حاجی عوسمان عەلی مستەفا، ١٩٢٧-٢٠٠٩



مەحموودی خەلیفە عەزیز عەبدولقادر عەبدوڵڵا، ١٩١٩-١٩٨٨



مەحموود ئەحمەد رەسول یار محەمەد، ١٩٣٧-١٩٩٨

# گەڵاڵی

ئەم عەشـیرەتە لـە کۆنەوە بوون و تەواجودیان وەک عەشـیرەتێکی دیاری دیار و ناسـراو ڕۆڵ و دەوری خۆیـان گێـڕاوە و لـە ڕووداوەکانـدا بەرچاو کەوتووە و لـە ململانێی نێوان دوو زلهێزی وەک دەسـەڵاتی سـەفەوی و عوسـمانیدا وەک عەشـیرەتێکی کورد لەو بگـرە و بەردە خوێناوییەیـدا زەرەر و زیانـی زۆر و زەبەنەیـان کردووە و هیچ جۆرە پاداشـت و ڕێزلێنانێکیان بـۆ نەکـراوە، ئەم جـۆرە ڕەفتارەش وەنەبێت تەنیا لە بارەی عەشـیرەتی گەڵاڵـی ئەنجام درابێت بەڵکو لە بارەی سەرتاسـەری عەشـایەر و ناسـراوانی کورد ئەو دوو زلهێزە بە چاوی گومان و هەوای داپڵۆسـاندنەوە سەیریان کردووە، ئیدی زنجیرە دەسەڵاتەکانی دوای سەفەویش (ئەفاعنە، سەردەمی نادر شای ئەفشار، زەندیە و سەردەمی کەریم خانی زەند و وەکیل الرعایا سەرەنجام دەسەڵاتی قاجارییە و تا دەسەڵاتی پەهلەوی و ئێستاش).

ئەمە ڕاسـتەقینەیەکی مێژووییە و حاشـاهەڵنەگرە کە ئەو دەسـەڵاتانە پەیوەستە کوردیان بە مەترسییەکی گەورە و گران هاتووەتە بەرچاو بە تەواوی توانایانەوە کۆشاون ئەوەی دووبەرەکییە، ئەوەی کرداری خوێناوییە، ئەوەی ڕەفتاری ناجەوانمەردانەیە دەربارەی لێهاتووانی کورد و ئەوی پیاوی ئازا و دلێری ناو عەشایری کورد هەیە بە فێڵ و درۆ و هەڵخەڵەتاندن بووە بە شێوەیەکی

جۆراوجـۆر لە ناویان بردوون یان ئەگەر عەشـیرەتێک نەچووبێتە ژێر فەرمانی زۆر و زەوتەوە رایانگوێزاوەتەوە، تەفر و تونایان کردووە، هەر خێڵ و برکەیەکیان لە دەڤەر و شوێن و جێگایەک بە زۆر و بە زەبر نیشتەجێ کردووە عەشیرەتی (جەلالی یان گەڵاڵی) یەکێک بووە لەو عەشیرەتە کوردانەی نەیانتوانیوە تەماشاکەری زوڵم و زۆری سەڵاتینی عوسمانی بووبن.

ئەم عەشـیرەتە سـەرەتا لە کوردسـتانی باکووردا ژیاون، دیارە نەیانتوانیوە بەرامبەر زوڵم و زۆری دامودەسـتگای عوسـمانییەکان بێدەنگ بن، سـا بە هەوەسـی خۆیان یان ناچار کراون هەوارگـە و دەڤەری هەمیشـەگی خۆیـان بەجێبهێڵن ئەڵبەتـە نەک بە شـێوەیەکی تێکڕایی بەڵکو کۆمەڵێکـی زۆریـان بەرەو کوردسـتانی رۆژهەڵات کۆچیان کـردووە و لەوێدا گیرسـاونەتەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سـەردەمی پێش پێکهاتنی دەسـەڵاتی سـەفەوی، کە ئەو دەسەڵاتە لەسەر بناغەی شیعەگەری دونیای تەشەیوع بە زمانی شمشێر و کوشتن و بڕین کەوتە پەلاماری ئەوی غەیرە شـیعە بوو و بە مانای «ئەوی لەگەڵم نەبێت دوژمنمە» کەوتە هەڵکوتاندن و هەنگاونان و دەسەڵاتداری بە تەئکید ئاوا بیروڕایەک لەگەڵ چۆنیەتی تێفکرینی دەسەڵاتی عوسمانیدا نەگونجاوە و سەرەنجام ئەو جیاوازییەی مەزهەبی و ئایینیە بۆتە هۆی سەرەکی ململانێی چەند سەد ساڵەی زنجیرە دەسەڵاتەکانی ئێران و عوسمانی.

ئـەو ململانێیـە خوێناوییەی نێوان ئەو دوو زلهێزە وەک شمشـێرێکی دوولای تیژ وا بووە لە لایەکەوە تەواوی شـەڕی نێوان ئەو دوو دەسـەڵاتە لە کوردسـتاندا روویەدەدا و ئیدی کۆی ژیان و دارایی خەڵکی کوردسـتان بووە لە ژێر سـمی ئەسپی داگیرکەراندا پاشیل کراوە و بە گڕی قین و پەلاماریـان سـووتاوە، لـە لایەکی تـرەوە دەر و دەروازەیەک بووە بۆ قبـوڵ نەکردنی زوڵم و زۆری هەمیشـەیی تورک و عەجەم کە پەیوەسـتە لە کورد دەکرا و هەر لایەنێک زیاد لە لزووم چەوسـاندنەوەی زیاتـر بکردبا کوردەکە پەنای دەبردە ئەو لایەنـە و بە ناو پەنای دەدا، ئیتر ئەو شـانۆییە چەند سەد سـاڵ بەردەوام بووە و تا بە ئەمڕۆیش کە لە سەدەی بیست و یەکدا دەژین ئاش هەمان ئاشە شتێکە بە شێوەیەکی تر.

عەشـیرەتی گەڵاڵـی لـە پێش پێکهاتنی دەسـەڵاتی سـەفەوییەوە لە کوردسـتانی باکوورەوە کۆچیان کردووە بۆ کوردستانی ئێران و لە بەشی سەرەوەی کوردستاندا لێرە و لەوێ نیشتەجێ بوونە، کە دەوڵەتی سەفەوی پێکدێت و شمشێری تیژی دەمارگرژی شیعەگەری لە غەیری شیعە هەڵدەکێشـن، عەشـیرەتی گەڵاڵی یەکێک بووە لەو عەشـایرانەی بەر ئەو توند و تیژییە دەکەون، بۆ خۆپاراسـتن بڕێکی زۆریان دەکشـێنەوە ناو عەشایرە کوردەکانی دەڤەرەکانی سنە و سەقز و بەشـێک لە موکریان و هەروەها جوانڕۆ، ئەو بەشـەی کە لە باکووری کوردستان مانەوە هەر بە جەلالی مانەوە ئەم هیجرەتە دەوروبەری پێنج سـەد سـاڵ لەمەوبەر بووە و تێکەڵاوی تیرەکانی جاف دەبن و بە گوێرەی زەمان ناویان دەگۆڕێتە سەر «گەڵاڵی».

ئەوانەی نرخ و بایی بۆ پێنج سـەد سـاڵ دانەنێن و لە رووی مەبەسـتێکی تەنگی تایبەتییەوە واقیعێکـی مێژوویـی قەبوڵ نەکەن و بگۆڕن هیچ لە حەقیقەتـی مێژوویی ناگۆڕێت، ئەگەر گەڵاڵی جاف نەبێت جافیش وجوودی نییە و نەبووە. لەوانەش گوزەشـتە لە هیچ کوێی دونیادا هیچ تیرە و عەشـیرەت و میللـەت و رەگەزێـک بە تەنیایی پێکنەهاتووە، زەمان ئـەو جەبرەی نواندووە، کە تێکـەڵاوی خەڵکی تـر بێت کۆمەڵگای بەشـەرییەت و میللەتان هەروا پێکهاتـووە و لە جێگەیەکدا

نیشــتەجێ بــووە و نــاوی ناوە «وڵات و وەتــەن»، وە ئیللا لە پێش پێکهاتنی هــەر میللەتێک ئەو وڵاتەی تێیدا سەقامگیر بووە و تیایدا نیشتەجێ بووە لە پێش ملیارەها ساڵەوە هەبووە و فرێشی بەسەر ئەو میللەتانەوە نییە و نەبووە، کە ئێستا لە ناویدا دەژی و خۆشی لەسەر دەدا بە کوشت و بە ناوی وەڵات و وەتەن.

گەلاڵی پەیڕەوی و سیستەمی بەگزادەیی بووە بەڵام گەورەکانیان بە «ئاغا» بانگ کردووە و ناو بردووە، کە تێکەڵاوی تیرەکانی ناو جاف دەبن ئیتر ژن و ژنخوازی و رۆژبەڕۆژ و ســاڵ لە دوای ســاڵ خزمایەتییان پتەوتر دەبێت بە گوێرەی ســەدان ساڵ لە شین و شایی و رووداوەکاندا گەلاڵی سەرقەتار و پێش قەرەوڵ بوونە، کاتێک سوڵتانی عوسمانی «موورادی چوارەم» پەلاماری بەغدا دەدا، جاف تێکڕا لەو شەڕەیدا بەشدار دەبن و شەڕێکی قارەمانانە دەکەن، سوڵتان نازناوی «جافی موورادی» بە تێکڕای جاف دەدا و بەشــێکی زۆری ئەو لەشــکرە جافە لە شــارەزوور و دەڤەرە جۆراوجۆرەکانی دەوری شــارەزوور دەمێننەوە و دەبنە خاوەنی زەوی و زار. بەتایبەت تیــرەی گەلاڵــی و تیرەی هاروونی، بۆیە دەڵێم تیرە لەبەر ئەوەی ئەو ســەردەمە «گەلاڵی» خۆی لــە جــاف جیاواز نەکردبوویەوە و لەســەر جاف حیســاب کراوە و نازناوی مــورادی وەک هەر تیرەیەکی تری جاف بەر ئەویش کەوتووە. بەداخەوە تا ئێستا وەدەرنەکەوتووە ئەو هێزە جافە لە پەلامارەکەی سوڵتان موورادی چوارەمدا بە سەرۆکایەتی کێ بووە.

لەو ســەردەمەوە ئەو تیرە جافانە لە شــارەزوور و دەوروبەریدا جێگیر بووبوون، لە هاویندا گەرمای دۆڵی شارەزوور هەراسانی دەکردن و گەرمیان و کوێستانیان دەستپێدەکردەوە..

کە دەسەڵاتی ئەردەلان بە سوپایەکی تۆکمەی گەورە و گرانەوە پەلاماری جوانڕۆ و دەڤەرەکانی جاف دەدا و بڕێکی زۆر لە تیرەکانی جاف بە ســەرۆکایتی «زایەر بەگی جاف» کۆچێکی گەورە دەکەن بۆ ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و ئیمارەتی بابان، ئەو هیجرەتە وردە وردە تەنگ بە عەشیرەتە نیشــتەجێیەکانی دۆڵی شــارەزوور هەڵدەچنن و جێگەیان دەگرنەوە و لەبــەر ئەوەی گەلاڵییەکان لەمێــژدا لەوێ نیشــتەجێ بووبوون و بە تیرەیەکــی جاف دەژمێردران هیچ جــۆرە گیروگرفتێک نەکەوتە نێوان جافە موهاجیرەکانەوە و ئەوانەوە بەڵکو بوونە پاڵپشتی یەکتر خاڵێکی گرنگ هەیە دەبێت پەنجەی بخەینە ســەر لەوەی دەڕوا دەســەڵاتی ســەفەوییە، لە ئەوپەڕی لاوازیدا بووە و ســەردەمی شا سوڵتان حوسەینی سەفەوی بووە و ئەفاغنە بە سەرۆکایەتی مەحموودی ئەفغانی و ئەشرەفی ئەفغانی تەواوی کاروباری دەرباری سەرفەوییان بە دەستەوە بووە و شەڕ و بیگرە و بەردەی نێوان نادر قولی کە ئەودەم فەرماندەی گشتی لەشکری سەفەویە بووە و یەشتا نەبوو بە شــا سەرتاســەری ئێرانی ئەو کاتە پڕبووە لە پەلامار و هەر کێ بۆ خۆی و لەو ســەردەمەدا ئەردەلانییەکان پەلاماری هۆزی جاف دەدەن و زۆر لە داراییان کاول دەکەن و سەرۆکی جافیش لەو شەڕەیدا کوژراوە، کە نادر شا دەسەڵاتی ئەفغانی لە ئێران وەدەر دەنێت و لە دەشتی موغاندا کۆبوونــەوەی تێکڕایــی بە ســەردەم دارانی ئێران دەکا و تێکڕا بە شــای هەڵدەبژێرن و لە «نادر قولی»ەوە ناوی دەگۆڕێتە نادر شا و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ئەوەی ملهوڕی ناو ئێران بووە لە ناوی بردووە و دەکەوێتە فکری بەربەرەکانی دەوڵەتی عوسمانییەوە.

لەم کاتەیدا (خان ئەحمەد خانی ئەردەلان) لە نادر شا یاخی دەبێت و بە لەشکرێکی رازاوە و پڕچەکەوە بەرەو خاکی عوسمانی دەکەوێتە رێ. (نادر شا) هەواڵ بۆ (زایەر بەگی جاف) دەنێرێت

کە لە نێوان جاف و ئەردەلاندا کۆنە قین و شەڕ و شۆڕی زۆر ڕوویدابوو تا بەر بە (خان ئەحمەدی خانی ئەردەلان) بگرێت سوپا و لەشکری (خان ئەحمەد خان) لەشکرێکی نیزامی و دارایی تۆپ و مەنجەنیق و پڕچەک بووە و هێزی لای زایەر بەگی جافیش هێزیکی عەشایەری سەرەتایی بوونە ئەگەرچی ئەوپەڕی ئازایەتی دەنوێنن بەڵام لەشکری جاف توانای شەڕی سوپایەکی ئاوای نابێت و شپرزە دەکرێن و زایەر بەگ و چەند کەسێک لە ناودارانی جاف دەستگیر دەکرێن و لە لایەن خان ئەحمەد خانی ئەردەلانەوە ئیعدام دەکرێن و جاف تەرمەکەی زایەر بەگ لە ڕۆژئاوای دەربەندیخانی ئێستادا دەنێژن و تێکڕای جاف بەسەر مەزارەکەیدا ساڵانە چەمەرانەیان گێڕاوە و هەر بەو بۆنەیەوە ئەو دەڤەرە ناو نراوە چەمەرگە.

کە نادر شا دەکەوێتە جووڵانەوە بۆ ناو وڵاتی عوسمانی پەیوەندی بە سەرۆکەکانی عەشایەری کوردەوە دەکات و دیارە بەشێکی زۆری تیرەکانی ناو جاف لە پەلامارەکەی ( نادرشا)دا بەشداری دەکەن بە تایبەت (تیرەی گەڵاڵی) بەڵام نادرشا لەجیاتی ئەوە ڕاستەوخۆ پەلاماری شاری بەغدا بدات سەرەتا بەرەو شاری مووسڵ دەڕوات و شار ئابڵوقە دەدا، شار خۆی بە دەستەوە نادات و ئابڵوقەدان درێژە دەکێشێت دیارە ئەحمەدی کوڕی بەهرامی شیرە گڵاڵی یەکێک بووە لە لێپرسراوانی ئەو لەشکرە.

لە کۆنەوە شارەزوور بە هەوارگەی سەرەکی (گڵاڵی) دەژمێردرێت و بەشێکی زۆری ئاغاکانی گڵاڵی لەوێدا نیشتەجێ بوونە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت لە جێگە و شوێنی تر نەبن بەڵکو لە زۆر جێگە و شوێنی دوور و نزیکی شارەزووردا زەویوزار و تەواجودیان هەبووە وەک:

شارەزوور، گەرمیان، هەولێر، کوردستانی ئێران، چەمچەماڵ، کۆیە، کەرکووک، حاجی ئۆمەران، باڵەکایەتی، گەڵاڵەی شارباژێڕ.. هەتاوەکو لە شارە گەورەکان ژمارەی (گەڵاڵی) کەم نین جگە لە چەند دێیەک کە لە دواییدا ناویان دەبەین لە ناو شاری هەولێردا ژمارەیەکی یەکجار زۆری گڵاڵی هەیە، لە شاری (کووت) ژمارەیەکی زۆری گڵاڵی هەیە، لەبیرمە ڕۆژێک لە دیوەخانی (سەردار جاف) دانیشتبووم دە دوانزە عەبا لە شان و عەگال لەسەر هاتن بە ژووردا و دوای چای و قاوە خواردنەوە یەکێکیان بە عەرەبی خۆی ناساند کەوا کوردن و جافن و لە تیرەی گڵاڵین، سەردار جاف زۆر ڕێزی لێگرتن و لەو ڕۆژەوە پەیوەندییان لەگەڵ سەردار جافدا تا مەرگی هەر بەردەوام بووە، لە لایەکی ترەوە (مارف ئاغای گڵاڵی) لێم بیستووە کەوا خزم و خوێش زۆر لە برایانی گڵاڵی لە لیوایەکەدا هەن و کوردی نازانن.

ئەوەی ئاشکرایە هەوارگەی سەرەکی گڵاڵی عالان و «حاسڵ»ە و گڵاڵی لە هەر کوێ بووبێت وەلای بۆ ئەو جێگەیە و شوێنە بووە، کە بە مەرکەزی سەرەکی گڵاڵییەکان ژمێردراوە و لە سەرتاسەری شارەزووردا لە زۆر دێ و جێگە و شوێن تیرەی گەڵاڵی زۆرینەن وەک:

حاسڵ، عالان، قەڵبەزە، کانی مرواری، کانی کۆتر، دەتی، کانی کەوەی کۆن، مالوان، تەچەکەل، سۆیلەمێش، کولەپی، چەم و ژالە، ناوشاری سەی سایەق.

گەرمیان: کەلار.
سەیدە، شاکەل، ئەوڵا قوت، سەید خەلیل، گردە گوزێنە، شێخ لەنگەر، حەمەی کەریم، بەردە

سوور، مچەشەل.

### کوردستانی ئێران:

کێڵەکەوە، دەورە قەڵا، سوورموستی، چنارتۆو، حافز خان، کاوڕکاچی سەروو و گاور کەچی خواروو، سەعید کەریم ئاغ، تەوەر کەلان لە ئوستانی مەشهەد کە کەوتووەتە رۆژهەڵاتی ئێرانەوە، زیاتر لە پەنجا گوندی عەشیرەتی (جەلالی) پەخش و بڵاون و ئەگەرچی زمانیان ئەوڕۆکە فارسییە، بەڵام رەفتار و کردار و ئاداب و نەریتەکانیان کوردەوارییە و تا رادەیەکیش هەستی کوردەوارییان تێدایە بەندە (نووسەر) چەند کەسێکیانم دەناسی.

### گەلاڵی هەولێر:

وەک لە مێژوودا باسیان کرد (گەلاڵی) لە سوپا و لەشکری نادر شا دا بۆسەر شاری مووسڵ بەشدارییان کردووە و ئەو پەلامارە و ئابڵوقەدانی شاری مووسڵە درێژەی کێشاوە و دیارە لەو کاتەیدا لە ئێراندا لە چەند لاوە دەسەڵاتی نادر شا یاخی دەبن نادرشا ناچاری گەڕانەوەی ئێران دەکرێت و ئابڵوقەی شاری مووسڵ ئاواڵە دەکرێت و دیارە مەحموود ئاغای کوڕی بارام ئاغای (شێرە گەلاڵی) لەو لەشکری نادر شایەدا بەرپرس بووە، کە ئابڵوقە بەرەڵا دەکرێت سوارەی گەلاڵی ناگەڕێنەوە بۆ شارەزوور و لە دەوروبەری شاری هەولێردا نیشتەجێ دەبن سەرەتا لە نێوان پردێ و دارەماندا نیشتەجێ دەبن بە ناوی (گەلاڵ) و ئاسەواریان لەو جێگەیەدا هێشتا ماوە بە تایبەت لە گوندەکانی وەک:

وەلی پاشا، یارمجە، سەربیر، گەونێ، بیبانی، پردێ.

بەڵام گەلاڵی بەو دەڤەرەی رازی نابن و وردە وردە دەگەنە دەشتی هەولێر و تا ئەمڕۆ لە بڕێک شوێن لە دەشتی هەولێردا بە ئاسەواری گەلاڵی ناو دەبرێت وەک:

(دێدەوان) و گێریرەش، و لەو دەڤەرەدا نیشتەجێ دەبن.

ئەوڕۆ ژمارەی گەلاڵی لە هەولێر و دەوروبەریدا زۆرن و ئەم دێهاتە لەسەر گەلاڵی حیساب دەکرێن:

شێراوە، سۆربەش، قورشاغلۆ، دووکەڵە، ترپە سیپان، دوگردکان، میرەکان، سێبیران، باقرت، قولتەپەی یابە، دۆڵە بەکرە، جڕتاوە، کەردز، پارانیان، سابراغ، گردیش، چەمرگە، هەمزە بەگ، کورداوە.

بە لای دیبەگەوە عاڵڵا، سێ قوچان، خۆشار، چەغەمیرە، چەڵتووک، مەلا کاغە، گەرەلەهیبان، کورتان درووی، حەسەن بەگ.

لە سنووری قەراج:
پوونگینە، گەڕە سوور
بەلای گوێڕدا:
عەوێنە، شێخ شێروان، یەدوقوو

بە لای دەڤەری خەباتدا:

بنەسڵاوە، دارەتوو، تۆپزاوە، مەلائۆمەر، لە ناو شاری هەولێردا لە زۆربەی زۆری گەڕەکەکانی ناوشار نیشتەجێن.

لە دەڤەری کۆیەدا چەندین گوندی گەلاڵی هەن.

دێمەوە سەر ئێستای ئەم تیرەیە، بەرەگەزی هۆزی جافە لە ناو گەلاڵیدا ئەوڕۆکە ژمارەی هەڵگری بەڵگەنامەی ئەکادیمی زۆری تێدایە و خوێنەوارانی ئەم تیرەیە لە بواری جۆراوجۆری دڵسۆزانە لە کۆمەڵگای کوردەواریدا خەریکن جگە لە بەشداربوونیان لە راپەڕینەکانی گەلی کورد کە دژ بە عوسمانی و سەفەویە کراوە و «گلاڵی- جەلالی» بەشدارییان تیادا کردووە و دەوری سەرەکییان نواندووە و هەر بەو هۆیەوە زەرەر و زیان و تالان و دەربەدەر بوونە، لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولەوە ئاغاکانی گەلاڵی و خوێنگەرمانی ئەو تیرەیە چەکی پێشمەرگایەتییان هەڵگرتووە بۆ وڵات و خاک و شەڕی سەر و ماڵیان کردووە، ئەوڕۆکە ژمارەیەکی یەکجار زۆری شەهیدی سەنگەر و شەهیدی ململانکەری سیاسی لە ناو گەلاڵیدا تۆمار کراوە، تەنیا جیاوازییەکی ئەم تیرەیە لەگەڵ تیرەکانی کەی جافدا شێوەزاری گفتوگۆیانە، تۆزێک وشە و واژەی تایبەتمەند بەکاردەبەن، کە ئەو موفرەداتە نیشانەی دەوڵەمەندی زمانی کوردییە، ئومێدەوارم رۆژێک لە رۆژان بتوانم کۆیان کەمەوە یان یەکێک لە خوێندەوارانی خودی گەلاڵی ئەو کارەی بکات، بێ گومان خزمەتێکە بە بواری زمانەوانی.

خاڵێکی تر دەخەمە بەرچاو لە ناو هۆزی قەلخانیدا کە پەیوەندی ئایینی «ئەهلی حەق»ن، تیرەیەک هەن بە ناوی خێڵی «قوڕێ» من زۆر لە ریشسپیانی ئەو تیرەم دیوە و دواندوومن بەڕاشکاوی دەیانوت ئێمە لە بنەچەکدا لە عەشیرەتی «گەلاڵی»ن، بەڵام بۆخۆیان نەیاندەزانی چۆن کەوتوونەتە ئەوێ، کەی کەوتوونەتە ئەوێ؟ چۆن بوونەتە پەیڕەوی ئایینی ئەهلی حەق..؟ بەندەش تا ئێستا لەم باس و بەراوردی مێژووی «گەلاڵی»دا هیچ بەڵگە و دیکۆمێنت و سەرچاوەیەکم لەو رووەوە وەبەر چاو نەکەوتووە، ئەوەندە نەبێت لەمێژدا زۆربەی زۆری هۆزی جاف پەیڕەوی ئایینی پارسان بوونە.

## کەسایەتییەکانی ئەوسای گەلاڵی:

١- کوێخا عەباسی عەلی زاڵم ناسراوە بە «شێرە گەلاڵی».
٢- بارام ئاغای گەلاڵی.
٣- ئەحمەد ئاغا.

٤- عەباس ئاغا.
٥- رەزا ئاغا.
٦- حاجی حەمە ئاغا
٧- حوسێن ئاغای عەباس ئاغا
٨- رۆستەم ئاغای عەباس ئاغا
٩- شەریف فەتاح
١٠- سەلیم ئاغای گەورە
١١- بەور ئاغا
١٢- ئینجە ئاغای شاعیر
١٣- کەریم قوباد
١٤- رەمەزان ناکە
١٥- ئیبراهیم کەریم قوباد
١٦- حەمەی کەریم قوباد
١٧- حەمە ئاغای حەمە قالە
١٨- حاجی خەلیفە کەرەم وەیس
١٩- رەشید کەریم قوباد
٢٠- مەولود دەروێش کاکل
٢١- عەبدولڕەحمان غەفوور
٢٢- عەبدولڕەحمان فەتاح
٢٣- سۆفی محەمەد ئەلکی
٢٤- خدر وەیس
٢٥- حاجی محەمەد دەروێش کاکل
٢٦- عەزیز مەولوود
٢٧- حەمەی دەروێش
٢٨- حەمەی کەریم میر ئەحمەد
٢٩- خەلیفە محەمەد رەحیم
٣٠- محەمەد رەحیم حەپە
٣١- حاجی عەبدولقادری حاجی حەمە
٣٢- حاجی فەرەج ئاغا
٣٣- حاجی محەمەد عەلی وەلی
٣٤- خەلیفە عەزیز
٣٥- حەمە رەشیدی حاجی عەبدولقادر
٣٦- عەلی محەمەد رەحیم
٣٧- عەلی محەمەد حەسەن مەنسوور

## چەند لێزان و بەهرەمەندێکی کشتوکاڵیی ناو گەڵاڵی

١- حەمە شەل لێزانی ئاش نانەوە
٢- حەمەی حەمە شەل وەستای ئاش نانەوە
٣- حاجی ئەحمەد ئاغای رەشید ئاغا، لێزانی ئاودێری کشتوکاڵ و جۆگە هەڵگر.
٤- حەسەن ئاغای گەلاڵی لە زۆر کاروباردا چاوساق بووە هەتاوەکو چەخماخسازیش.
٥- عەبدولکەریم عەلی حەکیمی کردووە.
٦- مامە ئەلە دەواو دەرمانی خەڵکی کردووە.

## ئافرەتە دەست رەنگینەکانی ناو گەڵاڵی:

زۆر لە ئافرەتانی ناو تیرەی گەلاڵی قاڵی بەڕە و لاکێشــیان چنیوە چیخ و تەختە دەواریان چنیوە جگە لە شارەزایی لە نان و خوان دروست کردندا بۆ دیوەخان و میوانان وەک:

١- عەدلە خانم خێزانی عەباس ئاغای گەلاڵی ١٨١٠ز لە چنینی فەرشدا هونەرمەند بووە.
٢- مەنیجە خانم ١٨٢٥ز لە فەرش چنیندا لێزان بووە.
٣- پیرۆزە خانم خێزانی رەزا ئاغای گەلاڵی بووە و پشت و پەنای ژنان و کچانی گەلاڵی بووە و لە خێرخوازیدا پەنجەی بۆ درێژ کراوە.
٤- ئامینە خانمی ئینجە ئاغای خێزانی حاجی حەمە ئاغا
٥- عەتیە خانم رەشید ئاغای خێزانی رەسول ئاغا
٦- رەعنا خانمی رۆستەم ئاغا
٧- تەیبنە خانمی رۆستەم ئاغا
٨- ئافتاو خانمی تۆفیق ئاغا خێزانی حوسەین ئاغا و دایکی مارف ئاغای ئێستای گەلاڵی
٩- تەمین مەحموود ئاغا
١٠- نەجە سلێمان «نەجە سلێمان».
١١- ئەفروزی حاجی کەریم وەیس
١٢- تەلیعەی حاجی عەبدولقادر
١٣- خاتوو خەزانی ئەحمەد حەمە
١٤- فاتیمەی حەمە ناجە
١٥- نەسرەتی مەحموود ئاغا
١٦- فاتمەی ئەحمەد حەمە

١٧- نەجمەی محەمەد عەبدولڕەحمان
١٨- سەلمەی خاڵە
١٩- ڕەعنای ساڵح خەزان
٢٠- حاجی سەلمەی کەریم قوباد
٢١- ئەفروزی عەزیز
٢٢- شەمسە یاوەر
٢٣- سەلمەی هەسەن سلێمان
٢٤- بەهیەی مەحموود مرادخان
٢٥- فاتمەی ئیبراهیم فەتحە
٢٦- بەهیەی شەریف کەریم حوسەین
٢٧- وەردی عەزیز ئەلاک
٢٨- فانوس مەحموود حەمک
٢٩- پیرۆزەی کەریم قوباد
زۆری تری خانمگەلی تیرەی گەڵاڵی...

## کەسایەتییەکانی گەڵاڵی هەولێر:

١- حاجی ڕەحمان عەوڵا
٢- حاجی مەعرووف خدر
٣- حاجی عەلی حاجی حەسەن
٤- حاجی حەمەدەمین حاجی مەعرووف
٥- حاجی حەمە
٦- کایانی
٧- حاجی عەزیز حاجی ئەحمەد
٨- حاجی عوسمان ئەحمەد
٩- محەمەد حاجی عەلی ناسراو بە «مام خەلیفە»
١٠- مەلا بەهرام شێخ محەمەد
١١- مستەفای فەتاح
١٢- حاجی ساڵح عەوڵا
١٣- حاجی عەوڕەحمان عەوڵا
١٤- سمایلی ئەحمەد گوڵی ناسراو بە «سمە گوڕی»
١٥- کوێخا موسا مەلاک ئاغا
١٦- شێخ محەمەد خالند
١٧- حاجی عەلی پوونگینە
١٨- سابیری حاجی عەلی پوونگینە
١٩- عەلی سوڵتان

٢٠- سمایل مەولوود
٢١- حاجی عوسمانی گەڵاڵی
٢٢- ئەحمەد پیرداود خەلیفە
٢٣- کوێخا مستەفا
٢٤- کوێخا حەمەد مستەفا
٢٥- عەلی عەبدوڵڵا شوێن هەڵگر
٢٦- ئەحمەد فەتاح چەمرگە
٢٧- حاجی کەیانی کردیش
٢٨- حاجی ئەحمەد سوبە
٢٩- حاجی عەبدولڕەحمان مەخموور
٣٠- مەلا فەتاح هەمزە بەگ
٣١- کوێخا حەسۆ
٣٢- حاجی ڕەشید ئەحمەد
٣٣- حاجی مەدیدی دووکەڵە

## چەند ئافرەتێکی دەواودەرمانی زانی گەڵاڵی، دەڤەری هەولێر:

١- حاجی ئامینەی ئەحمەد کەردز
٢- حاجی خەجیەی مستەفا فەتاح
٣- حەجولی دایکی مەلا عەبدوڵڵا
٤- فاتیمەی سۆفی

## پیاوە ناودارەکانی گەڵاڵی دەڤەری شارباژێڕ:

١- کوێخا حەمەدی دەورە
٢- کوێخا عەزیز
٣- سلێمانی کوێخا محەمەد
٤- عومەر کوێخا محەمەد
٥- حاجی شێخ عوسمان
٦- مەحموودی عومەر
٧- کوێخا دەروێش
٨- حاجی ڕەسول حاجی دەروێش

٩- حاجی ئەحمەد هۆمەر
١٠- حاجی ئەحمەد حەمەی قادر
١١- کوێخا محەمەدی عەبدولقادری عەزیز
١٢- کوێخا مستەفا

## کەسایەتی گەڵاڵی شەوگری- کۆیە:

١- مەلا عەلی رەسول
٢- حاجی ئەسعەد
٣- حاجی سمایل
٤- حاجی مەحموود هۆمەر گەڵاڵە
٥- مەحموود مارف
٦- عەلی سلێمان
٧- قادری کوێخا
٨- حەسەن دەست
٩- قادری کوێخا محەمەدی گەڵاڵە
١٠- حەمەی حاجی رەسول- سەرگەڵوو.

بەندە لێرەدا سوپاس و رێزی فراوانم بۆ دوو کەس هەیە کە لە بارەی «گەڵاڵی»یەوە زۆر یارمەتییان دام.
یەکەم: سەرۆکی ئێستای «گەڵاڵی»، کە ئەورۆ بە براگەورە و قسە لێبیسراوی گەڵاڵییەکان دەژمێردرێت.
کاک مارف ئاغای، حوسێن ئاغای، حاجی حەمە ئاغای دەورە، رەزای ئاغای، عەباس ئاغای، ئەحمەدی ئاغای، بەهرام ئاغای، شێرە گەڵاڵی کوێخا عەباسی عەلی زاڵم.



حاجی ئەحمەد ئاغای ڕەشید ئاغای عەباس ئاغا، سەرۆکی ئەوسای گەڵاڵی



حاجی عەلی حاجی حەسەن
١٩٨٠-١٨٧٩



حاجی رەحمان عەوڵا
١٩٧١-١٨٩٢



حاجی مەعرووف خدر
١٩٥٩-١٨٩٥



حاجی محەمەدین ئەمین مەعروف
١٩١٩-١٩٩٧



حاجی ئیبراهیم گەلاڵی
زۆر سوپاسی ڕێزدار حاجی ئیبراهیم دەکەم لە بارەی گەلاڵی هەولێر یارمەتی دام خودا نموونەیان زۆر بکات..
حاجی ئیبراهیم کوڕی مەعروف خدر مەحموود ئومەران ئەحمەد بەهرام شێرە گەلاڵی، یەعقوب عەلی ناسراو بە عەلی زاڵم.



حاجی عوسمان گەلاڵی
١٩٢٧-١٩٩٦




شێره گەڵاڵی

لێـرەدا زۆر سوپاسـی بـرای ئازیزم «مـارف ئاغای گەڵاڵـی» دەکەم بۆ ئـەو زانیارییانەی بۆی نـاردووم خـودا نموونەی «مارف ئاغـا» لە ناو هۆزی جافدا بە تایبـەت خزمانی «گەڵاڵی» کەم نەکاتەوە.
هەروەهـا سوپاسـی حاجی ئیبراهیم حاجی حەمە ئەمین شـێراوە دەکەم بۆ ئـەو زانیارییانەی لە بارەی برادەرانی گەڵاڵی دەشتی هەولێری پێدام ماڵی ئاوا.
سوپاسێکی کە ئاراستەی خەلیفە عەزیز محەمەد رەحیم دەکەم.

# مەنمی

سەرچاوەیەکی کەی جیاواز دەربارەی تیرەی مەنمی دەڵێت:- کابرایەک بە ناوی وەیسی بەگ شـــەش کوڕی هەبووە بـــە ناوی: ئەڵڵاموراد، تاری مورادم میرانم قوبـــاد، زەینەل و عەبدولکەریم (ئەوکە) لەو شەش پیاوە تیرەی مەنمی پێکهاتووە. ئەڵڵاموراد بووە بە بەرەبابێکی زۆرو ناسراون بە (ئەڵڵامورادی). لە سیاسەرانی سەروو و خوارووودا و لە گڑی کران دەژین.

تایفەی تاری موڕادی. زیاتر لە دوو هەزار خێزانن، لە دێهاتی شیکەش، چەشمەدرێژ، قرخلەرو نەقارەخادا دەژین.

تایفەی میرانی:
تایفەی جان ئاقایی، لە نەوەو نەتیجەی قوباد پێکهاتوون.
تایفەی حەمیلی و جەمشیدی لە نەوەو نەتیجەی (زەینەل)ن.
و تایفەی مەلا وەیسی لە جەمشیدەکان جوێ بوونەتەوە.
ئەم بەرە بابە لە کوردستانی ئێراقدا دەژین.
عەبدولکەریم (ئەوکە) لەم بەرەبابە چەندین تایفە پێکهاتووە.

بە ناوی: گاخۆری، ئاماشەیی، کۆی، کروژی، چەقەڵی، پیرەجانی و بۆرەکەیی (محەمەد ئەمین سولّتان)، لەبەر ئەوەی ئامادەگی سەربازدانی نەبووە، بەرەو کوردستانی ئێراق کۆچی کردووە و سێ هەزار خێزانیان لە وڵاتی کوێتدا نیشتەجێن بە شێوەیەکی سەرەکی تیرەی (ئیناخی و پیروەیسی) لەگەڵ (مەنمی) دا خزم و خوێشن و لە بنەچەدا تیرەی کەرەم وەیسی بۆسەر مەنمی دەگەڕێتەوە..

زیاتر لە دوو هەزار خێزان لە تیرەی مەنمی لە دەڤەری شمشیر و دەوروبەریدا دەژین و لە ناو هۆزی فەیزوڵڵا بەگیدا زیاتر لە پێنج سەد خێزانی مەنمی نیشتەجێن. سێ سەد خێزانی بۆرەکەیی لە تەکبایی ئەشفاران.

بە شێوەیەکی تێکڕایی هەوارگەی سەرەکی مەنمییەکان حوسەین ئابادەو زۆرتر لە سی هەزار خێزانی مەنمی لە دەورو بەریدان کە لە دێهاتی وەک: سیاسەرانی سەروو و خواروو، کێڵە سپی، گژی گەڕان، سادق ئاباد، پشت تەنگ، کانی چەمک، موبارەک ئاباد، برگشاد، خوراسان، شیکوژی سەروو، زەینەل خانی، دەرقە، ئیبراهیم ئاباد دا دەژین. هەزار خێزانیان لەناو شاری سنەدا نیشتەجێن . شێخ محەمەدی مەردوخ، لە بەرگی دووەمی مێژووی مەردوخدا، مەنمی بە تیرەیەکی سەرەکی جاف داناوەو کردوویە بە چوار بەشەوە:

١- تاری موڕادی
٢- عەلی موڕادی
٣- لولەزی
٤- ئاخەسوری

# پەلاماری دووەم جاری سەردار رەشید بۆ سەر مەنمی و گەڵباخی

لە هەشتی مانگی رەمەزانی ساڵی ١٣٣٧ک، سەردار رەشید بە فەرمانی (سەیفولدەولە) توانی تیرەی جوانرۆ و وەلەدبەگی و هەورامییەکان رازی بکاو پەلاماری ئەو دوو تیرەیە بدەن و شەڕێکی خوێناوی روویداوە، وا دیارە بۆ جاریَ سێهەم دیسان پەلاماری مەنمی گەڵباخی دراوە، ئەمجارەیان لە لایەن (شەریفولدەولە)وە راستەوخۆ ئەنجام دراوە، دوور لە تەواوی تەرازووەکانی ئەو سەردەمە بیست ناسراو کوێخای مەنمی گەڵباخی دەستگیرکراون و تیرباران کراون.

# پەلامار بۆ سەر مەنمی گەڵباخی

ئەوەی روونە عەشایەری مەنمی بە سەختی دژ بە هێزی رووسیا شەڕیان کرووە، هەروەها گەڵباخییەکانیش چەندین ساڵ هیچ جۆرە سەرانەیەکیان بە دەوڵەت نەداوە، سەردار رەشید کەوتە بیری ئەوەی ئازاریان پێ بگەیەنێت، ئایەتوڵا مەردوخ لەم رووەوە دەڵێت:-

(دوای ئەوەی ناو شاری موحکەم کرد و دوو مەترەلوزی لە جێگەی گرنگ دامەزران،داوای یارمەتی لە رووسەکان کرد، دوو قوماندان بە ناوی ( خارونجی و فیودور گرنکو) وە (نیکالوڤیچ کراچێن کوپیوتەر) لەگەڵ خۆیدا برد و بەرەو ناو هەوارگەی مەنمی و گەڵباخی رۆیشتن. کە ئەو دوو تیرەیە دژ بە رووسەکان دەست وەشێن بوونە. سالار فاتح و سەردار ئەشرەف هەردوو ئەوانەشی لەگەڵ خۆدا بردوو کە بە حیساب دوای کوشتاری ئەو دوو هۆزە، ئەو دووانەش لەوێڕا ئیعدام بکەن.

سەردەمی برسێتی بووە، بڕێک لە مەنمییەکان خۆیان گەیاندە لای (سەردار رەشید) و سالار

فاتحیان لەگەڵ خۆیاندا برد، تا سەرانەی نەدراو بدەنە خزمەت، لەم کەین و بەینەدا دیارە هەواڵی گۆڕانکاری ناو وڵاتی روسیا گەیشتۆتە سوپای روسی، لەشکری روس کە بنەماڵەی (رومانۆف)ی هەموو کوژراون و سوپای روسی بە پەرێشانی گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان. سەردار رەشید کەوتە بیری چەککردنی سـوپای روسـیا، لەم هەراو بەزمەیدا عەشـایەری مەنمی و گەڵباخی ئاگاداری گۆڕانکاری ناو روسیا دەبن. ئیدی نەچوونە ژێر باری سەرانەدان.

## ناوی بڕێک لە کەسایەتییەکانی ئەوڕۆی هۆزی مەنمی:

١- عەونی حاجی قادر مستەفا
٢- خوسرەو حاجی قادر مستەفا
٣- زەید حاجی قادر مستەفا
٤- ئەحمەد عوزێر حەمە جان
٥- عومەر ئەحمەد حەمەد
٦- فەیسەل ئەحمەد حەمەد
٧- نەعمان کاک ئەحمەد مەعرووف
٨- رەفعەت کاک ئەحمەد مەعرووف
٩- چەتۆ محەمەد جوامێر
١٠- رەشید محەمەد جوامێر
١١- عەبدولڕەحمان عەبدوڵڵا مام قادر
١٢- بێکەس عەبدوڵڵا مام قادر
١٣- حاجی یوسف میرزا محەمەد
١٤- ئەحمەد یوسف میرزا
١٥- محەمەد یوسف میرزا
١٦- فارس سەعید فەتاح
١٧- بایز سەعید فەتاح
١٨- عەونی عەبدوڵڵا بایز
١٩- سەباح حەمشین سەلیم
٢٠- رەشاد مستەفا کەریم



خاولێخۆشبوو
حاجی قادر عوزێر حەمە جان



خوالێخۆشبوو
کانەبی کاک ئەحمەد



خوالێخۆشبوو
کاک حەمزە مەعروف



حاجی محەمەد جوامێر قوربانی
١٩٠٤-١٩٩١



میرزا محەمەد قادری قوباد
١٩٢٦-٢٠٠٦



حاجی سەعید فەتاح ئەحمەد
١٩١٥-١٩٩٩

# ژیاننامەی خوالێخۆشبوو (حاجی قادر مستەفا قادر مەنمی) ناسراو بە حاجی قەدۆ

خوا لێخۆشبوو لە ساڵی (١٩٠٩) لە دایکبووە لە ساڵی (١٩٨٩) کۆچی دوایی کردووە، باوک و باپیرانی ناوبراو کاتی خۆی لە ناوچەی (داری کەلی و باڕۆیی) بە هۆی هەندێ کێشەی کۆمەڵایەتییەوە کۆچیان کردووە بۆ شاری هەولێر و لەماوەی ژیانیاندا لە دەشتی هەولێر ژیان و لە ساڵی (١٩٥٠) هاتۆتە شاری هەولێر و خاوەن دووکان و شوێنی تایبەتی خۆی بووە بۆ کاری بازرگانی و عەلافی جگە لەوەی خاوەنی دوو گوند بووە گوندی (بیستانەی گچکە) و گوندی (کانی بزرە) و کاری کشتوکاڵی و بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتیشی کردووە. ئەم کەڵە پیاوە لە زەمانی خۆیدا خاوەنی دەست و تفەنگی خۆی بووە و راوچییەکی زۆر باش بووە قۆناغ بووە و خاوەنی دیوەخانی خۆی بووە و لە دەشتی هەولێر ناوبانگی هەبووە لە پیاوەتی و ناندان کاری چاکە و خەڵکێکی یەکجار زۆر ناسیویەتی و لە ناو خزمەکانی خۆی بە گەورە و ریش سپی دانراوە. خوالێخۆشبوو لە دوای خۆی هەشت کوڕو شەش کچی جێهێشتووە، نەوەکەی ئێستا زیاترە لە ١٠٠ کەس زۆربەیان خوێندەوارن وەک دکتۆر و ئەندازیار و پارێزەر و ئەفسەر و مامۆستا و بڕوانامەی جۆراوجۆری تروە گشت نەوەی ئەم پیاوە لە شاری هەولێر نیشتەجێن. خوا لێخۆشبوو تەنیا یەک برای هەبووە بەڵام چەندین ئامۆزا و خزم و کەس و عەشیرەتی هەبووە.

ناوی کوڕەکانی خوالێخۆشبوو:

١. عەونی حاجی قادر مستەفا/ ئەندامی ئەنجوومەنی نیشتمانی عێراقی پێشوو (دوو خول)
٢. ئیسماعیل حاجی قادر مستەفا/ کۆچی دوایی کردووە
٣. مستەفا حاجی قادر مستەفا/ لیوای عەسکەری کۆچی دوایی کردووە
٤. خەسرۆ حاجی قادر مستەفا/ پارێزەر
٥. پوشۆ حاجی قادر مستەفا/ کاسب
٦. زەید حاجی قادر مستەفا/ عەمیدی عەسکەری
٧. کاوە حاجی قادر مستەفا/ کاسب
٨. سەیفەدین حاجی قادر مستەفا/ کاسب

١. عەونی حاجی قادر مستەفا
٢. چەتۆ محەمەد جوامێر
٣. کەمال کانەبی کاک ئەحمەد
٤. عومەر ئەحمەد حەمەد
٥. فارس سەعید فەتاح
٦. حاجی یوسف میرزا
٧. رەحمان عەبدوڵڵا قادر
٨. محەمەد حەمەدەمین قوبادی
٩. موستەفا خدرکەریم
١٠. دکتۆر تارق نادر
١١. میرزا ئیسماعیل شەریف
١٢. رەزا مەولوود عەلی
١٣. خالد قادر ئەمین.

# ژیاننامەی خوالێخۆشبوو (حاجی قادر حەوێز حەمە جان) مەنمی

خـوا لێخۆشـبوو لە سـاڵی (١٩٣٢) لە دایک بـووەو، وە لە ماوەی ژیانیدا لە شـاری هەولێر ژیاوەو خاوەن دووکان بووە و قۆناغ بووەو ناوبانگی زۆر باشـی هەبووە لە پیاوەتی و چاکە و خەڵکێکی یەکجار زۆر ناسـیویەتی چونکە تەنیا کاری چاکە و پیاوەتی کردووە. خوا لێخۆشـبوو دوو برای هەبووە کە ئێستا لە هەولێر دەژین وە نەوەکانی زۆربەیان بڕوانامەی باڵایان هەیە.

ناوی براکانی خوالێخۆشبوو:

١. ئەحمەد حەوێز حەمەجان/ فەرمانبەر لە وەزارەتی ناوخۆ
٢. نادر حەوێز حەمە جان/ کاسب

# ژیاننامەی خوالێخۆشبوو (ئەحمەد حەمەد قادر) مەنمی

خوا لێخۆشـبوو لە سـاڵی (١٩٣٢) لە دایک بـووە و باوک و باپیرانی ناوبـراو کاتی خۆی لە ناوچـەی (داری کەلـی و بارۆیی) بە هۆی هەندێ کێشـەی کۆمەڵایەتییـەوە کۆچیان کردووە بۆ شاری هەولێر لە ماوەی ژیانیدا لە دەشتی هەولێر ژیاوە لە گوندی (کەردز) خوالخۆشبوو یەکێک بووە لە پیشـمەرگە ئازاکانی شۆڕشـی ئەیلول و لە سـاڵی (١٩٧٤-١٩٧٥) لەم شۆڕشەدا شەهید بووە، شـەهید زۆر خزم دۆسـت بووەو زۆر خۆشەویسـت بووە لە لایەن خزمەکانی و خەڵکانی تریش چونکە تا لە ژیان مابوو هەر خەریکی کاری چاکە بوو خوالێخۆشـبوو لە دوای خۆی سـێ کوڕی جێهێشـتووە کە ئێسـتا لە شـاری هەولێر نیشـتەجێن و ناوبانگی خۆیان هەیە وە چەندین ئامۆزاو خزم و کەس و عەشیرەتی هەبووە.

ناوی کوڕەکانی خوالێخۆشبوو:

١. عومەر ئەحمەد حەمەد، ئەندام لقی دووی پ.د.ک
٢. فەیسەڵ ئەحمەد حەمەد، فەرمانبەر و خاوەن کۆمپانیا
٣. سالار ئەحمەد حەمەد، کاسب

# ژیاننامەی کاک ئەحمەد مەعرووف مەنمی

خوالێخۆشـبوو لـە سـاڵی (١٩١٠) لە دایک بووەو، بـاوک و باپیرانی ناوبـراو کاتی خۆی لە ناوچەی (داری کەلی و بارۆیی) بەهۆی هەندێ کێشەی کۆمەڵایەتییەوە کۆچیان کردووە بۆشاری هەولێر وە لە ماوەی ژیانیدا لە دەشـتی هەولێر لە گوندی (سـابلاغ) سـەربە ناحیەی قوشـتەپە ژیـاوەو خەریکـی کاری کشـتوکاڵی و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات بووە. ئـەم کەڵە پیاوە لەزەمانی خۆیدا خاوەنی دەسـت و تفەنگی خۆی بووە و قۆناغ بووە و خاوەنی دیوەخانی خۆی بووە و لە دەشتی هەولێردا لە پیاوەتی و ناندان و کاری چاکە و خەڵکێکی یەکجار زۆر ناسیویەتی هەورەها

خوالێخۆشبوو هوشیار بووە و قورئان خوێنیش بووە خوالێخۆشبوو لە دوای خۆی چوار کوڕی جێهیشتووە کە هەندێکیان مردوون و ئەوانی تریش لە ژیان ماون ئامۆزاو خزم و کەس و عەشیرەتی هەبووە.

ناوی کوڕەکانی خوالێخۆشبوو:

١. کانەبی کاک ئەحمەد مەعرووف/ کاسب (کۆچی دوایی کردووە)
٢. عوسمان کاک ئەحمەد مەعرووف/ عەلاف ( کۆچی دوایی کردووە)
٣. نەعمان کاک ئەحمەد مەعرووف/ مامۆستا لە زراعە (ئێستا) لە ئەڵمانیا دەژی
٤. رەفعەت کاک ئەحمەد مەعرووف/ مامۆستا ( ئێستا لە دانمارک) دەژی

# ژیاننامەی خوالیخۆشبوو ( حاجی محەمەد جوامێر قوربانی) مەنمی

خوالیخۆشبوو لە ساڵی (١٩٠٤) لە دایک بووە لە ساڵی (١٩٩١) کۆچی دوایی کردووە. باوک و باپیرانی ناوبراو کاتی خۆی لە ناوچەی (داری کەلی و باڕۆیی) بەهۆی هەندێ کێشەی کۆمەڵایەتییەوە کۆچیان کردووە بۆ شاری هەولێر و لە ماوەی ژیانیدا لە دەشتی هەولێر لە گوندەکانی (ئۆمەرە سوور) و بیستانەی (گچکە) ژیاوە خەریکی کاری کشتوکاڵی و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات بووە. ئەم کەڵە پیاوە لەزەمانی خۆیدا خاوەنی دەست و تفەنگی خۆی بووەو قۆناغ بووەو خاوەنی دیوەخانی خۆی بووەو لە دەشتی هەولێر ناوبانگی هەبووە لە پیاوەتی و ناندان و کاری چاکە و خەڵکێکی یەکجار زۆر ناسیویەتی. خوالێخۆشبوو لە دوای خۆی حەوت کوڕ و حەوت کچی جێهیشتووەو نەوەکەی ئێستا زیاترە لە ١٠٠ کەس زۆربەیان خوێندەوارن وەک دکتۆر و ئەندازیار و پارێزەر و مامۆستا و بڕوانامەی جۆراو جۆری تر وە گشت نەوەی ئەم پیاوە ئێستا لە شاری هەولێر نیشتەجێن. خوالێخۆشبوو تەنیا یەک برای هەبووە لەگەڵ یەک خوشک بەڵام ئامۆزا و خزم و کەس و عەشیرەتی هەبووە.

ناوی کوڕەکانی خوالێخۆشبوو:

١. چەتۆ محەمەد جوامێر/ ئەندازیاری شارەزا
٢. رەشید محەمەد جوامێر/ فەرمانبەر
٣. ئەکرەم محەمەد جوامێر/ فەرمانبەر
٤. شینە محەمەد جوامێر/ کاسب

٥. ناسیح محەمەد جوامێر/ کاسب
٦. ئیبراهیم محەمەد جوامێر/ کاسب
٧. قاسم محەمەد جوامێر/ کاسب

# ژیاننامەی خوالێخۆشبوو (عەبدوڵڵا مام قادر کەریم مەحمود) مەنمی

خوالێخۆشبوو لە ساڵی ١٩٩٨ کۆچی دوایی کردووە. لە ناو خزمەکانی برا گەورە بووە، بنەماڵەی خزمەکانی خوالێخۆشبوو (٢٨٠) ماڵ بوون وە ئێستا بە پێشنیازی هەموو خزمەکان و ریش سپییەکان کوڕە گەورەی خوالێخۆشبوو (عەبدولرەحمان عەبدوڵڵا مام قادر) ە کراوە بە برا گەورە لە جێگای باوکی واتە بووە بە برا گەورەی (٢٨٠) ماڵ، نەوەکەی ئێستا زیاترە لە (٤٨٠) کەس کە زۆربەیان خوێندەوارن و بڕوانامەی جۆراو جۆری تر وە گشت نەوەی ئەم پیاوە ئێستا لە شاری هەولێر نیشتەجێن.

ناوی کوڕەکانی خوالێخۆشبوو:

١. عەبدولرەحمان عەبدوڵڵا مام قادر
٢. بێکەس عەبدوڵڵا مام قادر
٣. محەمەد عەبدوڵڵا مام قادر
٤. جەنگی عەبدوڵڵا مام قادر
٥. رێبوار عەبدوڵڵا مام قادر

# ژیاننامەی خوالێخۆشبوو (میرزا محەمەد قادر قوباد) مەنمی

خوالێخۆشبوو لە ساڵی (١٩٢٦) لە دایک بووەو لە ساڵی (٢٠٠٦) کۆچی دوایی کردووە خوالێخۆشبوو دەینووسی و دەیخوێندەوە.
یوسف میرزا محەمەد: (تاکە منداڵی بووە) ١٩٤٦ دەرچووی یاسا ساڵی (١٩٧٥) بریکاری وەزارەتە لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران.
ئەحمەد یوسف میرزا: دەرچووی ئامادەیی خاوەن سوپەر مارکێت و بەڵێندەریشە (١٩٧٤).

بەختیار یوسف میرزا: فەرمانبەرە لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دەرچووی کۆلێژی ئاداب (١٩٧٦) بەڕێوەبەری جێبەجێکار.
محەمەد یوسف میرزا: (١٩٧٧) مامۆستای کۆلێژی دەرمانسازی دەرچووی کلاسکۆ\ ماجستێر.
دیدار یوسف میرزا: بەڕێوەبەر لە وەزارەتی دارایی و ئابووری (١٩٨٠) دەرچووی کۆلێژی شەریعە.
دیار یوسف میرزا: دەرچووی یاسا – ماجستێر ( ئیدارە و ئیقتیساد ١٩٨١) فەرمانبەرە لە عیلاقاتی دەرەوە.
ئازا یوسف میرزا: (١٩٨٣) دەرچووی کۆلێژی شەریعە بەڕێوەبەر لە وەزارەتی دارایی و ئابووری.

# ژیاننامەی خوالێخۆشبوو (حاجی سەعید فەتاح ئەحمەد) مەنمی

حاجی سەعید فەتاح ئەحمەد کوڕی شێرزاد کوڕی کۆزاد مەنمی (بارۆیی) خوالێخۆشبوو دوو برای هەبووە بە ناوی شێخ محەمەد و حەمە عەلی ناو دەینووسی و دەیخوێندەوە لەدایکبووی (١٩١٥) وە لە ساڵی (١٩٩٩) کۆچی دوایی کردووە، حاجی سەعید لە ساڵی (١٩٥٣) گوندی بیستانەی بەجێهێشت و رووی لە شاری هەولێر کردووە دووکانی (بەزازی) داناوە خەریکی بازرگانی بووە، ناوبراو زۆر رۆڵی جوامێری هەبووە لە رووی کۆمەڵایەتی ناو خزمان و دراوسێکانی لە هەموو کێشەیەکی کۆمەڵایەتی بەشداری کردووە بۆ نزیککردنەوە و نەهێشتنی دووبەرەکی لە ناو خزماندا، ناوبراو زۆر خانەدان بووە خاوەنی دیوەخان یان هەر ناسیارێکی ئەم هەرێم دەهاتن بۆ هەولێر شەو لای ئەو مێوان دەبوون و خزمەتێکی زۆری دەکردن و رێزی لێ دەنان خوالێخۆشبوو (٦) کوڕ و (٢) کچی لە پاش خۆی بەجێ هێشتووە.

١. فارس سەعید فەتاح: مامۆستا دەرچووی (١٩٦٥) ٥ کوڕو ٤ کچی هەیە.
٢. بایز سەعید فەتاح: دەرچووی کشتوکاڵی (١٩٧٥) ٢ کوڕو ٥ کچی هەیە.
٣. جبار سەعید فەتاح: دەرچووی ئامادەیی بازرگانی ١ کوڕو ٥ کچی هەیە.
٤. سەعید فەتاح: لە دەرەوەی وڵاتە لە ئەڵمانیا ٤ کوڕی هەیە
٥. ئازاد سەعید فەتاح: دەرچووی ئامادەیی، کاسب ٢ کوڕی هەیە.
٦. فاخر سەعید فەتاح: دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی ٣ منداڵی هەیە
کۆی بنەماڵەکەی حاجی سەعید فەتاح وە براکانی دەگاتە زیاتر لە (١٠٠) کەس لە خوا بەزیاد بێت.

# تیرەی باشکێ

یەکێکە لە تیرەکانی هۆزی جاف و پەیوەستە لە گەرمیان و کوێستاندا بوون، وەک ژمارە رەنگە وەک تیرە گەورەکانی جاف ژمارەیان زۆر نەبێت، بەڵام وەک تیرەیەکی سەربەخۆی ناو جاف ناسراون. ئەم تیرەیە بە ئازایەتی ناسراون، بە تایبەتی لە شەڕە بەردا هیچ تیرەیەکی کەی جافیان پێدا راناگا، خڕک وەشێنی ناو باشکی بەناوبانگە جارەوبار «بەردەقانێ»شیان بە کاربردووە، بەردی بەردەقانێ، باشکێ بەر هەر کەسێک کەوتبێت ساغ دەرنەچووە، ژنگەلی باشکی ئەوانیش لە بڕێک شەڕدا بەشدارییان دەکرد و تەنیا تەماشاکەر نەبوونە و وەکو پیاوان لە شەڕە بەردا بەشدار بوونە. ئەمە «ئەوسا» دیارە ئەوڕۆش دنیا بۆ هەمووان گۆڕاوە، لە ناو ئەم تیرەیەدا ئەوڕۆ چەندین هەڵگری بەڵگەنامەی زانکۆیی تیادایە و لە کاروباری ژیانی ئەمڕۆدا لە زۆر بواردا بەشدارن. ئەم تیرەیە دوو بەشن.

١- باشکێ
٢- غولامی

**ناوی باشکێ**:

بێگومان ناوی ئەم تیرەیە لە وشەی «باش»ەوە هاتووە، «باش-چاک» و دیارە باشەکە بووە بە «باشکێ». یانی ئەو کەسەی کاری نەشیاوی لێ ناوەشێتەوە، ئەوەی دەیکا و دەیڵێت لە رووی باشی خۆیەوەیە. بڕێکی تر لایان وایە ناوی «باشکێ» لە «باشوکی»یەوە وەرگیراوە، بە تەئکید

هەردوو وشـــەکە دەگەڕێتەوە ســـەر وشەی «باش» لەوانەش گوزەشـــتە ئەم تیرەیە ناسراون بە دڵپاک و دڵ ســـاف و دوورن لە درۆ و دەلەســـە و لە بۆچوون و قەناعەتی خۆیاندا راستن، رەنگە وتەی بە ناوبانگی «جافی سینە ساف» لە تیرەی باشکییەوە وەرگیرابێت.

## خێڵ و بنەماڵە ناسراوەکانی تیرەی باشکی:

١- بنەماڵەی ئەحمەد باشک: لەساڵی ١٩٠٢ سەرۆکی ئەم تیرەیە فارسی خەلیفە حەسەن بووە.
٢- بنەماڵەی وەیسی باشک: لە ساڵی ١٨٨٣، وەیس شاسوار گەورەی ئەم بەرەبابە بووە.
٣- بنەماڵەی مەحموود باشک: لە ساڵی ١٨٨٢، ئەحمەد موراد براوەیس ریش سپی ئەم بەرەبابەی بووە.
٤- بنەماڵەی حەمەلاو باشک: لە ساڵی ١٩٠٧، حەمە خورشیدی حەمەلاو دەمڕاستی ئەم بەرەبابە بووە.
٥- بنەماڵەی ســۆفی رەســول: کەریمی ســۆفی رەســول یەکێک بووە لە پیاوە دیارەکانی ناو ئەم بەرەبابە.
٦- بنەماڵەی سورەک: لە ساڵی ١٩١٨، زۆراو سورەک گەورەی ئەم بەرەبابە بووە، لە ناو تیرەی باشکیدا چەندین پیاوی دیاری و ناسراو ناویان براوە وەک:.

١- محەمەدی خەلیفە هەسەن، گوندی کانی زەرد، ١٩٢١ز
٢- حەمەجانی مەحموود موراد وەیسی ١٨٥٢ز.
٣- سەعید موراد ئاخە، ناسراو بە «سەعە یەکی» گوندی گەرەکە رەشی گەرمیان ١٩٣١ز.
٤- ئەحمەدی حومەینی خەسرەو، ناسراو بە «ئەحەلاڵ» گوندی میوەکەی خواروو ١٩٣٧ز.
٥- حەمەی رەحیمی وەسین ١٨٧٦ز.
٦- حەمولی سۆفی ساڵح کەرەم وەیس گوندی بنەبەراز ١٨٩٧ز.
٧- روبیتەن قارەمان مارف گوندی وردیلە ١٩٢٤ز.
٨- مەجیدی حەمەلاو گوندی پووکە- ئەم پیاوە لە ســاڵی ١٩٦٣ لەگەڵ بەندەدا پێشــمەرگە بووە، پیاوێکی ئازا و نەترس بوو، تا بڵێی راستگۆ و ساف و دەست وەشێن.
٩- مەحموودی پیروەیس گوندی زاوت ١٩٢٠.
١٠- هەسەنی سۆفی رەسول
١١- محەمەدی هەسەن مارف، گوندی قولە سووتاو
١٢- رەشید ئەحمەد مارف، گوندی قولە سووتاو، سەعیدی سۆفی نادر.
١٣- رەشیدی عەولکەریمە سوور، ١٩٢٧.
١٤- قادر ئەمین ئەولا، لە شەڕەکانی شێخ مەحموودا بەشداری کردووە و بریندار بووە، لە ساڵی ١٩٨٥ مردووە.
١٥- وەسین قەیتول حەمە وەیس، لە شەڕی ئاوباریک شەهید کراوە.

١٦- حەمەی قادری یاسین، لە لایەن ئینگلیزەوە کوژراوە.
١٧- مارف مەحموود یاسین، لە شەڕی ئاوباریک شەهید بووە.
١٨- ئەولکەریمی قازی، گوندی مۆسۆیی ١٩٢٢.
١٩- خەلیفە ڕەشیدی حەمەلاو، گوندی دوخڕان ١٩١٩.
٢٠- ئەلی بچووک پاڵەوان، گوندی کانی گەورە ١٨٩٤.
٢١- ئەولکەریم قادر، ناسراو بە ئەولکەریم خاتوون،
٢٢- حوسەینی عەلی قادر ١٩٠٣
٢٣- ساڵح وەسین قەیتول، گوندی بنەبەراز ١٩١٢
٢٤- کەریم عەلی بچووک، گوندی کانی کەوە ١٩٢٥.
٢٥- ئەحمەدی حەمەی سەلمان ناسراوە بە «فەقێ ئەحمەد» گوندی کانی میل.

# داستانی بەرد و باشکێ

وەک لە پێشـــدا ئاماژەم بۆ کردووە، ئەم تیرەی جافە «باشــکێ» شــۆرەتێکی بەربڵاویان هەیە لە شەڕەبەرد و خڕک وەشاندندا، دەگێڕنەوە لەو بنەبەرازە، کە دێیەکی (باشکێ)یە، بەفرە ڕۆژ دەبێ، چوار ئاسک ڕوو دەکەنە ناو دێ، هەر بە بەرد سیان لەو ئاسکانە گل دەدەنەوە.
یەکێکی تر بۆی گێڕامەوە، کە بۆ خۆی پێشــمەرگەیەکی تیرەی باشــکی بوو، سوێندی بۆم خوارد، بە چاوی خۆی دیویەتی یەکێک لە خڕک وەشێنەکانی ناو باشکی، ئەوەندە چاپک و گورج و گۆڵانە بەردی هاویشــتووە، دوو بەردی بە ئاســمانەوە بووە و هێشــتا بەر زەوی نەکەوتوون بەردێکی تری لە مشتدا بووە..



فارسی خەلیفە هەسەن
١٩٠٢-١٩٧٨



حاجی ساڵح حوسێن
قەیتول
١٩٢١-١٩٩٠



قادر ئەمین ئەولا
١٩٢١-١٩٨٣



محەمەدی خەلیفە هەسەن
١٩٢١-١٩٨٣

# هاروونی

تیـرەی هاروونـی یەکێکە لە کۆنترین تیرەکانی ناو جـاف، لە زۆر پەرتووکی کۆندا ناوی ئەم تیرەیە هاتووە و ناوی جاف نەهێنراوە، هەتاکو لە شەرەفنامەکەی میر شەرەفخانی بدلیسیدا.

ناوی هاروونی: ئەم ناوە وەک زۆر ناو و وشە و واژەی کوردی گۆبەنی لەسەرەو دەمارگرژانی عارەب و عەجەم و تورک لە مێژەوە دەسـتیان لە بینماندایە و کۆشـاون ئەمڕۆ ئەوی بە کەڵکە و دزیویانە و ئەوڕۆ هی خەڵکە...

هەتاوەکو ناوی (جاف) و رەگەزی جاف دەیبەنە سـەر فڵان سـەیدی عارەب و فڵان شـێخی ئەو عەرەبسـتانە. کورە وەرە بمکوژە عارەب و عەجەم و تورکی ئەنادۆڵی هەر نەیسـە، بڕێک لە مەلا و شـێخە ناسـراوەکانی کوردیش هەمان ئەو زوڕنا ژەنینە دەکەن و کردوویانە و بە هەزار فیـڵ و تەڵەکەی ناڕەوا منێکی جافی سـینە سـافی پەروەردەی دۆڵ و دەربەنی ئەم کوردسـتانە لەبەر (مامە حەمەیی) بۆ دەسـەڵاتە ناوەندییەکان ئەو مەلا و شـێخە قەڵەم پیسانە دەکەنە (عارەب ئوغڵو)یەکی ئەو بناری مەککە و مەدینە و دەیانەوێ عاگالی مەینەت و ریسـوایی بکەنە سـەرم و بەشێکی زۆری ئەم میللەتە چەوساوەی کوردە بخەنە سەر رەگەزی «بەنی قەحتان» من نامەوێ نـاوی ئـەو خوالێخۆشـبووانە بهێنم، بەڵام ئەوانەی بـە دوای ناوی (جـاف)دا بگەڕێن حەی عەلا سـەڵات دیـارن.. هەر بۆ نموونە بنواڕە چۆن لە یەک نـاوی (عارەبی) ناگوزەرێن، بە چنگ و دان لە تەقەللادان بۆ هەڵبەسـتن، ئەو کابراشـە دەڵێت: ناوی تیرەی هاروونی لە (هاروونە رەشـید)ی عەباسـییەوە هاتووە..!! ئەی باشـە ئەگەر هەر لەبەر ئەوە بێت هاروونە رەشید بە ناخێر خەلیفەی عەباسـی ئیسـلامی بووە خەیر و ئەجری زۆرە ئەگەر ئەم تیرە بە شـەرەفی کوردە جافە بکاتە عـارەب خۆ براکەی موسـا پەیامبەر کە یەکێک بووە لە پەیامبـەرە گەورەکانی دنیای وەحدانیەت

ناوی (هاروون) بووه. تازه وتەوێژی ئەو حەزرەتەش بووە، کەواتە ئەو خێرخوازە بێ حیسابانە لە حیسابەکانیاندا ئالتیان هێناوە، ئەگەر بۆ خێرخوازی و رەزامەندی عارەب و گەلی بە دەسەڵات بووە چاک وابووە بەرەو لای هاروونی برای حەزرەتی موسایان بردبا چاکتر دەبوو.

لێیان گەڕێ با بگەڕێینەوە سەر ناوی (هاڕوونی)..برێک دەڵێن لە نەوە و نەتیجەی پیاوێکی بەدەسەڵات و هەڵکەوتوو بە ناوی (هاڕون) بوونە و بە گوێرەی زەمان و زۆر بوونە و (هاروون) بووتە (هاروونی) یان (هاورونییەکان) ئێمەی هۆزی جاف بە تەواوی تیرەکانییەوە تا ئەو کاتەی (جاف) ناوی (جاف) بووە لە هاتوچۆی ئەم دیو و ئەودیوی کوردستاندا بووینە، یان لەبەر لەوەڕگای مەڕومالات یان لەبەر رووداو و پەلامارەکانی دەسەڵاتە جۆراوجۆرەکانی (سەفەویە-قاجاری-ئەردەلان، یان عێلجاری عەشایەرەکان) لە پێش ئەوەشدا کە (جاف) ناوی (جاوان- جاڤان، جافان) بووە، دەسەڵاتی جاوان بە تیرەکانییەوە لە دەوروبەری شاری بەغدا و شاری حیللەدا نیشتەجێ بوونە لە پێش ئەوەشدا ( جاپان) کە دەسەڵاتدارانی دەسەڵاتی ساسانییەکان بوونە و بڕبڕاگەی لەشکری شەڕەنگێزی ئەو دەسەڵاتە بوونە و لە دوای شەڕی ( قادسیە)ی نێوان لەشکری ئیسلام و سوپای ساسانی و سەرکەوتنی داگیرکەری عارەب لەو شەڕەدا و داگیرکردنی پایتەختی دەسەڵاتی ساسانی ( تیسفون) کە عارەب پێی دەڵێ (مەدائین) و تاوەکو ئەوڕۆ تاقە هەرە بەرزەکەی دیوانی کیسرا لە خواری بەغداوە ناز و فەخر بە جیهان دەفرۆشێت.

دوای پەلاماری مەغۆل و بەغدا داگیرکردن، کەم و زۆر هۆزی (چاپانی بە جاوان) بوو و لە ئاکامدا بە (جاف) بوو دووبارە کەم و زۆر دەگەڕێنەوە بۆ سەر ژیانی کۆچەری و برێکیان لە دەڤەری جوانڕۆ و دەوروبەریدا نیشتەجێ دەبنەوە. ئیتر بە گوێرەی بەرژەوەندی (ئاسایش، ئابووری، جوگرافی) کەوتوونەتە گەرمیان و کوێستان.

برێک بۆچوون لایان وایە، تیرەی هاڕوونی لە دەڤەرێکدا بەزیبوون و ئەو دەڤەرە بە ناوی (هاروون) ناوێکەوە کە بێگومان چاوساق و دەمڕاستی بەرەبابی هاوورونییەکان بووە و لە ئاکامدا ناونراوە هاروون ئاوا، ئەو (هاروون ئاوا)یەش تا بە ئەمڕۆیش جێگەیەکی ئاوەدانە لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا، بەندە وا دەزانم ئەوەیان لوژیکانەتر بێت، تا هاروونە رەشید و هاروونی برای حەزرەتی موسا چوزانم کێشانی بەرەو لای بەنی قەحتان و بەنی عەدنان.

ئەوی ئاشکرایە لە پێش دوا کۆچی هۆزی جاف، یانی دوای پەلاماری دەسەڵاتی ئەردەلان بۆسەر هۆزی جاف و کوژرانی سەرۆکی جاف و تاڵانکردنی برێکی زۆری داراییی تیرەکانی جاف لە لایەن ئیمارەتی ئەردەلانەوە، برێک لە تیرەی هاروونی لە دیوی دەربەندیخانەوە بوونە کە ئەو شەڕە رووەدا برێک لە هۆزی جاف بە سەرۆکایەتی (زایەر بەگی جاف) لە ژێر دەسەڵاتی (ئەردەلان – سەفەوی) دەگوێزرێنەوە بۆ رۆژئاوای کوردستانی ئیمارەتی بابان و ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و هاروونیە کۆچکردووەکان لەگەڵ هاروونیە نیشتەجێکاندا تێکەڵ دەبنەوە و میر شەرەفخانی بەدلیسی ناوی هۆزە کۆچەرەکانی نەبردووە وەک جاف، هەرکی، کە دوو هۆزی گەورەی کۆچەری کوردن، کەچی ناوی برێکی هێناوە لە ژمارەیدا کە یەکجار کەم بوونە و لە دەسەڵاتی مەرکەزییەوە نزیک بوونە. (سەفەوی عوسمانی) ئێمە لە بەشەکانی دیکەی ئەم کتابەدا ئاماژەمان بەو خاڵە کردووە، یانی دەمەوێ بڵێم: ئاماژەکردنی برێک لە سەرچاوە کۆنەکان بۆدوو تیرەی جاف (هاروونی و گەلاڵی) بە ناوی خۆیانەوە، هی ئەوە بووە کە برێک لەو دوو تیرەیە نیشتەجێ بوونە و بە شێوەیەک لە شێوەکان لە دەسەڵاتەوە نزیک بوونە.

# دێهات و جێگە و شوێنی تیرەی هاروونی

وەک وتمان بەشـیک لەم تیرەیە لە کۆنەوە نیشـتەجێ بوونە و جێگە و شـوێنی دیاریکراوی خۆیان هەبووە و خێڵە کۆچەرەکانی تیرەی هاروونی وەک ئەو باقی تیرەکانی جاف لە گەرمیان و کوێستاندا بوونە. بەندە لام وایە، تیرەی هاروونی لە پێش دوا هیجرەتەکەی جاف ( سەردەمی زایەر بەگی جاف) دا لە دیوی باشـووری کوردسـتاندا نیشـتەجێ بوونە و پەیوەندیشیان بە دەسەڵاتی عوسـمانی و ئیمارەتی ئەردەلانەوە هەبووە. ئیدی لەچی ئاسـتێکدا ئەو پەیوەندییە بەرقەرار بووە. بەڵگەیەکی مێژووییمان بە دەسـتەوە نییە، ئەگەر هەشـبێت ئەوا وەک ملیۆنەها دیکۆمێنتی دەست بەسەرا کێشراوی لە (ئەنجوومەنی پاراستنی دیکۆمێنتە عوسمانییەکان) دروستکراوێکە لە شاری ئیستەنبول، ملیۆنەها بەڵگەنامەی مێژوویی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تێدایە ( بەندە توانیم پەیوەندی لەگەڵ چاوساقێکی ئەو ئەنجومەنەیدا پەیدا بکەم، ئەو کابرایە وتی هەر دەربارەی عەشیرەتی جاف ٤٠ هەزار دیکۆمێنت و بەڵگە و فەرامین لەوێدایە)

لێکـی بدەرەوە، هەر دەربارەی یەک عەشـیرەتی کورد ئەو ژمـارە زۆرە بەڵگە و دیکۆمێنتانە بە دەستەوە بێت مانای ئەوەیە ئەگەر کورد و دەسەڵاتی کورد بتوانێت بە شێوەیەک لە شێوەکان ئەو دیکۆمێنتانە بەدەسـت بهێنێت لە بنەڕەتدا واقیعیاتی مێژووی کورد دەگۆڕێت و زۆر راسـتی و رووداوی مێژوویـی دەخرێنـە بەرچاو. مـن وەنەبێت کۆڵم دابێت لە هەمـوو رێگایەکەوە بۆی رۆیشـتووم (خەریکم) سـا بە پارە بێت یان بە چارە بێت شـتێک هەر بە دەسـت دێنم بەڵام ئەوە کارێکـی گرنگی نەتەوایەتـی حکومەتی هەرێمە و ئەرکێکە کەوتۆتە ئەسـتۆی، ئەگەر بۆی بکرێ، دەبێ بیر لەو کارانە بکەنەوە.

تیرەی هاروونی وەک تیرەکانی دیکەی جاف، زەمان ناچاری کردوون بە تەواوی دەسـت لە گەرمیان و کوێسـتان هەڵگرن، بەڵام لە کوێسـتاندا وەک هەر تیرەیەکی جاف، هەوارگە و شوێنی تایبەتمەنـدی خۆیـان هەبووە وەک: کانـی تەمەرخان، گوڵچیەر، کانی کەریان، گوێزە سـووتەک، تەنگی وەڵاش، تۆراخ تەپە، خانزاد دیوە، دۆڵەلار، کەرمەردە، سوڵتان تاغزوت، ملەمەیدا و سەراڵ و سـورڵ. ئەمـەش ناوی دێهاتەکانی تیرەی هاروونیە؛ دەشـتی پیواز، باینجـان، تۆپخانە، حاجی لالیخان، تازەدێ، حاجی حەسەن، پونگڵە، دڕکە..

لەولاشەوە، دەرەدوین و برێک لەم شوێنانە هاروونی نیشتەجێن، باکان، باغی خێڵان، کەورە زەینالّی، قەرەبڵاخی خواروو، لە شارەزووردا.. تەپە زێڕینە، قاجر، ریشین، مەلاوەیسە، گوڵەخانە، قوخورد، قەیەفەڕی، کانی شێخ، دوانزە ئیمامی خواروو، کاگردەڵ، خولامییەکان، بیژاوا، قارەمانی، نیرگەجر، حەسەکانی مەلاعەلی، عەلیاوا، بیسەلمێن، جەردسنە، کانیبەرینە، گوڵان، تووەقووت، وازوڵ، عازەبان. لەبەر ئەوەی دۆڵی شارەزوور تێکڕا بە زۆرینە (جاف)ن، لە زۆربەی شارەکانیدا تیرەی هاروونی تێدایە. هەڵەبجەی شەهید، سیروان، سەید سادق و دەربەندیخان و کەلار.

## ناودارانی تیرەی هاروونی لە سەدەکانی پێشوودا:

١. سەلیمەسوور: لە سەردەمی کەیخوسرەو بەگی جافدا بۆخۆی بە گەورە و دەمڕاستی تیرەی هاروونی ژمێردراوە.
٢. محەمەدی سەلیم: لە سەردەمی حەمە پاشای جافدا سەرۆکی تیرەی هاروونی بووە.
٣. حەمومینی سەلیم: لە سەردەمی مەحموود پاشای جافدا دەمچەرمووی تیرەی هاروونی بووە.
٤. عەول محەمەدی محەمەد ئەمین: سەرۆکی هاروونیی سەردەمی فەرمانڕەوای مەحمود پاشای جاف بووە.
٥. عەلی حەمومین: لە سەردەمی سەرۆکایەتی کەریم بەگی جاف و داود بەگی جافدا سەرۆکی هاروونییەکان بووە١٩٢٠ تا ١٩٦٠ز.
٦. ئەحمەد حەسەن قەیتوول: پیاوێکی ناوداری هاروونییەکان بووە.
٧. پیروەیسی حاجی عەلی: یەکێک بووە لە دەمڕاستەکانی تیرەی هاروونی
٨. ئەحمەدی مستەفا خالە
٩. قوری عەلی ئەحمەدی زاڵە
١٠. ئەحمەد کامەران
١١. حاجی فەرەجی حاجی مەحموود حەسەن وەیسی..

## ئەمانەش ناوی ناودارانی تیرەی هاروونین لە دوای ساڵانی 1950ز دا:

١. محەمەدی عەلی حەمومین
٢. حاجی مەحمودی حاجی قادر
٣. حەمە عەلی حاجی محەمەد رەحمان
٤. سدیقی عەلی حەمومین.
٥. ئەنوەری محەمەد عەلی
٦.  حاجی عەبدولقادری عەبدولکەریم
٧. حەمە ساڵحی رەشید
٨. حاجی حەمە ئەمینی قادری حاجی حەمە عارف

٩. حاجی حەمە عارف
١٠. حاجی حەمە سالمی عەلی ئیبراهیم

لە ناو تیرەی هاروونیدا دەمڕاســت و پیاوی لێهاتوویان زۆر تێدا بووە، باوەڕ بکەن ئێســتاش هەر وەک ئەوسا دەمڕاست و پیاو ماقووڵی زۆریان تێدایە.

حەمــەی حاجی مەحمودی هاروونــی، ئەوڕۆ یەکێکە لە گەورە پیاوانــی هاروونی. هەروەها حەمەی حاجی مەحمودی گوڵەخانی کەســایەتییەکی سیاســی گەلی کورد و لە دنیای سیاســەتدا جێگە و شوێنی خۆی هەیە

لــەم تیرەیەدا خوێنــدەوار و هەڵگری بەڵگەنامەی زانکۆکانی زۆر تێدایــە، خوێندەواری وایان تێدایە بە پەنجە ئاماژەی بۆ دەکرێت وەک:

حەمە ساڵحی عەلی حەمومین، ناسراو بە (ساڵح هاروونی) کە بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەم کتێبە یارمەتی دام، خودا ئەم عەشیرەتە لە نموونەیان بێبەش نەکات.

**ئەو ناوانەی خوارەوەش لەکاتی جافداری گەرمیان و کوێستانکردندا خێڵیان هەبووە:**

١- حاجی رۆستەم بارام
٢- حەمەی پیروەیس
٣- حاجی حەمە ئەمین حاجی قادر
٤- عەبدولکەریم حاجی محەمەد
٥- حاجی حەسەن حاجی قادر
٦- حاجی عەبدوڵڵا هوریخانی

بــۆ بــرای گەورە و بەڕێزمان کاک خوســرەو جاف پاش رێز و حورمەتــی زۆرمان بۆ جەنابتان لەگەڵ ئەم نامەیەدا وەڵامی ئەو پرســیارانەتان دەدەینەوە کە ئاراســتەتان کردبووین سەبارەت بە چەنــد زانیارییەک لە بارەی تیرەکەمــان (تیرەی هاروونی)، هیوادارم جێــگای رەزامەندیتان بێت، تەمەننای سەرکەوتنیشتان بۆ دەکەین.

دڵسۆزتان
**حەمەساڵح محەمەدەمین هاروونی (ساڵح هارونی)**
**باوەنوور ٢٠٠٩/٧/٣**



حاجی فەتاحی حاجی ئەحمەدی هارونی
١٩٢٢-١٩٨٩



حاجی وەلی
١٩١٢-١٩٧٨

## تیرەی کویک و فیزی لە کۆنەوە دەگەڕێنەوە سەر تیرەی هاروونی.

وەڵامی پرسیاری سێیەم:
أ- بە رای من ژمارەی تیرەکەم لە هەزاران کەس دەدات.
ب- ئەوانەی زانکۆیان تەواو کردووە یان لە زانکۆدان سەد کەسێک تێپەڕ ناکات.
ت- ئەوانەی بڕوانامەی ناوەندییان هەیە بە سەدان کەس دەبن.

وەڵامی پرسیاری چوارەم:
تیرەی هاروونی لەمێژدا لەگەڵ تیرەکانی (بەیداخی، سەیانی، عەمەڵە) زۆر گونجاو بووە و لەگەڵ تیرەی شاتریدا نزیکایەتی هەبووە بەڵام لەگەڵ هەردوو تیرەی (رۆغزایی و تەرخانی)دا چەند جارێک بەشەڕ هاتوون.

وەڵامی پرسیاری پێنجەم:
أ- لە ساڵانی بیستەکانی رابردووەوە خێڵەکانی تیرەی هاروونی ساڵ بە ساڵ وردە وردە کەمیان کردووە و ژیانی نیشتەجێبوونیان هەڵبژاردووە، بەڵام خێڵەکانیان لە ساڵانی سییەکان و چلەکان و پەنجاکانی سەدەی رابردوو بگرە هەتا شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ لە گەرمیان و کوێستان کردندا بووە و هەتاوەکو سەرەتای ساڵی حەفتاکانیش چەند بڕکە ماڵێکیان لە نێوان پێواز و شارەزووردا کۆچەرییانە دەژیان.
ب- هارونی لە کوێستاندا هەوارگەی زۆریان هەبووە کە ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لەو هەوارانە: (کانی تەمرخان، گوڵیچیەر، کانی کەریان، گوێزە سووتک، تەنگی وەڵاش، تۆراخ تەپە، خانزادە دێوە، دۆڵە لار، کەرمەدە، سوڵتان ئاغزۆت، ملە مەیدانیان، سەراڵ و سوراڵ).
ت- ناوچە و دێهاتەکانی ئێستای هاروونی:

هاروونی لە دەشتی پێوازی ناوچەی گەرمیان ئەم دێهاتانەی هەیە: (بانیخان، تۆپخانە، حاجی لاڵیخان، تازەدێی حاجی حەسەن، پونگەڵە و دڕکە). هەروەها گوندی گەرمک موڵکی هاروونییە بەڵام دانیشتوانەکەی ئێستای لە تیرەی باشکین. لە دەرەوەی دەشتی پێواز (دەرەدۆین) گوندێکی هاروونییە. بەشێک لە دانیشتووانی گوندەکانی (باسکان و بانی خێڵان و کەوزەیناڵی و قەرەبلاغی خواروو) لە تیرەی هاروونین. لە دەشتی شارەزووردا هاروونی لەم گوندانەدان: (تەپە رێزینە، قاجر، ریشێن، مەلا وەیسە، گوڵەخانە، قولخورد، قەیەفەری، کانی شێخ، دوانزە ئیمامی خواروو، کاگردەڵ، خۆلامییەکان، بێژاوا، قارەمانی، نێرگسە جاڕ، مەسەکانی مەلا عەلی، عەلیاوە، بێسمەڵمێن، جەداسنە، کانی بەردینە، گوڵان، تۆوە قووەت) هەروەها بەشێک لە دانیشتووانی گوندەکانی (گردەنازێ، گردی شەریف، وازۆڵ، عازەبان) هاروونین.

وەڵامی پرسیاری شەشەم:
بەدەگمەن ماڵی هاروونی لە (سلێمانی و هەولێر و کەرکووک) نیشتەجێن، بەڵام لە شار و شارۆچکەکانی (هەڵەبجەی شەهید و سیروان و سەید سادق و هەڵەبجەی تازە و دەربەندیخان و باوەنوور و کەلار) بە دەیان خێزانی هاروونی نیشتەجێن و لە چەند شارێکدا بە زۆری دێنە پێش چاو.

# تیرەی سۆفی وەند

تـا حەفتـا سـاڵ لەمەوبەر ئەم تیرەیـە لە گەرمیان و کوێسـتاندا بوونە و ئەوڕۆکە لە شـێروانە، قەڵخانلو، هوانی نزیک سلێمانی نیشتەجێن.



حاجی تالیبی حەمە حەسەن، سەرۆکی ئەو دەمەی تیرەی سۆفی وەند
١٩٢٢-١٩٨٩



کوێخا محەمەد حەسەنی سۆفی وەند

# تیرەی کەماڵەیی

تیرەی کەماڵەیی یەکێکە لە تیرە سەرەکییەکانی ناو تیرەکانی جاف لە مێژەوە وەک تیرەیەکی سەربەخۆ و چوارچێوەدار ناوبراون و لە شەڕ و شادیدا پرسیان پێ کراوە و خاوەن بیر و رای خۆیان بوونە و وەک هەر تیرەیەکی کەی جاف لە گەرمیان و کوێستاندا خێڵ و سەرخێڵی ناسراوی خۆیان هەبووە و چ لە گەرمیاندا و چ لە کوێستاندا خاوەنی هەوارگە و لەوەڕگای تایبەت بە خۆیان بوونە. بە لای ئومەرا و پاشاکانی جافەوە بە چاوی رێز و نەوازشەوە نواڕیویانەتە دەمڕاسان و پیاوماقووڵانی ئەم تیرەیەدا.

## ناوی کەماڵەیی:

وەک ناوی سەرجەم تیرەکانی دیکە، بەڵگەیەکی نووسراومان بە دەستەوە نییە، کەوا سووربین لەسەر چۆن چۆنی ناوەکە بەڵام لەم رووەوە بۆچوونی جۆراوجۆر هەیە، بڕێک لای وایە ئەم تیرەیە لە نەوە و نەتیجەی پیاوێکەوە پێکهاتوون بە ناوی (کەمال)، بڕێکی تر لایان وایە کەماڵ

ناوی ناوچەیەک بووە و لە ژێر دەسەڵاتی ئەم تیرەیەدا بووە و بەو ناوەوە ناونراون. بڕێکی تر لایان وایە کەوا چەند سوارەیەکی ئازا و چاپوک لە ئێرانەوە هاتوون بە ناوی (کەماڵ، شاتر، هاروون، سمایل، مکایل) ئەوانە هەمووی دەگونجێت لەگەڵ ناو هاتنی (کەماڵەیی)دا .. بەڵام بەگوێرەی لۆژیکی لێکدانەوەی ناوی تیرە و عەشایەری جۆراوجۆر و (ئالیەتی ئەنساب) زۆرتر باوەڕ وایە کەوا سەرەتا ئەم تیرەیە بەرەبابی پیاوێک بوونە بە ناوی (کەماڵ)وە، ئەو کەماڵە یان بۆ خۆی ناوی (کەماڵ) بووە، یان نازناوی کەماڵ بووە. دیارە ئەو پیاوە کەسێکی لێهاتوو و ناودار بووە، بۆیە تیرەیەکی بە ناو ناونراوە. دوای چەند سەد ساڵ هەر بەو ناوەوە ماوەتەوە. بەندەش لەو باوەڕەدام کە ناوی ئەم تیرەیە لە ناوی پیاوێکەوە هاتووە بە ناوی (کەماڵ).. تیرەی کەماڵەیی وەک تیرەکانی کەی جاف ئاژەڵداربوونە و مەڕ و ماڵاتێکی زۆریان هەبووە و یەکێک بوونە لە تیرە دەوڵەمەندەکانی ناو جاف، ئەم تیرەیە وەک تیرەکانی دیکەی جاف ژیانێکی کۆچەرییان هەبووە و پەیوەستە لە گەرمیان و کوێستاندا بوونە و سا بە دوای لەوەڕدا بۆ ئاژەڵەکانیان یان تەسلیم بوون و زەبوون نەبوون بە دەست جەبر و زۆری تەوژمی جوگرافیا و گەرما و سەرمای زستان و هاوینەوە.

لە گیاگەناندا خێڵ و جموجۆڵی پێ کەوتووە و نەیانهێشتووە زەردی گژوگیا وەدەرکەوێ خێڵیان گوێزاوەتەوە بۆ مێرگ و سەوزەڵانییەکی تر، ئیدی بەو چەشنە هەوارگە بە هەوارگە ڕۆیشتوون تا گەیشتوونەتە دواهەوارگەی دەستنیشانکراویان لە کوێستاندا وە هەر کە کزەبای ساردی پایز دەستی پێ کردووە سەرەوخوار بەرەو گەرمیان بوونەتەوە. ڕێچکەیان گرتووە کە باوباپیرانیان پیادا هاتوچۆیان پێدا کردووە. بەندە لێرەدا ئەو ڕێچکەیەتان دەخەمە بەرچاو، کە لە گەرمیانەوە تیرەی کەماڵەیی پیادا ڕۆیشتوون تا کوێستان. با ئەوەش بڵێم تیرەی کەماڵەیی لە ڕۆژی سێ شەممەدا هەوارگەیان نەگوێزاوەتەوە و ڕۆژی سێ شەممەیان بە ڕۆژێکی شووم و نەگبەتبار لە قەڵەم داوە.

من لام وایە ئەو ڕۆژە بۆیە بە نەگبەت لە قەڵەم دراوە، هەروەک لە ناو ئێمەی بەگزادەدا لەو ڕۆژدا هیچ کارێکی تازە و نوێ نە دەکەین و نە لەبەر دەکەین، چونکە لە ڕۆژی سێ شەمەدا حەمەپاشای جاف کوژراوە. دیارە بڕێک لە تیرەکانی جاف ئەو کارەیان بۆ بووەتە کەلتورێک.

## ڕێچکەی هەوارگەکانی تیرەی کەماڵەیی

دوانزە ئیمام، شێروانە، قەڵەمە، نەی وەسەرە، حەمەنامیق، ملەی هەرەسەکە، داری خلە، تووتنەجار، عەزەبەجۆ، قەڵاتە بزان، چەمی دووسەر، شێخ تەویل، مەرەزەجار، بەرکەڵ، کەلی پەیکوڵی، بانی میران، دیوانە، باوەخوشین، بەردە مارەکە، ملەی گەورە قەڵا، کەماڵەیی ڕێی، زەلەڕەش، ئەحمەدئاوا، کارێزەی باوەسمایل، تانجەڕۆ، جۆگەی کاژاو، کریزە، ملەکەوە، مێرگەسوور،

نزاره، فەمتەریەی رەشید، ناڵەشکێنە، هەنگەژاڵە، تەڕەتولێ، سورەتوکانی، چەمی چاش و عەوالان، قەڵاتە ڕەشکە، کوسیەوار، چەمی میشولەوار، ملەی کەڵی، کۆتەڕەش...

وەک وتمان هەر تیرەیەکی جاف لە کوێستاندا هەوارگەی تایبەتی خۆی هەبووە، هەر تیرەیەک لە کوێستاندا هەوارگەی تایبەتی خۆی هەبووە، ئەمانەی خوارەوە هەوارگەی تیرەی کەماڵەیە لە دیوی کوردستانی رۆژهەڵاتدا:

١ ـ بیاندەرە .. کۆز و هەوارگەی خێڵی کەچەڵی بووە.
٢ ـ شەکەربەگ: کۆز و هەوارگەی عەلی ئەحمەدی ((مەمێ)) بووە.
٣ ـ حەوزێ: کۆز و هەوارگەی خێڵی شەمینی شاوەیس بووە.
٤ ـ مێشاوەکۆن: کۆز و هەوارگەی خێڵی مەحموود خان بووە.

بە تەئکید ئەم تیرەیە وەک هەر تیرەیەکی کەی جاف و غەیری جاف لە چەندین بەرەبابی جۆراوجۆر پێکهاتووە و لەبەر ئەوەی ئەو دەم ئالیەتی ژیان رەوەندی و کۆچەری بوونە سەرۆکی بەرەبابی ناو تیرەکە لەسەر خێڵەوە دەستی پێکردووە و لە ناو هەر تیرەیەکیشدا چەندین خێڵ و سەرخێڵ هەبوونە و سەرۆکی تیرەش وەک ریشسپی و براگەورەی هەمووان بووە.

## خێڵ و سەرخێڵەکانی ناو کەماڵەیی:

أ– خێڵی کەچەڵی: بە گەورەترین خێڵی ناو تیرەی کەماڵەیی دەژمێردرێت و لە ناو ئەو خێڵەدا چەندین سەرخێڵی کارامە و لێزان و دەمڕاستی تیادا بووە، وەک «حەمەسووری کەماڵەیی» باوکی شاعیری سۆفی سفەتی جوانەمەرگ «وەلی دێوانە».
ب– مستەفا عەلی پیروەیس
ت– مەحموودی حەمەی عیسا، کە بکاتە زاوای «کوێخا حەمەسوور»ی باوکی وەلی دێوانە و مێردی پەریخان خوشکی وەلی..
پ– مستەفا ئەلی
ج– حەسەنی محە
ح– خەلیفە قادر
خ– زۆراوی رەمەزان

وەک وتمان «کەچەڵی» گەورەترین بەرەبابی ناو کەماڵەیین و دەوڵەمەندتریشن لەدوای نیشتەجێبوونیان لە گەرمیان لەم دێهاتانەی خوارەوە نیشتەجێن..

- قەلوەزە
- گۆمەزەردی بچووک
- گۆمەزردی گەورە

لە شارەزووریش:
- قلرخی سەروو
- قلرخی خواروو
- خەر جافە

کەچەڵی لەم بنەماڵانە پێکهاتووە:

- حەمەسوور
- حەمەلی
- هەیدەری
- زایەری
- باپیر
- سەیفوڵڵا
- زۆراو
- شاوەیسی
- بەرەبابی خانی. ناودارەکانیان
- قازی مەحموودی خانی
- عەزیزی مەحموودی خانی
- حەمەی خانی
- حەمەی هەسەن..

ئەم پیاوە، یەکێک بووە لە پیاوە ئازا و دەمڕاستی نەک تەنیا تیرەی کەماڵەیی، بەڵکو سەرتاسەری هۆزی گەورەی جاف. بەندە «نووسەری ئەم باسە» ئەم پیاوەم لە نزیکەوە دیوە و بە باشی بە بیرم دێت و لە ناو بەگزادەکانیشدا پەیوەستە بە چاوی رێز و نەوازشەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە لە دیوەخانەکانیاندا پەیوەستە دادەنیشت و لە تەنگ و چەڵەمەی گەورەی ناو جافدا پرسیان پێ دەکرد و قسەی دەبیسترا.. ئێستاش کوڕەکەی (لالە فایەق) بە یەکێک لە براگەورەی تیرەی کەماڵەیی دەژمێردرێت. ئەم بەرەبابە لە دێی میلان و دوومیلان نیشتەجێن..

## بەرەبابی شەروانی. ناودارانیان

شەمێ بەناوبانگ و شاعیری گەورەی کورد «وەلی دێوانە» لەم بەرەبابەیە و باوکی یەکێک بووە لە دەمڕاستی نێو تیرەی کەماڵەیی (تکایە بگەڕێوە بۆ کتاوی «وەلی دێوانە» ٢٠١٠ لە نووسینی خوسرەو جاف) تا بە باشی ئەو تراژیدیایەت بۆ شی بکرێتەوە...

پیاوە ناودارەکانیان:

قادری شێروان، یوسفی شێروان، مەحموودی ئەمین، لە گەرمیان لە گوندی میلان و حاجی قازی و کانی چایلە دادەنیشن.

## بەرەبابی مەمەیی. ناودارانیان

- حەمە تالیبی مستەفا، سەرخێڵی ئەم بەرەبابەی بووە.
- حسەینی بارام
- مارفی ئەلی
- عارفی ئەحمەد عەولا

زۆرتر لە گۆپان و دێی نازیە نیشتەجێن.

## بەرەبابی بەخلان. ناودارانیان:

- فەرەجی پیروەیس
- ئەحمەدی حەمەی ئازیز
- مەولەی حەمەی ئازیز

- حاجی قادری وسو
- سەمینی فەرەج

**بەرەبابی بەکرانی یان شاوەیسی. ناودارانیان:**

- سەمینی شاوەیس
- قازی حەسەنی خێروەیس
- ئەحمەدی غەریبی خێروەیس

**بەرەبابی سوسکی یان گونە. ناودارانیان:**

- حەمە فەتاحی مەحمو
- حەمەی ئەمینی گۆنە
- حەمومینی رۆستەم

# خەسڵەتی تیرەی کەماڵەیی

ئەم تیرەیە لە ناو تیرەکانی جافدا بە تیرەیەکی پاک و خاوێن و دوور لە کاری بگرە و بەردە و دزی و دەخەڵیەوە دووربوونە و زۆرتر لە تیرەکانی کەی جاف پابەندی ئاین و رێبازە جۆراوجۆرەکانی ئیسلام و پیرەکانی ناو تەریقەتە جۆراوجۆرەکان بوونە بۆنموونە کەڵە سۆفییەک و پایەبەرزێکی وەک «وەلی دێوانە» کە لە دنیای لێبوردندا گەیشتە «فەنا فیللا» و لەسەر بیروڕا و لەخۆ

گوزەشـــتەکی ژیانی دۆڕاند و ناوی هەمیشـــەگی بە دەست هێنا. (بڕوانە: وەلی دێوانەی خوسرەو جاف). لەم تیرەیەدا پەیڕەوانی تەریقەتی قادری و نەقشـــبەندی زۆر هەبووە و پیاوی خواناســـی زۆریان تیادا هەڵکەوتووە.

- لالە مارف
- حەمەی شەریف
- لالە عەزە
- ئەحەی سوور
- خەلیفە قادر
- دەروێشی عەبدوڵڵا
- کەریمی مستەفا
- سۆفی مەجید

هەروەها رەنگە کەسانێکی کەش هەبن و من ئاگاداریان نیم، با ئەوەش بڵێم: تیرەیەک کەسایەتییەکی هۆشـــیار و ئـــاگاداری وەک «وەلـــی دێوانە»یان تیا هەڵکەوت، ئەوە دەگەیەنێـــت. قەینا ئەو تیرەیە وەک تەواوی جاف رەوەند و کۆچەر بوونە، بەڵام پابەندی خوێندەواری و مەلا و لێزانین بوونە و لە هەر خێڵێکدا مەلای تایبەتمەندی خۆیان هەبووە و مەلاش وەک ئەوان لە گەرمیان و کوێستاندا بـــووە. بۆ نموونە ســـەرخێڵێکی دەوڵەمەنـــد و بە توانای وەک «حەمەســـوور» زۆر پابەندی مەلا و خوێنـــدەواری بـــووە و حوجرەیەکی خوێندنی بۆ نۆ منداڵـــی تیرەکە پێکدێنێ و مەلای زیرەک و هۆشـــیاری بـــۆ راگیر دەکات و نـــۆ منداڵی تیرەی کەماڵەیی دەخاتـــە لای حوجرەی مەلا و ئەم نۆ منداڵە هەر یەکەیان دەبنە خوێندەواری باش و ناودار.

١- مەلا محەمەدی حەمەجان
٢- مەلا سەمین
٣- حەمەی شەریف
٤- وەلیدی حەمە سوور، وەلی دێوانەی بەناوبانگ
٥- فاتمی قازی
٦- پەریخان
٧- مەلا ئەحمەدی کەرەم وەیس
٨- شەمسەی قادری شیراون «شەم»ی لای وەلی دێوانە.
٩- مەلا ساڵحی حەمەی ئەولڕەحیم.

جگە لە وانە، چەندین مەلای بەناوبانگی تر لە ناو کەماڵەییدا هەڵکەوتووە، وەک: مەلا مەحموودی سەیالی، مەلا مەحموودی حەمەی ئەحمەد، مەلا ئەمینی سەلمان. هتد..

لەبەر رووداوێک دەبینرێت تیرەیەک کۆمەڵێک چوزانم عەشیرەتێک. کارێک، کردەوەیەک، رووداوێک دەکەنە دیاردە و لە رۆژی ئەو رووداوەدا پارێز دەکەن و ئیدی سا شەڕ بووبێت یان بوومەلەرزە، یان درم و نەهامەتی، یان لافاو، یان رووداوێکی دڵتەزێن ئەو رۆژە بە رۆژێکی بەدیووم و شووم لەقەڵەم دەدەن.

لەناو تیرەی کەماڵەییدا رۆژی نۆزدەی سەوزەی فارس، کە بکاتە دووی مانگی شوبات، بە رۆژێکی نا موبارەک لە قەڵەم دراوە. ئەم تیرەیەش وەک تیرەکانی دیکەی جاف، دژ بە زوڵم و زۆری دەسەڵاتی عەجەم و عارەب و تورک دەستیان داوەتە چەک و لە وڵات پارێزییان کردووە و بەربەرەکانیان ئەنجام داوە و لە شۆڕشی ئەیلوول و گوڵاندا بە گەرمی بەشدار بوونە و شەهیدێکی زۆریان پێشکەش بە کوردستان کردووە (خۆزگە رۆشنبیرێکی جاف ئامارێکی تێکڕای لە شەهیدانی جاف پێکدەهێنا و دەیکردە کیتاوێک).

لە ناو تیرەی کەماڵەییدا «حازر وەڵامی» یەکێک لە خەسڵەتەکانیان بووە. دەگێڕنەوە، زەوارێکی کەماڵەیی دەڕۆن بۆشاری کفری، لە خڕەکەی بندەستی سەرقەڵادا بە چای کردن خەریک دەبن سوارەی دەوڵەت لێیان نزیک دەبنەوە، مودیر ناحیە دەڵێت: ئێوە گەماڵەیین؟ یەکێکیان وەڵامی دەداتەوە: بەڵێ مودیر بەگ. ئێمە هەوین. بەڵام گەماڵ بە بێ دەڵ نەبووە، لە خزمەتتداین...

کەریم بەگی جاف لە کیتاوەکەیدا «تەئریخی جاف» لە بارەی تیرەی کەماڵەیی دەڵێت: ئەم تیرەیە تا بڵێی لەخواترس و بە ئایین و دڵ سافن، تیرەکانی کەی جاف رێزی تایبەتی لەم تیرەیە دەگرن.

# (وەلی دێوانە)

بێگومان «وەلی دێوانە»ی جوانەمەرگ لە بەرەبابی کەچەڵی تیرەی کەماڵەییە و کوڕی کوێخا حەمە سوور بووە و ئەمە حاشا هەڵنەگرە و ئەوانەی موخلیسی راستەقینەی ئەدەبیاتی کوردین ئەوەیان سەلماندووە ئەگەر کەسێکی کۆلکە خوێندەوار لە رووی نەزانینەوە لێرە و لەوێ لەم رووەوە شتێکی نووسیبێت، هیچ لە جەوهەری حەقیقەت کەم ناکاتەوە، بەندە لەم رووەوە پلە و پایەی رۆشنبیری هەروەها مەقامی بەرز و بڵندی «وەلی دێوانە»م لە کتێبێکی قەبارە ئەستووردا بڵاوکردۆتەوە، لاشم وایە ئەو شاعیرە گەورەیە حەقی خۆی پێنەدراوە و کاتی ئەوە هاتووە دووبارە لەدایک ببێتەوە و خوێندەواری کورد بە وردی پەی بە بلیمەتیی «وەلی دێوانە» ببات و لەوەش دڵنیام لە داهاتوودا چەندین بەڵگەنامەی ماجستێر و دوکتۆرای لەسەر وەردەگیرێت و ئەو حەلەیە دڵ سووتاوی هۆزی جاف و کوردەواری ئارام دەگرێت.

بە ئومێدی ئەو رۆژە.

خاڵێکی دیکە، کە دەمەوێت ئاماژەی بۆ بکەم: بڕێک لە نووسەرانی کورد لەبەر نزیکی ناوی «کەماڵەیی» و «مکەیاڵی» لەبەر ئەوەی هەردوو تیرەکەش «جاف»ن، بە هەڵە ناوی وەلی دێوانە

بە مکەیالی دەبەن، لە راستیدا «وەلی» کوڕی سەرخێڵێکی تیرەی کەماڵییە.

## کەسایەتییەکانی ناو تیرەی کەماڵەیی

١- حاجی عەبدوڵڵا مستەفا شەریف
٢- حاجی ئەحمەدی حاجی محەمەد مستەفا شەریف
٣- حاجی مەحموود عارف مستەفا
٤- عەزیز محەمەد فەتاح مەحموود
٥- مستەفا حاجی عەلی مەحموود ئەحمەد
٦- محەمەد حاجی مستەفا
٧- حەمە ساڵح حاجی سلێمان عەزیز قازی
٨- قادر حوسێن ئەمین عەزیز شەروان
٩- قادر حاجی مەحموود محەمەد ئەحمەد
١٠- حەمە ئەمین قادر زۆراب رەمەزان
١١- ئەحمەد محەمەد قازی فەرەج
١٢- ساڵح مەجید فەرەج
١٣- ئەبو بەکر حاجی حەمە ئەمین شاوەیس
١٤- عەلی محەمەد ساڵح وەلی
١٥- لەتیف عەزیز مەحموود ئەمین
١٦- حەمە حاجی حوسێن حەمە عیسا
١٧- محەمەد تالیم یوسف شەروان
١٨- حاجی کاکەوڵا قازی حەسەن
١٩- عەزیز حەمەئەمین رۆستەم

# لیستی ناوی بنەماڵەکانی عەشیرەتی کەماڵەیی

| ژ | ناوی سیانی | بنەماڵە |
|---|---|---|
| ١- | محەمەد قادر مەحموود | کەچەڵی |
| ٢- | محەمەد حوسێن محەمەد عیسا | کەچەڵی |
| ٣- | محەمەد حاجی مستەفا | کەچەڵی |
| ٤- | ساڵح عەلی مستەفا | کەچەڵی |
| ٥- | حەمەئەمین قادر زۆراب | کەچەڵی |
| ٦- | محەمەد فەتاح عەلی | کەچەڵی |
| ٧- | مەلا عومەر فارس حەسەن | کەچەڵی |
| ٨- | عەلی مەحموود مەعروف | کەچەڵی |
| ٩- | عەلی رەشید قادر | کەچەڵی |
| ١٠- | جەمال فەتاح ئەحمەد کامەران | کەچەڵی |
| ١١- | محەمەد مەحموود فەرەج | کەچەڵی |
| ١٢- | عەبدوڵڵا محەمەد جەلەبی | کەچەڵی |
| ١٣- | مەلا ئیبراهیم مەحموود سەید عەلی | کەچەڵی |
| ١٤- | محەمەد تالیب یوسف شەروان | شەروانی |
| ١٥- | لەتیف عەزیز مەحموود ئەمین | شەروانی |
| ١٦- | قادر حسێن ئەمین | شەروانی |
| ١٧- | ساڵح کامیل حەسەن ئەمین | شەروانی |
| ١٨- | محەمەد قادر فارس | شەروانی |
| ١٩- | ئەحمەد محەمەد قازی فەرەج | شەروانی |
| ٢٠- | عەزیز قازی فەرەج جەلەبی | شەروانی |
| ٢١- | قادر مەجید محەمەد قادر | شەروانی |
| ٢٢- | والی محەمەد مەحموود قادر | شەروانی |
| ٢٣- | فالیب عەلی یوسف شەروان | شەروانی |
| ٢٤- | بەکر حەمە ئەمین کەریم | شاوەیس |
| ٢٥- | عەلی عەبدوڵڵا کەریم | شاوەیس |

| | | |
|---|---|---|
| -٢٦ | حاجی تالیب قادر | شاوەیس |
| -٢٧ | مەلا عەلی محەمەد ساڵح | شاوەیس |
| -٢٨ | مەلا محەمەد ساڵح | شاوەیس |
| -٢٩ | جاسم ئەحمەد عەزیز | شاوەیس |
| -٣٠ | عاصی حەمە گوڵە | شاوەیس |
| -٣١ | جافر محەمەد عەزیز | شاوەیس |
| -٣٢ | کاکە عەبدوڵڵا قازی | خدروەیس |
| -٣٣ | ساڵح حاجی قادر | خدروەیس |
| -٣٤ | فایق محەمەد حەسەن | خانی |
| -٣٥ | عەزیز ئیبراهیم قازی مەحموود | خانی |
| -٣٦ | مەلا محەمەد حەمە عەلی قازی مەحموود | خانی |
| -٣٧ | ئەحمەد شاسوار قازی | خانی |
| -٣٨ | مەحموود عارف مستەفا | مەمەیی |
| -٣٩ | محەمەد ئەحمەد عەبدوڵڵا | مەمەیی |
| -٤٠ | قادر محەمەد عارف مستەفا | مەمەیی |
| -٤١ | دارا رەشید مارف | مەمەیی |
| -٤٢ | مستەفا عەلی مەحموود ئەحمەد | مەمەیی |
| -٤٣ | محەمەد عەبدولکەریم مەلا | مەمەیی |
| -٤٤ | عەزیز محەمەد فەتاح مەحموود | سۆسکی- گونە |
| -٤٥ | مەلا ئەحمەد حەسەن مەحموود محەمەد | سۆسکی- گونە |
| -٤٦ | مستەفا مەلا حسێن مەحموود | سۆسکی- گونە |
| -٤٧ | عومەر قادر باوەڵێ | سۆسکی- گونە |
| -٤٨ | ئیبراهیم ئەحمەد محەمەد | سۆسکی- گونە |
| -٤٩ | ساڵح مەجید فەرەج پیروەیس | پەخڵان |
| -٥٠ | مەلا ساڵح عەبدوڵڵا محەمەد خوسرەو | پەخڵان |
| -٥١ | عوسمان مەحموود رەحیم محەمەد | پەخڵان |
| -٥٢ | ئومێد عەزیز مەحموود رەحیم | پەخڵان |
| -٥٣ | عەبدوڵڵا مستەفا محەمەد شەریف | پەراو |
| -٥٤ | ئەحمەد محەمەد مستەفا محەمەد شەریف | پەراو |
| -٥٥ | مەحموود کاکە محەمەد محەمەد شەریف | پەراو |

# سەد رەحمەت لە وەلی دێوانە

مێژووی ئەم تیرەیە لە ناو تیرەکانی کەی هۆزی جافدا دیارە و هیچ تەمومژێکی بەسەرەوە نییە و جێگە و پێگەی خۆیان هەبووە و ئێستاش هەیە.
داستان و تراژیدیای «وەلی دێوانە» چەندین ئەوەندەی تر ناوی ئەم تیرەیەی بەناوبانگتر کرد و خستییە سەر زاری خوێندەواران و عاشقانی دوور و نزیک، ئاوا داستانێکی ویژدانی، عشقی، ئەدەبی، لە ناو تیرەی کەماڵەییدا روویداوە شانازییە نەک بۆ منێکی «جاف» بەڵکو بۆ تەواوی میللەتەکەم.
تراژیدیای «شەم و وەلی دێوانە» تەنیا پەیوەندییەکی نێوان کچ و کوڕێک سەرەنجام دەست بە یەخە بوون لەگەڵ سۆزی عەشقدا ناژمێردرێت و ئەگەر وەستاکارانە لەو پەیوەندییە روحییەی وردبینەوە رازە ئاسمانییەکانی وەدەردەکەوێت. بڕوانە کتاوی «وەلی دێوانە»ی خوسرەو جاف «چاپی دەزگای سەردەم، ٢٠١٠».
بەندە بۆ خۆم تا رادەیەک ئاگاداری تیرەکانی جاف هەم، بەڵام بەچاکم زانی بڕێک زانیاری لە دەمچەرمووە خوێندەوارانی تیرە جیاوازەکانی جاف وەرگرم، ئەلحەق و ئینساف زۆر کەس قۆڵ و بازووی مەردانەگی هەڵکرد و هەر یەکە بە جۆرێک ئەم کیتاوەی دەوڵەمەندتر کردووە.
لەو تیرەیەدا دەمەوێت ئاماژە بە خاڵێک بکەم نەک تەنیا لە ناو تیرەی کەمالەییدا وەدیم کردووە، بەڵکو لە دوو سێ تیرەی دیکەدا دووفلیقانەیی کەم و زۆر خۆی خستۆتە بەرچاو کەوا کێ سەرۆکی ئەم تیرەیەیە..
ئەو دووبەرەکییەی لە ناو ئێمەشدا «بەگزادەی جاف» روویدا دوو سێ کەس هەر یەکە خۆی بە رەواتر و شایستەتر دەزانی بۆ سەرۆکایەتی. تا بیرم لەوەی کردەوە ئەم هەڵەفە و گرێیەی بە شێوەیەکی سەردەمییانە و دوور لە دەمارگرژی و توندوتیژی ئاسان بکەم..
ئەوەبوو لە رۆژدا هەرچی خزمان هەبوو کۆم کردنەوە و دوای لێدوان وتم ئەوەی بەخۆیدا دەنازێت و مەرجەکان لە خۆیدا دەبینێت «ئەمە گۆ و ئەویشە مەیدان» با خۆی هەڵبژێرێت.
بە راستی رۆژێکی مێژوویی بوو دوور لەهەرا زۆر حەزارییانە یەکێکمان بە براگەورە هەڵبژارد.
من پێشنیاز دەکەم خزمانی کەمالەیی ئەلحەمدولیللا پیاوی بە ئەزموون و خوێندەواری زۆریان تیادایە، ئەگەر لەسەر یەک کەس «کۆک» نین با برایانە بیخەنە دەنگدان و هەڵبژاردنەوە، ئێمەش پیرۆزباییان لێ دەکەین و خزم و خوێشی شاعیری گەورە و جوانەمەرگی میللەتی کورد «وەلی دێوانە» شاد، دەبێت روحی یەکتری قبوڵکردن و لەیەک بوردن هەر لەو شاعیرە گەورەوە بکەنە هەوێنی ژیانی ئەمڕۆ و باوەشی سازش و خوێشاوەندی بۆ یەکتر بکەنەوە.

**خوسرەو جاف**
2010/10/10
**هەولێر**




حەمە سووری کەماڵەیی، باوکی وەلی



محەمەدی فەتاحی مەحموودی کەریم



ئەحمەدی حەمە ئەمین رۆستەم



عەلی حاجی فەرەج



مەحموودی عەزیز
محەمەدی قازی فەرەج



نوری حاجی محەمەد



مەحموود فەرەج محەمەد



خەندان سالح عەزیز

خەنـان خانـم ئەوڕۆکە کـوڕ و کـوڕەزا و نەوەی فراوانـی هەیـە و لەنـاو تیـرەی کەمالییـدا ئـەم خانمە ناسـراوە و لـە ڕووداوەکانـدا دەوری خـۆی هەبووە، شەڕێک لە نێوان کەماڵەیی و تیرەی بێسەریدا ڕوویدا و چەند کەسێک لە بێسەرییەکان دەکوژرێت و خەنان خانم کچە کەماڵەیی لە چۆیەی خوێندا دەدرێت بە شوو، بەڵام شـێوەی ڕەفتاری ناپەسندی لە جویەی خوێنا دراو ئەم ئافرەتە دەسـتەمۆ ناکات و وەک ئافرەتێکی سەربەرزی جاف و کوردەواری کەسـایەتی خۆی بە دوور و نزیک دەسەلمێنێت.



ئەحمەد فەرەج محەمەد



حاجی سلێمانی عەزیزی قازی



حاجی محەمەدی حەسەنی مەحموود خانی
ئەم پیاوەم بەبیردێت و لەو دەمانەیدا بە یەکێک
لە پیاوە ئازاکانی سەردەمی خۆی دەناسراو و
بەگزادەکانی جاف زۆر ڕێزیان لێدەگرت و قسەیان
لێدەبیست و لە ناو سەرتاسەری تیرەی کەماڵەییدا
حیسابی بۆ دەکرا.



عارف ئەحمەد عەبدوڵڵا



قادر ئەحمەد محەمەد



حەمە ئەمینی حەمەساڵح



عەلی فەرەج چەلەبی
١٩١٤



حاجی عوسمان عەزیزی قادر



قادر ئەحمەد قادر شێروان



ساڵح ئەحمەد عەبدوڵڵا



حەمە عەلی قازی مەحموود خانی

# تیرەی کەماڵەیی

سەرچاوەی ناوەکەی:

تیرەی کەماڵەیی یەکێکە لە تیرەکانی عەشیرەتی گەورەی جاف کە بە درێژایی مێژوو بوونێکی بەرچاوی هەبووە لە زۆرێک بۆنە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی دەوروبەریدا. هەندێک لە سەرچاوە مێژووییەکان ناوی کەماڵەیی بۆ کۆمەڵێک سوار دەگێڕنەوە، کە لە ئێرانەوە هاتوون بۆ کوردستانی باشوور، کە بە سوارەی جەفایی بەناوبانگ بوون و ناوەکانیان کەمال و شاتر و هاروون و سمایل و مکایل بووە و پاشان نەوەکانیان زۆربووە و بە کەماڵەیی و شاتری و مکایەلی و سمایل عوزێری ناسراون. هەنێکی تر ناوەکە دەگێڕنەوە بۆ وشەی کەماڵا کە دێیەکە لە هەورامانە و پێیان وایە کەماڵەیی لە کەماڵاوە هاتووە لە بنەڕەتدا بە گشتی پشتیان بە ئاژەڵداری و پاشان کشتوکاڵ بەستووە بۆ بژێوی ژیانیان.

## کۆچی گەرمیان و کوێستان

یەکێک لە سیفەتەکانیان ئەم تیرەیە دیاردەی کۆچ و کۆچبەری بووە و ساڵانە خێڵەکانی ئەم تیرەیە گەرمیان و کوێستانیان کردووە بۆ دابینکردنی لەوەڕگای پێویست بۆ مەڕ و ماڵات و وڵاخەکانیان. ئەم سەفەرە دوور و درێژەش لە ناوچە گەرمەسێرەکانی دوانزە ئیمام و دەشتی شێروانەوە دەستی پێکردووە تاوەکو کوێستانەکانی بانەی خایاندووە. بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

لە بەهاردا و لە کاتی گیاگەناندا، سەرخێڵ فەرمانی دەکرد کە ئینشائەڵڵا سبەی لەگەڵ بانگی

بەیانیدا بارە، (جگە لە ڕۆژی سێ شەممە کە بە لای کەماڵەییەکانەوە ڕۆژێکی شووم بووە). بەرەبەیان هەر خێڵە و باری خۆیان باردەکرد و ئەم خێڵەش بارەبەری کەم بوایە وڵاخی لە خێڵەکانی تر وەردەگرت.

لە کاتی کۆچەکەدا چەندین جار حەیوانی کۆرپەزێ (کار بێت یا بەرخ) لە شەڵتاندا هەڵیان گرتووە لەبەرگەل هەروەها ڕان سارااما کراوە. سەرەتا لە دوانزەئیمامەوە خێڵ کەوتۆتە ڕێ بەرەو دەشتی شێروانەوە خێڵ چووەتە قەڵەم لەوێوە کۆچیان کردووە بۆ نەیوەسەرە ئەنجا خێڵ دەبەزێ، لەوێوە بۆ حەمەنامیق لەوێوە بۆ ملەی هەرەسەکە (داری خلە) لەوێوە بۆ تووتنەجاڕ ئەنجا بۆ عەزەبەجۆ لەوێوە بۆ قەڵاتەپزان لەوێوە بۆ چەمی دووسەر دوای ئەوە بۆ شێخ تەویل (کانی ئایش) لەوێوە بۆ مەرەجاڕ لەوێوە بۆ بەرکەل (دێی دۆمەکان) ئەمجا بۆ نوختەی پەیکوڵی لەوێوە بۆ بانی میران لەوێوە بۆ کەمپی دێوانە لەوێوە بۆ باوەخۆشێن لەوێوە بۆ بەردەمارەکە دوای ئەوە بۆ ملەی گەورەقەڵا لەوێوە بۆ کەماڵەیی ڕێی ئەنجا بەرەو زەڵەڕەش (کانی توو) لەوێوە بۆ ئەحمەدئاوا لەوێوە بۆ کارێزەکەی باوەسمایل نزیک دسکەرە و خەرجانە لەوێوە بۆ تانجەڕۆ لەوێوە بۆ پشت جۆگەی کاژاو ئەمجارە بەرەو گرێزە و دوای ئەوەش بەرەو کانی کونەکە لەوێوە بۆ ملەی گوڵان لەوێوە سێبیاران لەوێوە بۆ کانی مانگا پاشان بەرەو ملەکەوە لەوێوە بۆ مێرگەسوور ئاوایی مینەبەگی گۆڵەوگلێنە (قزڵجە) لەوێوە بۆ نزارە لەوێوە بۆ قەمتەرەی ڕەشید لەوێوە بۆ ناڵەشکێنە پاشان بەرەو هەنگەژاڵ و لەوێوە تەڕەتوڵی لەوێوە بۆ سوورەتووکانی (دارۆغان) لەوێوە بۆ چەمی چاش و عەواڵان لەوێوە بۆ قڵاتە ڕەشکە لەوێوە بۆ کۆسی وار و ئەمجارە بۆ چەمی مێشوولەوار و لەوێ بۆ ملەی کەلی و لەوێوە بۆ کۆتەڕەش لە پاش هەموو ئەم شوێنانە ئەمجا بەرەو دیوی ئێران.

شایانی باسکردنە کە ماوەی دابەزینی خێڵ لەم کۆچانەدا سێ کاتژمێر جارێک بووە ئەمەش بەگوێرەی توانای ئەندامانی خێڵەکە و ئاژەڵ و وڵاخەکانیان.

## کۆز یان هەوارگەی تیرەکە لە ئێران

کۆزەکانی کەماڵەیی لە دیوی ئێران:

١ ـ بیاندەرە، کۆزی خێڵی کەچەڵی

٢ ـ شەکەربەگ، کۆزی عەلی ئەحمەد (مەمەیی)

٣ ـ حەوزێ، کۆزی سەمینی شاوەیس

٤ ـ میشاوەکۆن، کۆزی مەحموودخانێ بووە.

ئەم تیرەیە پێکهاتووە لە چەندین خێڵ و هۆزی گەورە و بچووک کە هەریەکەیان سەرۆکێکی تایبەتییان هەبووە جگە لە سەرۆکی گشتی تیرەکە کە توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو تیرەکاندا هەبووە و پرس و ڕاوێژی بە سەرۆک خێڵەکانی تیرەکە کردووە. لەو خێڵانەش:

کەچەڵی: کە گەورەترینی خێڵەکانی کەماڵەییە و چەندین کەڵەپیاوی وەک حەمەسوور کەماڵەیی (باوکی وەلی دێوانەی شاعیر) و مستەفای عەلی پیروەیس و مەحمووی حەمەی عیسا (کە چنەکەی واتە پەریخانی حەمەسوور، خوشکی وەلی دێوانە بووە)، مستەفای ئەلی و حەمەی کوڕی، حەسەنی محە، خەلیفە قادر، زۆراوی رەمەزان.

شوێنی نیشتەجێبوونیان لە گەرمیان قەڵوەزە و هەردوو گۆمەزەردی گەورە و بچووک، لە شارەزووریش خەرجانە و هەردوو گوندی قلەرخی سەروو و خواروو. ئەم هۆزە لە چەندین بنەماڵەی وەکو: بنەماڵەی حەمەسوور و خەملی و هەیدەری و زایەری و باپیر و زۆراو و سەیفوڵڵا و شاوەیس پێکهاتووە.

خانێ: لە پیاوە ناودارەکانی: قادری مەحمووخانێ، عەزیزی حەمەی خانێ، حەمەیی هەسەن. شوێنی نیشتەجێیان میلان و دوو میلان بووە بە زۆری.

شەروانی: کە سەرخێڵەکەیان قادری شێروان بووە، لە پیاوە ناودارەکانی: مەحمووی عەمین، یوسفی شێروان. بە زۆری لە گوندەکانی میلان و دوومیلان و کانی چایلە و حاجی قادی نیشتەجێن.

مەمەیی: لە پیاوە ناودارەکانی: حەمەتالیبی مستەفا (سەرخێڵی مەمەیی)، حسەینی بارام، مارفی ئەلی، عارفی ئەحمەد عەبدوڵڵا. بە زۆری لە هەردوو گوندی نازێی گەورە و بچووک و گۆبان نیشتەجێن.

پەخلان: لە پیاوە ناودارەکانی: فەرەجی پیروەیس، ئەحمەدی حەمەی ئازیز، مەولەی حەمەی ئازیز، حاجی قادرەسوور و سەمینی فەرەج.

بەکرانی یا شاوەیسی: سەمینی شاوەیس، قازی حەسەنی خیروەیس، ئەحمەدی حەمەغەریبی خیروەیس.

سۆسکی یا گونە: حەمەی فەتاحی مەحموو، حەمەی ئەحمەیی گونە. حەمۆمینی رۆسەم.

## پابەندییان بە ئایینەوە

یەکێکی تر لەو خەسڵەتانەی ئەم تیرەیە لە تیرەکانی تری جاف جیا دەکاتەوە ئەو پابەندییە توندەیەتی بە ئایین و تەسەوفەوە کە تا دوارادەی دڵسۆزی دڵسۆزییان نواندووە بۆ تەریقەت و مورشیدەکەیان. لەو نێوەندەشدا چەندین کەڵەپیاوی تیا هەڵکەوتووە کە بە کەرامەت و پلە ئایینەکانیان خەڵکی دەوروبەریان سەرسام کردووە. لەوانەش لالەمارف، حەمەی شەریف، لالە عەزە، ئەحەسوور، خەلیفە قادر و دەروێش عەبدوڵڵا و کەریمی مستەفا و سۆفی مەجید و هتد. دەروێشەکانی کەماڵەیی بە زۆری سەر بە شێخانی کەسنەزانی و قەرەچێوان کە دوو لقی تەریقەتی قادرین. سۆفییەکانیشیان بە زۆری سەر بە خانەقای شێخانی بیارەن لە تەریقەی نەقشبەندی.

بە هۆی کۆچی ساڵانەی گەرمیان و کوێستانەوە و جێگیرنەبوونیان لە شوێنێکی هەمیشەییدا. ئەوانیش وەک سەرجەم عەشرەتەکانی دەوروبەریان بێبەش دەبن لە زۆربەی ئەو گۆڕانکاری و پێشکەوتنانەی کە هەندێ ناوچەی تر لە رووی بازرگانی و کۆمەڵایەتی بە خۆیانەوە بینی. هەر ئەمەش وای کردووە کە تا رادەیەک بێبەش بن لە مەدرەسەی ئایینی و حوجرەکانی خوێندن کە تاکە سەرچاوەی خوێندن و زانست بووە لەو کاتەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێبەش نەبووە لە مەلا و خوێندەوار و شاعیری زیرەک و بەتوانا. بۆ نموونە لە سەردەمی حەمەسووردا کە پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند و خانەدان بووە نۆ کەس لە ئەندامانی بنەماڵەکەی و دەوروبەری بە کچ و کوڕەوە دەخاتە بەر خوێندنی حوجرە و مامۆستای ئایینی بەتوانایان بۆ دابین دەکا و تێچوونی حوجرەکەشی خستۆتە ئەستۆی خۆی، ئەو ٩ کەسەش لە دواییدا مەلا و شاعیر و خواناسی باشیان لێ دەردەچێ کە بریتی بوون لە: مەلا محەمەدی حەمەجان، مەلا سەمین، حەمەی شەریف، وەلیدی کوڕی حەمەسوور (وەلی دیوانەی شاعیر)، فاتمی قازی، پەریخان، مەلا ئەحمەدی کەرەم وەیس، شەمسەی قالەی شێروان (شەم) ئەمە جگە لە مەلا ساڵحی حەمەی ئەولڕەحیم و مەلا مەحمووی سەیالی و مەلا مەحمووی حەمەی ئەحمەد فەتاح و مەلا ئەمینی سلێمان.

## خوێندنی هاوچەرخ

لەم ساڵانەی دواییشدا کە زانست و قوتابخانەکانی سەردەم گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، منداڵانی کەماڵەییش توانیان بەشدارییەکی باشیان هەبێ تیایدا و چەندین دکتۆر و مامۆستا و پسپۆڕی باشیان تیا هەڵکەوتووە، تا ئێستا نزیکەی ٧٠٠ خوێندکار زانکۆیان تەواو کردووە لە بەشەکانی (جوگرافیا ١٩٤ خوێنکار، مێژوو ٨٥ خوێنکار، زمانی ئینگلیزی ١٣٢ خوێندکار، کۆلێژی یاسا ٦٤ خوێنکار، ٤٨ خوێنکار بەشی ئەندازیاری، ٨٨ خوێنکار کۆلێژی پزیشکی، ٦٧ خوێنکار بەشی کیمیا و چەند بەشێکی تری زانکۆکانی کوردستان و عێراق. بۆ نموونەش مەحسووم مەحموود ئەحمەد فەتاح کە خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سلێمانییە، ماوەی سێ ساڵە پلەی یەکەمی سەر هەموو کوردستانی هەیە لە بەشەکەی خۆیدا.

هەروەها نزیکەی ٥٠٠ خوێندکار پەیمانگایان تەواو کردووە (بەشی بیرکاری ٥٤ خوێندکار، ئینگلیزی ١١٣ خوێندکار، کۆمەڵایەتی ١٦١ خوێندکار، بەشی پەرستیاری ٧٦، کارەبا ١٧ خوێندکار و دەرمانسازی ٨٣ خوێندکار، چەند خوێندکارێکی تریش کە بەشە جیاجیاکانی تری پەیمانگاکانی کوردستان و ناوەڕاستی عێراقیان بڕیوە.

ئەمەش جگە لە زیاتر لە هەزار خوێندکارە کە بە هۆی هۆکارە ئابووری و سیاسییەکانەوە تەنها پلەی ناوەندییان بڕیوە و نەیانتوانیوە زیاتر درێژە بە خوێندن بدەن.

## ئەو نەهامەتی و تەنگەژانەی تووشی تیرەکە هاتووە

کەماڵەیــی لــە رابردوودا تووشــی کۆمەڵێک نەهامەتی و کارەســات هاتووە کە بۆ چەندین ســاڵ شوێنەواری لەسەر لایەنی کۆمەڵایەتی و دەروونی خەڵکەکە جێهێشتووە. لەوانەش کارەساتەکەی حەمەسوور کەماڵەیی کە ژمارەیەک مەڕ و ماڵاتی بە هۆی بەفر بارینێکی زۆرەوە رەقی بردۆتەوە، لە چارەگی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا رووی داوە و تاوەکو چارەگی کۆتایی سەدەی بیستەمیش خێڵەکانی کەماڵەیی لەو رۆژەدا واتە ١٩ی سەوزەفارس کە دەکاتە ٢ی شوباتی هەموو ساڵێ، مەڕ و ماڵات و ئاژەڵەکانیان لە ماڵ دەرنەدەکرد و ســەفەریان نەکردووە ئەگەر ئەم کارەشیان کردبێ ئەوە بە وریاییەوە بووە!

## رۆڵیان لە شۆڕشەکانی کورددا

کەماڵەییەکان چەندین شەهیدیان لە پێناوی شۆڕش و بزووتنەوە کوردییەکان داوە لەوانەش: دوای ئەوەی یەکێک لە خێڵەکانی تر کاروانێکی رووسەکان تاڵان دەکەن و چەک و کەرەسەکانیان دەبەن، بۆ رۆژی دواتر رووســەکان ســێ لە پیاوەکانی کەماڵەیی رەشبگیر دەکەن لە گردەیەغنی نزیک گوندی سەید خەلیل بە ناوی ساڵحی عەزیزی، ئەمینی عەزیزی عیسا، حەمەلی ئەلی محە.

هەروەها لە شــەڕی نێوان شــێخ مەحموود و رووسەکانی ساڵی ١٩١٧ی ناوچەی بانەدا دوو شــەهیدیان دەبێ بە ناوی (ئەولکەریمی مەحمووی هۆرتان و فەرەجی مەحموود خانێ). هەروەها شەهیدبوونی ئافرەتێکی تیرەکە بە ناوی حسنی حاجی قادر و برایەکی لە بۆردومانی فڕۆکەکانی ئینگلیز بۆ سەر خاکی کوردستان گوندی خەرجانە. هەروەها لە شۆڕشی ئەیلولدا پۆلێک شەهیدی وەک ئەحمــەدی خواڕەحیم و قالەی فارس و عەلــی ئەمین لە گوندی بێستانســووری کەماڵەیی لــە رێکەوتــی ٢١ ـ ٨ ـ ١٩٧٤دا گوللەبــاران کــران. ئەمە جگە لە دەیان شــەهیدی تر لە شۆڕشــی نوێی گەلەکەماندا گیانی خۆیان بەخشــی. لە پرۆســەی بەدناوی ئەنفالیشــدا نزیکەی ١٠١ کەســی کەماڵەییەکان بووەتە قوربانی.

هەروەها هەمیشــە بە سەروەت و سامانەکەیان پشتگیری ئەم شۆڕشانەیان کردووە، هەر لە ســەردەمی شۆڕشــەکەی شێخ مەحموودا پیاوێک بە ناوی مســتەفای عەلی پیروەیس، بۆ ماوەی ســێ رۆژ نانی ٧٠٠ کەسی لەشــکرەکەی شێخ مەحموودی داوە و شێخیش لە کۆتاییدا پێی دەڵێ

(مچە بە لای دۆستایەتییەوە ماڵمان تالآن کردی!) ئەویش دەڵێ «قوربان ماڵێک بۆ تۆ نەبێ بۆ کێ بێ! شێخیش لە پاداشتی ئەم میواندارییە کەم وێنەیەدا ٥٠ پەنجا کیسە فیشەکی بۆ جێ دەهێڵێ.

هەروەها یەکێک لە جوامێرییەکانی تری ئەم تیرەیە و شۆڕشـەکەی شـێخی نەمر ئەوەیە کە لە شـەڕی بانەدا دژی رووسـەکان. بنکەیەکی رووسـەکانیان لێ عاسـی دەبێ و شێخیش وەکو کاردانەوەیەک وتوویەتی ئەمشەو خۆم بە تەنیا دەڕۆمە سەر بنکەکە، لەو کاتەدا پیاوێکی کەماڵەیی بە ناوی (سـاڵحی عەزیزی عیسـا) گوێی لێ دەبێ و شـەو پێش شـێخ دەڕواتە شوێنەکە، کاتێک شـێخ دەڕواتە نزیکی بنکەکە و سـاڵح دەبینێ، دەڵێ سـالە لێرە چی دەکەی؟ ئەویش دەڵێ یا شێخ دیارە هەر خۆت بە شـت دەزانی؟ لە بەرامبەر ئەو جوامێرییەدا شـێخ کراسـەکەی خۆی کە هی کاکەحمەدی شێخ بووە، پێی دەبەخشێ و هەموو کەماڵەییەکان لە باج و سەرانە دەبەخشێ.

هەروەها لە پەنجاکانی سەدەی بیستەما کە کاروانێکی کەماڵەییەکان دەڕۆن بۆ کفری بۆ هێنانی خواردەمەنی و شـتومەکی پێویست، لە خڕەکەی سـەرقەڵا لادەدەن بۆ پشوودان و مدیر ناحیەی سـەرقەڵا دەیانبینـێ و دەڵێ ئای ئەمـە کاروانی گەماڵەییەکانە!!! یەکێک لـە پیاوە کەماڵەییەکانیش لـە وەڵامیـدا دەڵـێ قوربان گەماڵ بە بێ دەڵ نـاژی. لە ئەنجامدا مدیر ناحیە سـەر نەوی دەکا و دەگەڕێتەوە.

یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی ئەم تیرەیە، مازوونان بووە. مازوو کە توێکڵی درکاوی هەیە بۆ سـزای هەموو ئەو کەسـانە هاتووە کە دزی یا هەر دەسـدرێژییەکی تریان بکردایەتە سـەر سەروەت و سامانی عەشرەتەکە.

## شوێنی نیشتەجێبوونی تیرەکە:

شوێنی نیشتەجێبوونی تیرەکە بە شێوەیەکی سەرەکی لە گەرمیاندا، باکووری کەلار و دەشتی شـێروانە بووە، کە پێکهاتوون لە ١٥ دێ و لە شـارەزووریش ٤ دێ. بەڵام لەم سـاڵانەی دواییدا بە هۆی کۆچی بە لێشـاوی دێ بۆ شـار وە شاڵاوی بەدناوی ئەنفالەوە هەندێک لە کەماڵەییەکان بە شـار و شـارۆچکەکانی دەوروبەریاندا بڵاوەیان کردووە، وەک سـلێمانی و هەولێر و کەلار و عەربـەت و دەربەندیخان و سـەید سـایەق و کۆیـە و باوەنوور و رانیە، هەروەهـا لە خانەقی و جەلەولاشدا چەند ماڵێکی کەماڵەیی هەن. بە دیوی ئێرانیشدا لە هەندێ دێی نزیکی سەقز کەماڵەیی هەیە کە ژمارەیان حەوت دێیە.

# وەلی دێوانەی کەماڵەیی



بەپێی زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان وەلی دێوانەی شاعیر سەر بە تیرەی کەماڵەی جافە و لە بنەماڵەی حەمەسوور کەماڵەییە و لە تیرەی کەچەڵی، بەڵام بە داخەوە لەم ساڵانەی دواییدا چەند کەسێک بە دەستی ئەنقەست و بێ هەستکردن بە ئەمانەتی مێژوو ئەم شاعیرەیان داوەتە پاڵ مکایەڵی!!! لە کاتێکدا کە زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان ئەم راستییەیان سەلماندووە. بۆ نموونە لە کتێبی مێژوویی (تاریخ مشاهیر کرد) چاپی دووەم، بەرگی دووەم، لاپەڕەی پێنج، ساڵی ١٣٨٢ی هەتاوی، مێژوونووسی ئێرانی (بابا مردووخی رۆحانی) ناسراو بە (شیوا) هاتووە و دەڵێ «ولی یا ولید مشهور بە دیوانە، فرزند کدخدا محمد (حمەسوور) از عشیرە کمالەی جاف». هەروەها (رازی) کە هەستاوە بە کۆکردنەوە و نووسینەوەی دیوانە شیعرییەکەی وەلی دێوانە و کتێبەکە لە بڵاوکراوەکانی (انتیشاراتی کردستان، چاپی یەکەم ١٣٨٧، لە لاپەڕەی چواردەدا پێناسەی وەلی دێوانە بەم شێوەیە دەکا «هونەر ناوی وەلیدە کوڕی کوێخا محەمەدە، کوێخا محەمەد کوێخای هۆزێ بووە لە تیرەی کەماڵەیی. باوکی وەلید بە کوێخا حەمەسوور بەناوبانگ بووە».

# پێگەی کەماڵەیی لە نێو تیرەکانی جافدا

کەماڵەییەکان بەو پێیەی کە تیرەیەکی بێوەیی و لەخواترس بوون، هەمیشە جێگەی رێز و ستایش بوون لە نێو عەشرەتەکانی تردا وەک لە کتێبەکەی کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف (تەئریخی جاف) هاتووە کە خەڵکی کەماڵەیی خەڵکانێکی دڵساف و بێگەردن و تیرەکانی تر ئەدەبیان لێکردوون. بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی کە هەرگیز تووشی شەڕ نەهاتبن لەگەڵ عەشرەتەکانی دەوروبەریاندا، بەڵکو ئەم حاڵەتە چەندین جار رووی داوە. بە هەوڵ و کۆششی ریش سپی و پیاوماقوڵانی کەماڵەیی و تیرەکانی دەوروبەریاندا باش بووە بەتایبەتی شاتری و باشکی و تەرخانی و وێسووجانی. خزمایەتیشی لەگەڵ زۆربەی هەرەزۆری تیرە و عەشرەتەکانی جاف و دەرەوەی جافدا هەبووە کە دیارە زۆربەی بە هۆی ژن و ژنخوازییەوە بووە. بۆ نموونە کاتێک کە بە هۆی هێرشی چەند کەماڵەییەکەوە بۆ سەر کاروانێکی ئینگلیزەکان لە ناوچەی کربچنەی سەنگاو، کەماڵەییەکان لە ئینگلیز قاچاغ دەبن ناچار خۆیان لە نێو تیرەکانی تری جافا خۆیان حەشار دەدەن. پاش چەند ساڵێک ئینگلیزەکان پیاوێکی کەماڵەییان دەستگیر کرد بە ناوی (حەمەی عیسای یوسفی حاجی) و زۆرێک لە پیاوەکانی کەماڵەیی وەکو خۆنیشاندانێک لەگەڵیدا رۆیشتن. دەگێڕنەوە کە تەرخانییەکان بۆ ئەوەی کە پیاوەکانی کەماڵەیی رزگار بدەن، کەوا و سەڵتە و مێزەریان بۆ زۆرێک لە پیاوە کەماڵەییەکانی ناو تەرخانی بەستۆتەوە و چەکیان داوەتە دەستیان و ناردوونیان.

## سەرچاوەی زانیارییەکان:

* سەرپەرشتیاری گشتی زانیارییەکان: بەڕێز فایەقی حاجی محەمەد ناسراو بە لالە فایەق
* تایپ و داڕشتنەوە: ساڵح حەمەئەمین قادر
* فۆتۆ: کۆماجی لالە فایقە
* هاوکاران لە پێدانی زانیارییەکان:

کاک ساڵحی خەلیفە قادر، مەلا عومەری فارس، حاجی محەمەدی ئەحمەدی عەوڵا، فاتمەی حاجی ساڵح، یەمەنی خێزانی حاجی عارف.

## ناودارانی کەماڵەیی:

سەمینی شاوەیس
فەتاحی مەحمود
مەحمودی ئەمین
مەحمودی حەمەی عیسا
نادری شێروان
حەمەسوور

# نەورۆڵی

ناوی نەورۆڵی

لەم رووەوە بۆچوون زۆرە، بۆچوونەکانیش وەک زۆر لە بابەتی کوردەواری و جۆری ژیانی ئێمەی کورد وەک دیکۆمێنت شتێکی وامان بە دەستەوە نییە، تەنها گێڕانەوە و وتنی سنگ بە سنگ نەبێت، ئەو شێوەشە زۆر شتێکی ئاساییە لە ناو توێژ و سەرجەم ئالیەتی ژیانی هۆزەکان و عەقڵی خێڵایەتیـدا یان هەر کۆمەڵگایەکی فکری کشـتوکاڵی، بە تەئکید هـۆزی گەورەی جاف بە تەواوی تیرەکانیەوە هۆزێکی رەوەند و کۆچەر بوونە و هەمووی ناکاتە سـەد سـاڵ لەمەوپێش زۆربەی زۆری تیرەکانی جاف لە گەرمیان و کوێستاندا بوونە و چۆنیەتی ژیانی هەر هۆز و عەشایەرێکی رەوەندیش ئەبعادەکانی روون و ئاشکرایە.

ئەگـەر بە گوێـرەی وردەکاری زمانەوانییەوە لە ناوی «نەورۆڵی» وردبینەوە لە دوو وشـە پێکهاتووە «نەو - رۆوڵ». بێگومان «نەو» یانی تازە.. «رۆول» یانی «رۆڵە» کوڕ.

ئێمە لە دواییدا دێینە سـەر باسـی ئەو دوو وشـە بەیەکەوە بەسـتراوە. برێکی تر لایان وایە، ناوی «نەورۆڵی» لە «نۆ رۆڵە»ەوە دەستی پێ کردووە..

مەردۆخی مێژوونووس. وای بۆ نارِوات و دەڵێت عەشـیرەتی «نەورۆڵی» لە شـارەزووردا

نیشــتەجێن و لە هۆزی گەورەی جافن، وشــەی «نۆر» یانی تیشــک، ((وەلی))یان گەورە پیاوێک لە ســەرەتاوە ناوی ((وەلی)) بووە، یان پیاوچاکێکی وەلی کردار رەوشــت خاوێن بووە و بە لای خەڵکــەوە رێــزدار و بە کەرامەت بــووە، پێی وتراوە ((نوروەلی)) یان تیشــک و کەرامەتی وەلییە پیاوچاکەکە...

بەندە لەو بڕوایەدام، ناوی ((نەورۆڵی)) لە نۆ رۆڵەوە هاتووە...

وشــەی ((رۆڵە)) لە ناو کوردەواریدا تەنها لە نێو کوڕ و باوکدا بەکارنەهێنراوە، هەتاوەکو لە ئەمڕۆشــدا، کەوا سەدەی بیست و یەکەمە، جاروبار دەبیســتین دەوترێت ((بەخوا رۆڵەیە)). رۆڵە . یانی ئازا، یانی شاســوار، یانی قارەمان.. لە هەل و مەرجی ژیانی ســەدەکانی ناوەڕاستدا ئازایی یەکێک بووە لە رەوشت و خەسڵەتە هەرە گەورەکانی ئەو سەردەمە... ((نۆ کەس)) نۆشەڕکەر، نۆ شاسوار، نۆ ئازا، نۆ پیاو...

ئەو نۆ کەســە ســا خزم و خوێش بوونە.. یان هاوڕێ، یان هاوکار و کردەوە پێکەوە ژیانیان بردووەتە سەر و سەرئەنجام ئەم تیرەیە کە ئەوڕۆ پێیان دەوترێت ((نەورۆڵی)) نەوە و نەتیجەی ئــەو نــۆ رۆڵەیــەن، لەبەر ئەوەی ئەم تیرەیە تا بە ئەمڕۆش لە نــاو تیرەکانی تری جافدا بە ئازا و پەلاماردەر دەناســرێن و لە زۆر رووداودا جێگەی دەســتیان دیار بووە، من زۆرتر لەوەی دڵنیام ئەم تیرەیە لە نەوە و نەتیجەی نۆ کەڵەپیاوی ئازا بوون و هەر یەکە لەو نۆ پیاوە ئازا و دەمڕاستی سەردەمی خۆیان بوونە، بۆیە نەوە و نەتیجەشیان هەر بەو ناوەوە شۆرەتیان دەرکردووە و ئەو ناوەیان بۆ ماوەتەوە.

بەپێــی زەمــان ژیان لە گۆڕانکاریدایــە، وەک ئەندازە وەک قەبــارە، وەک بۆچوون وەک نیاز وەک هەڵســوکەوت. ئیدی ئینســان ئەگەر لەو قاڵبەیدا نەبێت زیندەگی رادەوەســتێت، شکۆمەندی پــەروەردگار لەوەدایــە گیانلەبەرێکی خوڵقانــدووە بە ناوی ((مرۆڤ)) بــە ئەندازەیەک بە توانا و بەهێزە، من لەو باوەڕەیدام ئەگەر دەیناســوورە زل و زەلامەکانی ئەوســاش بمایەن ئێســتا وەکو ئاژەڵ مرۆڤ دەستەمۆی کردبوون.. عەقڵ و فکری مرۆڤ بەشێکە لە وجوودی خودا لە عەزەمەتی پەروەردگار، لەوەش دڵنیام قەدەغەکانی ئەمڕۆ.. ئەوانەی ئەمڕۆ بە نەشیاو و شوورەیی دادەنرێت لە کۆمەڵگای سبەی کوردەواریدا زۆر بە ئاسایی قبوڵ دەکرێن، زۆر شتی ئەمڕۆی ئێمە سەردەمێک لەمەوبەر یەکێک بوو لە نەشیاوەکان و ئەو دەم باوەڕ وابوو کە یەکێکە لە هەرگیزەکان.

ئێمــەی جاف لە قووڵایی مێژووەوە بەشــێکی بەربڵاوی کەلتوورێکی ســەرەتایی ئەم میللەتە بووینــە وەک کــردار، وەک رەفتار، هەتاوەکو وەک گفتاریــش تایبەتمەندی خۆمان هەبووە، دەڵێم تایبەتمەندی ئەوە ناگەیەنێت ئێمە لە خەڵکی باشــتر بووینە.. نەخێر، بەڵام ئەگەر لە رابردوویەکی نزیکــی ئــەم هۆزە گەورەیە کە پێی دەوترێ جاف هەمووی ســەد ســاڵ نابێت دەســتی لە ژیانی ((کۆچــەری)) هەڵگرتووە، یانی بە تێگەیشــتنێکی دیکە لەوەتەی هەبووە ((کۆچەر)) بووە تا ســەد ســاڵ لەمەوبەر وجوودی رەگەزی (جاف)یش بەپێی ســەرچاوە باوەڕپێکراوەکان دەگەڕێتەوە بۆ ســەردەمی دەسەڵاتی ساســانییەکان، یانی زۆرتر لە ((١٦٠٠)) ســاڵەوە ئێمە لە بەشی تردا وەک مێژوو باســمان لێ کردووە ((جاپان - جاڤان - جاوان - جاف)) .. ســەیری هێز و توانای زەمان و جەبری گۆڕانکارییەکەی بکە و تاوێک هەڵیســەنگێنە و تێی ڕاما، عەشــیرەتێکی هەزاران ســاڵەی

ڕەوەند و کۆچەر و سـەرەتایی ئەوڕۆ چۆن دەسـتەمۆی نیازە ئەمڕۆییەکان بوونە سـەیر، هەر ئەو هۆزە یاخییە سـەرەتاییەکەی ئەوڕۆ سەدان بگرە هەزاران خوێندەواری هەڵگری بەڵگەنامەی زانکـۆ جۆراوجۆرەکانی تیادایە. تیرەی ((نەورۆڵی)) یەکێکە لە تیرە سـەرەکییەکانی هۆزی جاف، لـە تـەواوی ڕووداوە گەورەکانـدا کە دامێنگیری هـۆزی جاف بووە، ئەم تیرەیـە ڕۆڵ و دەوری سەرەکییان هەبووە، ئاخرین ڕووداوی گەورە کە بەسەر هۆزی جافدا هاتووە پەلامارە کتوپڕەکەی ئیمارەتی ئەردەڵان بوو، کە وەک سوپا و لەشکرێکی نیزامی دەوڵەتی پەلاماری هۆزی جافیان دا و بە پاڵپشتی دەوڵەتی مەرکەزی ئێران و بە تەئکید شەڕی نێوان عەشیرەتێک و دەوڵەتێکی بەهێزی وەک ((سـەفەوی یـان قاجـاری)) لەگـەڵ جافدا لەگەڵ تۆپ و لەشـکری ئیمارەتی بە دەسـەڵاتی ((ئەردەڵان))دا شـەڕێکی نابەرانبەر ڕوویداوە و لەو شـەڕەیدا سەرۆکی جاف دەکوژرێت و بڕێک لە ناودارانی هۆزیش دەستگیر دەکرێن.

ئـەو پەلامـارە خوێناوییە بوو بە هۆی پەرتەوازەی هۆزی گەورەی جاف و بە ناچاری بوونە سـێ بەشـەوە، بەشـێکیان هەر لە جوانـڕۆدا مانەوە، بەشـێکی تریان بەرەو زەهـاو و ناوچەی گۆرانەکان کۆچیان کرد و ئەوڕۆ ناسراون بە ((جافی گۆران)) و بەشێکی زۆری تری جاف بەرەو ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کۆچیان کرد و لە دەڤەرەکانی دزی ئایش و شارەزوور و گەرمیاندا گیرساونەتەوە و ناسراون بە جافی ((مورادی)) و تیرەی ((نەورۆڵی)) یەکێک بوون لەو تیرانەی کە لەسەر ((جافی مورادی)) دەژمێردرێن، ئەو هیجرەتە گەورەیە بە سەرۆکایەتی ((زایەر بەگی جاف)) بووە و بە دوای ئەو هیجرەتەوە بەرەبەرە تیرەی تر وەک بڕکە و وەک خێڵ بەرەو ناو خزمە کۆچکردووەکانیان ڕۆیشتوون.

دیارە تیرەی ((نەورۆڵی)) یەکێک بووە لەو تیرانەی زووتر لە خزمانی تریان نیشتەجێ بوونە و زەویوزارێکی پڕ پیت و بەرەکەتیان بووە بە نسیب.

دیارە دوای نیشتەجێبوونی جاف لە نزیکی ئیمارەتی بابان و دەسەڵاتە زلهێزەکەی عوسمانیدا ((زایـەر بەگی جـاف)) بووە بە هێزێکی بەتوانا و بەقودرەت، ئەودەم دەور دەوری ((نادرشـا))ی گـەورە و مـەزن دەبێت. خان ئەحمەدخانی ئـەردەڵان کە یەکێک بووە لە فەرمانڕەوا لێهاتوو و بە دەسەڵاتەکانی زنجیرەی ئەردەڵانییەکان، ئەوەندە بەهێز دەبێت لە شایەکی شەڕکەر و پەلاماردەری وەک ((نادر شـا)) یاخی دەبێت وە بە سـوپا و لەشکرێکی ڕازاوە و پڕ چەکەوە شاری سنە بەجێ دێڵێت و بەرەو خاکی عوسـمانی بەڕێ دەکەوێت، پایتەختی دەسـەڵاتی ((نادر شاە)) لە ئەسفەهان دەبێت کە دەبیسـتێت وا خان ئەحمەد خانی ئەردەڵان لە دەسـەڵاتی مەرکەزی یاخی بووە و دەم لە شـاهێتی دەکوتێت بە سـوپایەکی زۆرەوە بۆی دەڕوات و ((نادر شـاە)) دوژمنایەتی جاف و ئەردەڵانەکانی زانیوە، نامەیەک بۆ ((زایەر بەگی جاف)) دەنووسێت، تا بەرگری لە خان ئەحمەدخان بکا، تا گەیشـتنی ئەو، دیارە ((زایەر بەگی جاف)) ئاگاداری دەسـەڵات و لەشکری پڕچەکی ((خان ئەحمەدخـان)) نەبـووە و ئەوەی بە وردی هەڵنەسـەنگاندووە، لە ڕووی ملهـوڕی و ئازایەتییەوە بـە خـۆی و هێزی جافەوە پەلاماری لەشـکری ئەردەڵان دەدات دیسـان شـەڕێکی نابەرانبەر لە نێوانیان ڕوودەدات، لەشکرێکی نیزامی بە تۆپ و خومپارەوە بە چەکی جۆراوجۆری ئەو دەمەوە بەرامبەر هێزێکی عەشـایەری کە تەنها بە چەکی ئازایەتی خۆیەوە نازیویەتی، شەڕێکی خوێناوی

لە شـارەزووردا رووودەدات و لەشـکری جاف دەشـکێن و کوشـتارێکی زۆر لە دوولا دەکرێت و لەو شـەڕەیدا زایەربەگ و برێکی تر لە سـەرۆکەکانی جاف دەسـتگیر دەکرێن هەر لەوێدا ئیعدام دەکرێن.. جاف تەرمی زایەربەگ هەڵدەگرن دەیبەنەوە بۆ دزی ئایشی نزیکی دەربەندیخانی ئێستا و لەوێرا دەینێژن. تا بە ئەوڕۆ گۆڕەکەی وەک مەزارێک ماوەتەوە.

بـە تەئکیـد تیـرەی نەورۆلی لـەو مەلحەمە و شـەڕە خوێناوییەدا وەک تیرەیەکی سـەرەکی شەڕکەری جاف بەشداربوونە.

## نەورۆڵییەکان و شوێنی نیشتەجێبوونیان:

نەورۆڵییەکان بەپێی دابەشـبوونی دیموغرافییان دوو بەشن یەکێکیان پێی ئەوترێت نەورۆڵی (حەمە) یا (تەخت) یا (دەشت) بەشی دووەمیان پێی ئەوترێ نەورۆڵی (پارچە).

لـە کتێبی (تاریخی جـاف)دا لە دانانی (کەریم بەگی فەتاح بەگی جـاف) لاپەڕە ١٧ بەم جۆرە باسـی نەورۆڵییەکان ئەکات و ئەو بە سـێ بەشـیان لە قەڵەم ئەدا و ئەڵـێ ئەمانەش تایەفەیەکی گەورەن لە جافدا، بە سـێ کۆمەڵی پارچە، ساتیاری، بەشی حەمە) ئەگەرچی سەرچاوەی ناوبراو نیشتەجێی ئەو سێ بەشەی دیاری نەکردووە، بەڵام زۆربەی سەرچاوەکان وای نیشان ئەدەن کە ساتیارییەکان هەر نەورۆڵین و شانازیش بە نەورۆڵی بوونیان دەکەن، ئەگەرچی دوو بەش بن یان سێ بەش بن: دابەشبوونەکە تەنها لەسەر بنەمای هەڵکەوتنی شوێنەکەیانە بەپێی تەختی و بەرزی و نزمی زەویوزار و جێنیشتەبوونیانە، ئەو دێهاتانەی سەر بە نەورۆڵی تەختەن بریتییە لە (خێڵی حەمە، تەپەکوڕە، دەلین، گۆمەلار، دێ کۆن، شەشکی (ناحیەی سیروانی) ئێستا، ئەو دێهاتانەش کە بە ناوچەی نیشـتەجێبوونی نەوڕۆڵی پارچە ئەژمار دەکرێ بریتییە لە (تریفە، چروسـتانە، پریسی سەروو و خواروو، هانەسوورە، گوندە، میراولی، نوورە، هانەی ژالە، کانی توو، بیەنگە، کەوتە).

جگـە لـەو ناوچانەی ناومان برد کە زۆربەی زۆری دانیشـتوانی نەورۆڵین، لە زۆر شـوێنی تـردا نەورۆڵی هەیە، بەتایبەتی لە ناو هەڵەبجەی تازەدا هەروەها نەورۆڵی سـلەیمانی نەورۆڵین، هەروەها لە ناو شـاری سـلێمانی و هەولێر و کەرکووکیشدا ژمارەیەکی دیار و بەرچاو نەورۆڵی هەیـە، بێگومان عەشـیرەتێکی وا گەورە لق و پۆیی زۆری لـێ دەبێتەوە و بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبێتەوە و پەل ئەهاوێژێت، جگە لەوە لە کوردسـتانی رۆژهەڵاتیشـدا ژمارەیەکی زۆر نەورۆڵی هەیە.

## شوێنەوارەکانی ناوچەی نەورۆلی:

ناوچەی نەورۆڵ نشینەکان زۆر شوێنەواری گرنگی دێرینی تیا هەیە کە جێی سەرنج ڕاکێشانی شوێنەوارناسانە بەتایبەتی بیانییەکان لەوانە (گردی بەکراوا) کە یەکێکە لە بەناوبانگترین شوێنەوارەکانی ناوچەی شارەزوور، بە دەوری گردەکەدا خەندەقێکی گەورە هەڵکەنراوە، وەک ئەڵێن ئەو گردە پێش سەردەمی بابلییەکان دروست کراوە.

شوێنەوارێکی گرنگی تر قەڵای (گوندەیە) کە شوێنەوارناسەکان وای بۆ ئەچن کە لە سەردەمی ساسانییەکانەوە بنیات نراوە، لەم قەڵایەدا ئاسەواری زۆری تیا هەیە وەک گۆزە و دیزە و پارەی ئەو سەردەمە و شتی تر.

هەروەها گردی (خاتوو ئایش) و (گردە قووچ) لە تەپەکوڕە وە (گردەبۆر) لە نزیک خێڵی حەمەوە کە زۆر شتی بەنرخی تیا هەیە بێگومان جگە لەو شوێنەوارانەی باسمان کرد ڕەنگە داهاتوو پەردە لەسەر زۆر شوێنەواری گرنگی تر لابدات ئەگەر پشکنینی ورد و بەدواداچوونی زانستییانەی بۆ بکرێت بەتایبەتی لە لایەن شوێنەوارناسە بیانییەکانەوە.

نەورۆڵییەکان و تەبایی بوونیان لەگەڵ هۆزەکانی تر و نیشتمانپەروەرییان: نەورۆڵییەکان بەردەوام گیانی تەبایی بوونیان تیا هەبووە و خۆیان بەدوور گرتووە لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکی و خوێنڕشتن لەگەڵ هۆزەکانی تردا، لە کاتێکدا کە لە توانا و ژمارە و هێمنیدا خۆیان بە کەم نەزانیوە بەڵکو لە پێناوی پاراستنی هێمنی و گیانی دانیشتوانی ناوچەکەدا بووە، خۆ ئەگەر کێشەیەکیش هەبووبێت لەگەڵ لایەکدا هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەری بەپەلەیان داوە، نەک هەر ئەوەندە بەڵکو زۆر جار ڕۆڵی ناوبژیوانیشیان دیوە بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ و دوژمنایەتی دوو خێزان یان دوو هۆز، چونکە پیاوی قسەزان و خاوەن کەسایەتی بەتوانای تیا هەبووە، هەروەها پەیوەندییەکی پتەویشیان هەبووە لەگەڵ سەرجەم هۆزەکانی تردا وەک شاتری بە هەموو بەشەکانییەوە، عەمەڵەیی و کۆکۆیی و ئیمامی و یەناخی و خزمانی هەورامی و یەزدانبەخشی (شەمێرانی) و هۆزەکانی تریش.

لە رووی نیشتمانپەروەرییانەوە، نەورۆڵییەکان هەردەم پشتیوانی هەموو شۆڕشێکی ئازادیخوازانەی گەلی کورد بوون و لەو پێناوەشدا شەهیدی قارەمانی زۆریان هەیە و ناوچەکانیان بەردەوام پەناگای پێشمەرگە بووە تەنانەت لە سەردەمی شێخ مەحموودی نەمردا کاتێ شێخ و جەنگاوەرەکانی دژی ئینگلیز شەڕیان کردووە نەورۆڵییەکان چوونەتە خزمەتی شێخ و

ئامادەباشی خۆیان پیشان داوە بۆ پاراستنی کوردستان لە هەموو دەستدرێژییەک، هەڵوێستی تری جوامێرانەیان لە سەردەمی شێخ مەحموودا کاتێ لە شعێبە شەڕ روو ئەدات لەگەڵ ئینگلیزدا، سەد سوارچاکی نەورۆلی بە هەموو چەک و تفاقێکی شەڕەوە بە سەرکردایەتی (حاجی عبدالرحمن) باوکی خوالێخۆشبوو (میرزا حەسەن و شەهید ملازم سیروان) بۆ بەشداریکردن لەگەڵ شێخدا ئەچن بۆ شعێبە و شەڕێکی مەردانەیان کردووە و شەهیدیشیان داوە.

## ناودار و کەسایەتییە رۆشنبیر و زانا و شاعیرەکانی نەورۆڵی:

لە پێشتردا باسمان لەوە کرد نەورۆڵییەکان هەر زوو نیشتەجێ بوون و چەندین دێیان ئاوەدان کردووەتەوە و وازیان لە کۆچ و رەوی گەرمیان و کوێستان هێناوە، هەر دێیەکیش ئاوەدان کرابێتەوە مزگەوتیان تیا دروست کردووە دیارە لەو سەردەمانەشدا مزگەوت جگە لەوەی جێگەی خواپەرستی بووە مەڵبەندێکی ئاوەدانی خوێندن و زانست و رۆشنبیری بووە لە پاڵ ئەوەشدا رۆحی گەل و نیشتمانپەروەری تیا پەروەردە کراوە، هەروەها دواتریش قوتابخانە لە دێهاتەکاندا کراوەتەوە کە ئەمەش ریخۆشکەر بووە بۆ ریشەکێشکردنی نەخوێندەواری و بووەتە شوعلەی چرایەکی خوێندن و دەڤەرەکەی کردووەتە تیشکستان و منداڵەکان دواڕۆژێکی گەشیان بۆ خۆیان زامن کردووە، بوونەتە خاوەن بڕوانامەی بەرز و پلە و پایەی باشیان بەدەست هێناوە، هەر بۆیەش کەسایەتی ناودار و رۆشنبیر و زانا و شاعیر لە ناو نەورۆڵییەکاندا هەڵکەوتووە کە مێژوو بە زیندوویەتی و نەمری ئەیانهێڵێتەوە و جێگەی شانازین بۆ نەوەکانی دوای خۆیان بەو خزمەتە بێ پایانەی کردوویانە بە گەل و نیشتمانیان، ئێمەش وەک وەفایەک بۆ هەوڵ و ماندووبوونیان چەند کەسایەتییەکی هەڵکەوتوو و ناوداری نەمری نەورۆڵییەکان لە چەند لاپەڕەیەکدا باس ئەکەین، لەگەڵ داوای لێبوردندا لێرەدا هەر ئەوەندە دەرفەت هەیە کە باس لە ژمارەیەکی زۆر کەمی ئەو کەسایەتییانە بکەین.

# تۆفیق وەهبی بەگ

تێبینییـەک: ئەگەرچـی ئەو رایـە هەیە کە ناوبراو ئەچێتەوە سـەر میرەکانـی بابان، بەڵام لە راستیدا نەورۆڵییە و خەڵکی دێی تریفەی سەر بە قەزای هەڵەبجەیە، نەورۆڵییەکانیش شانازی بە هەموو ئەوانەوە ئەکەن کە خشتێکیان نابێتە سەر خشتێ بۆ خزمەتی گەل و نیشتمانەکەیان.

تۆفیق وەهبی بەگ کوڕی مەعروف کوڕی محەمەدە، ساڵی ١٨٩١ز لە سلێمانی لە دایک بووە، لەسەر دایکییەوە زانای گەورە رەسوڵ مەستی باپیرێتی.

دوای ئەوەی فێرگەی سەربازی لە بەغدا تەواو ئەکات، پێش جەنگی جیهانی یەکەم ئەچێت بۆ ئەسـتەمبوڵ و کۆلێجی سـەربازی و کۆلێجی ئەرکان بە سـەرکەوتوویی تەواو ئەکات، لە جەنگی یەکەمی جیهاندا یەکێ بووە لە ئەفسـەرە بەتواناکانی دەوڵەتی عوسـمانی و بەشداری شەڕەکانی کردووە، لە ساڵی ١٩١٩ز گەڕاوەتەوە عیراق و بووە بە قایمقامی رانیە، یەکێکە لەو دە ئەفسەرەی لە (٦) شەشی کانوونی ١٩٢١ز سوپای عیراقیان دامەزراند، ساڵی ١٩٢٢ز دایە پاڵ شێخ مەحموود و لەسەر ئەوە ماوەیەک گیرا.

ماوەیەک موتەسـەڕیفی سـلێمانی بـووە و لەبەر راپەڕینـی ئەیلولی ١٩٣٠ز دەسـتی لە کار کێشاوەتەوە، کۆتایی ساڵی ١٩٣٦ز گەڕاوەتەوە سەر کار و دوای ساڵی ١٩٤٤ز چەند جارێ بووە بە وەزیر و ئەندامی ئەنجوومەنی ئەعیان.

ئەندامی کارا و جێگری یەکەمی سەرۆکی کۆڕی زانیاری عیراق بووە، لە رۆژی دامەزراندنیەوە واتە لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ز.

لـە سـاڵی ١٩٧٠زدا کۆڕی زانیاری کورد دامەزراوە، تۆفیـق وەهبی یەکەم کەس بووە کە بە ئەندامی شەرەفی ئەو کۆڕە هەڵبژێردراوە.

ئەندامی کۆمەڵەی جوغرافیاناسانی (بەریتانی) بووە و زۆر شارەزایی مێژوو و ئاسەوارەکانی بووە لە زمانا زۆر شارەزایی هەبووە و زیاتر لە شەش زمانی رۆژئاوایی زانیوە بایەخی زۆر بە زمان داوە، چونکە زمانی بە قەڵغانی یەکەمی پاراستنی نەتەوە زانیوە.

چەندین نامیلکە و کتێبی هەیە بە هەر سێ زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی لە زۆر بواری زانستیدا بە تایبەتی بواری زمانەوانی.

ڕۆژی ٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٤ز تۆفیق وەهبی بەگ کۆچی دوایی کردووە لە شاری لەندەن لەسەر داوای خۆی تەرمەکەیان هێناوەتەوە بۆ سلێمانی و لەسەر چیای پیرەمەگروون بە خاک سپێردراوە بە مەراسیمێکی شکۆدارەوە.

# زانای بەتوانا مامۆستا مەلاساڵح پریسی

مامۆستا مەلا ساڵح لە بنەماڵەی پریسییە و یەکێکە لەو زانا ناودارانەی کە خاوەن پلە و پایەیەکی شکۆدار بوو، بەڵکو لە زۆر مەسائیلی شەرعیدا زانایانی ئایینی پەنایان بۆ ئەبرد، دەستێکی باڵای هەبووە لە سەرجەم زانستی ئایینی و عەرەبییەکانی تردا.

# ڕەسوڵ مەستی

زانای بەناوبانگ و دیار (ڕەسوڵ مەستی) خەڵکی شارەزوورە و لە تیرەی نەوڕۆڵییە لە ساڵی ١٨٢٣ز هاتۆتە دنیاوە، لە ناوچەی هەورامان و سنە درێژەی بە خوێندن داوە، لای مەلای خەتێ لە ڕەواندز خوێندوویەتی و ئیجازەی عیلمیشی لەو وەرگرتووە.

هەر لە سەردەمی خوێندنیدا لە ڕەواندز کتێبی (تشریح الادراک في تشریح الافلاک) داناوە و (اثبات واجب الوجود)یشی هەر لەوێ نووسیوە، لە دواییدا چووەتە ئەستەمبوڵ و لە قوتابخانەی مەلکیەدا خوێندوویەتی و تەواوی کردووە، لەو ماوەیەشدا کتێبی فیزیای نووسیوە پێشکەش بە سوڵتانی کردووە و خەڵات کراوە، لە ڕوشدییەی ملکییەی موسڵ و کەرکووک و بەسرە چەند ساڵێ مامۆستایەتی کردووە، لە پاشان چۆتەوە ئەستەمبوڵ و کراوە بە سەرپەرشتیاری مەعاریفی ویلایەتی (وان) لە پاش ماوەیەک کراوە بە بەڕێوەبەری مەعاریفی ئەو ولایەتە، دواتر چووەتە وڵاتی میسر ماوەیەک ماوەتەوە و لەوێ فێری زمانی فەڕەنسی بووە و گەشتێکی بە ئەورووپادا کردووە، تا لە ساڵی ١٩٠٨ز لە ئەستەمبوڵ کۆچی دوایی کردووە.

بەرهەمێکی زۆری زانستی و هونەری هەیە، بەڵام ئەوەی بە چاپ گەیەنراوە تا ئێستا (حوادث عناصر) و (سپر زلزلە)یە.

# زانا و خواناسی گەورە ـ مەلا عەبدولرەحیم چروستانی

زانا و خواناسی کورد مەلا عەبدولرەحیمی چروستانی لە ساڵی ١٢٧١ک لە دێی چروستانە لە دایک بووە شـەجەرەی ئەچێتەوە سـەر پیرخدری شاهۆیی، ئەم زانایە خزمایەتی لەگەڵ شاعیری گەورە مەولەویدا هەیە و هەر ئەویش بە ناوی خۆیەوە ناوی (عبدالرحیم)ی لێ ناوە، مەلا عبدالرحیم لە منداڵییەوە خولیای خوێندن ئەکەوێتە سـەری و سـەرەتای خوێندنی لەو مزگەوتەدا دەست پێ ئەکات کە مەولەوی تیا مەلا بووە، دوای خوێندنی زانستە سەرەتاییەکان لە چروستانە دەرئەچێت شـار بە شـار و دێ بە دێ لە کوردستاندا و تەنانەت پەی بە سنووری کوردستانی رۆژهەڵاتیش ئەبات هەر بەو مەبەسـتە و لە خزمەتی گەلێک زانای گەورەدا خوێندوویەتی وەک مەلا عوسـمان باوکـی مەحوی شـاعیر و مەلا عبدالرحمن پێنجوێنی و مەلا عمـر خەیلانی و لە هەولێر لای مەلا ئەبوبەکری ناسـراو بە گچکە مەلا زانسـتی وەرگرتووە، دوای وەرگرتنی (اجازە) دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی دەست ئەکات بە دەرس وتنەوە لە ئابلاخ و مزگەوتی شێخ سەلام، بەڵام لە ترسی هێرشی رووسـەکان لە شـەڕی جیهانی یەکەمدا ئەچێت بۆ بەرزنجە و ئەبێتە مەلای ئەوێ دوای شـەش مانگ واتە سـاڵی ١٩٣٤ وەفات دەکات و هەر لە حەوشـەکەی شێخ عیسا و شێخ موسادا بە خاک دەسـپێردرێت مەلا عەبدولرەحیم لەسـەر دەستی شێخ عومەری زیائودین لە بیارە تمسک دەکات و رێگـەی ئیرشـادی پێ دەدرێت، بەڵام ئەو هەر (تەدریسـی) کردووە مەلا قـادری مەلا موئمین کە لە تەکیەی شـێخ زیائودیندا پێشـنوێژی و تەدریسی کردووە لە کۆڕێکی فەقێ و مەلای زۆردا وتوویەتـی (مـەلا عەبدولرەحیم لە هەمووتان مەلاترە و لە هەمووتان ئیماندارترە) مەلا عبدالرحیم هەر کتێبێکی زانسـتی خوێندبێت چەند جارێک بە خەتی خۆی نووسیویەتییەوە لە دانراوەکانیشی (علـم النحو، المنطق، الفائض، التجوید، الآداب والحکمة، العقاید، الموعظة) و پەراوێزێکی زۆریشـی لەسەر سەرجەمی زانستەکان هەیە کە کەڵکێکی باشی گەیاندووە بە خوێندەواران.

# زانای گەورە و بلیمەت مەلا عەبدولعەزیزی پریس

زانای گەورە مەلا (عەبدولعەزیز پریس کوڕی محەمەد) ساڵی (١٣٠٣ک) لەدایک بووە، هەر لە سـەرەتای ژیانییەوە رووی کردووەتە خوێندن و قورئانی پیرۆزی خەتم کردووە ئینجا خەریکی زانسـتەکانی تری عەرەبی بە تایبەتی ئاینییەکان بووە، دواتر چووە بۆ بیارە کە مەدرەسـەیەکی

گەورەی تیا بووە مەلا باشـەکان دەرسـیان تیا دەوتەوە، وە بووە بە موریدی شـێخ نجم الدینی بیارە، هەر لەسـەر داوای جەنابی شـێخ بووە بە پێشـنوێژ و مودەرسـی مزگەوتی پرێس، مەلا عبدالعزیز بە زانسـتە فـراوان و بڕوانامە ئاینییە پتەوەکەی و بە گفتوگۆی شـیرینی بە تەواوەتی جێی خۆی لە دڵی خەڵکدا کردبۆوە، بەردەوام کۆڕ و کۆمەڵی گەرم بوو لە مزگەوتەکانی هەڵەبجەدا بەتایبەتی مزگەوتی گەورە یان مزگەوتی محەمەد پاشا لە بارەی پەیڤە زانستییەکانەوە یان کێشە کۆمەڵایەتییەکانـەوە ئـەدوان، زۆر جاریش بە قسـەی خۆش و نوکتەبازی کاتیان ئەبردە سـەر، مامۆسـتا عبدالعزیز بەدەر لە زانسـتەکەی و خواناسییەکەی کەسـێک بوو بە تەنگی کۆمەڵگایەوە ئەهات و بە هانای هەموو کەسێکەوە ئەچوو کە پەنای بۆ ببردایە و پێی وابوو سیاسەت کردنیش بەشـێکە لە کار و فەرمانی مەلای ئایینی، ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە ڕابوونی ئیسـلام لە ناوچەی هەڵەبجەدا و چاو و مێشـکی موسـوڵمانانی کردووەتەوە و هەرچیەکیشی کردبێت تەنها بۆ خوای کردووە وە هیچ مەبەسـتێکی دنیایی و مەرامێکی لە پشـتەوە نەبووە، مامۆستای گەورەمان دوای خۆی شوێنەکەی بە ئاوەدانی مایەوە و کۆمەڵێ زانا و خواناس و لەخۆبوردەی بەجێ هێشت کە خۆیان کردبووە پێشەنگی خەباتی موسوڵمانان بۆ پاراستنی ئایینەکەیان لە کوردستاندا، ئەوانیش جەنابی حاجی مەلا عومەر و حاجی مەلا عوسمان و حاجی مەلا عەلی و مامۆستا مەلا سدیق.

مامۆستا مەلا عەبدولعەزیز لە ساڵی ١٣٦٠ی کۆچیدا هەر لە دێی پریس وەفاتی کردووە.

# زانا و خواناسی گەورە ـ مەلا عەبدوڵڵا چروستانی

مەلا عەبدوڵڵا چروسـتانی یەکێک بووە لە هەرە مەلا باشـەکانی سـەردەمی خۆی لە سـاڵی ١٨٩٧ی زایینی لەدایک بووە لە ساڵی ١٩٨٨ی زایینی کۆچی دوایی کردووە ئەویش زۆر شوێنی لە کوردستانی باکوور و ناوەڕاستدا کردووە بۆ خوێندن لە تەمەنی ٤ ساڵییەوە دوای ئەوەی جوزئی عەمـە و تبـارک لای باوکی ئەخوێنێت ئیتر خۆی ئەبێت بە مامۆسـتای خـۆی و هەموو قورئانی پیرۆز زۆر بە باشـی ئەخوێنێت، لە لای مەلا حوسـێنی پسـکەندی ئیجازەی عیلمی وەردەگرێت و هەروەها لای شێخ عومەریش بۆ پیرۆزی ئیجازەی دووەم وەردەگرێت.

مەلا عەبدوڵڵا زیاتر لە (٦٥) سـاڵ تدریسـی کردووە کەسـانێکی زۆر لە زانسـتە جیاجیاکان پێدەگەیەنێـت یەکێـک لەوانەی قوتابی بووە لای خوالێخۆشـبوو (مەلا مسـتەفا بارزانی) کە چەند سـاڵێک لای خوێندوویەتی، مەلا سـەعیدی چراغە رووتە و مەلا رەسـوڵی تەلانی، قانیعی شاعیر و زۆر کەسـانی تر چەند جار داوای ئەوەیان لێکردووە ببێت بە قازی قبوڵی نەکردووە لە ترسـی ئەوەی نەک بە هەڵەدا بچێت لە حوکم داندا مەلا عەبدوڵڵا لە ساڵی ١٩٧٠ کە لە خانەقای مەولانای سـلێمانی تەدریسـی کردووە خانەشـین دەبێت و بەڵام دوایی ئەوەش تا چەند سـاڵێک ماڵەوەی جمەی هاتووە و مامۆستای ئایینی هاتوون بۆ دەرس خوێندن.

لە بەرهەمە چاپکراوەکان:

١ ـ مێژووی بەسەرهاتی پێغەمبەری (کوردی).
٢ ـ چرای زانیاری بۆ حەج و پێداویستییەکانی.
٣ ـ محاضرات في اصول الحديث والفقه.

لە بەرهەمە چاپ نەکراوەکانی:

١ ـ مختصر طبقات الكبرى.
٢ ـ مختصر الاتقان.
٣ ـ أسئلة وأجوبذ في المسائل الفقهيذ.
٤ ـ ژیانی پێغەمبەر و جێنشینەکانی.
٥ ـ کۆمەڵە وتارێک.

هەندێک شیعری هەبووە بەڵام شیعردانانی نەکردووە بەماڵ بەسەر خۆیەوە لە ترسی ئەوەی دووری نەخاتەوە لە تەدریس.

# خواناس و شاعیری کورد ئەحمد پریسی (مەجذوب)

ئەحمەد پریسی کوڕی خەسرەو چاوەش، ناسراو بە کاک ئەحمەد پریسی یان مەجذوب لە هۆزی نەورۆڵییە و ئەم زانا و شاعیرە لە دێی پریس لە ناوچەی هەڵەبجە لەدایک بووە، ساڵی لەدایکبوونی جێی مشتومڕە، چونکە هەندێک سەرچاوە مێژووی لەدایکبوونی بە نادیار لە قەڵەم ئەدات ئەگەرچی سەرچاوەی تریش هەیە مێژووی لەدایکبوونی دەگێڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨١٢ی زایینی وەفاتیشی بۆ ساڵی ١٨٨٦ی زایینی بە هەرحاڵ هاوچەرخی شاعیری ناسراو مەولەوی بووە کە لە ١٢٢١دا لەدایک بووە لە ١٣٠٠ک وەفاتی کردووە، کەواتە ژیانی کاک ئەحمەد پریسی سەرەتای خوێندنی لە پریس بووە دواتر بە مەبەستی خوێندن دەچێتە هەڵەبجە و نودشە و سنە و دیارە دەچێت بۆ زۆر شوێنی تریش بە مەبەستی خوێندن چووبێت بەڵام کاک ئەحمەد بە هۆی باری نالەبار و کولەمەرگی ژیانەوە دەست لە خوێندن هەڵدەگرێت ئەگەرچی دانابڕێت لە زانست و پێ نابڕێت لە زانا و ئەدیبان، کاک ئەحمەدیش هەر لە تەمەنی (١٤) ساڵییەوە لەسەر دەستی شێخی

سـراج الدين تمسـك ئەكات و هەر زووش مەقامەکانی تصوف ئەبڕێت و بەرەو پێش ئەڕوات لە حەیاتی مەعنەویدا و پێی ئەگات بۆیە مەولەوی شاعیر کە دۆستی نزیکی بووە ئەفەرموێت:

**بریا وەبالای کالای رەئیسی**
**رجال (الغیب)ە ئەحمەد پریسی**

شـیعرەکانی کاک ئەحمەد تا بلێی وشـەکارییەکی جوان و دەسـتەواژەی ناسـکی خەیاڵێکی دوور مەودایـە خۆکارییەکی هەمەڕەنگی پێوە دیارە، ئەگەرچی بەسـەرهاتەکانی مێژوومان وەک دەسـتدرێژیکردنی تورکەکان بۆ سـەر دەڤەری هەڵەبجە و ناچاربوونی خەڵکەکەی بەجێهێشـتنی دەڤەرەکە و قبوڵ نەکردنی سەرشـۆڕی بە چەک داماڵینیان و کارەسـاتی سیاسی و رووداوی تر ئەمانە بۆتە هۆی ئەوەی کە خەڵکەکە تووشی نەهامەتی بێت و لە ناویشیاندا شاعیرەکانمان دواتر فەوتاوی بەشـێکی زۆری بەرهەمە ئەدەبییەکانیان، یەکێک لەوانەی بەشـێکی زۆری شـیعرەکانی دیار نییە کاک ئەحمەدی پریسـە لەگەڵ ئەوەدا ئەو بەشـەی ماوەتەوە توانا و سوارچاکی پریسی نیشـان دەدات و لـە بواری شـیعردا بەڵگەی لێهاتوویشـی ئەوەیە کە زۆر جـار لەگەڵ مەولەوی شاعیردا شەڕەشیعری کردووە و یەکێ: لەو منازەرە شیعرییانە: کاتێک مەولەوی بێ هیوا ئەبێت لە (لەیلێ) کە خوشـکی احمد پریسـی ئەبێت ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ و جوان ئەبێت، بەڵام پێش ئەوەی مەولەوی بنێرێتە داخوازی (لەیلێ) ئەدرێتە شێخ عبدالرحمن کوڕی شێخ سراج الدین دواتر مەولەوی نامەیەک ئاڕاستەی ئەحمەد پریسی دەکات و تیایدا داوای بەیجێ (بەهیجە) کە ئامۆزای ئەحمەد پریسی ئەبێت ئەکات و لەگەڵ داخوازییەکەدا ئەم شیعرەی بۆ دەنووسێت:

**قسەیێ ئەکەم وە ڕێ و جێ وێ**
**کە لەیلێ نەوو، با بەییجێ وێ**

کاک ئەحمەدیش بەم بەیتە وەڵامی ئەداتەوە:

**قسەیە ئەکەی بێ ڕێ و جێ وێ**
**تۆ کە مەجنونی، چۆن بەییجێ وێ؟**

قسە زۆرە لەسەر ئەحمەد پریسی بکرێت، بەڵام لێرەدا هەر ئەوەندە دەرفەت هەیە بە نموونەیەک لە شیعرەکانی کۆتایی بە باسی کاک ئەحمەد دەهێنین:

**گوڵان دەستە جەم هەدیە ئاوردەن**
**عەروسی (سەرووەڵخ) ئارایش کەردەن**
**(کانی گوێز) ماچۆ بە (کانی جانە)**

**(کانی مرواری) بالاش کە دیارمە بۆلێت**
**ماچی سەرسامەن وە هاژەی (شاڵ شێت)**
**وەهار ئەر مەیلت هەن وەشاد باش**
**عەزمی سەفەرکەر وە کانی (دەراش)**
**ئەوجا بەزمگەی یارانی مەیەن**
**سەیارنگەی هەزار (دار) و (کەی)ەن**
**(کۆلارە) سینەش تیتە بەندە کەردەن**
**خەم نە (قەورسان) گیری بەند کەردەن**
**(مەیان) شادیشەن بە دۆک پڕ نەگۆڵ**
**بۆی عەتر مەدا وە دەماخی دڵ**
**تافی (بەرکەورگ) چۆن ئەگریجەی لەیل**
**گوڵاو مەشانۆ دەرووی قەیسی مەیل**

(سـروەڵح) (کانی گێز) (کانی جانە) (کانی مرواری) (شـاڵ شێت) (کانی دەراش) (بەرکەورگ) ئەو ناوانەی سەرەوە ناوی شوێنە خۆش و ئاوادارەکانی گوندی پریسی سەروون.

(کۆلارە) (مەیان) دوو دەشتن لە دەوری پریس
(بەرکە ورگ) تاقیگەیەکە ـ ئەم شیعرەی پریسی نیشانی ئەدات کە چەندە دڵی بە زێدی باو و باپیرانی کراوەتەوە.

# زانا و شاعیری کورد ـ مەلا محەمەدی چروستانی
## (1890 ـ 1963)

مـەلا محەمەدی کـوڕی مەلا عەبدولرەحیمی چروسـتانییە لـە ئابلاخ، کە گەڕەکێکی شـاری سـلێمانییە هاتۆتە دنیاوە هەر لە پێنج سـاڵییەوە لای باوکی دەست دەکات بە خوێندن و دواتریش زۆر لە ناوچەکانی کوردستان دەگەڕێت بۆ بەدەستهێنانی زانست، دوای تەواوکردنی خوێندنی لە چەند شوێنێکیش پێشنوێژی و تەدریس ئەکات لە ساڵی ١٩٣٢ی زایینیدا ژیانی گوندنشینی واز لێ دەهێنێت و بە تەواوەتی لە سلێمانی نیشتەجێ ئەبێت ١٩٣٦ بە فەرمی ئەبێتە پێشنوێژی مزگەوتی نەقیب لە سلێمانی.

مەلا محەمەدی چروستانی لەو شاعیرە هەست ناسکانەی ئەکرێت بڵێین لە ریزی نالی و ناری و کـوردی شـاعیرانی تردایە هەندێک لە شـیعرەکانی لە چەند ژمارەیەکـی گەلاوێژدا کاتی خۆی

بڵاوکراوەتەوە و دواتریش دیوانەکەی بە چاپ گەینراوە و مامۆستا برایم ئەحمەد کاتی خۆی کە شــیعری داناوە پیشــانی چروستانی داوە بۆ دڵنیابوون لە جوانیی شــیعرەکەی هەروەها دۆستی نزیکی صافی شاعیر بووە، کاتێک بە هەژاری شاعیر گەیشتووە پێی وتووە:

**بە بێ هێ ژاریو بێ ژێ کە هاری**
**ئەوەندە ژیر و وریای بۆ هەژاری؟**

شیعرەکانی چروستانی لە نیشتمانپەروەری و کۆمەڵایەتی و غەزەل و پیاهەڵدانی بە نەورۆز و سروشــتی کوردســتان و شیعری ئایینی خۆی ئەبینێتەوە، شیعری چروستانی گەلێ قووڵ و پڕ مانایە و پڕە لە وێنەی جوان و خەیاڵی فراوان.

زۆر شت ماوە بوترێت سەبارەت بە زانا و شاعیری گەورە مەلا محەمەدی چروستانی، بەڵام لێرە هەر ئەوەندە دەرفەت هەیە لەگەڵ نموونەیەک لە شیعرەکانی:

**من کە دڵ ماتەم نشین و بولبولیش هاوار و شین**
**هەریەکە سەوداسەری خونچە گوڵێکی بێ غەشین**
**من بە نەقدی دڵ لە سەوزەی خونچە لێوی سوخمە شین**
**ئەو بە ئاهی لێوی خونچەی دوگمە سەوزی ئاتەشین**
**هەریەکە خار و جەخارێ باری دەردی دڵکەشین**
**ئاڵی شاری کوڵم و ژاری ماری زولفی خەمچە شین**
**هەریەکە زامی بە تیر و نەشتەری کون کون لە شین**
**دڵ بە ئاواتی نەباتی گوڵ دەمی ماتەم بە شین**

تا لە دواییدا دەفەرموێت:

**من سەرم سوڕماوە چۆن رێکەوتووە وا سوور و شین**
**حاڵی شین ماتەم دەکا بەو لێوە سوورە دڵکەشین**
**ئوچی پاراو و تەڕی زاری چروستانی یەقین**
**بولبولا سا نەغمەیێ سەد نەزمە بێ طالع رەشین**

دیوانی چروستانی ـ ل١١٥

# شاعیر و نیشتمانپەروەر (ساڵح هەژار)

ساڵح کوڕی سەعید کوڕی بایز لە ساڵی ١٩٢٧دا لە گوندی تریقە سەر بە قەزای هەڵەبجە هاتووەتە دنیاوە، قوتابخانەی سەرەتایی لە هەڵەبجە تەواو کردووە، بەڵام لەبەر باری هەژاری و نەداری نەیتوانیوە درێژە بە خوێندنی بدات بۆیە هەردەم پاڵپشتی هەژاران بووە لە پێناوی لایەنگیری کردنی هەژارانیشدا تووشی گەلێک چەرمەسەری دەبێت هەر لەبەر ئەوەش نازناوی هەژاری بۆ خۆی بە شایستە زانیوە، شیعرەکانی هەژار دەنگێکی یاخیبوونە دژی ئیمپریالیزم و داگیرکەران و فاکتەرێکی بەهێز بووە، هەژار لەگەڵ دەستەیەک رۆشنبیرا گۆڤارێکی نهێنی بە ناوونیشانی (نرکەی جووتیار) دەردەکەن، شاعیر دژ بە هەموو رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عیراق بووە کە مافی هەژاریان پێشێل کردووە جگە لەوەی کە داوا رەواکانی گەلی کوردیان پشتگوێ خستووە بۆیە بەردەوام بە ئاسوودەیی نەژیاوە، لە ساڵی ١٩٨٢دا تووشی نەخۆشی دەبێت و لە بەرواری ١٩٨٣/٣/٤دا کۆچی دوایی ئەکات و دوای خۆشی شەش کەس لە خێزانەکە کە بریتی بووە لە هاوسەرەکەی و سێ کچ و دوو کوڕی ئەکەونە بەر لێشاوی دڕندانەی رژێمی بەعسی فاشی بە کیمیابارانکردنی هەڵەبجەی شەهید و ئەوانیش ئەچنە ریزی کاروانی شەهیدانەوە.

نموونەیەک لە شیعرەکانی بە ناوونیشانی (بۆسۆی کوردستان)

**بۆ چرووکی لەش بۆ سۆی سوتاندن**
**ناڵەی زامار و لرخەی خنکاندن**
**هاوار و دادی خێزانی ناو دێ**
**کفەی خوێناوی تەرمی دەوری رێ**
**چرە دووکەڵی دار و پەردووی ماڵ**
**یا بۆ کرووزی دەست و پێی مناڵ**
**لە کوردستانا ئەوەن بە سامە**
**نازانی شار و گۆڕستان کامە**

# میرزا محەمەدی نەورۆڵی

میـرزا محەمــەد نەورۆڵی شــاعیرێکی بەتوانا بووە، بەڵام بەداخەوە شــتێکمان لــە بارەی ژیان و بەرهەمەکانییەوە بەدەست نەکەوت.

# شاعیری پایەبەرز ـ عەبدوڵڵا حەسەن

لە راســتیدا ئەو زانیارییانەی هەیە دەربارەی عەبدوڵڵا حەســەن کەمە و تەمومژاوییە، بەڵام ئــەوەی بەردەســت کەوتووە ئەوەندەیە کە عبدالله حســن لە ئێلی جافــە و هاوچەرخی مەولەوی شــاعیر بووە بەڵکو دۆســتی نزیکی بووە و خزمایەتیش هەبووە لە نێوانیاندا، ڕێچکەی شــیعری مەولەوی بە شــیعرەکانی (عبدالله حســن)ەوە دیارە عبدالله حســن خەریکی کشــتوکاڵکردن بووە لــە هەڵەبجــەدا ژیــاوە و پیاوێکی نەخوێندەوار بووە، بەڵام شــاعیرێکی پایەبــەرز و بەتوانا بووە بەتایبەتی لە شــیعری جنێودا (هجو) جگە لەوەش لە بوارەکانی تردا شیعری وتووە وەک شیعری خۆشەویستی و شیعری گاڵتەجاڕی و شیعری دانایی (حکمە)تیش بووە، وەک ئەوەی روو لە خوا ئەکات و ئەڵێت:

**ئەمە نان نەبوو تۆ دات وە بەنە**
**وە هەوڵی قۆڵ وە زەبری چەنە**

نموونەیەکی تری شیعری گاڵتەجاڕی:

**دەمزانی ئاغا هەوای باغی هەس**
**نەمزانی تەمای سیکەجاغی هەس**
**سوورەی سەرخڕی کەمێ بۆ نم دا**
**کوتای وە ژێر کلک خاتوون یەک سمدا**
**ئەگەر هەروەها بمێنێتەوە**
**(سیواس تەپۆڵە)یش ئەسێنێتەوە**

ئەم شاعیرە لە ساڵی ١٣١٦ک هەر لە هەڵەبجە کۆچی دوایی کردووە

# بنەماڵە و کەسایەتییە بەرچاو و پیاوماقووڵەکانی هۆزی نەورۆڵی

بنەماڵەی (محەمەد حەمە میرزا) (خێڵی حەمە): ئەم دێیە هەر بە ناوی ئەوەوە ناونراوە.

حاجی عبدالرحمن محەمەد حەمەمیرزا: یەکێک بووە لە خاوەن دیوەخان و سوارچاک و شۆڕشگێڕ و نیشتمانپەروەرەکان، کاتێ شێخ مەحمودی نەمر لە شعێبە، کە لە باشووری عێراقدایە لەگەڵ (١٥٠) سواری نەورۆڵیدا بە هەموو چەک و تفاقێکی خۆیانەوە دەچن بە هانای شێخی نەمرەوە وە شەڕێکی مەردانە ئەکەن و زیانێکی گیانی زۆریش لە ئینگلیز و ئەڵقە بەگوێکان ئەدەن لەخۆشیان دوو شەهید و سێ بریندایان دەبێت.

نەوەکانی (ئەحمەدی حاجی ئەوڕەحمان و کوێخا محەمەدی ئەولمحەمەد) رۆڵی لەو کەمتریان نەدیوە لە سیفاتە عەشایەری و هەڵوێستە نیشتمانپەروەرییەکانیاندا، دواتریش (میرزا حسنی کوێخا محەمەدی حاجی ئەولمحەمەد) کە سەرۆک عەشیرەتی نەورۆڵی بوو هەمیشە پیاوی سوڵح و کوردایەتی بووە، بۆیە لە ناوچەی شارەزوور و هەڵەبجە و هەورامان و گەرمیاندا بە پیاوی (هەوێنی سوڵحەکان) ناسراو بوو، میرزا حسن پیاوێکی رۆشنبیر و قسەخۆش و هەمیشە دیوەخان گەرم بوو، دوای کاولکردنی دێهاتەکانی کوردستان لە لایەن رژێمی بەعسی فاشییەوە هەوڵێکی زۆریان لەگەڵ دا و بەڵکو چەند جارێ بەگیریان ئەهێنا کە قبوڵی مستەشاری بکات، بەڵام هەرگیز ویژدانی رێی پێ نەداوە خیانەت لە گەل و نیشتمانەکەی بکات.

تا لە ساڵی ١٩٨٧زدا ناچار بوو بە ماڵ و منداڵەوە روو لە وڵاتی ئێران بکات و ژیانێکی کولەمەرگی، بەڵام بە سەربەرزی لەوێ بەسەربەرێ، تەنها (عەبدولڕەحمان)ی کوڕە گەورەی نەبێ جێ هێشت و بەر لە خواحافیزی پێی گوت ئەگەر کوڕی من بیت خاکەنازەکەت فڕێ ئەدەیت و چەکی شەرەفی پێشمەرگایەتی ئەکەیتە شان، لە دژوارترین و سەختترین رۆژانی پێشمەرگایەتیدا (عەبدولڕەحمان) بوو بە پێشمەرگە تا لە شەوی ٢٣ ـ ١٩٨٩/٤/٢٤ لە باوە کۆچەک شەهید ئەبێت و گیانی ئەبەخشێ بە کوردستان، دوای شەهیدبوونی (عەبدولڕەحمان) (میرزا حەسەن) یش لە غەمی ئەو و غەمی کاولکردنی دێهاتەکانی کوردستان و دەربەدەر بوونی دانیشتوانەکەی بەتایبەتی ناوچەی هەڵەبجە و هەورامان و شارەزوور بە نەخۆشییەکی کتوپڕ دڵە گەورەکەی لە لێدان ئەکەوێت و هەر لە ئێران لە وەیسی قەرەنی (وەیسی مایدەشت) نزیک کرماشان بە خاکی ئەسپێرن.

دوای لەدنیا دەرچوونی (میرزا حســن) (ملازم ســیروان نەورۆڵی) بەرپرسێتی سەرۆکایەتی عەشــیرەتی نەورۆڵی ئەگرێتە ئەستۆ، (ملازم سیروان) پیاوێکی شۆڕشگێڕ و نیشتمانپەروەر بوو جگــە لەوەی پێشــمەرگەیەکی ئازای شۆڕشــی ئەیلول بوو، پــاش راپەڕینی ســاڵی ١٩٩١ یەکەم کــەس بــوو توانی (هێزی ســەربازی یەکگرتووی کوردســتان) لە پێشــمەرگەکانی هەموو حیزبە کوردســتانییەکان پێکبهێنێــت لــە ناوچەی کەرکووک، بــەڵام بە داخەوە ئەویش بــوو بە یەکێ لە قوربانییەکانی شەڕی براکوژی، لە هەولێر شەهید ئەکرێت و هەر لەوێش بە خاک ئەسپێردرێت.

کەسایەتییەکی تری خاوەن هەڵوێست و هەڵکەوتوو (کوێخا عەبدوڵڵای حەمەی خواکەرەم) کە وەک کوردێکی خاوەن غیرەت کاتێک (ئەحمەد موختار جاف) بەرەو رووی ئینگلیزەکان دەبێتەوە، تیایدا شــەهید دەکرێت، بۆ ئەوەی تەرمەکەی نەکەوێتە بەردەســتی ئینگلیــزەکان کوێخا عبداللەی قارەمــان خــۆی و قەومانی نەورۆڵی چمکی مەردانەی لێ هەڵدەکــەن و بێ گوێدانە هێزی زۆری ئینگلیــز ئەچن لە مەیدانی شــەڕدا تەرمەکەی دەهێننەوە بۆ هەڵەبجە و بە مەراســیمی (کۆتەڵ) لە عەبابەیلێ بە خاکی ئەسپێرن.

ئــەو بنەماڵە و کەســایەتی و پیاوماقووڵانەی کە رۆڵی بەرچاویــان هەبووە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا ئێمە لێرەدا داوای لێبوردن دەکەین ئەگەر ناوی هەندێک بنەماڵە یان کەسایەتیمان بیرچووبێت:

١ ـ خورماڵ: بنەماڵەی کوێخا فەتاح و عەزیز حەمەمین یاسە و حاجی رەشیدی ئەحمەدی قادر.
٢ ـ دێ کۆن: حاجی محەمەد ساڵحی کاکەوڵا و حاجی ئەحمەد شەریف و فەتاحی پیرۆز.
٣ ـ گۆمەلار: مەحموود ئەحمەد.
٤ ـ حەمە: کوێخا محەمەد حاجی ئەولمحەمەد و حاجی ئەورەحمان.
٥ ـ تەپەکورە: حاجی میر ئەحمەد و رەشید دەروێش ئەحمەد و مەحموود حەمەی میر وەیس.
٦ ـ شەشکی سەروو: حاجی عیسا حەمەد حەمە میرزا.
٧ ـ شەشکی خواروو: بنەماڵەی مەحموود وەیس.
٨ ـ بەشارە: حاجی حەمە سعید فەقێ هەسەن.
٩ ـ کلیە سپی: کوێخا محەمەد ئەحمەدی هەسەن.
١٠ ـ دوانزە ئیمام: هۆزی ئیمام (حاجی صالح محمود ئیمام حاجی عەزیز و حاجی مستەفا)
١١ ـ زەردیان: ئەحمەدی زولفقار.
١٢ ـ کاگــردەڵ: بنەماڵــەی ئەولقادری رەمــەزان، حاجی فەرەجی ولوخــان، ئەولقادری مەحموود نازدار.
١٣ ـ بەکراوا: بنەماڵەی ئەورەحمان (کوێخا محەمەد ئەورەحمان).
١٤ ـ پریس: بنەماڵەی ئەحمەد پریس (هۆزی نەسرین)، میرزا کەریم حەمەی مراد وەیس، بنەماڵەی دەروێش قادری شا پەسەند، بنەماڵەی مەلا جەلالی عەزیزی ئاغا وەیس.
١٥ ـ هەسەناوا: بنەماڵەی حەمە چەف، عەزیزی سەیدە.
١٦ ـ زەمەقی سەروو و خواروو: بنەماڵەی حاجی ئەحمەدی وەیس محەمەد.
١٧ ـ تریفــە: بنەماڵــەی ئەولمحەمــەد حەمەی رۆســتەم، کەریم محەمەد، ئەحمــەد ئەورەحمان کە دەکاتە ئامۆزای فوئاد مەستی، تۆفیق وەهبی، بنەماڵەی وەیس.

١٨ ـ هانەسووورە: بنەماڵەی سەید عەبدولرەحیمی هانەسورە، بنەماڵەی ئەڵلاوەیس و کاکە وەیس.
١٩ ـ پریسی خواروو: بنەماڵەی کاکلی و قادر، بنەماڵەی دەرویش عەلی.
٢٠ ـ گردی سەفا: بنەماڵەی ساڵحی وەسمان.
٢١ ـ سەراو: بنەماڵەی خەسرەو (کوێخا محەمەد عەبدولڕەحمان)، بنەماڵەی کوردە، بنەماڵەی فەرهاد.
٢٢ ـ گوندە: بنەماڵەی وەیس کەرەمی، بنەماڵەی خواکەرەم (عەولای حەمەی خواکەرەم).
٢٣ ـ چرۆستانە: بنەماڵەی مەلا عەبدولرەحیمی چروستانی (م. مەلا عەبدوڵڵا چروستانی)، بنەماڵەی چنار بڕ (حاجی تۆفیق قادر نادر چناربڕ) کە بە هۆزی (بالە) ئەناسرێن.
٢٤ ـ کانی توو: بنەماڵەی حاجی سەی فەتاح.
٢٥ ـ کەوتە: بنەماڵەی حاجی ئەورەحیم (بنەماڵەی ئەمینی عەزیز، بنەماڵەی نوروڵڵا).
٢٦ ـ میراولی: بنەماڵەی رەزا، بنەماڵەی حاجی ئەورەحیم.
٢٧ ـ نوەر: عەولای حەمەی خواکەرەم (کوێخا مەحموود حەمەساڵح عەولای حەمە خواکەرەم)
٢٨ ـ دوانزە ئیمامی خواروو: بنەماڵەی (نالە عەرەو).

جگە لەوانەش زۆر زانا و کەسایەتی بەهێزمان هەبووە لەوانە مامۆستا مەلا ئەحمەدی خانم، مامۆستا مەلا جەلالی عەزیز، میرزا محەمەدی نەورۆڵی و سەی ئەوڕەحیم و سەی ئەوڕەحمانی هانەسوورە.

ڕێژەی خوێندەوار و ژمارەی خوێندکارانی دواناوەندی و ژمارەی خاوەن بڕوانامەکانی زانکۆ و ماجستێر و دکتۆرا.

لە راستیدا ئێمە ناتوانین ژمارەی راست و رەوان بدەین بە دەستەوە، چونکە ئامارێکی بەردەستی لەو جۆرەمان نییە بەڵام تەنها بە خەمڵاندن ئەو ڕێژە و ژمارانە ئەنووسین وەک لە خوارەوە هاتووە.

| | |
|---|---|
| ڕێژەی خوێندەوار | ٪٨٠ |
| ژمارەی خوێندکاری ناوەندی | ٢٥٠٠ بۆ ٣٠٠٠ |
| ژمارەی خوێندکار لە زانکۆ و پەیمانگاکان | ١٥٠٠ بۆ ٢٠٠٠ |
| دەرچووی زانکۆ لە (٥) ساڵی رابردوودا | ٧٥٠ بۆ ١٠٠٠ |
| خاوەن بڕوانامەی ماجستێر | ٥٠ بۆ ٧٥ |
| خاوەن بڕوانامەی دکتۆرا | ٣٠ بۆ ٥٠ |

# ژمارەی شەهید و ئەنفالکراوانی نەورۆڵی

پێگە و شــوێنی عەشــیرەتی نەورۆڵی و هەستی نیشتمانپەروەرییان و رادەی رۆشنبیری وای کردووە کە ئەم عەشیرەتە لە شۆڕشەکانی کوردا بەشی شێری هەبێت.

– تێکڕای شــەهیدانی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد لە ســاڵی ١٩٦١ تا راپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١: (٣٢٢ شەهید).

– شەهیدانی کیمیابارانی هەڵەبجە: (٢٩٠ شەهید) لە منداڵ و جوان و پیر و نێر و مێ.
– ئەنفالکراوانی نەورۆڵی: (٧٠ کەس).

داوای لێبوردن ئەکەین ئەگەر ناوی کەســایەتییەک یان بنەماڵەیەکی نەورۆڵیمان نەنووسیبێت یــان لــە یادمان چووبێت، چونکە بە راســتی تۆزێک کارەکەمان پەلە بوو، مەبەستیشــمان بوو لە کتێبەکــەدا هــۆزی نەورۆڵــی لە بیــر نەکرێت و جێی خۆی تیــا بکاتەوە، چونکــە یەکێکە لە هۆزە ناودارەکانی کورد.

مــن لێرەدا گەلێک سوپاســی دوو کەســایەتی ناو تیرەی بەغیرەتــی نەورۆڵی دەکەم کە زۆر زانیاری بەنرخیان پێدام ئەو دوو کەســەش دوو کەســایەتی بواری رۆشــنبیری ئەمڕۆی جاف و کوردیشن:

١ ـ دکتۆر عەبدولوەهاب عەبدوڵڵا چروستانی
٢ ـ ئەندازیار عەبدوڵڵای محەمەد نەورۆڵی

خودا لە چەشنیان لە ناو جاف و کوردا زیاد بکات. دەبڵێ ئینشائەڵڵا.

# تاوەگۆزی

عەلی ئەکبەری وەقایع نیگار، کە بە سادقولمولک ناسرابوو و ئامۆزای شاعیر و مێژوونووسی کورد «مەستوورەی کوردستانی» بووە و نازناوی «ئەفسەر»یشی هەبووە لە سەردەمی ناسرودین شای قاجاریدا ژیاوە، کتاوێکی بە زمانی فارسی نووسیوە بە ناوی «عەشایر و أیلات و طوائف کرد» کە سەرجەم پەنجاو یەک پەڕەیە لە بارەی «تاوەگۆزی» دەڵێت:

ئەم تیرەیە لەسەر سەید دەژمێردرێن و دەگەڕێنەوە سەر پیر خدری شاهۆ، ئەم تیرەیە تیرەیەکی ناسراو و ڕێزلێگیراوە. زۆرتر لە دەوروبەری سلێمانیدا دەژین، هەروەها لە دەوروبەری شارەزووریشدا هەن، بڕێکیان لە ناوچەی جوانڕۆ ماونەتەوە. لەژێر چاودێری حەبیبوڵڵاخانی باوەجانیدان و کوێخاکەیان ناوی (یوسف)ە، لە نێوان چیای ئەلاخوول و پەلکەزکای ناوچەی جوانڕۆدا گەرمیان و کوێستان دەکەن و دەڕۆنە دەڤەری بانی ناز و شێخ سمایلی خانە شۆر و خوالێخۆشبوو مەلا عەبدولڕەحیم ناسراو بە مەولەوی، لەم هۆزەیە، کە یەکێک بووە لە زانیار و شاعیرە بەتواناکانی سەردەمی خۆی و ئێستا. بە فارسیش شیعری جوانی هەیە، شیعرەکانی لە خواجەی شیرازی کەمتر نییە. یان لە ئیمروئولقەیسی عارەب بێ هێزتر نییە، داخەکەم دوو ساڵ لەمەوبەر جیهانی بە جێهێڵا..

ناوی تاوەگۆزی لەوەوە هاتووە، گوایە لە هەوارگەی هاوینان درەختێکی کۆنە ساڵی گوێز هەبووە و سەیدەکانی تاوەگۆزی لەژێر سایەیدا کۆبوونەتەوە، یانی ئەوانەی لەژێر سێبەری درەختی گوێزدا دادەنیشتن، لە نێو ئەم تیرەیەدا زانیار و مەلای بەتوانا هەبووە، وەکو مەلا ئەبوبەکری موسەنیف کە ناسراوی لای هەمووانە. کتێبی (وضوح درفته شافعی) و کتێبی (ریاض الخلود) و (سراج الطریق)، کە لە بارەی دنیای تەسەوف دەدوێ. سەیدەکانی ناسراوی (سابڵاخ) لە نەوەی ئەون و لە دەڤەری (مەریوان)، (سەید حەسەن) ناوێ ناسراوە لە سەیدەکانی تاوەگۆزییە و یەکێکە لە زانا بە تواناکان و لەو دەڤەرەدا قازی و مەلا و لێپرسراوە. ئەم سەیدانە لەسەر هۆزی جاف دەژمێردرێن.



سەید عەبدولڕەحمانی سەید مەحموود
١٩١٨



سەید موحسینی کوڕی سەید عەبدوڵڵای تاوەگۆزی، سەرۆکی ئێستای تاوەگۆزی
کوردستانی ئێراق

## سەرانی عەشیرەتی تاوەکۆزی پاش مەرحومی (مەولەوی):

١- سەید عەبدوڵڵا کوڕی مەولەوی
٢- سەید محەمەد کوڕی سەید عەبدوڵڵا
٣- سەید کاکە ئەحمەد کوڕی سەید عەبدوڵڵا
٤- سەید عەلی کوڕی شێخ محەمەد کوڕی مەولەوی
٥- سەید مەحموود سەید عەلی
٦- سەید فەتاح سەید عەبدوڵڵا
٧- سەید جەمیل سەید عەلی
٨- سەید مستەفا کوڕی سەید عەبدوڵڵا
٩- سەید عەبدولڕەحمان سەید مەحموود سەید عەلی
١٠- سەید جەلال سەید محەمەد سەید عەبدوڵڵا
١١- سەید موحسین سەید محەمەد سەید عەبدوڵڵا

ئەم ناوانەی ئاماژەیان پێکراوە پاش مەرحومی (مەولەوی) تا ئێستا یەک لە دوای یەک سەرۆکایەتی عەشیرەتی تاوەگۆزی (بەشی عیراق)یان بەدەستەوە بووە.

نەخشەی تەواجودی تاوگۆزی

# عەشیرەتی تاوەگۆزی (بەشی ئێران):

لــە (١٧) گونــد پێکهاتووەو عەشــیرەتێکی چالاک و لێهاتوو و ســەرۆکایەتی ئەم عەشــیرەتە بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

١- مەرحوومی کوێخا مەحموود
٢- کوێخا ئەحمەد کوڕی کوێخا مەحموود
٣- کوێخا یوسف برای کوێخا ئەحمەد
٤- کوێخا مستەفا کوڕی کوێخا ئەحمەد
٥- کوێخا یوسفی دووەم کوڕی کوێخا ئەحمەد

لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە و لەبەر چاوە، کوڕ و کوڕەزا و نەوەی مەولەوی بە ســەید ناودەبرێن و گەورەکانی تاوەگۆزی ئێران بە کوێخا ناو دەبرێن، لە کاتێکدا هەردوولا لە بنەچەدا کوڕی یەک باوکن.

ئەم شــەجەرەنامەیە لە لایەن خودی مەولەوییەوە داڕێژراوە و لە لایەن زۆر لە شــێخ و سادات و مەلای سەردەمی خۆیەوە مۆر کراوە..
من وەکو خۆی بڵاوی دەکەمەوە.

# بسم الله الرحمن الرحيم

فنقول- وبالله التوفيق-: وممن فاز بسعادة نسبة السيادة، الاعز الارشد والاعلم الاحلم الامجد، صاحب الشمائل الحميدة، والفضائل الكثيرة العديدة، مدرك المنطوق والمفهوم، جامع المنثور والمنظوم: (**الســيد عبدالرحيم المعروف بالمولوي المتخلــص بالمعدوم**)، عفا عنه القيوم. ولد ذي الرأي السديد والعقل الاكيد: (**السيد سعيد**). غفره مالك يوم الوعيد. ولد المرحوم المنيف: (**الســيد شــريف**). غفره الملك اللطيف. ولد المرحوم المســعود: (**السيد محمود**). رحمه الملك المعبود. ولد المغفور الكامل الايمان: (**الســيد يوســف جان**). غفر له المنان. ولد واصل درجة اليقين: (**السيد جمال الدين**). عفا عنه القوي المتين. ولد البازل جهده في متابعة سيد المرسلين: (**الســيد كمال الدين**). حفه بمغفرته غافر المســتغفرين! ولد منبع العلم والايمان: (**الســيد ملا يوسف جان**). رحمه الملك المنان! ولد صاحب العلوم الباطنة والظاهرة: (**السيد حسن المعروف بملا ابي بكر المصنف**) في الافاق قدس ســره العليم الخلاق. ولد صلب المنور قلبه بنور الله:

(**السـيد هداية الله**). حفه بمغفرة الله. خلف منبع التقى والزهد والايمان: (**السـيد يوسف جان**) من الله تعالى عليه بالرضوان في غرف الجنان. ولد كامل الايقان: (**السيد يعقوب جان**) غفره المنان. ولد مشـرق نور الله: (**السـيد هداية الله**). اعانه بعفوه الله. خلف مركز العرفان: (**السيد محمد جان**). حفه الله تعالى بالاحسـان. ولد مطلع شـمس محبة الله (**السـيد هداية الله**). ولد المرحوم المؤمن: (**السيد حسن**). رحمه ذو المنن لؤلؤ صدف الشرف في العلم والعين، (**شاه حسـين**)، خلف الارشـد المؤتمن: (**السيد حسـن**). من عليه ذو المنن. خلف المرحوم المطهر: (**السـيد جعفر**) غفره الله الاكبر. خلف جامع نعوت المزية والمزيد: (**السـيد ابي يزيد**). عفا عنه يوم الوعيد. خلف شيخ مشايخ الزمان قطب دائرة الدوران: (**السيد محمد زاهد المعروف بپير خضر الشاهوئي**) قدس سره وافيض بره! خلف مرحوم المسعود: (**السيد محمود**) صانه عن الحسـاب الملـك المعبود. ولد المطهر المظفر: (**السـيد جعفر**) غفره اللـه العلي الاكبر. ولد من ارتفع عنه حجاب البين: (**السـيد حسـين**) عفا عنه رب العلمين. ولد المرحوم المسعود: (**السيد محمود**) حفظه يوم الجزاء الملك المعبود! خلف مشـمول نعمة الله: (**السـيد رحمة الله**) رحمه الله! ولد المتصف بالمصابرة على موجب الاسـمى: (**السـيد موسـى**)، حفظه يوم الجزاء عما اسا! خلف رافع حجاب البين: (**السيد حسن**). عفا عنه بعز جده منور المشرقين. ولد الخلى عن العلل: (**السـيد بدل**) المشـهور بالعادل الهادي. خلف المرحوم ذي اللطيفة، المشهور بالخليفة: (**السـيد خلف**)، حشـره في زمرة السلف. ولد مطلع الافضال: (**السيد منذر المعروف بالمنهال**) عفا عنه ذوالجلال والجمال. ولد شمس فلك اليقين: (**السيد تاج الدين**) رحمه رب العالمين. ولد سالك مسالك الدين القيوم: (**السيد عبدالرحيم**) رحمه رب العظيم. خلف ذي المجد والمراسم: (**السـيد قاسـم**) شـفع فيه جده ابو قاسـم. خلف مدرس مدرسـة التقديس: (**السـيد ادريس**) حفظه رب المرؤوس والرئيس. ولد المزكي المهر: (**السـيد جعفر**) رحمة الله عليه وأثابه مما لديـه. ولـد من هو على مدارج حق اليقين مرتقى: (**الامـام على النقي**) خلف الامام التام الوفي الموقـي: (**الامام محمد التقـي**). خلف المتصف بمقام الرضا والارتضاء: (**الامام على موسـى الرضـاء**). ولـد من عجز من عجز مناقبة الناثر والناظم (**الامام موسـى الكاظم**). خلف من هو بالحق ناطق: (**الامام جعفر الصادق**). خلف ذي العرفان الوافر والمجد المتكاثر: (**الامام محمد الباقر**). ولد من هو ملجأ الاسـلام والدين، ومنبع العرفان واليقين: (**الامام زين العابدين**). ولد فلذة كبد نور المشـرقين والمغربين، وقدرة عين سـيد الثقلين، كاشـف الغطاء بنور القلب عن البين، البسط النجيب الحسيب السعيد، الخائف عن يوم الوعيد، مع ما حواه ممن النور المزيد: (**الامام حسين الشهيد**). من صلب امير المؤمنين وامام المتقين، اسد الله الغالب: (**علي ان ابو طالب**). وترائب سـيدة نسـاء العلمين، حازة اعلى درجات القبول: (**فاطمة الزهراء البتول**). ابنة من بظهوره ظهر البهاء والصفاء، ومنه كشـف عن الاعيان غطاء الخفاء، روح الوجود، حبيب المعبود، صاحب المقام المحمود، سيدنا وسندنا، ملاذنا ومعاذنا في معشنا ومعادنا: (**حضرة محمد المصطفى سيد الانبياء (ص)**).

# ناوی گوندەکانی سنووری تاوگۆزی و ژمارەی خێزانیان

## گوندەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان

| ژمارەی ماڵ | ناوی گوند | ژ |
|---|---|---|
| ١٥ | مله رەش | ١ |
| ١٥ | لاقەڵا | ٢ |
| ١٨٠ | قەلاجێ | ٣ |
| ١٠٠ | دۆڵەتا | ٤ |
| ١٥٠ | بانی لوان | ٥ |
| ١٠٠ | بەشی حەمە جان | ٦ |
| ١٠٠ | هۆزی سته | ٧ |
| ١٠٠ | ئالی خانی | ٨ |
| ١٥٠ | بەشی ناو خاس | ٩ |
| ٢٠٠ | رەجەوی | ١٠ |
| ١٥٠ | دسێردی | ١١ |
| ١٠٠ | بەشی کوێخا | ١٢ |
| ٨٠ | درێمی خواروو | ١٣ |
| ٨٠ | درێمی سەروو | ١٤ |
| ١٠٠ | بانی نار | ١٥ |
| ١٠٠ | گەزەنه (بەشی ئەلی وەیس) | ١٦ |
| ٣٠٠ | شێخ سێڵه | ١٧ |

# گوندەکانی باشووری کوردستان (هەرێمی کوردستان)

| ژ | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | سەرتاشەی خواروو | ٢٠٠ |
| ٢ | سەرتاشەی سەروو | ٢١٠ |
| ٣ | پشتقەڵا | ١٠٥ |
| ٤ | بەشی ئەلی | ٨٠ |
| ٥ | زارێن | ٣٠٠ |
| ٦ | مۆرتکە | ٢٢٠ |
| ٧ | بانی بۆڵان | ٩٥ |
| ٨ | قەڵپ | ١٥٠ |
| ٩ | گلیحاڵ | ٤٠٠ |
| ١٠ | پشتە | ٣٠٠ |
| ١١ | کانی وەیسکێ (سەربە تاوگۆزی) | ٩٠ |
| ١٢ | بەڕوێن (سەربە تاوگۆزی) | ١٥٠ |
| ١٣ | گمە | ٢٠٠ |
| ١٤ | کانی ژنان | ٩٠ |
| ١٥ | گەڕاو | ٤٥ |

# مەلای ناو تاوگۆزی

جگە لە مەلا عەبدولڕەحیم، ناسـراو بە «مەولەوی» کە بۆ خۆی یەکێک بووە لە کەڵە شـاعیرانی سەردەمی خۆی و ئێستاش.
مەلای بە توانا لە ناو ئەو تیرە جافەدا زۆر هەڵکەتووە وەک: مەلا عەلی تاوگۆزی، مەلا محەمەدی کوڕی عەلی، مامۆستا مەلا حەسەن، مەلا ئەحمەدی شەریفی...
مـەلا شـەریف کوڕی محەمـەدی کەریم و مەلا جەلالـی کوڕی مەحموودی تاوگۆزی سـەرجەم ئەو ناوانە نازناوی «سـەید»یان پێوەیە و دەگەڕێتەوە سـەر پیرخدری شـاهۆ. ئەم مەسـەلەیە باسـێکی زۆری لەسـەرە و لەبەر ئەوەی (سـەید ئەحمەد بەگی جاف) باپیرەگەورەی بەندەشـە و دەگەڕێتەوە سـەر پیرخدری شـاهۆ، بەڵام سـەیدەکانی تاوگۆزی لە بنەچەوە هەر بە سـەیدی ئاویرانەوە ناسـراون. ئێمە «بەگزادەکانی جاف» ئەوان لە بنەچەکدا دەڕۆنە سـەر یەک بەرەباب بە بێ گومان وایە. ئەوان سەیدن و ئێمە سەید نین، لە سەردەمی حەمە پاشا و مەولەوییەوە هەر وا هاتـووە. بـا ئێمەش لـەوە گەڕێین من لەوەی دڵنیام ڕۆژێک لـە ڕۆژان مێژووی میللەتی کورد دووبارە دەنووسرێتەوە با لێیگەڕێین بۆ ئەو کاتە.

# مەولەوی تاوگۆزی

ڕەنگە دێرزەمان بخایەنێت تا ڕۆژێک لە ڕۆژان دیسان دنیای عیرفان و عالەمی ئەدەبیاتی کوردی شـاعیرێکی کـەی وەک مەولەوی تاوگۆزی تیا هەڵکەوێتەوە. بەندە لـەوەی دوودڵم ئەو ڕووداوە دیسـان ڕووبـدا و میللەتەکـەم دووبارە بێ بە خاوەن شـاعیرێکی کەی لـەو بابەتە. بەندە چۆن لە باوەڕێکدام سـەردەمی پەیامبەران بەسـەرچووە و پەیامبەرێکی ئاسـمانی لە سەردمی ئێمە و ئەوانی داهاتوودا، ڕەنگە مەحاڵ بێتەوە دڵنیام سەردەمی پەیامبەرانی دنیای ئەدەبیاتیش لە وێنەی مەولەوی، نالی، مەحوی، سالم، تایەر بەگ، شێخ ڕەزا، بەسەرچووە..
مەولەوی لە دنیای وردەکاری و فەلسـەفە و عیرفانی ئیلاهیدا تا قووڵایی ئاسـمان ڕۆیشتووە، لە وردەکاری و زەرافەتکاری ئەدەبیدا شـۆڕە سـوارێک بووە، بە تەواوی تواناوە ئەسـپی ڕەسەنی خـۆی تـاو داوە، مەلەوانێـک بووە لـە قووڵایی دەریای بێ بنـدا دوڕ و مەرجانی غەواس ئاسـا وەدەرهێناوە..
پەکو لەو هەموو مەعریفەتە. ئافەرین بۆ عەقڵی پێگەیشـتوو و تێگەیشـتووی ئەو کەڵەشـاعیرە کە چەندە لە دەوروبەر و زەمانی خۆی گوزەراوە. بۆیە ئەو ناوە تا بە ئەوڕۆش بە لای هۆشیارانەوە ناوێکە لەبیرنەچووە. تۆمارێکە ئەزەلی شاد بێت ڕوح و ڕەوانی.

# پەیوەندی پتەوی نێوان مەولەوی و مەحموود پاشای جاف



مەحموود پاشای جاف
١٨٤٦-١٩٢١

**«مەولەوی و مەحموود پاشا»**

لــە نێوان مەحموود پاشــا و مەولەویــدا پەیوەندی و ڕێز و خۆشەویســتییەکی گیانیی بەهێز هەبووە، ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆیانە:

١- مەولەوی شاعیرێکی بەناوبانگ بووە و مەحموود پاشا عاشقی شیعر و ئەدەب بووە.
٢- مەحموود پاشــا هەمیشــە شــانازی بەوە کردووە، کە شــاعیر و زانا و دانایانی وڵات پیاوی بەڕێزی دیوەخانەکەی بن. لەوێدا هەمیشــە وەک کۆڕێکی ئەدەبی بە تایبەتی شــیعر بەسەر زاری هەمووانەوە بووە. دیارە کە مەولەوییش سەردەستەی ئەوان بووە.
٣- مەحموود پاشــا زیاتر لە هەمووان شــاعیرەکانی ســەردەمی ژیانی خۆی شــیعری مەولەوی زۆر کاریان تێکردووە و زۆربەی لەبەر بووە. نازک خەیاڵی مەولەوی هەستی ناسک و بە شیعر ئاودراوی مەحموود پاشای بزواندووە و نەشئەیەکی سۆفییانەی داوەتێ.

٤- مەولـەوی جگـە لەوەی شـاعیرێکی گـەورە بووە، پلەی بـەرزی ئاینی ئەو لە کوردسـتان و وڵاتانی دەوروپشـتدا دەنگی داوەتەوە، مەحموود پاشـا، خۆشـی پیاوێکی ئاینپـەروەر و خاوەن بیروباوەڕێکی پتەوی ئایینی بووە.
٥- مەڵبەند و جێ هەواری هەریەک لە مەحموود پاشا و مەولەوی لەیەکەوە نزیک بوون، یان بڵێین گەلـێ جار هەر پێکەوە بەسـەریان بردووە و ئەوەندەیان یەکتر خۆشویسـتووە، کە نەیانتوانیوە ماوەیەکی دوور و زۆر دووربن لەیەک و لە یەکتری داببڕێن.

ئەمە ئەو هۆیانەی نزیکی و هاوڕێیەتی و هاودەمیی مەولەوی و مەحموود پاشا بوون، بۆ بەڵگە و چەسـپاندنی زیاتری بیروڕاکانمان چەند نامە و شیعرێکی نێوان مەولەوی و مەحموود پاشا بە نموونە دەهێنمەوە- نامەکە شیعرە یاخود بەپەخشان دەستی پێکردووە و ناوبەناو شیعری تێکەڵ کردووە، هەروەها مەحموود پاشـا بۆ پیرۆزی و ڕێزی مەولەوی، نامەکانی مەولەوی وەک خۆی واتا کاغەزەکانی چەسپاندووە بە لاپەڕەکانی کەشکۆڵەکەیەوە و ئەم کارە ڕیزەکارانەی مەحموود پاشا بووە هۆی ئەوەی کە بتوانین خەت و شێوەی نووسینی مەولەوی وەک خۆی ببینین.

لە کاتێکدا کە مەحموود پاشا ماوەیەکی زۆر دووردەکەوێتەوە و لە بەغدا دەمێنێتەوە، مەولەوی زۆر یادی دەکات و ئەم نامەیەی بۆ دەنووسـێت، نامەکە بە پەخشـان دەست پێدەکات و دواییش بە شیعر کۆتایی دێت، مەولەوی نووسیویە:

((ئەوەتەی دووری سـێ نامەی دەردی مەهجووریم نووسـیوە، مەولەوی ڕۆحی فەرمکوویە، ئەی زیائولحەق حسام الدین، هەت دەفتەری سێهەم، لە سێ هەم سوننەتە، نازانم چی بنووسم، بە دووخی فکرت داوی خاوی کام ریس برێسـم، ئەگەر لە دەردی دووری بدوێم، موشـەفقی ئەو لە وێ و من لە کوێم واگیرم بینووسم، قەڵەم قامیش و سۆزی دەروون ئاگرە، لە سووتانی ئەترسم، هەر ئەوەم بۆ ماوە کە زەمان ماوەم بدا بگەمە خزمەت، ئەوەیش ڕێکخستنی بەتۆ ئەکرێ، ئەگینە بـۆ من زەحمەتە، ئەگـەر مەحموود رووی مەرحەمـەت بنوێنێ ئەیاز بەندەگی ئەنوێنێ. مراسـلە نیوەی مواسـیلەیە، بەڵام بەخوا حەواڵە بە قەباڵەیە، زەوقی ڕووبەڕوو شـەوقی گفتوگۆ بە پارچە کاغەزێک کفتوکۆی دانامرێ، ئارەزووی یاری جانی خستمیە گۆرانی:

**جە دووریت دەروون مەوج دەریای هوون**
**مەدوو وەچەودا وەجەستەی زەبوون**
**پایتەختی مەحموود —دارالسلام-ەن**
**منیش کەمێ فام ئەیاز جەلامەن**
**ئەیازت مافاش تەفائول کەردەن**
**سەلامەتی تۆش وەیاد ئاوردەن**
**وەخار و خاشاک مژەی چەسپیدە**
**سەر بەستەن نەرووی سەر چەمەی دیدە**
**وەرنە دجلەی چەم توغیان کەر دەبی**
**تا ئێستا چەند جار بەغداش بردەبی**[١٣]**.**

هەروەها لە کاغەزێکی دیکەدا کە مەولەوی بۆ مەحموود پاشـای نووسیوە هەر هەمان باسی دووری و بـێ ئۆقرەیـی خـۆی دەکات و بە هیوای دیـدار و چاوپێکەوتنەوەیە، لـە نامەکەدا دیار ئەوکاتە مەولەوی لە باخە سووتاوی نزیک هەڵەبجە بووە و مەحموود پاشا لە شەمێرانی زمناکۆ بووە، مەولەوی ئەم نامەیەی لە ساڵی ١٩٢٠–ی هیجریدا نووسیوە و ناردوویە، نامەکە بەم جۆرە بە شیعر و پەخشان نووسراوە:

**«ئەیاز هامراز ناڵە و ئاخ و دوود**
**عەرزش هەن وەخاک ئاستانەی مەحموود**
**ئەر نایدەی تۆ – زمناکۆ- جا کەرد**
**دوودی دڵی من نەگەردوون و یەرد**
**گەر باوەڕ ناکەی لە خودا بترسن**
**هەواڵ لە دیدەی هەراسان پرسن**

بەڵام دەسـەڵات چییە؟! قیمەتی دووری نە بەدەسـت ئێوەیە نە قووەی ئیختیاری ئەم دەروێشە – بێ وەی –یەیە:

**چەرخ ئەمڕەتێنێ بە هەموو لادا**
**ناتوانێ لە خۆی حەسوودی لادا**

گلەیی بێ ئیخلاسییە لەمن، فەرمووە ئەوێ، من ئەمویست عەرزی ئێوەی بکەم، ئێوە پێشدەستیتان فەرموو، با لە رووی گلەییشەوە بێ، باز مژدەی یەکدڵییە:

**ئەگەر تەقدیر لەگەڵ تەدبیر بگونجێ**
**وەها دێم چەخی بەد خواە لێم برەنجێ**
**گەر فەلەک دەستم ئەخا وەسڵی حەبیب**
**من و دەردی بێ نسیبی، یا نسیب!**

کتێبی عەقیدەنامەتان ویسـتبوو، ماڵم لە –باخە سـووتاوە- دڵیشـم وای لێقەوماوە، پیاوێ بنێرن لە – عبداللە–ی کوڕمی وەرگرێ، جاران لە گەشـتی دەشـتاو لە وزەی دیدەنی گشتا بوون. ئێستا شـابازی- زمناکـۆ-م یاخوا پەناهم بە تۆ، زمناکۆ-م لێ بـووە بە کێوی –طور- ئاگرێکی تەجەلی ئەبینم، لەدوور بەو نووره سووتام، بۆیە لە باخە سووتاو- خزاوم.

**ئەگەر مەحموود بۆ دەردی دووری نەک چارەسازێ**
**بە سۆز و نیازی ئەیازی ئێمە هەمراز و دەمسازێ[١٤]»**

لەم نامەیەی خوارەوەشــدا کە مەولەوی بە شــیعر بۆ مەحموود پاشای نووسیوە و پیرەمێرد وەریگێراوەتەوە سەر شێوەی سلێمانی بە روونتر نزیکی و خۆشەویستی ئەم دوو زاتە گەورەیە دەردەکەوێت، شــیعرەکە پەیوەندی بە رووداوێکەوە هەیە، کە پیرەمێرد بەم جۆرە باســی دەکات: «کاغەزێکــی زۆر خۆش و ســەیری مەولــەوی کە لەو بەری زەهــاو-ەوە، ئەگوێزرێتەوە دەوری هەڵەبجە ئەبێ، دەوروپشــتی ســاڵی ١٢٧٤-١٢٧٥- دوای ئەوە کە- محەمەد بەگی کەیخوســرەو بــەگ- یەعنــی- حەمە پاشــای باوکــی مەحموود پاشــا و ئەوانی تــر، ئەکەن بــە قائیمقام، خۆی سەرئێلی بەجێناهێڵێ، وەسمانی خانە ئەکا بە کاربەدەست. وابزانم ئەم وەسمانی خانەیە یا برا یا باوکی دایکە پیرۆزەیە، شــاوەیس برای بووە، مادەی عەزیزی شــاوەیس و کوژرانی حەمە پاشا، تەئریخی-یە. ئەو وەســمانی خانەیە گەلێ بەدکاری و ناهەمواری بۆ خوێشــانی مەولەوی ئەبێ» ئینجا کاغەزەکەی مەولەوی لەم بارەیەوە بۆ مەحموود پاشا نووسراوە:

کێشــی ئەم شیعرەی مەولەوی لە کێشی هەموو شــیعرەکانی تری جیاوازە چونکە سەرەتای دەســتپێکردنی نووســین و شــیعری مەولەوی بە زمانی ئەو بوو و کوردی نەبووە، واتا لەســەر کێشــی دە برگەی شــیعری کوردییەکانی مەولەوی نییە، کە کێشی زۆر باوی فۆلکلۆری کوردییە بەڵکو کێشی عرووز-ی عەرەبییە:

**موهاجیر بووین کە هاتین، خواستی خوا بوو**
**-عەلی-مان دی، خەلافەت بەو درابوو**
**لە تەئسیری محەمەد میری گەورە**
**خەلافەت گەییە سەر -عوسمان- بەدەورە**
**دڵی ساداتی ئێمەی هێندە رەنجان**
**بەهەشتی سەرزەمینمان بوو بە زیندان**
**بە جارێ پێکورەی خۆی خستە سەرکار**
**هەراجی خستە ناو، وەک قاڕی بازار**
**هەموویشی کەوتە دەست شاوەیسی خانە**
**گوریس و پەت، جل و هور و هەمانە**
**موانە و چەورە سانە و بزنە دۆخە**
**لەگەڵ سوورانە، خەرجی مەردە لۆخە**
**هەمووی تەسلیمی ئەحمەد کامەران بوو**
**خلە مالی رەسوولیش ئاشەوان بوو**
**لەهەر شوێنێ بەراوێکیان ئەبینی**
**ئەیانگوت موڵکی باوکمانە یەقینی**
**بە ئیرس هی ئێمەیە ئەم شوێنە هەوارە**
**مەرشی تیا سەربڕیوە خوێنی دیارە**
**کە باوکم گای زیانی لێرەدا کوشت**

**نیشان وابێ، دایکم ورگی تەڕ کرد**
**گەماڵە بازگیش ریخۆڵەی برد**

**غەریب و بێکەس و داماو لە ناوا**
**هەموو رەنج و هیوامان چوو بە ئاوا**
**لە خوا پاڕاینەوە، کاتێ دوعا بوو**
**دوعامان لای خودا گیرابوو چابوو**
**ئیتر بەگزادە نانوێنن لە لای ئەو**
**ستەمگەر رۆژی تاریک بوو وەکو شەو**
**ئەمە سەرپووتی ئەوزاعی غەریبی**
**وەتەن ئاوارەی دەردی بێ نسیبی**
**ئەمە –مەعدوومی-یە عینوانی ئەسڵی**
**بە بەدبەختی هەمیشە دوور لە وەسڵی**

لە راســتیدا باس و بەڵگەنامەی پەیوەندی و خۆشەویســتی مەحموود پاشــای جاف و مەولەوی ئەوەندە زۆرن کە لێرەدا ناتوانین هەمووی باس بکەین، ئەمە جگە لەو بەسەرهات و نوکتە خۆش و پڕمانایانەی لەو ســەردەمەدا روویانداوە و هەریەک لەو دوو پیاوە گەورەیە لایەنێکی بابەتەکە بوون.



سەید عەبدوڵڵای مەولەوی

# تیرەی عەمەڵە

ئـەم تیرەیـە یەکێکن لە تیرە ئازاکانی ناو هۆزی جاف و لەبەر خوو خسـڵەتی پەلاماردەریان ئومەرای جاف، بۆ کۆنترۆڵکردنی ناو هۆزی جاف و قایم و قۆڵکردنی کاروباری ناو هۆز زۆرتر هـەر لـە نزیکی پاشـا و ئومەراکانـی جافدا بوونە و هەمیشـە دەمچەرموانی ئـەم تیرەیە بە لای ئومەرای جافەوە قسـەیان بیسـتراو بووە. دەتوانم بڵێم تیرەی عەمەڵە و هەروەها پشـتماڵەش بە دوو هێزی سەرەکی و دەستوەشێنی ناو جاف ژمێردراون و لەناو تیرەکانی تردا باوەک ژمارەیان لەوان کەمتر بوونە بەڵام حیسابیان بۆ کردوون و مودارات کراون..

لـە کۆنەوە ئەم تیرەیە کەمیان وەک خێڵە کۆچەرییەکانی کەی جاف گەرمیان و کوێسـتانیان کـردووە، زۆرتـر نیشـتەجێ بوونە و لە نزیکی ئومـەرای جافدا وەک هێزێکی سـوارەی چەکدار پەیوەسـتە ئامادەبوونـە، بـەڵام ئەوانەی کۆچـەر بوونە لەژێـر فەرمانی سـەرخێڵەکەیان حاجی محەمەدی حاجی قادری سلێماندا گەرمیان و کوێستانیان کردووە.

**لە راستیدا ئەم تیرەیە دەکرێت بڵێی لە کۆنەوە سێ بەرەباب بوونە:**

١- بەرەبابی جامبازی
٢- بەرەبابی ئاخەوەیسی
٣- هۆزی حەمە

ئەو سێ بەرەبابە خزم و خوێشی یەکترن ئێستا رەنگە لە هەزار و پێنج سەد ماڵ زیاتر بن.
لە ناو ئەم تیرەیەدا دەمڕاسـت و کوڕی ئازایان زۆر تیادا بووە بەڵام لەکۆندا سـەرۆکی ئەم تیرە و دەم سپی ئەم تیرەیە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١- فەتاحی رۆستەم
٢- ئەمینی محەمەد
٣- ئەحمەدی محەمەد ئەمین

لە کیتاوی «تەئریخی جاف»ەکەی کەریم بەگی جافدا لە لاپەڕەی «١٣٧»دا ئەویش ناوی ئەو سیانەی سەرەوەی هێناوە، کەوا لە سەردەمی خۆیدا ئەوانە بەرپرسیاری تیرەی عەمەڵە بوونە.

بـاوەک ئـەم تیرەیە کۆچـەری زۆریان نەبـووە، بەڵام لە گەرمیـان و کوێسـتاندا لە رێچکە رێگەی تیرەی شاترییەوە دەڕۆیشتنە شارەزوور و پێنجوێن و سەرەنجام کوێستانی کوردستانی رۆژهەڵات و لەوێدا لیلاخی تایبەتیان هەبووە و بەناوی (کۆڵ و دوزەخ دەڕە، سی پلکان).

ئێستا ئەم تیرەیە وەک تەواوی تیرەکانی کەی جاف ژیانێکی ئاسوودە و سەردەمییانە دەبەنە

سـەر و ئەورۆ لە ناو تیـرەی عەمەلەدا توێژی خوێندەوار و هەڵگـری بڕوانامەی زانکۆی زۆری تیادایە، من لە نزیکەوە زۆریان دەناسم و هانی بەردەوامی بواری خوێندەوارییان دەدەم.

ئـەم تیرەیـە جگە لـە ئەوانەی بە پێی کاریان ناچارن لە شـارەکانی کوردسـتاندا بەربڵاوبن، زۆرتر لەم جێگە و دەڤەرانەیدا دەژین:

١- کەلار
٢- کوکس
٣- تازەدی
٤- هەسەن محە
٥- دەککە
٦- دەربەندیخان
٧- چەمەرگە
٨- فەقێ جنە
٩- هەڵەبجەی شەهید
١٠- ناحیەی سیروان

**ئەمانەش کەسایەتی ئێستای ئەم تیرەیەن:**

١- زمناکۆ حسەینی فەتاح، ئەورۆ بە براگەورەی ئەم تیرەیە دراوە لە قەڵەم.
٢- محەمەدی ئەحمەدی رۆستەم
٣- عەدنانی کوێخا مەحموود
٤- مەریوان رەشید محەمەد
٥- مەحموود کەریم مەحموود
٦- مەجید عەزیز رۆستەم
٧- عەبدولرەحمان عەلی عەبدولرەحمان
٨- محەمەد مەحموود فەتاح
٩- ئەرکان ئەحمەد فەتاح
١٠- رەشید ئەحمەد حەمە سالْح
١١- حەسەن ئەحمەد ئەمین
١٢- نەجم فەرەج قەیتەران
١٣- محەمەد فەتاح عەبدوڵڵا
١٤- محەمەد عەلی ئەمین سەمین
١٥- محەمەد عەلی گیان
١٦- باقی حاجی ئەحمەد
١٧- موحسین حەمە فەرەج فەتاح
١٨- سوعاد محەمەد ئەمین عەبدولرەحمان

١٩- ئەحمەد حەمە ئەمین حامید
٢٠- محەمەد ئەمین ناو خاسی
٢١- محەمەد ساڵح رەشید
٢٢- فایق ئەحمەد حەمە خان
٢٣- عەبدولڕەحمان فەتاح عەلی
٢٤- ئەحمەد رەشید فەرەج
٢٥- عەبدوڵڵا حەسەن عەبدولڕەحمان
٢٦- محەمەد عەلی فەتاح
٢٧- محەمەد ئەمین ئەحمەد فەتاح
٢٨- مەجید عەزیز رۆستەم
٢٩- شاهۆ محەمەد ئەحمەد



فەتاحی رۆستەم، سەرخێڵی تیرەی عەمەلە



حسین فەتاح رۆستەم



کوێخا ئەمینی حاجی ئەحمەد
١٩٣٤



کوێخا مەحموودی محەمەدی رۆستەم
١٩١٢



حاجی عەلی فەتاح عەلی ئەحمەد



حاجی محەمەدی قادر سلێمان
١٩١٨



کەریم مەحموود قادر
١٩٢٢

# تیرەی وەلی

تیــرەی وەلــی یەکێکە لــە تیرە ســەرەکییەکانی جاف، بە پێــی مەوقیعی جوگرافــی لە تیرەی شــاترییەوە لە تیرەکانــی دیکەی جاف نزیکتر بوونە، ئەو نزیکییــە بووەتە هۆی تێکەڵاوییان و لە زۆربەی رووداو و هات و نەهاتدا پێکەوە بوونە و لە بگرە و بەردەی عەشــایەری و ســازش و پەلاماردا لەســەر یەک حیســابکراون، بەڵام لەم دواییانەدا ژمارەی تیرەی «وەلی» زۆر بووە و هەستی سەربەخۆیی و تاکڕەوی لە ناویاندا پەرەی سەندووە و خۆیان لە تیرەی «شاتری»دا جیا کردۆتەوە و وەک تیرەیەکی ناسراو و سەربەخۆی ناو جاف مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت و مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکەن.

**ناوی وەلی**:

نــاوی ئــەم تیرەیە وەک زۆربەی زۆری تیرەکانی کەی جاف لە ناوی کەســێکەوە هاتووە بێ شک ئەو کەسە کەسێکی دیار و پەنجەی بۆ درێژکراوە و ناسراو بووە یان لە رووی دەسەڵاتەوە یان ئاینەوە.

بۆچــوون زۆرە برێک دەڵێن: ئەم تیرەیە نەوە و نەتیجەی پیاوخاســێک بوونە کاروکردەوەی خواپەرستی و رەوشتی چاک و کردەوەی باش و رەفتاری خاس بووە، ئەو پیاوە رەوشت پەسەند

بووە بە چاوساغی ئەو کۆمەڵە و لێرە و لەوێش خەڵکێکی دیکەی لێ گلێر بووەتەوە و هەر ئەو پیاوە چاکە تەواوی کاروکردەوەی خەڵکەکەی دەوروبەری بردووە بە ڕێگەوە و خێر و شەڕی ئەو کۆمەڵەی بردووە بە ڕێگەوە وشەی «وەلی» بە مانای بەڕێوەبەرە، لام وایە ناوی تیرەی وەلی لە بنەچەدا لە کردەوەی بەڕێوەبەر هاتووە «وەلی ئەمر». لە کوردەواریدا تا توانراوە لە وشە و واژەی قەبەی عارەبی بە گەرووی کورد نەهات دوورکەوتنەوە و هەر «وەلی»یەکەیان بە لاوە باشتر بووە و لە دواییشدا لامەکە وەک هەمیشە بووە بە لامی قەڵەو کە بکاتە «وەڵی».

بڕێک لایان وایە سەرەتای ئەم تیرە لە پیاوێکەوە بووە بە ناوی «وەلید»، بووە بە وەلی و لە دواییشدا بووە بە «وەڵی».

بڕێکی کەش لایان وایە لە پیاوخاسێکەوە ئەم تیرە کەوتنەتەوە و وەلی خودا بووە.

خەڵکێکی کەش وادەزانن تیرەی «وەلی» لە کوڕ و کوڕەزای «وەلی خان» ناوێک پێکهاتوون.

ئەوانە هەموو پێ دەچێت ناوی تیرەی «وەلی» لە یەکێک لەوانەوە هاتووبێت، بەڵام ناوی «وەلی» ناو لە ناو جافدا کەم بیستراوە، جگە لە شاعیری گەورەی کورد «وەلی دێوانە» نەبێت، کە لەو ناوە نراوە، چ لە کۆندا و چ لە تازەشدا، بۆیە زۆرتر پێموایە ناوی ئەو تیرەیە لە «دەمڕاسەکەیانەوە» لە بەڕێوەبەرەکەیانەوە بۆیان ماوەتەوە، ئەوەندەو ئەو بەڕێوەبەرەیان بەلاوە ڕێزدار بووە توخنی ناوە بچووکەکەی نەکەوتوون..

لە ناو کوردەواریدا بۆ ڕێزلێنان ناو زۆر بووە، وەک: پیر سوڵتان، ئاغا، بەگ، میر، سان. پیر بوونەتە پیرزادە و سوڵتان بووە بە سوڵتانی و ئاغا بوونەتە ئاغالەر و بەگ بووەتە بەگزادە. ئیدی هەروا، بۆیە «وەلی ئەمر» بووەتە وەلی و وەلییەکەی بووە بە «وەڵی».

ئەم تیرەی جافە لە یەک جێدا بە کۆمەڵ نەژیاون، هەر لە گەرمیاندا ژیاون، سەلیم بیرک، دزیاییش، فەقێ جنە، وارماوە و باوەنوور، کانی سارد و بڕێک جێگای دیکە.

من وادەزانم تیرەی «وەلی» زۆرتر لەسەر جافی جوانڕۆ دەدرێن لە قەڵەم و خزمایەتییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان وەلەد بەگییەکان و ئەم تیرەدا نمایانە و بەڵگەش بە دەستەوەیە نەک تەنیا لەبەر نزیکی ناوی وەڵەدەبەگی یان وەلید بەگی و ناوی «وەلی» بەڵکو لە بەگزادەکانی کۆنی وەڵەدبەگی بیستراوە، کەوا «وەلی» بەشێکی ڕاستەوخۆی ناو وەڵەدبەگی بوونە و لەبەر چەند هۆیەک ناچاری کۆچی نێو جافی مورادی بوونە.

لە ناو ئەم تیرەیەدا پیاوی ناودار و هەڵکەوتووی زۆری تیا هەڵکەوتووە. لێزانی و دەوڵەمەندی سەخاوەتی «سوورەی نەویجان» کەس ناتوانێت نکوڵی لێ بکات.

لە بارەی ئەم «سوورەی نەویجانە» لە مستەفا بەگی خاڵۆم بیستووە دەیوت: لە کەریم بەگی باوکی بیستووە کە دەیفەرموو: لە خزمەت مەحموود پاشای مامىدا بووم لە شارەزوور، بەرەو گەرمیان دەهاتین، سەد سوارێک دەبووین، عەسرێکی درەنگ بوو لە پاشایان پرسی: قوربان بۆ شەو هەوارگەمان لە کوێیە؟

پاشـــا فەرمووی: خێڵی «ســـوورەی نەویجان» لە پێشمانەوەیە، یەکێ: لە سوارەکان گورج لە پێشەوە بڕوات بێژێت ئەمشەو میوانی ئەوین..»

پاشـــا و هاوڕێیانـــی دەگەنـــە هەوارگەی «ســـووری نەویجـــان» و خێڵ و ســـەرخێڵ دەڕۆنە پیریانـــەوە، دەمـــە و ئێوارە دەبێت پەلەپەل و فـــڕکان فڕکێی ژن و زار و تەپودووکەڵی ئاگر خوان وەدی ناکرێـــت، یەکێـــک لە پیاوەکانی پاشـــا دەکەوێتـــە ئەملاوئەولا تا بـــۆی دەردەکەوێ لە دۆڵی بندەســـتیاندا چەندین قازانی زنجیر لە مل ریزکراوە و ئاگر لە ژێریاندا و دووکەڵیشـــی لێوە وەدەر نایەت. ئەو دەم بۆی دەردەکەوێت تەواوی ئاگری ئەو قازانە بە توێکڵە گوێز لێنراون. بۆ ئاگاداری خوێنەران، ئاگری توێکڵە گوێز دووکەڵی نییە و بۆ ڕێزلێنان لە پاشا تاوەکو دووکەڵ بەرز نەبێتەوە هەر بە توێکڵە گوێز ئاگرەکەیان کردووەتەوە. داخۆ دەبێت چەند فەردە گوێزیان ســـووتاندبێت تا ئەو چێشتە و خوانە لێنرابێت».

هـــەر لـــە کۆنەوە ژمارەی مـــەلا و فەقێ و خوێندەواری لە ناو تیـــرەی «وەڵی»دا لە تیرەکانی جـــاف زۆرتـــر بووە، ئەگەر ژمارەیـــان لە نەزەردا بگرێـــت هەتاوەکو لەم سەردەمەشـــدا هەڵگری بەڵگەنامەی زانکۆیان زۆر تیادایە لە دوکتۆراوە بگرە تا پلەکانی کەی خوێندەواری.

## بڕێک لە پیاوە ناودارەکانی ناو تیرەی وەڵی:

١- سوورەی نەویجان
٢- ئەڵماس پەخە
٣- مەلا قادری سۆفی
٤- مەلا حەسەنی هورینی
٥- مەلا محەمەدی کاکەوڵا ڕەسول
٦- مەلا ساڵحی عەبدولقادری محەمەد
٧- مەلا قادری حەمەی ئەحمەد
٨- مەلا ماجیدی پونگڵە
٩- مەلا سمایلی ئیبراهیم
١٠- مەلا مەحموودی کانی ساردی
١١- حاجی کاکەوڵا
١٢- حەسەن سەمین سەبە
١٣- حاجی کاکەوڵا محەمەدی ئەحمەد
١٤- محەمەدی عەلی سان ئەحمەد
١٥- حاجی کاکە عەلی محەمەد ئەحمەد

١٦- حاجی عارف شاتوانی
١٧- کوێخا ئەحمەد محەمەدی سمایل
١٨- حاجی حەمە فەرەجی دێوانە
١٩- حاجی کەریمی محەمەدی سمایل
٢٠- حاجی عەلی جاف
٢١- حاجی عەبدوڵڵای جەراح
٢٢- عەلی کەریم مەحموود پەریزاد
٢٣- مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی «ئەبو سەرباز»
٢٤- حاجی محەمەدی ئەمین
٢٥- حوسەینی عەبدوڵڵای عەزیز
٢٦- حاجی حەسەنی لالە مارف
٢٧- عەلی حاجی کەریم محەمەد
٢٨- مەلا ئەسعەدی بانیخێلانی
٢٩- حەمەی ئەحمەدی محەمەد
٣٠- حاجی حوسێن قادر مارف
٣١- حاجی مەحموودی محەمەد زۆراب
٣٢- حاجی قادری ساڵح مەحموود
٣٣- عەبدوڵڵای حاجی مەحموود
٣٤- حەمەی عەبدوڵڕەحمان
٣٥- د. ئەنوەر جاف

**ئەمەش ناوی بڕێک لە مەلا ناسراوەکانی ناو تیرەی «وەڵی»یە:**

١- مەلا قادری سۆفی
٢- مەلا محەمەدی گوڵان
٣- مەلا قادری دێوانە
٤- مەلا مەجیدی بونگلە
٥- مەلا قادری عەربەت
٦- مەلا ساڵحی ژاڵەناو
٧- مەلا حەسەنی هوریی
٨- مەلا سمایلی ئیبراهیم
٩- مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی
١٠- مەلا مەحموودی کانی سارد
١١- مەلا ئەسعەدی بانیخێلانی

١٢- مەلا مەحموودی ساڵحی هورینی
١٣- مەلا عادل
١٤- مەلا عارفی نادر
١٥- مەلا رەشید
١٦- مەلا نووری مەلا حەسەن
١٧- مەلا قادری ژاڵەناو
١٨- مەلا عەلی
١٩- مەلا فەتحوڵڵا
٢٠- مەلا قادر
٢١- مەلا حوسەین

(داوای لێبوردن لەو مەلا بەڕێزانە دەکەم کەوا ناویان لە ناو ئەو لیستەدا نەهاتووە، بە تەئکید هیچ لە پلە و پایەی مەلایەتییان و کەسایەتییان کەم ناکاتەوە).

ئەوی روونە دنیای ئەمڕۆ لەگەڵ دوێنێدا جیاوازە و شـێوەی تێفکرین گۆڕاوە و وەک ئەوسـا خوێندن و رۆشـنبیری تەنیا مزگەوت و خانەقا نییە و خەڵکەکە منداڵەکانیان دەنێرنە قوتابخانە و ئەوسـا ئەم تیرەیە بە گوێرەی ژمارەیان هەڵگری بڕوانامەی زانکۆیان لە تەواوی تیرەکانی کەی جاف زۆرترە تا بە مێژووی ٢٠٠٨ز.

هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا هەشت دانەن.
هەڵگری ماستەر چوار کەس.
پزیشک دە کەس.
ئەندازیار دە کەس.
بەکالوریۆسی جۆراوجۆر سیازدە کەس.

ئەوە ماوەتەوە بڵێم، لە ناو ئەم تیرەیەدا کەسانێک هەڵکەوتوون دژ بە زوڵم و زۆر، بێ دەنگ نەبوونە و هەتاوەکو لە سـەردەمی پاشایەتیشـدا بیروڕای چەپگەرایی لە ناویاندا بە دی کراوە و لە سـەردەمی شۆڕشـی نەتەوایەتیشدا شەهیدی سەرکردە و شەهیدی پێشـمەرگەیان زۆر تیادا هەڵکەوتووە.

لێرەدا سوپاسی ئەو کەسانە دەکەم کە بە تەنگی تیرەی خۆیانەوە هاتن و وەڵامی پرسیارەکانی ئێمەیان داوەتەوە و ئەو وەڵامانە من وەک خۆی دەیکەمە پاشوەندی بۆچوونەکەی خۆم و ئەگەر هەڵەشی تیا بێت راستی ناکەمەوە، ئەوە بۆچوونی نووسەرەکەیەتی.

## چەند مەلایەکی بەناوبانگی تیرەی وەڵی:



مەلا قادری سۆفی
١٩٥٣-١٨٦٧



مەلا حەسەنی هورینی
١٩٧١-١٨٨٤



مەلا مەحموودی کاکەوڵا
١٩٩٢-١٨٩٦



مەلا ساڵحی عەبدولقادر
١٣٣٤ک-١٩٨٦ز



مەلا قادر محەمەد ئەحمەد
١٩١٠-١٩٦٨



مەلا مەجیدی بونگلە
١٩١٥-١٩٩٠



مەلا سمایل ئیبراهیم
١٩٢٩-٢٠١٠



شەهید
مەلا مەحموود کانی ساردی
١٩٣٤-١٩٩٧
لە ئازاییدا کەم وێنەبوو، بۆخۆم دەمناسی



مەلا ئەسعەدی بانیخێڵانی
١٩٢٧-١٩٩٨
مەلایەکی هۆشیار و خوێندەوار و ئگاداری ژیان و ژین و دەروبەر، بۆخۆم لەگەڵیدا زۆر رووەوە دواوم، ئەشهەدو بیللا بە سەواد بوو.

# چەند کەسایەتییەکی تیرەی وەلی



حاجی کاکەوڵا محەمەد ئەحمەد
ئەم پیاوە پیاوچاک سەخاوەتمەند خۆشەویستی لای دۆست و ئەحباب بووە.



حاجی عارف شاتوانی
١٩٠٢-١٩٦٦



کوێخا ئەحمەد محەمەد سمایل
١٩٠٤-١٩٦٤



حاجی کەریم محەمەد سمایل
١٩٠٧-١٩٨٨



عەلی حادجی کەریم سمایل
١٩٣٩-٢٠٠٠




حاجی مەحموودی پەخە



حەمەی ئەحمەدی سمایل
٢٠٠٢-١٩٤٣



حاجی عەبدوڵڵای حسێن پیروەیس
٢٠٠٥-١٩١٢
لێزان و جەراحی کوردەواری



عەبدوڵڵای حاجی مەحموود
١٩٧٨-١٩٣٥



ئەحمەدی حاجی مەحموود
١٩٤٩-١٩٠٠



حاجی حەسەن سەمین سەپە
١٩٨٤-١٨٩٢



حاجی کاکەوڵای محەمەد ئەحمەد
١٩٧٨-١٨٩٤



محەمەد عەلی سان ئەحمەد
١٩٨٧-١٩٠٠



حاجی حەمە فەرەجی دیوانە
١٩٧٤-١٩٠٧



حاجی عەلی جاف
٢٠٠٧-١٩١٤



عەلی کەریم مەحموود
٢٠٠٤-١٩١٧



شەهید مام ئەسکەندەر
١٩٨٨-١٩٣٠



مەجیدی حەمەی رەسول
١٩٨٣-١٩٢٧



حاجی محەمەدی ئەمین
١٩٩٣-١٩٣٨



حاجی قادری ساڵح
١٩٨٦-١٩١٨



حاجی قادری ساڵح مەحموود
١٩٩١-١٩١٣



عەبدوڵڵای حاجی مەحموود
١٩٧٨-١٩٣٥



حوسێن عەبدوڵڵا عەزیز
٢٠٠٥-١٩٢٧



حاجی حەسەن لالە مارف
٢٠٠٧-١٩٣٧



شەهید محەمەدی عەبدولڕەحمان
١٩٣٠-١٩٧٤



ئەحمەد محەمەد سمایل
١٩٠٤-١٩٦٤



حاجی کاکەوڵا ڕەسول
١٨٦٨-١٩٥٦

## چەند ناوێکی ناسراوی ئەوسای تیرەی وەلی

١- سوورەی نەویجان
٢- عەبدولقاتدری محەمەدی خوابەخش
٣- سۆفی عەبدولکەریم محەمەد
٤- ئەلماسی محەمەد زۆراو
٥- ئەحمەدی حاجی مەحموود زۆراو
٦- فەقێ مەحموودی حەمە وەیس
٧- حاجی محەمەدی عەلی مەینا
٨- فەتاح قادر
٩- محەمەد رەسول
١٠- حەسەن محەمەد تەیمس
١١- محەمەد خوسرەو
١٢- حاجی غەفوور محەمەد
١٣- حسێن محەمەد رۆستەمک
١٤- حاجی سالّح مەحمووود جامە
١٥- ئەحمەدی دەروێش قادر
١٦- قادری ئەلماس پەخە
١٧- هەسەنی پیروەیس خانی

## چەند کەسایەتییەکی ئێستای تیرەی وەلی

١- دارا عەبدولقادر محەمەد خوابەخش. وەلییەکان بە براگەورەی خۆیان داناوە.
٢- روبیتەنی حاجی رەشید
٣- مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی، کە بە کەسایەتییەکی ناسراوی سەرتاسەری ئێراق دەژمێردرێت و یەکێکە لە سیاسییە ناسراوەکانی دونیای ئەمڕۆی سیاسەتی وڵاتی ئێراق.
٤- کوێخا محەمەدی فەتاح

٥- حاجی عەبدوڵڵای عەبدولکەریم رەحمان
٦- سەعیدی کاکی
٧- ئەحمەدی عەلی حوسێن
٨- حاجی ئەشرەفی مەجید
٩- حەسەنی محەمەدی عەلی
١٠- مەلا عەلی ساڵح شەریف
١١- مەلا حەمە ساڵحی هورینی
١٢- مەلا رەشیدی حاجی کاکە عەلی
١٣- مەحموودی کوێخا کەریم
١٤- تۆفیق ئەحمەد جوامێر
١٥- ئیبراهیم مستەفا ساڵح
١٦- مەلا حەمە نەجم حەسەن

برێک لە برادەرانی تیرەی «وەلی» زەحمەتیان کێشا و هاوکارییان کردم، لێرەدا سوپاسگوزاریانم ئومێدەوارم نموونەیان زۆربێت.

١- کاک دارا عەبدولقادر
٢- مەحموودی حاجی کەریم
٣- مەلا سمایل ئیبراهیم
٤- کاک خەلیل عەبدوڵڵا حاجی مەحموود

# تیرەی تیلەکۆ

عەلی ئەکبەری وەقایع نیگار دەڵێت:

ئەم تیرەیە دووسەد ساڵ لەمەوبەر لە نێوان کەرکووک و بەغدادا دەژیان و هاتوونەتە دیوی ئێران (ئەم باسە سەدوبیست ساڵە نووسراوە، دووسەدیش بخەینە سەر، یانی ۳۲۰ ساڵ لەمەوبەر بە قسەی خوالێخۆشبوو «وەقایع نیگار» گەڕاونەتەوە کوردستانی رۆژئاوا و لە باشماخدا نیشتەجێ بوونە و ئێستا خاوەنی بیست و سێ گوندن، دووسەد خێزانیان بەرەو «بانە» رۆیشتوون و لە «دەشتە تاڵ»دا گیرساونەتەوە، پەنجا خێزانیان لە خورخورەدا نیشتەجێ بوونە و سێ سەد خێزانیان لە ناو جاف دان و ئێستا زۆرتر لە سێ هەزار کەسیان لە باشماخدایە و هاوینان دەڕۆنە «هوبەتو»، هۆزێکی ئازا و سەخی و مێوان نوازن، خوالێخۆشبوو «عەزیز خانی سەردار کول» ژنی لێهێناون موقەرەبولخاقان سەیفوڵلاخان زادەی ئەو پەیوەندییەیە.

کوێخایان زۆرە، بەڵام سەرۆکی هەموویان «حەسەن بەگە» کوڕی محەمەدی بەگە، ئەو محەمەد بەگە هاوەڵ و رەفیقی کەریم خانی زەند بووە و پەیوەندی برایەتی لەگەڵدا بەستووە، رۆژگارێک پێکەوە رێگرییان کردووە (دیارە نووسەر یا لەبەر زەڕ یا زۆری دەسەڵاتی قاجارییەکان وا دەڵێت. نووسەر)، کە کەریم خان دەگاتە دەسەڵات خوسرەو خانی والی کوردستان لادەبات، بەڵام چاوساقان پێشنیاز دەکەن کە خوسرەو خان بگەڕێتەوە، کەریم خان دەڵێت: گەڕانەوەی خوسرەو خان بەستەگی بەڕاو بیری «خاڵۆ محەمەد بەگە». خاڵۆ محەمەد بەگ بڕیاری گەڕانەوەی دەدات، ناوی ئەم تیرەیە «تیلەکۆ» نەزانراوە لە چییەوە هاتووە.

ئەم تیرەیە یەکێکی دیکەی تیرەکانی جافە، لە کوردستانی باشووردا زۆر نین، بەڵکو زۆرینەی ئەم تیرەیە لە کوردستانی رۆژهەڵاتدا نیشتەجێن، لە دەڤەری خورخورە و باشماخدا بڵاوبوونەتەوە..

پەیوەندی ئەم تیرەیە لەگەڵ روغزایی و تەرخانیدا زۆر پتەوە و قووڵە، زۆریان لە شارەدێی شێروانەدا نیشتەجێن. رەشیدی حاجی مشیر، یەکێکە لەدەم چەرموانی ئەم تیرەیە.

# تایفەی سمایل عوزێری

وەقایع نیگار دەڵێت:

لە سـەردەمی شاهەنشاهی شای خوالێخۆشـبوو خواوەند بەرگی تیشکی لەبەرکا «مەبەستی فەتح عەلی شـای قاجار»ە دووهەمین شای زنجیرە دەسەڵاتی قاجارییە، خوالێخۆشبوو ئەمانوڵڵا خان (مەبەسـتی ئەمانوڵلا خانی ئەردەلانە) کە لەو دەمەوە تا ئێسـتا هەشتا ساڵ تێپەڕیوە، تیرەی سـمایل عوزێری لە دەوروبەری بەغداوە هاتوونەتە کوردستان و لە سەردەمی «محەمەد شا»ی باوکی ناسرودین شادا ئەو تیرەیە لە ناو هۆزی جافدا نیشتەجێ بوونە و جگە لە سەد ماڵیان، کە لە ئێراندا ماونەتەوە چوار سەد خێزانیان بەرەو خاکی عوسمانی ڕۆیشتوون و دەوروبەری پەنجا خێزانیان بەرەو گروس کۆچیان کردووە و نزیکەی سێ خێزانیان لە «هوبەتو»دا نیشتەجێن.

لەبـەر ئـەوەی ئەوانە لـە نەتەوەی سـمایلی کوڕی عوزێر بوونـە، هەر بەو نـاوەوە ناویان دەرکردووە.



سمایلی کوڕی عەزیز

# تیرەی سەدانی

یەکێکە لە تیرە ناسـراوەکانی هۆزی جاف، دەبنە سـێ بەشـەوە، لە حەفتا ساڵ لەمەوبەرەوە دەستبەرداری ژیانی رەوەندی بوونە و دابەشی جێگە و شوێنی جۆراوجۆر بوونە.

١- بەرەبابی سەید مورادی
٢- بەرەبابی ناودێری
٣- بەرەبابی سەدانی

بەشـێکیان لـە ناحیەی قورەتودا نیشـتەجێن، برێکی دیکەیان لە ناحیـەی خورماڵ دەژین، لە دێهاتەکانی: شیرمەڕ، گیلەک، شێخ موسا، لوسینان، چەقەڵاوە دەژین.

## پیاوە ناودارەکانیان:

١- خوسرەوی مچە
٢- عەبدوڵڵای رۆستەمی حەسەن

لـە کاتـی خۆیـدا ئەم تیرەیە یەکێـک بووە لە تیـرە گەورەکانی جاف، بەڵام لەبـەر ئەوەی لە تیرەکانی کەی جافدا زۆرتر نیشتەجێ بوونە، بەرەبەرە کەم بوونەتەوە و کەوتوونەتە ناو تیرەکانی کەی جاف و غەیرە جاف.
لە سەرچاوەی عارەبی و فارسیدا تیرەی «سەدانی» بە ناوی «زیائودینی» ناو دەبرێن.

# ناوی جوانڕۆ

لەم رووەوە زۆر وتراوە:

جاوانە، جاوان، جاپان، شاهویە، گەنجەویە، ئالانی، ئەهلانی، کلاش، جاوان رود، جافان رود و جوانڕۆ. تاکو ئەمڕۆ شارەدێیەک لە دامێنی چیای ئەلبورزی نزیکی شاری تارانی پایتەختی ئێران هەیە بە ناوی (جافان)ەوە.

لە کتابی (نزهة القلوب)دا هاتووە دەڵێت:

شـارۆچکەیەکە لـە کوردسـتاندا، ئاووهەوایەکی شـیاو و پەسـەندی هەیـە دار و درەخت و کشتوکاڵ و لەوەڕگای زۆری تێدایە و هەروەها پڕە لە نێچیر و مەڕ و بەرانی کێوی..

لە کتابی شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسیدا جوانڕۆی بە ناوی (ئالانی) ناوبردووە.

چەندیـن بیـروڕای ناوچەییش لـەم رووەوە وتراوە، بەندە بە بۆچوونێکـی عامییانەی دەزانم وەک:

گوایـە، یەکێـک لـە فەرمانڕەوایانی ئەو دەڤـەرە دژی پیری و پەککەوتن بووە و شـانازی بە گەنجێتییەوە کردووە و پەیوەسـتە ناویان بە (جەوان) یانی گەنج و هەرزەکار و بە جوانە مەرگی دەمرێت، لەبەر ئەوەی خۆشەویست بووە شیوەنیان بۆ کردووە بە (جەوان رۆ) ناویان بردووە و ئیـدی ئەو نـاوە ماوەتەوە بۆ ئەو دەڤەرە برێکی تر لای وایە ئەو ناوە لە رووباری «گاو» قوری قـڵاوە هاتووە کە لـەو دەڤەرەیدا کە رووبارێکی یەکجار جـوان و دیمەندارە کە بووە بە (جەوان رود)، بیرۆکەیەکی دیکە بە پێچەوانەوە دەڵێت:

شەڕێک لە ملە پڵنگانەدا رویداوە، شەڕکەر و گەنج و جەوانانی زۆری تێدا کوژراوە، شیوەنیان بۆ کوڕە گەنج و جەوانان کردووە، (جوان رۆ جوان رۆ) ئەو ناوە ماوەتەوە.

برێکی تر ئەو ناوەیان هەڵگەڕاندۆتەوە و هەسـتی ململانێ لە دەروونیاندا زاڵتر بووە بەسـەر سەرشۆڕکردن و تەسلیمبووندا، لە جیاتی ئەوەی بڵێن (جوان رۆ. دەڵێن جوان نەڕۆیی) یانی نابێت شیوەن و رۆڵەڕۆ بۆ گەنجان بکرێت.

# جوانڕۆ و بەگزادەکانی جوانڕۆ

بەگزادەکانی جوانڕۆ ناسـراون بە ڕۆسـتەم بەگـی، عادەتەن مەقامی (وەکیل) و دەسـەڵاتی وەکیـل بوونی جوانڕۆ و ناوچە و خێڵەکانـی دەوروبەری کە زۆربەی زۆری لە هۆزی (جاف)ن، ئەم بنەماڵەیە دەم سـپی و دەستڕۆیشتوو بوونە لە سەرتاسەری دەڤەرەکانی جوانڕۆدا. ناوچەی جوانڕۆ و هەوارگەی (ڕۆسـتەم بەگی) لە ڕۆژهەڵاتیەوە زنجیرە چیای شـاهۆیە و لە باکوورەوە پاوەیـە و هەورامان لە باشـوورەوە. هاوسـێی هەوارگەی وەڵەدبەگییەکانن و لە ڕۆژئاواشـەوە تیرەی قواپین. لە بنەچەکدا کوڕی یەک باوکن..

# تیرەکانی دەڤەری جوانڕۆ:

١. **زەردویـی**: ئەم تیرەیە یەکێکە لە تیرە بە دەسـەڵاتەکانی ناوچـەی جوانڕۆ، کە بە چوار بەش ناسراون.

أ- ساتیاری ب- ڕەوایی ج- شاقوبادی د- کواندکرند، یان کەمانگەر.

ئـەم تیرەیـە ناوچە و خەڵکێکی زۆری بەو ناوە دەناسـرێن، زسـتانان بەسـەر سـیروانەوە دەژین، لە هاوین لە (تین و زەردویی)دا ئاژەڵداری دەکەن. بەرەبابی شـاقوبادییەکان لە جوانڕۆدا زۆرتر نیشتەجێن-سـاتیارەکان هەر بەو ناوەوە ناو دەبرێن، لە رابوردوودا تا سەریاسی و پاوی دەڕۆیشتن و لە سەردەمی دەسەڵاتی سەفەویدا تا قەڵا شاهین و لە زەهاودا دەکشانەوە خوارەوە، ناوی قەڵاهین لە کۆندا بە (زەردویی) دەناسرا.

زەردویەکان بە یەکەمین تیرەی جاف دەژمێردرێن کە لە ناو شـاری کرماشـاندا نیشـتەجێ بوونە لە بواری بازرگانیدا دەستبەکار بوونە بە تایبەت بازرگانی وشکە بار و خوری و کەتیرە..

لە شـــەڕەکانی مەشــرووتییەدا زەردویەکان کاری خێر و یارمەتیدانی لێقەوماوانیان کردبووە پیشـــە و لەو شـــەڕەدا (وەکیلی جوانڕۆ عەبدولکەریـــم خان) کوژراوە، زەردویـــەکان تەرمەکەیان گەڕاندۆتەوە جوانڕۆ. زەردویەکان لە چوار هەزار خێزان کەمتر نین.

٢. **تیرەی کوری**: ناسراون بە سەیدەکانی کاکەجانە، لە دەوروبەری جوانڕۆدا دەژین.

٣. **تیرەی کۆکۆی**: بەسەر لێواری سنووری جوانڕۆدا دەژین.

ویستیان دەستدرێژی بکەنە سەر زەویوزاری ئیناخییەکان، بوو بە شەڕێکی قورس لە نێوانیاندا، ناچارکران لە سیروان بپەڕنەوە و لە شارەزوردا نیشتەجێ بن، لە هەردوو لای سیروان بە جێگە و شوێنی هۆزی جاف دەژمێردرا و تا بە ئێستاش هەروایە.

٤. **تیرەی ئیمامی**: ئەم تیرەیە یەکێکە لە تیرە گرنگەکانی نێو هۆزی جاف و بە تیرەیەکی ئازا و راســتگۆ لە ناو دوور و نزیکدا دەناســرێن، زۆرتر لەگەڵ ئیناخییەکاندا تێکەڵاون کاتێک حەبیبوڵڵا خـــان باوەجانی «نیزامولولایە» ویســـتی یەکێتی لە نێوان جافی جوانـــڕۆدا پێکبهێنێت (فاتمەخانی کچـــی محەمەد خان بەگـــی) ئیمامی هێنا کە ئەو دەم محەمەد خان بەگ ســـەرۆکی تیرەی ئیمامی جاف بووە.

عوســـمان بەگی ئیمامی باوکی محەمەد خان بەگی ئیمامی ســـەرۆکی ئیمامییەکان بووە و بە (ئیبل بەگ) ناسراوە، عوسمان بەگ لە لایەن (رەزا خان رەزا شای پەهلەوی) وەک زۆربەی زۆری سەرۆک عەشایەرەکانی کورد گیراوە و لە زیندانی قەسری قەجەردا مردووە. ئیمامییەکان زۆرتر بـــە ئاژەڵدارییەوە خەریکن، بەناچار لەبەر ئاژەڵەکانیان بە دوای لەوەڕدا گەرمیان و کوێســـتانیان کـــردووە، بـــەڵام لەم دوادوایانـــەدا نیشـــتەجێ بوونە (لەناو ئـــەم تیرەیەدا چەندان ریش ســـپی و دەمڕاســـت هەبـــووە تەنیا لـــە رووداوەکاندا کە پەیوەنـــدی بە دەمارگرژی تیرەیـــی یان هۆزییەوە هەبوایـــە دەچوونە ژێر فەرمانی ســـەرۆکی عێلەوە ئەگینا برێـــک لەوانە خۆیان لە کار و کردەوەدا بە سەربەخۆ زانیوە.

ئـــەم تیرەیە هاوینان دەڕۆیشـــتنە (لاران، مێگوری و لە زســـتاندا دەڕۆنـــە دورولە و لاوەران) ئەوسا لەسەر یەزدانبەخشی دەژمێردران.

٥. **تیرەی مەحموود باوەیسی**: لە شوانکارە و دەوروبەریداماڵداری دەکەن

٦. **تیرەی قشتەیی**: سەرەتا لە جوانڕۆدا بوونە بەڵام لەپێش ئەوەدا لە شارەزوورەوە هاتوون زۆرتر لە تایشەییەوە نزیکن.

٧. **تیرەی سۆفیان**: لە شمشێردا دەژین بە کشتوکاڵ و باخدارییەوە سەرگەرمن. ئەمانەش برێک لە دێهاتی جوانڕۆن کە لە مێژدا یا بە موڵکی یا بە شـێوەیەکی تر سـەر بە بەگزادەکانی جوانڕۆی بـووە وەک زیران سـپی ور، پەیوەندی سـەروو و پەیوەنـدی خواروو، نـووەل، نوخان، بزورە، قوری قەڵا، شـوانکارە، تازەئاوا، ئایشـەدول، بیاشوش،سەرفی ئاباد، چەمەمیران، بیلەیی، دەهۆپی سـەر و خواروو، شـرووتیە، هۆزی سـەردموراد، بیولە، وەیاری، یوسف خانی سەرەوە، یوسف خانی خوارەوە، قولی جان، دەرەدۆڵ، کولە، تاریکە، عەلی ئابادی کونە، مسـەندەر، کانی گەوهەر ساروخان، خۆش مەکانی سەروو، تەپە ڤۆر، ترکەپان، سەروو.
تەواوی ئەو دێهاتانە سەر بە قەڵای جوانڕۆ بوونە و سەر بە هۆزی جوانڕۆ بوونە.

ڕۆسـتەم بەگییـەکان بـە کۆڵەکـەی راسـتەقینەی دەڤەری جوانـڕۆ دەژمێردران لـە مێژەوە نەیانتوانیوە بچنە ژێر باری زوڵم و زۆرەوە. لە سـەردەمی دەسەڵاتی ئەردەڵانەکانەوە کە (قەڵای جوانڕۆ) کراوەتە شـوێن و جێگای فەرمانداری دەسـەڵاتی ئەردەڵان، عەبدوڵڵا بەگی جوانڕۆ کە ئـەودەم وەکیلی وەخت بووە و (محەمەد سـادق خانی ئەردەڵان)یش ئـەودەم فەرمانداری قەڵای جوانڕۆ بووە.

عەبدوڵا بەگ بەرهەڵسـتی هەڵسـاوە و محەمەد سـاق خان بە توانای ئەردەڵانەوە براکانی بە کۆت و زنجیرەوە دەنێرێت بۆ شـاری سـنە بۆ لای ئەمانوڵڵاخانی باوکی کە ئەودەم والی (سـنە) بووە.

دیـارە ناکۆکـی نێـوان بنەماڵـەی ئەردەلان دووچـاری عەبدوڵـڵا بەگ بووە، کاتێک دەسـت ڕۆیشتوانی ناو بنەماڵەی ئەرەڵان بەسەریەکدا سەردەکەون، ئەودەم لایەنگرانی دوولاش تووشی دەردەسـەری هاتـوون، لـەو بگـرە و بەردەیەدا مەلا و شـێخان و ناسـراوان دەکەونە تەقەللای بەرەڵڵاکردنـی عەبدوڵڵا بەگەوە. بە کەفالەتی ئـەوان بەڕەڵڵا دەکرێت، کە ئامانوڵڵاخانی ئەردەڵان دەمرێت هۆزەکانی جاف، دژ بە دەسەڵاتی ئەردەڵان دەست دەدەنە چەک و ململانێ، لەو هەرایەدا محەمەد سادق خانی ئەردەلان لە فەرمانڕەوایی لادەبرێت، ١٣٤١ک، بەڵام لە ساڵی ١٣٤٦ دووبارە دەکرێتـەوە فەرمانـداری جوانڕۆ، ئەمجارە دەکەوێتە دڵدانـەوەی لایەنگیرانی عەبدوڵڵا بەگ بەڵام غەفار بەگی کوڕی عەبدوڵڵا بەگ دەتوانێت کاروباری عەشایەرەکە بە چاکی بەڕێوەببات.

# غەفار بەگی وەکیل:

دوای مردنی باوکی لەبەر ئەوەی وەک باوکی دووچاری فێڵ و فەنی ئەردەڵانییەکان نەبێتەوە، لە قەڵای جوانڕۆوە دەرچوو، تەنیا بۆ کاروباری خێڵ دەڕۆیشـتنە قەڵا و خەڵکەکە تێکڕا لە دام و دەستگای ئەردەلانییەکان ناڕازی و داخ لە دڵ بوون. بەسەر ئەوانەدا دەستگای ئەردەڵان راستەوخۆ نەیدەتوانی لەوەی زیاتر دەسـەڵاتی غەفار بەگی وەکیـل کەمتر بکاتەوە و ئەوەیان دەزانی غەفار بەگ لە ناو تیرەکانی جافدا دەستی دەڕوا بۆیە بڕیاریان دا بکەونە پیلان و هەرواشیان کرد...

لە دوای فەتاح بەگی وەڵەد بەگدا دەنێرن، بێت بۆ قەڵای جوانڕۆ بە سەردان بڵاوی دەکەنەوە کە فەتاح بەگ هاتووە تا بیکەنە وەکیلی جوانڕۆ، غەفار بەگ هەر لەوێدا کە ئەوە دەبیسێت فەتاح بەگ لە مزگەوتدا دەکوژن و تەرمەکەی شێخ رەسولی دەولەت ئابادی دەیباتەوە ناو وەڵەد بەگییەکان، ساڵێک بەسەردا دەگوزەرێت دەکەونە نێوانەوە، بڕیار دەدەن جەماعەتی جوانڕۆ بڕۆنە نێو وەڵەدبەگییەکان و لەوێڕا غەفار بەگی وەکیل و قادر بەگ و نادر بەگی جوانڕۆ دەکوژن، ئەم پیلانە بوو بە هۆی ئەوەی ساڵانێکی دوور و درێژ یەکێتی نێوان جافەکان تێک بچێت، ئەردەڵانییەکان بە هەوەسی خۆیان فەرمانڕەوایی بکەن.

# ئەمین بەگی وەکیل:

سەردەمی وەکالەتی جوانڕۆیی ئەمین بەگ هاوکاری دەسەڵاتی عەلی ئەکبەر خان (شەرەفولمولک) بووە، ئەم شەرەفولمولکە دایکی خەڵکی بناری پاوە بووە، خاڵوانی خۆش ویستووە هەروەها ئەمین بەگی وەکیل و مەحموود بەگ دیارە ژنەکانیان دیسان خەڵکی بناری پاوە بوونە و خزمی خاڵوانی شەرەفولمولک بوونە، بە یارمەتی ئەو دووانە شەرەفولمولک نەوسو دەگرێت و رۆستەم سوڵتان ئازاد دەکرێت.

هەر لەو سەردەمەدا دوژمنایەتی نێوان حەبیبوڵلاخانی باوەجانی و رۆستەم بەگ وەڵەدبەگی هەردووکیان دژ بە شەرەفولمولک لە تەقەللادا بوون، رۆستەم بەگی وەڵەدبەگی بە پیلانی سنجاوییەکان دەکوژرێت ١٢٩٢ک. ئەو دەم حەبیبوڵلاخان لە شارەزوور بووە، بە پێی وەسیەتی خزمانی دەیسپێرنە ئەمین بەگی وەکیل تا لە دوژمنایەتی سنجاوییەکان بیانپارێزێت بەو شێوە دەسەڵاتی ئەمین بەگی وەکیل لە ناوچەی وەڵەدبەگییەکاندا تامردن بەردەوام بوو.

محەمەد بەگی وەکیل: دوای مردنی ئەمین بەگ بە پشتیوانی حەبیبوڵلاخانی باوەجانی، فەتحوڵلا بەگ دەبێتە وەکیل، محەمەد بەگی کوڕی ئەمین بەگ دوور دەخرێتەوە و دەڕوا بۆشارەزوور و تیرەی جافی زەردویی پشتی دەگرن، دوای دوو ساڵ دەگەڕێتەوە و دەکرێتە وەکیل، سەردەمی وەکالەتەکەی هی سەردەمی دەسەڵاتی حەبیبوڵلاخان باوەجانی بووە، (نظام الآیە) بووە ئەمیش وەک سەرۆک عەشیرەتەکانی دیکە دەڕواتە ناو یەکێتی عەشایەرەوە، محەمەد بەگ دەمی لە شیعر و شاعیری دەکوتا، زۆر رێزی لە ئودەبا دەگرت، هەر لەسەر داوای ئەو شاعیری بە توانا (میرزا عەبدولقادری باوەیی) خوسرەو و شیرینی خانای قوبادی تەواو کردووە، میرزا (عەباسی نەعلبەندی جوانڕۆیی) بە دەستخەت نووسیوەتەوە.

# عەبدولکەریم بەگی وەکیل:

محەمەد بەگ لەساڵی ١٣١٩ک دەمرێت، عەبدولکەریم بەگی کوڕی جێگەی دەگرێتەوە، ئەودەم حەبیبوڵڵاخانی باوەجانی مردبوو، دەسەڵاتی ئەردەڵانەکان دووبارە لە جوانڕۆدا وەردەگیرێتەوە، عەبدولکەریم بەگ، ژن لە لهۆنەکان دێنێت جوان نەبووە و خزمانی ڕەخنەیان لێگرتووە، لەوەڵامدا وتوویەتـــی بەهۆی بەهێزبوونی لە ناو خزمانی خۆیدا و هەروەها دەرەوەی خزمانیشـــی، ئەودەم دەورەی دەسەڵاتی مستەفاخانی باوەجانی بووە، کە مستەفاخان لە شەڕی ( کەڵوڕ)دا دەکوژرێت، عەبدولکەریم بەگ دەســـەڵاتی جوانڕۆ و دەوروبەری بە دەســـتەوە دەگرێت، پەیوەندی دۆســـتی لەگەڵ یار محەمەد خان دەبەستێت و لە شاری کرماشاندا یار محەمەد خان دەکوژرێت و شەڕێکی گەورە ڕوودەدات لەگەڵ دەوڵەتدا، لەو شەڕەدا عەبدولکەریم بەگ و مستەفا بەگ دەکوژرێن.

# محەمەد بەگی دووەم (وەکیل):

محەمەد بەگ لە بگیر بگیرەکەی ڕەزا شادا ١٣٢٠ک دا گیراوە، ئەودەم تەمەنی ١٧ ساڵان بووە، دوای چەند مانگێک ئازاد دەکرێت لە پادگاندا دەستبەسەری دەکەن، بەڵام مۆڵەتیان دەدایە بڕوات بۆ دیداری باوکی لە زیندانی قەسری قەجەردا.

لـــەو کاتانـــەدا لە ناو هەر تیرەیەک نوێنەری دەوڵەت دەستنیشـــان کرابوو بـــۆ چاودێری، ئەو ڕەفتارەی دەوڵەتە بوو بە هۆی لاوازی تەواوی سەردەم دارانی عەشایەر.

# قادر بەگی وەکیل:

ســـاڵی ١٣٢٠ زیندانییانی عەشـــایەر ئازاد کران، محەمەد بەگی جوانڕۆیی لە لایەن ئینگلیزەکانەوە بەرگری لە گەڕانەوەی کردبوو بۆ ناو جوانڕۆ، جوانڕۆییەکان قادر بەگیان بە وەکیل کرد.

# شەڕەکانی جوانڕۆ:

کاتێک محەمەد بەگی جوانڕۆ لە تاران دەگەڕێتەوە، بەگزادەکانی جوانڕۆ لە دەسەڵات و توانای زۆردا بوون، چەک و تەقەمەنییەکی زۆریان بە دەستەوە بووە، سەرەتا ئەو جێگە و شوێنانەی لێیان داگیرکرابوو، بە تایبەت لە لایەن (جافر سوڵتان)ەوە برێک لە خودی بنەماڵەی لهۆنی وەک حەموئەمین بەگی لهۆنی کە موقەدەمی ئیفتیخاری بووە، تا رادەیەک لایەنگیرانی کردووە، شەڕ روویداوە، دە رۆژ و دە شەو شەڕ بەردەوام بووە، لەو شەڕەدا تەواوی دێهاتی: پاوە، خانەگا، دەشە، نیجار، کومەدەرە، تا دوو ئاو لە لایەن جوانڕۆییەکانەوە داگیر دەکرێت. لەو شەڕەدا دەوڵەت لایەنگیری لهۆنەکانی کردووە و جوانڕۆییەکان بە ناچار دەگەڕێنەوە بۆ جوانڕۆ. بەڵام دەیانەوێ دووبارە پەلامار بدەنەوە، خەڵک و خوا دەکەوێتە نێوانەوە، بەڵام بەگزادەکانی جوانڕۆ داوای ئەملاکی سەیدەکانی دەکەن. کار دەگاتە دادگا و سەر ئەنجام مافی رەوای موڵکداری دەدرێتە جوانڕۆییەکان ١٣٢٢ک.

لە ساڵی ١٣٢٧ک سەرتیپ (شاهندە) ناوێک بە فەرمان دەڕواتە ناو عەشایەر و دەیەوێت جوانڕۆییەکان چەک بکات، جوانڕۆیی نەڕۆیشتنە ژێر چەک دانانەوە، ماڵ و منداڵیان بردە شاخ و سەنگەریان گرت و سوپای ئێران بێ شەڕکردن گەڕانەوە بۆ پادگاکانیان لە ساڵی ١٣٢٧ک، شەڕی نێوان جوانڕۆیی و دەوڵەتدا دووبارە روویداوە، هۆی روودانی ئەو شەڕە لەسەر دانانی چەک بووە، هەروەها نەبوونی ئازووقە و هەژاری زۆر هۆی دیکەی ئەو شەڕە بووە، لەبەر کۆنە قینی قەڵخانییەکان دەبنە لایەنگری دەوڵەت و دەکەونە پێش لەشکرەوە، سنجاوی و ئەلایارخانی، گۆران برێک لە وەڵەدبەگییەکان لەو پەلامارەدا بەشدارییان کردووە و لەو شەڕەدا نادر بەگ، عەبدولرەحمان بەگی ئیناخی، محەمەدی شمشیری کوژراون (١٣٢٧ک). ئەم شەڕە بووەتە شەڕێکی ئایینی لە نێوان سوننە و شیعەدا، دەوڵەت بە ناچار کشاوەتەوە.

# شەڕی دووەمی جوانڕۆ 1329ک

چەندین تیپی سوپای ئێران هێرشی کردەوە سەر جوانڕۆ، تیپێک لە کرماشانەوە لە خورەم ئابادەوە، تیپێک لە سنەوە هێزی چەکداری قورس. سەرەتا ویستیانە خۆرئاوا و سنووریان لێ بگرن، جوانڕۆییەکان وەک هەمیشە ماڵ و منداڵیان بەرەو شاخ رەوانە کرد و رۆیشتنە سەنگەرەوە، بە سەرۆکایەتی محەمەد بەگی وەکیل، لەم شەڕەدا لهۆنییەکان چەکی دەوڵەتیان هەڵگرت و کەوتنە پێش لەشکری ئێرانەوە، لە شەو پەلامارێکدا حەفتا و پێنج چەکداری جاشیان

لێگرتـن، ئـەو کارە بووە هۆی ئەوەی ئیدی کەس نەوێری چەک بۆ دەوڵەت هەڵگرێت. بەڵام دوای مانگێک ئەوەی زیندانی بوون لەسەر داوای ریش سپییەکانی عەشایەر ئازادیان کردن، لە دواییدا لەسەر چەند خاڵێک رێک دەکەون، کە سوپا بگەڕێتەوە کرماشان و ئەوانیش لەململانێی چەکداری دەست هەڵگرن.

# بەگزادەکانی جافی جوانڕۆ و پێشمەرگایەتی

ئەوەی کەمێ ئاگاداری چۆنیایەتی ژیانی سـاڵانی دوا دوایی دەسـەڵاتی رەزا شـا و ململانێی چەپگەرایانـی ئێرانـی و جەبهەی میللـی و جووڵانەوەی دکتـۆر موسـەدەق و راکردنی یەکەمی محەمەد رەزا شـا و گەڕانەوەی و رووداوی ٢٨ مورداد و بەردەوامی دەسـەڵاتی شاهەنشـاهی ئێران و دام و دەزگای بەهێز و تۆکمەی ساواک ببێت، بێ یەک و دوو جووڵانەوەی جوانڕۆییەکان و سـەردانەنەواندنیان بەرانبەر زوڵم و زۆر و زەوتی ئێران دەسـەلمێنێت، ئەوە پەنجەمۆر دەکات کەوا چاوساقانی جوانڕۆیی (بەگزادەکان) زیاتر لە چەند (نەسل) هەروا لە سەر خولیای شەرەفدا تا پای مەرگ کۆشـاون، بەڵام هێزی دەوڵەت و دەسـەڵاتی شاهەنشـاهی رۆژ بە رۆژ بەهێزتر و پاچکەی نیزامی حکومەتی ئێرانی بێ رەحمانە دەشێلا و بە ئاسان تەسلیم نەدەبوون.

ئیتـر پەیوەسـتە مـەرگ و خوێن دەمی ماڵی پێگرتبـوون. هەروا لە شـەڕ و وردە گرژییەیدا دەیانگوزەراند، بە هۆی پەیمانی نەنگینی بەغداوە لای ئێراقیشیان لێ گیرابوو. تا کودەتای چواردەی گەلاوێژ روویدا و پەنجەرەیەک لە قەفەسی ئاسنینی کراوەتەوە و بووەتە هۆی ئومێد و ئارەزووی دێرین. وردە وردە شۆڕشی گەلی کورد بە سەرۆکایەتی بارزانی نەمر دەستی پێکردووە. شەڕی کـورد لە زۆر لاوە هەڵگیرسـاوە ئەودەم دەر و دەروازەی ئومێـد لە جوانڕۆییەکان دەکرێتەوە و بەگزادەکانی جوانڕۆ دەڕۆنە ناو شۆڕشـەوە وەک: محەمەد بەگی وەکیل، حوسـەین بەگ، سەعید بەگی ئەمین، ئەحمەد بەگی غەفووری، تایەر بەگی رۆستەمی، محەمەد بەگی پەشەنگ، لەولاشەوە حەمە ساڵح بەگی شمشێر، هاتە پێشوازییانەوە حوسەین بەگی جوانڕۆ لە لایەن بارزانی نەمرەوە دەکرێتە ئامیر هێز و ئەلحەقو ئینساف شەڕی سەروماڵی کردووە لە پێشمەرگایەتیدا.



محەمەد بەگی وەکیل
لەدەستبەسەری دەسەڵاتی رەزا شای پەهلەویدا
جوانڕۆ



حوسەین بەگی وەکیل
جوانڕۆ



یەعقوب بەگی ئەمین



میرزا محەمەدی کرماشانی، کەیکاوس بەگی ڕۆستەمی، عەلی بەگی پشتەنگ



ڕۆستەم بەگی وەکیلی



کەیکاوس بەگی ڕۆستەمی



عیزەت بەگی لهۆنی، فەتاح بەگی وەلەدبەگی، چەند کەسایەتییەکی کەی بەگزادەی جوانڕۆیی



حوسێن بەگی وەکیل، محەمەد بەگی ڕۆستەمی، منوچەر بەگ، حواریز بەگ



حوسێن بەگی وەکیل، محەمەد بەگی وەکیل





حوسێن بەگی و ەکیل، محەمەد بەگی رۆستەمی



حوسێن بەگی وەکیل، قادر بەگی رۆستەمی



محەمەد بەگی ڕۆستەمی



قادر بەگی ڕۆستەمی



فەتحی بەگی ڕۆستەمی



عەزیز بەگی وەکیلی، محەمەد ساڵح بەگی شەمشیری



عزیز بەگی وەکیلی، محەمەد ساڵح بەگی شەمشیری



محەمەد بەگی ڕۆستەمی وەکیلی، عەریف جەلیلیوەند،
حوسێن بەگی وەکیلی



حوسێن بەگی وەکیل، محەمەد ئەمین بەگی وەکیل



عیزەت بەگی عنایەتی، عیزەت بەگی لهۆنی



عیزەت بەگی جوانڕۆ، حاجی محەمەد بەگی جوانڕۆ



حەسەن بەگی جوانڕۆ



فەیزوڵـڵا بەگی ڕۆسـتەمی، ناسـراو بە ئیقبال لەشـکر
١٢٤٤-١٢٩١
لـە بەگزادەکانـی جوانـڕۆ بـووە و لە زینداندا شـەهید
بووە.



حاجی محەمەد بەگی ڕۆستەمی
١٣١١-١٣٨٣
لە بەگزادەکانی جوانڕۆ بووە.



تۆفیق بەگی رۆستەمی
١٣٦٥-١٢٩٥
حاجی تۆفیق بەگ لە بەگزادەکانی جوانرۆ و کوڕی فەیزوڵڵا بەگی – ئیقبال لەشکرە بووە و لە شروینەدا دەژیا



محەمەد بەگی سەعیدیانی وەلەد بەگی ناسراو بە مەنسورلەتەنە، محەمەد بەگی رۆستەمی جوانرۆ لە زیندانی ئەسفەهاندا لە ١٣١٨ مردووە.



محەمەد بەگی وەکیلی جوانرۆ، کاتێک لە ناو شاری تاراندا دەستی بەسەردا گیرا و گەڕانەوەی بۆ ناو جوانرۆی لێ قەدەغە کراوە.



حوسین بەگی جوانڕۆ، حەسەن بەگی جوانڕۆ



قادر بەگی وەکیلی

# میرزا محەمەدی مەحموودی «ئەفواهی»

ئەم پیاوە هۆشیارە، تا رادەیەک ئاگاداری ئەدەبیاتی فارسی بووە، لە رووداوەکانی رۆژانەی خەڵکی جوانڕۆدا لەبەر لێزانی پرسیان پێکردووە، وەکیلەکانی جوانڕۆ لە بڕێک رووداودا دەیانکردە نوێنەری خۆیان و وتەبێژ..

لە ساڵی ١٣٣٤ کاتێک کۆماری کوردستان لە مەهاباد لە لایەن پێشەوا (قازی محەمەد)ەوە دامەزرێنرا، ئەم میرزا محەمەدە، بە نوێنەرایەتی بەگزادەکانی جوانڕۆ و خەڵکی جوانڕۆ دەچێتە مەهاباد بۆ خزمەتی پێشەوا و لە کۆنفرانسێکی تێکڕاییدا بە نوێنەرایەتی هاوبەستەگی جوانڕۆییەکان دەگەیەنێت و داوای یەکسانبوون و پتەوکردنی پەیوەندی ناوخۆ دەکات.



میرزا محەمەد مەحموودی ئەفواهی



عەبدوڵڵا بەگی جوانڕۆ

# تیرەی زەردویی

حاشـا هەڵنەگرە، تیرەی زەردویی یەکێکی کەی تیرە دیار و سـەربەخۆکانی جافە و لە کۆن و ئێسـتادا ئـەم تیرەیـە دەور و مەقامی خۆیان هەبووە و نەخشـێکی وەبەر چـاو کەوتوویان لە رووداوەکاندا گێڕاوە..

زۆر کەس لەم تیرەیە زووتر لە تیرەکانی تری جاف دەستیان لە ژیانی رەوەندی هەڵگرتووە و نیشتەجێی شاران بوونە و ژیانی شاریان بە لاوە چێژدارتر کەوتووەتە بەرچاو، بە تایبەتی شاری (کرماشـان)یان بەلاوە بە سـوودتر و گەواراتر هاتووەتە مەزاج و دەژیان لەو شارەدا لە کۆنەوە ژیانیان دامەزراندوە و توانیویانە جێگە و گەڕەک و چواردەوری خۆیان هەبێت و لە روداوەکانیشدا پرس پێکراو بوونە و جێگەی دەستیان دیاری و نەخش و رۆڵیان هەبووە. بە تایبەت لە ململانێی (مەشـرووتەخوازی) میللەتەکانی ئێراندا، دژ بە دەسەڵاتی شاهەنشاهی قاجاری، بەشداری شەڕی چەکدارانەیـان کردووە، بۆ نموونە (ئیقبال لەشـکر) یەکێک بووە لـە قارەمانانی تیرەی زەردویی، کە لەگەڵ عبدولکەریم بەگی جوانڕۆیی (وەکیل) کە هاوپەیمانی (یار محەمەد خان) بوونە، شەڕی قارەمانانەیان کردووە و لەو شەڕەشـدا شـەهیدیان زۆر داوە، هەتاوەکـو خودی ( عەبدولکەریم بەگ) و چەندین رۆڵەی تری جاف لەو شەڕەدا شەهید بوونە لە ساڵی ١٢٩٠ش..

لە کاروباری بازرگانیدا، دانیشـتوانی زەردویی ناو شـاری کرماشان، ناو و دەسەڵاتیان زۆر بووە، ئەوان بوونەتە پردی نێوان شـار و عەشـایەری دەوروبەری شـاری کرماشان. بۆ نموونە (حاجی عەزیز) یان (میرزا محەمەدی مەردانی) و (حاجی مەولودی شافیعیان) و (عەلی ئەفروشە) و (حاجـی حەبیبوڵلای زەردویی) و (حاجی عەبدوڵلای قادری) و (حاجی عەبدولڕەحمانی قادری) یان (حاجی عەبدوڵلاخانی عەزیزی) کە یەکێک بووە لە دەوڵەمەندانی ئوسـتانی کرماشـان، زۆر کاروباری خێرخوازی ئەنجام داوە.

بـە وردی دەردەکەوێـت تیرەی زەردویی لـە تیرەکانی کەی جاف زووتر نیشـتەجێبوونیان هەڵبـژاردووە، یانی زۆرتر لە ١٥٠ سـاڵ لەمەوبەرەوە، تـەواوی تیرەی زەردویی دێهات و ژیانی رەوەندییان لە مێژەوەوە هەڵبژاردبێت، هێشتا زۆریان لادێ نشینن و بە کار و کردەوەی رۆژانەی خۆیانەوە خەریکن.

## ناوی زەردویی:

وەک هەموومان دەزانین وشـەی زەردویی، بە مانای نەخۆشـییەک ناسـراوە و لە کۆنەوە لە نـاو خەڵـکا لەبەر چەند هۆیەک بڵاوبۆتەوە، ئەو نەخۆشـییەش زوو بـڵاو دەبێتەوە. بەندە ناچێتە عەقڵمـەوە، تیرەیەکـی وا کۆن و گەورە بە ناوی نەخۆشـییەکەوە ناونرابێـت. برێک دەڵێن تیرەی زەردویی سەرەتا کوڕی پیاوێک بووە تووشی نەخۆشی زەردویی هاتووە و ئیدی کوڕ و کوڕەزای ئەو پیاوە هەر بە نەخۆشی باپیریانەوە ناوبراون، با نەختێک ورد بینەوە، ئایا نەخۆشی (زەردویی) لەو پیاوەوە داهاتووە و ناسراوە، یان ئەو نەخۆشییەی لە سەردەمی سۆمەر و ئەکەد و ئاشوور و یۆنـان هەخامەنیشـییانەوە هەبووە و ناسـراوە، چارەش کراوە، کەواتە نەشـیاوە بنەماڵەیەک، کۆمەڵێک، تیرەیەک، چوزانم عەشـرەتێک بە ناوی کابرایەکی نەخۆش بە نەخۆشـی (زەردوییەوە) ناونرابێت، بێگومان دەربارەی ناوەی زەردویی بیروڕا زۆرە بەڵام لەبەر نەبوونی مێژوونووسـی وردەکاری کـورد و نەبوونی دەسـەڵاتی کوردایەتی و سـەرئەنجام نەخوێندەواری، ئێمەی کورد هێشتا زۆر شتمان خامە و کاڵە و هەر وەک خۆی بێ خێو و خاوەن ماوەتەوە ئەوەشی بە کەڵکە لێمان دزراوە و ئەوڕۆ هی خەڵکە. بە گوێرەی ئەو بەڵگە جوگرافییانەی بە دەست منەوەیە، تیرەی زەردویی یەکێکن لە کۆنترین تیرەکانی ناو سەرتاسەری عەشیرەتی جاف، ئەم تیرەیە لە جێگە و شوێنێکدا ژیاون پڕ لە چیای سەخت و پۆپەی بەرزی کەژەکانی کوردستان، هەمیشە چاویان بەو دیمەنە هەڵهێناوە و لەو چیا سەربڵندانە دوور نەکەوتوونەتەوە، یەکێک لە بەناوبانگترین ئاگردانی سـەردەمی دەسـەڵاتی ساسانییەکان لە (روان)دا بووە، ئەو ئاگردانە تاکو ئەوڕۆ ئاسەواری چوار تاقەکـەی هێشـتا مـاوە (روان) دێیەکە کەوتووەتە پانزە کیلۆمەتری باشـووری شـاری (پاوە) و دوانزە کیلۆمەتری رۆژئاوای باینگانەوە.

مانای وشەی روان یەکگرتنی چەند (ئاوێکە) روان کەوتووەتە پشتی ئاتەشگا و روو بە کێوی ماکوانە. ئەو جێگە و شوێنە بە هەوارگەی بنەڕەتی تیرەی زەردویی دەژمێردرێت و لە سەردەمی دەسـەڵاتی ساسـانییەکاندا تیرەی زەردویی پاسەوانی ئەو ئاگردانە بوونە و نەیان هێشتووە گڕو گڵپەی ئەو ئاگرە بۆ چرکەیەک کز و کەم بێتەوە یان بکوژێتەوە.

وەک وتـم: لـە سـەردەمی ساسـانییەکاندا، سـێ ئاگردانی هـەرە گەورە هەبـووە یەکێک لە ئازەربایجان، یەکێک لە دەڤەری فارس، کە بکاتە شـیراز و یەزد ئەوی تر لە کوردسـتان کە بکاتە (روان) لە هێرشـی عارەب و پەلاماری ئیسـلامیدا شەڕی سـەر وماڵیان دەکرد بۆ کوژاندنەوەی ئاگری هەمیشـە هەڵگیرسـاوی ئایینی زەردەشـتی و بە پەیڕەوانی ئایینی زەردەشـتییان دەگوت (مەجووس) لەو هێرشـەدا دەڤەری (روان) بە دیاردەیەکی مەعنەوی ئایینی زەردەشـتی لە قەڵەم دراوە هـەر واش بـووە، بۆیە بە هێزێکی پەلاماردەری بێ ویژدانی تاڵانکەرەوە پەلاماری دەڤەری (روان) دەدەن و پارێزەرانـی ئـەو ئاگـرەش شـەڕی سـەر و ماڵیـان کـردووە کە بکاتـە باپیرە گەورەکانـی تیـرەی زەردویی، بەڵام دیارە ئەو پەلامارە دوای شـەڕی گەورەی قادسـیەی نێوان

ئیسلام و ساسانی بووە و مەعنەویاتی شەرکەرانی ئێرانی پتەو نەبووە. لە ئاکامی ئەو پەلامارەدا تیرەی زەردویی ئێستا و (زەردو)ی ئەوسا، کە بکاتە پارێزەری ئاگر، بڵاوەیان کردووە، وەنەبێت پەلاماردەری عارەب بە ئاسانی توانیبێتی ئەو دەڤەرەی گرتبێت، تابە ئەورۆ، چەندین گۆڕستانی جۆراو جۆر لەو بنارەدا ماوەتەوە و ناسراوە بە گۆڕی (ئەسحاوان) و لەو دەڤەرەدا لە نێوان (برکی و سەردانی) دا ئاسەواری قەلایەکی مێژوویی هەیە، بە قەڵای گاوران یان گەبران ناسراوە. تا دوا دڵۆپی خوێن لەو قەڵایەدا بەربەرەکانی کراوە، دیارە فەرماندەی ئەو بەربەرەکانییە، کەسێک بووە بە ناوی (قەشەنگ شا) چونکە ناوی بەسەر ئەو ئاسەوارەوە هێشتا ماوەتەوە و بە پێی لێکدانەوەی ئاسەواری ئەو قەڵایە بە بۆڕی گڵین ئاویان گەیاندۆتە ناو قەڵاکە و داگیرکەران توانیویانە سەرچاوەی ئاوەکە بگۆڕن و بەو شێوە پارێزەرانی قەڵایان زەبوون کردووە، دیارە فەرماندەی ئەو لەشکرە (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) بووە، کە باوکی خەلیفەی دووەمی ئیسلام بووە، دەسەڵاتی ئیسلام ئالییەتی ژیانی لە دەڤەرە داگیرکراوەکاندا گۆڕیوە و خەڵکەکە بە زۆری شمشێر و کوشتن و باجدان، یان ئیمانیان هێناوە یان کۆچیان کردووە، تیرەی زەردویی وەک هەر کوردێک بە ئاسانی دەستبەرداری خاک و دەڤەرەکەیان نەبوونە، زۆربەیان زوڵم و زۆری داگیرکەریان قەبوڵ کردووە و وڵاتیان بەجێ نەهێڵاوە و بن بڕ نەبوونە، عەشیرەتی جاف، زەردویی کە یەکێکن لە تیرەکانی، بە پێی مێژوو چەندین کۆچی گەورەی خوار و ژووریان کردووە، لە سەردەمی سەلجووقی و عەباسییەکاندا لە دەوروبەری بەغدا و حیللەوە بەرەو جوانرۆ هەڵکشاون لە ٤٥٠ ساڵ لەمەوبەرەوە لە جوانرۆ کۆچێکی گەورە بەرەو کوردستانی ژێر دەسەڵاتی (عوسمانی)یان کردووە، لە دووسەد و پەنجا ساڵ پێشەوە هیجرەتی زایەر بەگی جاف لە جوانرۆ و بۆ ئیمارەتی بابان ئەنجامی داوە، بە تەئکید تیرەی زەردویی لە جاف دانەبڕاوە و پەیوەستە لەو خوار و ژوورەیدا بەشدارییان کردووە، هەتاوەکو لە شەڕەکانی وەکیلەکانی جوانرۆدا هەمیشە کوڕانی زەردویی جێگەی دەستیان دیار بووە، یا سەردەمی حەمە ڕەزا شایش هەر لەو شەڕانەیدا بەشدارییان کردووە. لە پێشمەرگەییدا، پێشمەرگەی تیرەی زەردویی ئاماژەی بۆ کراوە لە ئازایەتی و چاونەترسیدا.

عەشیرەتی زەردویی، عەشیرەتێکی کۆچەر و ئاژەڵدار بوون و یەکەم داهاتی ئەوان لە ڕێگای ئاژەڵدارییەوە دابین کراوە، کوێستانێکی بەر فراوان، لەوەڕی زۆر بۆ ئاژەڵ و ئاووهەوایەکی خۆش ئەو عەشیرەتەی بە ئاژەڵدارییەوە خەریک کردووە. هەوارگەکانی برکێ، وزەپوچ، سەردانی، وێراش و گەرمەسێری هەنجیرگ، هەریەک ماوەیەک لە ساڵ هەواری ئاژەڵداران بوونە، ئەو عەشیرەتە لە دوای ئاژەڵداری خەریکی باخداری و باخەوانی ئەبن و باخاتی ئەوان لە زێتی ورشکە پێ زۆر پڕ بایەخ و خاوەن سەمەرەن، هەر چەند لەبەر کوێستانی بوون کشتوکاڵ لە ئەو ناوچەیە نییە بەڵام باخاتی زۆر جوان دەبن بە هۆی بەفیرۆنەچوونی ئاوی زۆری ئەو ناوچەیە لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی زەردویی خەریکی ئیشی دەست وەکو جاجم و کلیم و خوێدان و خورج و هۆڕ و بەرماڵ و قلی و گریس کردن و هەروەها ئاسنگەری و ناڵبەندی و نەجاری و وەستابەنایی دەبوون و بێجگە لە دابینکردنی پێویستییەکانی خۆیان، ئیش و پێویستی گوندەکانی دەوروبەریان بەڕێوەدەبرد و لەباتی ئەودا لە گەوان روون و کەشک و خورییان وەردەگرت. بنێشتکردن یەکێک لە ئیش و کارە تایبەتییەکانی عەشیرەتی زەردوییە و لە مێژەوە ئەو خەڵکە بۆ بنێشتکردن لە وەرزی هاوین بەرەو شارەکانی ئیلام، خرەم ئاباد، ئابدانان، مەریوان، بانە، هەورامان و چەند شاری تر بەڕێ دەکەون و بۆ ماوەی دوو تا سێ مانگ خەریکی بنێشتکردن دەبن.

دوای نیشتەجێبوونی بەشێک لە عەشیرەتی زەردویی لە کرماشان تیجارەت و کاسبی لە نێو

ئەو عەشـیرەتەدا پەرەی سـەندووە و ڕۆژ بـە ڕۆژی چ زیاتر دەبوون تـا رادەیەک کە زۆربەی تیجارەتی: بنێشـت، ڕۆن، خۆری، قەزوان، مەژگە و گوێز، کشـک، سـالە، گژنیز، شـمیش کاولی، قاتولی، تەرشی شادی کرماشان بەدەستی زەردوییەکانەوەیە و بێجگە لەوە لە تیجارەتی زەڕات، کەتیـرەدا دەسـتیان هەیـە، لە شـاری کرماشـان خەڵکی زەردویـی بە خەڵکی تاجر و کاسـب و خاوەن وەعد ناسـراون و نیشانەی ئەو بەشـداربوونی زەردوییەکان لە ژووری بازرگانی شاری کرماشانە.

دیـارە کـە هەندێک لە خەڵکی زەردویـی خەریکی خوێندن و ئیش لـە دەزگاکانی دەوڵەتیدان هەرچەند کە لەبەر مەرجی ئیقلیمی و سیاسـییەوە ژمارەی ئەوان بە پێی نفوسـی زەردویی زۆر نییـە بـەڵام هەرچی دەچـێ ژمارەی خوێنـدەواران و پلەی خوێندن و زانسـت زۆرتـر دەبێ، تا رادەیەک کە ئێستا ژمارەی خوێندەواران لە زانستگاکاندا جێی ئومێدەوارییە.

تیرەی زەردویی، وەک تیرەکانی دیکەی جاف، دابەشـبوونەتە سەر کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشووردا و ئەو تیرەیە چەندین بەرەبابن، ئەوانەی ڕۆژهەڵات:

١. هیرقەمەری
٢. گۆران
٣. شاقوبادی
٤. شێخ ئەمیری
٥. حەمولیتی
٦. فەتاحی
٧. جامی
٨. یاقوبی
٩. ناودێیی
١٠. یونسی
١١. قەشەیی
١٢. شێخ فەتاحی
١٣. سەلەیی

## دیسانەوە ناوی زەردویی

زەردوییەکان (بڕێکیان) لایان وایە، ناوی تیرەکەیان لە ناوی زەردەشتەوە هاتووە، لەبەر ئەوەی پاریـزەری ئاگردانـی بەناوبانگی (ڕوان) بوونـە. بەڵگەیەکیان بە دەسـتەوەیە ئەویش (قورئانێکە) لەسـەر پێسـتی ئاسک نووسراوە و لە مزگەوتی ( ڕوان)دا تا بە ئەوڕۆ پارێزراوە قەد و قەبارەی ئەو قورئانە: پانی ٣٥سم، درێژی ٤٥سم، ئەستووری ١٥سم، لە پەراوێزی ئەو قورئانەدا، باس لە ناوی زەردویی هاتووە بە وشەی (زەردو).

برێکی تر لایان وایە ناوی زەردویی، لە دوو وشـەی مورەکەبەوە هاتووە (زەڕ-دویی). زەڕ، یانی زێڕە و (دۆیی) هەر دۆی خواردنەوەیە و جاران بۆ خێر و بەرەکەت پارەی زێڕیان دەخستە ناو مەشـکەی (دۆ) وە، دیارە زەردۆییەکان دەوڵەمەند بوونە و ئیدی ئەو دوو وشـەیە، پێش وەند و پاش وەندە، زەڕ-دۆیی) بە درێژی زەمان بووە بە یەک ناو (زەردۆیی)ی و تەواو وەک ئەمڕۆ کە ئەم تیرەیە بە زەردویی ناسراون.

ئەم تیرەیە لە ئالیەت و ئەرکانی عەشیرەتی بەدەر نەبوونە، هەر پەلامار و شەڕێک دووچاری دەڤەرەکە بووەتەوە، بە تایبەتی دەڤەرەکانی هۆزی جاف هاتبا، شەڕکەرانی ئەم تیرەیە بەشدارییان کردووە، لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا، زۆرتر سوێند خوار و هاوسەنگەری وەکیلەکانی جوانرۆ بوونە کە لەگەڵ دەسـەڵات و دەوڵەتی مەرکەزی ئێراندا بەشـەڕ هاتوون، کاتێک خەوانینی وەڵەدبەگی و باوەجانی لە دەسەڵاتدا بوونە کەم و زۆر تیرەی زەردویی بە حوکمی جاف بوون لە رووداوەکاندا بەشـدارییان کردووە وەک لە پێشدا باسـمان کردووە ئەم تیرەیە وەک زۆربەی زۆری تیرەکانی کەی جاف دوای دروسـتبوونی حکومەتی ئێراق لە سـاڵی١٩٢٠ز و دابینکردنی سـنووری نێوان ئێران و ئێراق و دابەشـکردنی کوردسـتان ئەم تیرەیەش دابەش بوونەتە سـەر دوو لادا، بەپێی تەقەللای زۆر و یارمەتی برێک لە برادەران هەندێ زانیاریم بە دەسـت هێناوە و ناوی ناودارانی ئەم تیرەیە تێکڕا دەنووسـم، ئەگەر ناوی کەسـانی ترم لە بیرچوو یان لە قەڵەم کەوتووە داوای لێبوردن دەکەم.

## ناودارانی زەردویی رۆژهەڵاتی کوردستان لە رەوان:

١. فەقێ عەلی
٢. کوێخا ساڵح
٣. کوێخا قادر
٤. کوێخا عەبدوڵلا
٥. حاجی فەتاح
٦. میرزا حەمە کەریم
٧. حەمەی وەیسی
٨. حاجی خان ئەحمەد
٩. حاجی فەتحوڵلا
١٠. قادری کاکە خان
١١. فەتاح مستەفا
١٢. عەلی یوسف تەیمەز
١٣. تەیمەز
١٤. حاجی عەبدولرەحمان

## لە کرماشان:

فەتاح خان
حاجی حەمەجان
ئەحمەد لالو
حاجی فەتحوڵلای حەمەی لوپەر
حاجی حەبیبی زەردویی
حاجی عەبدولرەحمانی قادری

بەلای زۆربەی زەردوییەکانی ئێستای رۆژهەڵاتی کوردستانەوە (حاجی حەمە تەقی حەیدەری) بە براگەورە و قسە بیستراو دەناسرێت لە کۆنیشەوە برێک کەسایەتی لەناو زەردوییەکاندا ناسراو بوونە وەک:

١. فەتاح شاوەیس
٢. مامە خەلیفە
٣. مینەی ئامین
٤. مام روسەم

زەردویی کوردستانی خواروو زۆری لە دەووروبەری هەڵەبجەدا نیشتەجێ بوونە وەک: بناری سورین، گوندی گلیجال بناری بەمۆ-کوێستانی شنروێ و باڵانبو.

دوای نیشتەجێبوونی تێکڕای ئەم تیرەی جافە لە شار و شارۆچکەکانی دۆڵی شارەزووردا پەخش و بڵاوبوونەتەوە و برێکیان بەرەو گەرمیان سەرەوخوار بوونە. کەسایەتییەکی بەناوبانگی وەک (مەلا یوسفی گلیجاڵی) لە ناو زەردوییدا هەڵکەوتووە، دیارە لەسەر ناکۆکی زەویوزار لە ساڵی ١٩٤٦ز کوژراوە.

## کەسایەتی ناو زەردویی دەوروبەری هەڵەبجە:

١. حاجی مەلا حەمە کەریم «باوکی رۆژنامەنووسی ناسراو مامۆستا حەمە سەعید».
٢. حەمە سەعید زەردویی
٣. ئەلەی بەیخان
٤. بارامی رەمەزان
٥. مەحمودی مایجان
٦. حاجی مەحموودی ریشاو
٧. مەلا عەبدوڵلای دەلەمەڕی
٨. حاجی عەورەحیمی حەمەرەزا
٩. ئەولە حەمەدی میسری
١٠. بارامی مەحمود
١١. مەلا عەبدولکەریمی دەڵەمەڕ
١٢. حەمەی حەمە وەیسی
١٣. ئەورەحمانی حەمەی حەمەوەیسی
١٤. کوێخا محەمەدی ریشاو

١٥. حاجی فەتاحی دەڵەمەڕی
١٦. حاجی هادی دەڵەمەڕی
١٧. حاجی حوسەینی عالی
١٨. حەمە کەریمی ئەلی
١٩. ئەولقادری زەرین
٢٠. حاجی تۆفیقی مایجان

## زەردویی دەلەمەڕ و ریشاو

١. مەلا عەبدولکەریم زەردوویی
٢. مەلا عەبدوڵڵا مەلا عەبدولکەریم
٣. حاجی هادی مەلا عەبدولکەریم
٤. ئەڵا کەرەم خوا مراد
٥. تۆفیق خوامراد
٦. مەحموود مایجان
٧. حاجی عینایەت حەمە سەعی
٨. حاجی عەلی مایجان

## زەردوویی بناری شارەزوور

١. مەلا محەمەد حەمە میرزا
٢. مەلا تاهیری مەلا محەمەد
٣. رەئوفی مەلا محەمەد
٤. مەلا ئەحمەدی مەلا محەمەد
٥. حەسەن حەمە سەدیق
٦. حاجی محەمەد حاجی قادر

## کۆمەڵێکی دیکەی ناسراوانی زەردوویی

١. خەلیفە محەمەدی زەردویی
٢. مەلا عەبدولی خەلیفە محەمەد
٣. مەلا عەلی حەمە ڕەش- شەهید جەمال مەلا عەلی
٤. ساڵح شابە- عەبدوڵڵای ساڵح شابە
٥. حەمە رەشیدی مینەی ئامین
٦. عەبدول محەمەدی شاوەیس
٧. حاجی فەتاح عەول محەمەد
٨. حەمە کەریمی حەمەی قادر زەردویی
٩. مام مارفی عەزیز زۆراو

١٠. حوسێنی رۆستەم
١١. ئەحمەدی خەلیفە
١٢. رەشەی مارف (مەریوان)
١٣. حەمەی غەریبی حەمە عەزیز (مەریوان)
١٤. حەمە بەرکەورگانی

## کەسایەتی زەردویی ناوچەی گلیجال

- مەلا غەفووری (باوە گەورەی هۆزی هەسەن)
- مەلا محەمەدی نادری
- مەلا عەزیزی عەلی
- مەلا مەجیدی ئەیمین
- مەلا تۆفیق
- سۆفی عەزەمی باپیر
- مەلا عەزیزی حاجی مارف
- سۆفی فەتاح
- ئەمینی خالان
- مستەفای حسەین
- محەمەدی عەزەم
- مەحموی ئەحەمەی حەمەعەلی
- عەبدوڵای رەمەزان عەلی فەتاح عەلی
- حەمەی ئەمین
- ئەحمەدی حوسەین
- ئەحمەدی عەزەم
- محەمەدی مستەفا
- ئەمینی محەمەد
- سۆفی حوسەینی فەتاح
- حەمە شەریفی مستەفا
- ئەمەد ئەیمین
- باوە قدری ئەحمەد ئەمین
- محەمەدی ئەحمەدی حەمەعەلی
- ئەورەحمانی حەمەساڵح
- ساڵح مەحمودی مستەفا

## کەسایەتی زەردوییەکانی دەوروبەری سورین

- خودە زەردویی
- مامە خەلیفە
- مینەی ئامین

- مامە عەزیز
- مامە زۆراو
- فەتاحی شاوەیس
- مەلا عەبدول
- مامە روسەم
- قادر زەردویی

## زەردوویی بناری سوورین

١. فەرەج قادر وەسمان
٢. تۆفیق ئەمین قادر
٣. حاجی مەلا حەمە کەریم فەرەج «حاجی مەلا»
٤. مەلا ئەحمەد نادر نەوتی
٥. حاجی فەتاحی خەلیفە مارف
٦. خەلیفە مارف
٧. عارفی خەلیفە مارف
٨. حاجی محەمەد سۆفی فەرەج
٩. حەمەی عەبەی سوسەن
١٠. حەمە قانعی عارفی خەلیفە
١١. سادق فەرەج قادر

ئەوانــەی دەربارەی تیرەی زەردۆیی یارمەتییــان داوم ئەوانەی خوارەوەن ئومێدەوارم خودا نموونەیان زۆر بکات، بۆ تیرەو عەشرەت و میللەتی کوردیش لەگەڵ سوپاسی فراوانی خوسرەو جافدا.
١. رۆژنامەنووسی ناسراو: حەمە سەعید حەمەکەریم، لە باشووری کوردستان
٢. سابیری حەمەی ئەمین بارام
٣. محەمەدی مەلا عەبدوڵڵا
٤. مامۆستا محەمەد عەبدوڵڵا
٥. سەردار حەمە ئەمین

## لە کوردستانی رۆژهەڵات:

١. شاهین تۆفان جاف
٢. کاک مەسعودی مستەفایی
٣. عەلی حوسەینی
٤. مستەفای حوسەینی
٥. محەمەدی ناوخاسی
٦. ئەلیاسی رۆشنی
لەگەڵ رێزی فراواندا سوپاسیان دەکەم.



کوێخا محەمەد ئەحمەد ئەلیاس ریشاوی



ئەورەحمان حەمەی حەمەوەیس



مەلا عەبدوڵڵای مەلا عەبدولکەریم دولەمەڕی



شەهید زولفیقار مەحموود محەمەد
٢٠٠٨-١٩٦٦



مەحموود محەمەد ئەحمەد ناسـراو بە کوێخا مەحموود مایخان



مامە نووری فەتاح عەلی زەردویی گلیچال



حاجی عەبدوڵڵا حاجی عەبدولڕەحمانی قادر
١٣٨٥-١٣٠١
لە تیرەی زەردوویی لە ناو شاری کرماشاندا دەژیا و لە بوقعەی وێدا نێژراوە.



حاجی عەبدولڕەحمانی قادری
١٣٤٨-١٢٧٢
تیرەی زەردوویی بازرگانی دەکرد لە ناو شاری کرماشاندا



حاجی ئیسماعیلی شافیعیان
١٣٦٩-١٣١٣
یەکێک بووە لە ناسراوەکانی تیرەی زەردووی ناو شاری کرماشان و بە کاری بازرگانی خەریک بووە.



عەلی ئەفروشە
١٣٨٣-١٢٩٧
لە تیرەی زەردویی ناو شاری کرماشان بووە و
ئەندامی ئەنجوومەنی شاری کرماشان بوو.



حاجی محەمەد عەزیزی زەردوویی
١٣٣٧-١٢٧٦
ئـەم پیاوە دایکی لە بەگزادەکانی جوانڕۆ بووە و لەگەڵ
عەبدولکەریم بەگی وەکیلیدا کوژراوە.



حاجی ئەحمەدی گولعەنبەر
١٣٧٣-١٣٠٣
یەکێک بووە لە پاڵەوانەکانی شاری کرماشان بە تایبەت
لە زۆرانبازیدا لە ناو شاردا ڕێزی زۆری لێ گیراوە و
لە ناو زەردووییەکاندا قسەی بیسراوە.



## پاڵەوان ئەحمەد سەلیمی
## ئەحمەد لالۆ 1305-1339

هەر لە سەرەتای گەنجێتییەوە هەوا و هەوەسی مەردانەگی و رەفتاری پاڵەوانانە کەوتە خولیایەوە، لە ناو دۆست و ناسراوانیدا وردە وردە ناوی دەرکردووە و دۆست و دوژمن حیسابیان بۆ قسە و کەسایەتی کردووە، بەسەر ئەو جۆرە تێفکرینەیدا خاوەنی دەست و بازووی بەهێز و لەش و ئەندامی وەرزیدە و چاپک و بە توانا بووە، ئیدی لە تەواوی کرداریدا لە پیاوەتی و کار و کردەوەی مەردانە دوور نەکەوتووەتەوە، هەر ئەو رەفتارەی بووە هۆی شۆرەتێکی هەموو جێگیر چ لە کرماشان و چ لە تاران و یان لە سنە و شارەکانی دیکەدا، لە کاری بازرگانیدا دەستی بەکارکردووە بە رووداوی ئۆتۆمبیل مردووە.

بەندە رووداوێکم لەگەڵ «ئەحمە لالۆ»دا هەیە، شایانی گێڕانەوەیە دوای ئەوەی لە پێشمەرگایەتییەوە گەڕامەوە بۆ ناو خوێندن لە ساڵی دووی کۆلیژی هونەرەجوانەکاندا بووم، شەهیدی جوانەمەرگ نەبەردی بڕام لە حدودەوە پەڕیبووەوە ناو ئێران و ئێمەش بە شەش حەوت کەسەوە لە تارانەوە رۆیشتین بۆ کرماشان. شەو بڕیارمان دا بڕۆین بۆ بناری تاقوستان و هەرواشمان کرد و لەوێڕا لەنگەرمان خست و تارلێدەر و گۆرانیبێژ و ئیدی خواردنەوەمان دەست پێکرد، سەرمان گەرم بووبوو، کوڕێکی کرماشانی دەنگ خۆشمان بانگ کردبوو گۆرانی دەوت، هەر ئەوەندەمان زانی کابرایەک هاتە سەرمێزەکەمان و رووی کردە گۆرانیبێژە کرماشانییەکە وتی: من هاومە یرا بیشە وەچ روو گۆرانی چریت..؟ یانی من لەیرام تۆ بە چی روویەکەوە گۆرانی دەڵێیت..؟ ئێمەش ئەو رەفتارەمان بەلاوە سەیر بوو و فێری قبووڵکردنی ئاوا رەفتارێک نەبووبووین. بەندە وەڵامم دایەوە. کاکە لاوە بەولاوە ئەوە میوانی ئێمەیە.. کابرا ئاوڕێکی لەمن دایەوە و وتی: تۆ خۆت تێکەڵ مەکە و ئیدی قسەش مەکە..

من کە ئەوەم بیست بەسەر کورسییەکی ئاسنی «ئەرج»ەوە دانیشتبووم ئەو کورسییانە لوول دەکرا. بێ یەکو دوو کورسیم لەژێرم وەدەرهێنا و بە تەواوی هێزمەوە ماڵیم بەسەری کابرادا. کابرا تەختی زەوی بوو.

کاکە لەپڕ لەولاوە دە نەفەر زیاتر زرتە زەلامی چەقۆکێشمان لێیەتاین بوو، بوو بە شەڕێکی دەست بە یەخە لەیەکمان دایەوە ئێمە دەرەقەدی ئەو جۆرە شەڕە نایەین قەرارمان دا بیکەینە شەڕە بەرد کورە «باشکییەک»مان لەگەڵ بوو تا ئێمە بەردێکمان دەوەشان ئەو پانزەی دەهاویشت، تیرەی باشکی لە ناو جافدا بە شەڕە بەردەوە ناوبانگییان هەیە. هەردوولا زامار بووبووین، بەڵام شەڕی دوورەبەرد ئێمەی منداڵی لادێ ئەوانیش هۆکاری شەڕەمشتی ناوشار و چەقۆکێشی بە حەقیقەت ئەگەر ئەو شەڕی دوورە بەردانە نەبووایە، خراپیان پێدەکردین. شەڕ پەرەی سەند و هێزی «ژاندارمەی» گەیشتنە ئەویێ. ژاندارم ئەوانیان دەناسی. ئێمە غەریب و ئاوارەی وڵات سەیرمان کرد، بە لای ئەواندا دەیکێشن و خەریکی پەروەندە دروست کردنن. ساڵ ساڵی ١٩٦٦ لە کلاسی دووهەمی کۆلیژدا بووم، ئامۆزاکانم لە ئێراندا دەستیان دەڕۆیشت، سەردار جاف و سالار جاف، بەندەش بەهۆی برادەرێکمەوە پیاوێکم دەناسی ئەوەندەم دەزانی کە سەرلەشکرە و لە هێزی ژاندارمریدایە، چوومە لای ئەفسەرەکە و وتم: دەتوانم تەلیفۆنێک بکەم؟

زۆر بە ناڕەزا مۆڵەتی دا تەلیفۆن بکەم، لە بەختی ئێمەدا سەرلەشکر بۆخۆی جوابی دایەوە و کاتژمێر یەکی شەو بوو، تومەز سەرلەشکر جەباری، فەرماندەی تەواوی هێزی ژاندارمری رۆژئاوای ئێرانە و من نازانم، دیاربوو لەخەوم کردبوو، وتی ها خێرە؟ وتم نەوەڵا خێر نییە و داستانەکەم بۆ گێڕایەوە. سەرلەشکر وتی خۆم پۆشتە دەکەمەوە و دێم. دیاربوو مەرکەزی فەرماندەیی لە شاری کرماشاندا بوو، ئێمە زۆرمان برینـدار و خوێن ئاوڵ بووبووین، بەڵام چەقۆکێشەکان بە دوورە بەردی ئێمە بەرباد بووبوون.
ئێمە نەماندەزانی ئەوانەی پەلاماری ئێمەیان دابوو دەستە و دایەرەی «ئەحمەد لالۆ»ی بەناوبانگن و خودی ئەحمەد لالۆیش لە دوو لاوە سەری شکابوو، لە راستیدا ژاندارمەکان لێیان دەترسان. زۆری نەخایاند «سەرلەشکر جەباری» خۆی کرد بە ژوورا و ئێمەی دی زۆربەمان خوێن ئاوڵ کراوین. و ئەفسەری مەرکەز لە ترسا رەنگی بوو بە زەردەچوو و وەزع گۆڕا و «تیمسار جەباری» دەستی بە جوێندان کرد بە ئەفسەر و ژاندارم و چەقۆکێشەکانیش..

لێرەدا پیاوەتی و ئازایەتی «ئەحمەد لالۆ» وەدەردەکەوێت. هاتە پێشەوە و وتی: من داوای لێبوردنتان لێدەکەم و وا نەزانن لەبەر ئەوەی فەرماندەی ژاندارم هاتووە، نەخێر من ئەو پیاوە بە قەڕانێک ناسێنم. بۆیە داوای لێبوردنتان لێ دەکەم، چونکە ئێوە جافن و منیش جافم. من زەردوییم. من «ئەحمەد لالۆ»م..

خوالێخۆشبوو سەردار جاف تا ئەو حەلە دووری گرتبوو، کە ئەو قسەی «ئەحمەد لالۆ»ی بیست، هاتە پێشەوە و وتی: نەدەبوو ئەمشەو تووشی ئەم گرفتارییەی بین، بەڵام ئیتر بوو. جا لێرەدا دەیبڕینەوە..

«سەرلەشکر جەباری» ئاگری دەکردەوە، خەریکی فایل دروستکردنی دوورخستنەوەی چەقۆکێشەکانی «ئەحمەد لالۆ» بوو. بەندە و سەردار داوامان لێکرد لەو کارەی گەڕێت. بەهەرحاڵ دوای فەلاکەتێکی زۆر توانیمان فەرماندە رازی بکەین کە هیچ بە «ئەحمەد لالۆ» و دەستەکەی نەکات.



حاجی فەتحوڵڵای گولعەنبەر
١٣٨٣-١٣٠٠
لە تیـرەی زەردوویی، کارمەندی دەوڵـەت بووە، کاری بازرگانی کردووە. لە مەزاری وەیسدا نێژراوە.



حاجی مولوودی شافیعیان
١٣٧٦-١٣٠٢
تیرەی زەردوویی
یەکێک بووە لە بازرگانە ناسراوەکانی شاری کرماشان.



حاجی حەبیبوڵڵای زەردوویی
١٣٧٩-١٢٩٣
بازرگانێکی نێودەوڵەتـی بـووە، یەکـێ بـووە لـە ریشسپییەکانی زەردوویی ناو شاری کرماشان



حەبیبوڵڵای گول عەنبەر
١٣٧٥-١٣١٠
تیریە زەردوویی
دانیشتووی شاری کرماشان



حەبیبوڵڵای پور ئەحمەدی مەردانی
١٣٦٩-١٣٠٠
تیرەی زەردوویی
یەکێک بووە لە بازرگانە گەورەکانی ناو شاری کرماشان



حیشمەتوڵڵای مەردانی
١٣٥٨-١٣٠٩
کوڕی حاجی عەزیزی مەردانی بووە، بە بازرگانییەوە سەرگەرم بووە و یەکێک بووە لە ناسراوەکانی تیریە زەردوویی ناو کرماشان



حاجی ئیبراهیمی خاوەری
١٣١٥-١٣٦٩
لە دەڤەری جوانڕۆدا هاتووتە دنیاوە و ڕۆیشتووە بۆ شاری بەغدا، گەڕاوەتەوە بۆ کرماشان و لەوێڕا نیشتەجێ بووە.
زۆر تەوحی بەلای داودەرمانی کوردەواری گیا و سەوزەلانییە جۆراوجۆرەکانەوە بووە.
دوکتۆرای فەخری پێدراوە، هەزاران نەخۆشی چاک کردۆتەوە و لە شاری کرماشاندا مردووە و لەوێشدا نێژراوە.



ڕۆستەمی مەردانی
١٢٧٩-١٣٤٩
کوڕی حاجی عەزیزی مەردانی بووە و لە ناو شاری کرماشاندا هاتووتە دونیاوە و لە تیرەی زەردوویی.
زاوای سەرۆکی هۆزی گۆران و کە مردووە لە کوردستانی وەیدا نێژراوە.



میرزا تۆفیق زەردوبان
١٣٠٧-١٣٨٢
یەکێک بووە لە کەسایەتییەکانی تیرەی زەردووی ناو شاری کرماشان.



میرزا محەمەدی مەردانی
١٢٤٨-١٣٢٨
یەکێک بووە لە ریشسپییەکانی تیرەی زەردوویی ناو شاری کرماشان زۆرتر مەڕومالاتی لە دێهاتدا بەخێو کردووە و لە کاروباریدا سەرکەوتوو بووە و چەندین دێی زەرخەرید کردووە.
زۆر حەزی لە راوکردن و تا شەوانی کردووە و لە مەزاری وەیسی قەرەنیدا نێژراوە.



حاجی عەبدوڵڵا خانی عەزیزی زەردوویی
١٣٣٨-١٣٨٣
یەکێک بووە لە دەوڵەمەندەکانی شاری کرماشان دەستی دۆستایەتی لەگەڵ زۆربەی خەوانینی عەشایری کرماشاندا هەبووە، مزگەوتی زەردووییەکانی ناو شاری کرماشان بە هاوکاری ئەم دروست کراوە.
دیارە لە سەردەمی جمهوریەتی ئیسلامیدا ماڵ و موڵکی زەوت کراوە.



مەحموود محەمەد ئەحمەد
١٩٠٢-٢٠٠٥
ئەم پیاوە لە ناو تیرەی زەردووییدا بە ڕێزەوە سەیر کراوە و لە دەوروبەریشیدا قسەی ڕۆیشتووە و ماڵەکەشی پەیوەستە بۆ میوانان کراوە بووە، یەکێک بووە لە پێشمەرگەکانی ئەیلوول و بەرگری لە پەلامارەکانی دوژمن کردووە و هەمیشە هانی عەشیرەتەکەی داوە لە پێشمەرگایەتیدا بەشداربن و دریغی نەکەن.

# وەڵەد بەگی

ئەم تیرەیە بۆ خۆی تیرەیەکی ناسراوە و فرە بەرەبابن لەناو جافی جوانڕۆدا، هەروەها لەنێو جافی مورادیشــدا، دیســان ناســراون و وەک ناوچەی جوانڕۆ، لە عێراقیشــدا بەگزادەیان هەیە و لەگەڵ بەگزادەکانی کەی جافدا خزم و خوێشــی و تێکەڵاون. سەیر لەوەدایە تەنیا بە بەگزادەکانی (روســتەم بەگی) دەڵێن جوانڕۆیــی، بە هۆزەکانی دەڤەری جوانڕۆ کە سەرتاســەری جافن ناڵێن جوانڕۆیی بەڵکو دەڵێن: جاف

## هەوارگەی وەڵەد بەگی لە زستاندا ئەمانەن:

کوری قەڵاســپی، کورە، رەئیس، ماخوشــین، بناوجکوە، کزازی، دێ ســوور، حەســەن ئاباد، بانشــلە، شەی بی، شــاینگان، مامنان، گراب، دەوڵەت ئابادی ســەروو، نەهرئاو، عەلی ئاباد، خانم ئاباد، گمشتەر، هلول..

## سنووری وەڵەد بەگی:

لە باکوورەوە جوانڕۆ، لە رۆژهەڵاتەوە رەوانە، لە رۆژئاواوە ناوچەی قوایەکان، لە باشوورەوە سنجاوی و گۆران.

لە هاویندا لەم دێهاتانەدان: تیلەکۆ، باوەیســی، شــێخ رۆژبەیان تەپەرەش، پشــتبلکە، جێگران، چەوتە..

ئایەتوڵڵا مەردوخ، دەربارەی بەگزادەکانی وەڵەدبەگی دەڵێت:
زۆرتــر لە ســەد خێــزان دەبن و بە ئازایی و شاســواری ناســراون وەڵەدبەگییەکان، جگە لە بەگزادەکان چەندین تیرەی ترن کە هەر بەو ناوەوە دەناسرێن:

## ١- دەروێشی:

یەکێکن لە تیرە ناسراوەکانی جافی جوانڕۆ، ئەم تیرەیە بە ئازایی و چاپوک سواری بەناوبانگن، هەروەها زیرەک و بە حیکمەتن، زۆربەیان لەســەر ســنوور دەژین نزیکی باوەیسی، زۆربەشیان کۆچەرن لە زستاندا دەڕۆنە شەشی و قولی قاورمە و دێ سوور.

## پیاوە ناسراوەکانیان، بۆ سەردەمێک ئەمانەی خوارەوە بوون:

١- کوێخا نادری حەمەی شاموراد
٢- حسێن محەمەدی شاموراد
٣- حوسەین عەبدولکەریم
٤- مەحموودی حوسەینی
٥- کەریم محەمەد عەلی
٦- مەلا فەتاحی بەهرۆزی

## ٢- تیرەی دلەژیری:

یەکێکە لە تیرەکانی جاف، ســەر بە وەڵەدبەگییەکانە، لە زســتاندا لە دێهاتی. کورکورە، شــێخ روزین، ریولە، باوەیسی، حاجی قادر، دەربەند زەرد، گوزەرون، ماشاندا دەژین.

لە هاویندا دەڕۆنە. مامتان، سەرابیان، گیلان بەرد، چەرموسوار، شاینگان، ئەنجیرە..

## پیاوە ناسراوەکانیان:

١- حاجی قادر عەبدولڕەحمان
٢- کوێخا حوسێن ئەعزەم بێگداد
٣- عەبدوڵلا شاە موراد
٤- کوێخا فەتحوڵلا کەرەم
٥- کوێخا محەمەد موراد خان
٦- کاکە عەبدوڵلای فەرەج
٧- حاجی ئەحمەد محەمەد مامە خان

**٣- تیرەی خالوان**:

لەبەر ئەوەی برێکی زۆر لەسەر تیرەکانی جاف لەگەڵ ئەم تیرەیەدا ژن و ژنخوازییان هەبووە بەو ناوەوە ناسراون. جگە لە ناوچەکانی وەڵەدبەگی لە دەڤەری ئاهەنگەرانی ئەلاهیرخانیدا دەژین و لەسەر تیرەی دەلەژیری دەژمێردرێن. هاوینان دەڕۆنە مامنان و سەرابیان و بە سەخاوەت و ناندەری بەناوبانگن پیاوماقووڵانی ئەم تیرەیە ئەمانەن:

١- کاکە عەلی محەمەد عەبدولعەلی
٢- کوێخا عەبدولعەلی سلێمان عەبدولڕەحمان.

**٤- قادر میروەیسی**:

ئەم تیرەیە بەشێکی راستەوخۆی تیرەی سەربەخۆی (قادر میروەیس)ین، کە زۆرتر لە ناوچەی زەهاو و ئەودیو سنووردا دەژین و بە جافی مورادی ناسراون، بەڵام برێک لەم تیرەیە رۆیشتنە ناو وەڵەدبەگییەکانەوە، لە سەردەمی فەتاح بەگ «صارمودەولە»دا. سەرۆکی تیرەی قادر میروەیسی کچەکەی فەتاح بەگی بۆ کوڕەکەی کوێخا عەلی حەسەن پوور مارەی کرد. قادر میروەیسییەکان زستان لە شانەڕەش دەگوزەرێنن، هاوینیش تەپەڕەش لە نزیکی سەرقەڵا و جێگیران کە ئەوسا بە لەوەڕگای تایشەیی ناسرابوو. کوێخا عەلی حەسەن برا گەورەیانە.

**٥- نەدری. نەبیری**:

ئەم تیرەیە، یەکێکن لە کۆنترین تیرەکان، لەم رووەوە، دکتۆر مەسعود کەمیهان و ئایەتوڵڵا مەردۆخ باسیان کردووە، کە گوایە پاشماوەی مادەکانن، یانی لە دووهەزار و پێنجسەد ساڵ لەمەوبەر، لە بەردە نووسراوەکانی سەردەمی دەسەڵاتی ئاشووریدا باس لە تیرەی «نەدری» دەکات، هەتاوەکو مێجەرسۆن دەڵێت: ئەگەر بنواڕینە مێژووی کۆن، ناوی «نەدری» وەبەرچاو دەکەوێت، ئازایی و لێهاتوویی ئەم تیرەی جافە لە مێژووی کۆندا بەناوبانگە و لەسەر تاتە بەردەکان نووسراوەتەوە و تا رادەیەکی وا دەوڵەتیان دروستکردووە. شەڕیان لەگەڵ دەسەڵاتدارێکی وەکو «تکلات بالازار»دا کردووە، بە درێژایی فەرمانڕەوایی بیستوسێ فەرمانڕەوایی دەسەڵاتی نەدری بە تایبەت شەڕی خوێناوی مەزگرد. ئەو شەڕە لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا باس کراوە. یانی ٩١٠ ساڵ پ ز.

نەدرییەکان چقڵی چاوی گەورەترین دەسەڵاتی دنیا بوونە، کە ئەو دەم دەسەڵاتی ئاشوور بووە (سەیر لەوەدایە ئەم تیرە ئازایە کە بە باوکی مێژوو دەژمێردرێن و کوردن، ئێستاش تیرەیەکن لە هۆزی جاف، مێژوونووسانی کورد ناویان ناهێنن. من نازانم لە نەزانینەوەیە، یان

وەک زۆر شــتی دیکە کەمتەرخەمییە لە بەرامبەر حەقایقی مێژوو، هەر کامیانی بێت نەشــیاوە و ناپەسندە).

وا دیارە مێژوونووســانی بیانی زۆر پابەندی وردەکاری مێژووی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاســت و دەوروبەرەکەین، بۆیە بە درێژایی دەسەڵاتی نەدرییەکان نووسیویانە، وەک لەو بەردە نووسراوانەدا دەرکەوتووە، تەواوی هۆز و عەشایەرێک لە ولایەتی (دیاربەکر، خەرپوت، دەرسیم)دا دەژیان.

بە لای ئاشوورییەکانەوە بە نەدری ناسراو بوونە، تا گەیشتووتە چیای بتلیس و توروس، ئەو دەڤەرانە دوای لەناوچوونی دەسەڵاتی ماد بە ناوچەی کوردان ناسراون، بە نەژادی کوردی ئێستا دەژمێردرێن، ئەمەش مایەی شانازی ئێمەی هۆزی «جاف»ە کە تیرەی «نەدری» ئەوڕۆ یەکێکە لە تیرەکانی ئێمەی جاف، ئەوڕۆ ئەم تیرەیە لە دەڤەری «جوانڕۆ»دا دەژین، بە تایبەت لە دێهاتی وەک: کمشــتەر، پیرۆزە، نەهرئاوی، گراب، دەوڵەت ئاباد، ســادق ئاباد، ڕوانسەر و لە دێهاتەکانی وەکو: تورکەپان، کەلی، بیاشــوش، کانی گوڵ، کولســەوە. لە هاویندا لە: پشتیلکە، بەمو، کامیاران، چرسانە، زیونە، قلاداراخان.

## پیاوە ناودارەکانی ئێستایان:

١- مــەلا عەبدولمەجیدی موەحــەدی نەدری، کە بۆ خۆی مەلایەکی بەناوبانگی ســەردەمی خۆی بووە.
٢- خەلیفە حوسەینی بان چیا.
٣- مەلا ئەحمەدی نمایندە
٤- کوێخا مستەفای سادق ئاباد

### ٦- کاکە ڕەشید:

ئەم تیرەیە تاوەکو ئەوڕۆ هەر کۆچەرن، لاشەڕن، دوورن لە کێشە و بگرەوبەردە.. لە زستانان دەڕۆنە: ملەدزگە، کانی شرینە، تووەوشکە، کیکەچەرموو، گوزەرەوت، بەلەفیرە، دەرون زەرد..

هاوینان دەڕۆنە: بناچکو، کوزازی، گرابی، سەروو.

### ٧- عەلی ئاقای- یان عەلیاخەیی

ئــەم تیرەیە لــە تیرەی عەلی یاخەیی لە قوایی جویێ بوونەتەوە لە ســەردەمی ســەرۆکایەتی

حەبیبوڵڵاخانی باوەجانیدا ڕۆیشتوونەتە ناو وەڵەدبەگییەکان، یانی ئەوە نزیکەی دووسەد ساڵ دەبێت.

زستانان دەڕۆنە: تیلەکۆ، تووەوشکە، دارەوەن، کەریم ئەوڕەحمان، سیوەرەهوار، تەڕەش، تەقتەقی نادر، دۆڵەوشکە، کوێخا عەزیز، سەرقەڵا..

هاوینان دەڕۆنەوە بۆ شەش دارەبی، هلول، نەیریژ، ملەلو..

ریش چەرموانیان ئەمەنانە:

١- حاجی سەید ئەحمەد سان ئەحمەد
٢- کوێخا عەبدولعەزیزی محەمە قادر.
٣- کوێخا کاکە حەسەن
٤- کوێخا غەفووری یوسفی
٥- کوێخا حەسەن سالح وەلی
٦- کاکە حوسێن
٧- کوێخا سەید ئەحمەدی سان ئەحمەد

٨- **یوسف یار ئەحمەدی**:

بەشێکن لە هۆزی یوسویار ئەحمەدی، لەسەر جافی مورادی دەژمێردێن، دەمڕاستیان حاجی عەبدولعەزیزە.

٩- **گاخۆری**:

لەوە دەڕوا ئەم تیرەش وەک نەدرییەکان لە هۆزە کۆنەکانی کورد بن و ئەوڕۆ تیرەیەکن لە تیرەکانی جاف، زۆرتر لە دەڤەری قەرەتەپەی کەرکووک دەژین و بڕێکیان بەرەو سەرقەڵا و جێگیرانی کۆچیان کردووە «مەردۆخ»
براگەورەیان «حاجی حوسەینی گاخۆری»یە.

١٠- **گورگ کوژ**:

یەکێکن لە تیرە کۆنەکانی ناو جافی جوانڕۆ، زۆرتر تێکەڵاوی وەڵەدبەگییەکانن، بەڵام سەردەمێک لەسەر «جافی گۆران» دەژمێردران.

گورگکوژەکان لە گەرمەسێردا هەروەها لە لیلاخیشدا کشتوکاڵیان کردووە، لە کوڕکوڕە و چەوتە، قەڵاسپی، حەسەن ئاباد، شانەڕەش دەژین.
کوێخاکانیان:

١- محەمەد جوانڕۆیی
٢- محەمەد میرزایی
٣- محەمەدی وارانی. لەکاتی خۆیدا دەمڕاستی ئەم تیرەیە بوو.
٤- محەمەدی عەلی

## ١١- قادر میروەیسی:

ئەم تیرەیە لەسەرتاسەری دەڤەرەکانی جافدا لێرەولەوێ بەدی دەکرێن، ئەگەرچی لەسەر جافی جوانڕۆ دەژمێردرێن، بەڵام لە نێو جافی مواردیشدا وەک تیرەیەک حیسابیان بۆ دەکرێت و لە ئێراندا لە ناو هۆزی کەلهوڕدا بڕێکیان هەن و بە تیرەی «بوداق بیگی» ناو دەبرێن، لە پێش مەشرووتییەتدا ئەم تیرە بۆ خۆیان سەربەخۆ دەژیان، بەڵام لە دواییدا لە سەردەمی فەتاح بەگی وەڵەدبەگی «صارمولدەولە»دا هاتنە ناو وەڵەدبەگییەکانەوە. ئەودەم کوێخا حەسەنی قادر میروەیسی سەرۆک خێڵیان بووە و فەتاح بەگی وەڵەدبەگی کچەکەی لە کوڕی کوێخا حەسەن مارە کردووە کە ناوی «کوێخا عەلی حەسەن پوور» بووە.

ئەم تیرەیە هاوینان دەڕۆیشتنە «شانەڕەش» و زستانانیش دەگەڕانەوە «تەپەڕەش» لە ناوچەی سەرقەڵا. دوا کوێخای ئەم تیرەیە «عەلی حەسەن» بووە لە ساڵی ١٣٧١ک مردووە.

## ناوی وەڵەدبەگی

ئەمەیان لێدوانی تیا نییە، کەوا بەگزادەکانی زایەر بەگی کە بە «کەیخوسرەو بەگی» ناسراون، هەروەها بەگزادەکانی جوانڕۆیی «ڕۆستەم بەگی» و بەگزادەکانی وەڵەدبەگی باوەجانی و سەرەنجام بەگزادەکانی قوایی یان «قوبادی»، ئەم چوار بەرەبابە یەک پشتن و کوڕی یەک پیاون و دەگەڕێنەوە سەر «سەیدی» ئەحمەد بەگ، کە ئەویش دەگەڕێتەوە سەر پیرێک بە ناوی «پیرخدر» لێرەدا هیچ دیکۆمێنتێک نە مێژوویی و نەنووسراو نییە بسەلمێنێت کە ئەم پیرە لە حەقیقەتدا لە ڕەگەزی سادات بێت، جگە لە شەجەرەنامەکەی «مەولەوی» تاوگۆزی نەبێت، کە ئەویش زەحمەت و دژوارییەکی یەکجار زۆری کێشاوە تا بڕێک لە ناسراوانی ئەو دەمە مۆریان کردووە و بۆیان سەلماندووە..

ئەوانەی مەولەوییان ناسیوە و ئاگاداری پایەی بەرز و بڵندی شاعیرێتی ئەو پیاوە بوونە پێموانییە دریغی پەنجە مۆرێکیان لێ کردبا، کە هیچ پوول و پارەیەکی تیا زەرەرمەند نەبووە و

شاعیرێکی وا گەورەش بە مۆرێک دڵخۆش و ڕەزامەندیش بکا، لە لایەکی دیکەوە بە گوێرەی ئەو شـەجەرەنامەیەی مەولەوی ئێمەی بەگزادەی جافی مورادی لەگەڵ ئەو سێ بەرەبابە کوڕی یەک پشـتین، ئەمەیان حاشـا هەڵنەگرە. باشە مەولەوی لە سـەردەمی حەمەپاشای جاف و مەحموود پاشای جافدا ژیاوە، زۆریش تێکەڵیان بووە، بۆچی هیچ جۆرە مەدرەکێک پسوولەیەک چوارینەیەک بەدەسـتەوە نییە، وەک گفتوگۆیەک یان باسـێک لە نێوان ئەو دوو پاشا بە دەسەڵاتە و مەولەویدا. ئەوە کەشکۆڵەکەی مەحموود پاشای جاف کە پڕە لە وردەکاری. ئەوە تەواوی ئەسناد و فەرامین و پەیوەندییەکیان ئەو پاشماوانە هێشتا ماون و پارێزراون، کوا پسوولەیەک لەم ڕووەوە؟.

بێگومان لەم ڕووەوە لە فەسـلەکانی دیکەدا بە درێژی دەدوێین، ئەگەر پیر خدر سـەید بێت، یانی زایەر بەگ و ڕۆسـتەم بەگ و وەڵەدبەگی باوەجانی و قوبادییەکانیش سـەیدن، ئەمەش سەد پرسیاری بە دواوەیە...!!

دێمـەوە سـەرناوی وەڵەدبەگـی، ئەم بنەماڵەیە کە ئێسـتا ڕەنگە چەند هەزارێـک بن لە نەوە و نەتیجـەی «وەڵەدبەگـی» بووە و هەر بەو ناوەشـەوە ماونەتەوە. ئەگەر «سـەیدی» ئەحمەد بەگ «سـەید»بوایە و «سـەیدی» نەبووایە، یانی «گەورەم» دەبووایە ناوی وەلەدبەگ «سـەید وەلەدبەگ» بووایە..

وەک بە بەندە ناڵێن «سـەید خوسـرەو بەگ»، بە هیچ بەگێکی وەلەدبەگی یان جوانڕۆیی یان قوایی ناڵێن، سەید فڵان بەگ!!

لە برێک سـەرچاوە مێژووییەکاندا لە بارەی ئازایەتی و لێهاتوویی بەرەبابی وەلەدبەگییەکان زۆر دواون، کەوا ئازا و نەترس و کوڕی دواڕۆژ بوونە، هەروەها دەسەڵات و قودرەتی بەربڵاویان هەبووە لە ناو تێکڕای هۆزی جاف و دەوروبەریدا..

پەیوەندی ژن و ژنخوازییان لەگەڵ دوو دەسـەڵاتی گەورەی ئەو سـەردەمەدا هەبووە، وەک ئیمارەتی ئەردەلان و ئیمارەتی بابان، لە ناو هۆزی جافدا توانا و دەسەڵاتیان زۆر هەبووە، هەتاکو دوای مردنی کەیخوسـرەو بەگی جاف ئەودەم حەمە پاشـا مێرد مندال بووە و قادر بەگی برای لـە ڕووداوێکدا کوژراوە و کەیخوسـرەو بەگی باوکی لە تەمەنێکی گەنجیـدا مردووە، وەلەدبەگ بە هۆی خاڵوانی بابانەوە دەیەوێت ببێتە سـەرۆکی جاف و پاشـای ئەو وەختەی ئیمارەتی بابان پاڵپشـتی دەکا و بەزەر و زۆرەوە بۆی دەکۆشـێت. بڕوانە (ڕۆمانی پاشـایان کوشت- خوسرەو جاف) بەڵام تیرەکانی جاف و زرنگی خودی محەمەد بەگی جاف لە دواییدا بوو بە پاشا، بەرگری لەو بەرنامە و بۆچوونە کردووە.

لـە دەڤـەری جوانـڕۆدا وەلەدبەگی لە زۆربـەی زۆری ڕووداوەکاندا حزووریـان هەبووە و تەماشـاکەر نەبوونـە. بـۆ نموونـە کاتێک عەبدوڵڵا بەگـی وەکیلی جوانڕۆ، دژ بـە تاڵان و بڕۆی محەمـەد سـادق خانی ئـەردەلان دەکەوێتە تەقەللا و خۆپیشـاندان، محەمەد سـادق خانی ئەمیر وەختی جوانڕۆ دەتوانێت عەبدوڵڵا بەگ بە کۆتکراوی بۆ شـاری سـنەی پایتەختی ویلایەت ببات. وەلەدبەگ بەرامبەر ئەو کارە بێدەنگ نەبووە و دەستی داوەتە چەک دژ بە ئەردەلانەکان. ئەمانوڵڵا خانی ئەمیری گشـتی ئەردەلانی ناچار کردووە بێت بۆ جوانڕۆ، بە پێی سـەرچاوە مێژووییەکان

وەک (حەدیقەی ناسـریە یان تەئریخی ئەردەلان- مەسـتوورەی کوردسـتانی). وەلەدبەگی جاف یەکێـک بووە لە کەڵەپیـاوە ناودارەکانی زەمانی خۆی. بەڵام ئەمانوڵلاخـان لەو هاتنەیدا توانیویە دەستگیری بکا و دوو کوڕەکەی ڕۆستەم بەگ و حەبیب بەگ لە قەڵای «قصلان»دا زیندانی بکات و بۆخۆی وەڵەدبەگیشی لەشاردا دەستبەسەر کردوە.

دوای یەک سـاڵ لە دەستبەسـەری، بەخشـێنراوە و یەکێک لە کچەکانی میرزادە مارە کراوە، کامکار حوسـەین عەلی خان و ئەو دەم وەلەدبەگ نێردراوەتەوە ناو هۆز و دوو کوڕەکەی هەر لەوێدا ماونەتەوە.

بـە دوای گەڕانـەوەی وەلەدبەگ بۆ ناو عەشـیرەت زۆری نەخایاندووە مردووە، بەڵام ئەوی تۆمارکراوە زۆربەی شۆڕشە عەشایەرییەکان دژ بە دەسەڵاتی ئەردەلان، لە لایەن کوڕ و کوڕەزای وەلەدبەگەوە ئەنجام دراوە.

## یەعقووب بەگی یەکەم

لە ساڵی ١٢٢٥ک، سەفی خانی سوڵتان زۆربەی موڵکەکانی خۆی کە لە دەڤەری وەلەدبەگییەکاندا بـووە، لەجیاتـی ئەوەی واگـوزاری کا بە والی هەروەها محەمەد سـادق خان ئـەو موڵکانەی وا گـوزار کردووەتـە یەعقووب بەگی سـەرۆکی وەلەدبەگـی و ئەو هەنگاوە بووەتـە هۆی بەهێزی وەلەدبەگییـەکان. لە لایەکـی دیکەوە ئەردەلانییەکان تا دەهات تەنگیان لە تایفەی ڕۆسـتەم بەگی جوانڕۆ هەڵدەچنی و ئەوان لەگەڵ وەلەدبەگییەکاندا لە سەیدی ئەحمەد بەگدا یەک بەرەباب بوونە و پێکـەوە دژ بـە دەسـەڵاتی ئەردەلان کەوتوونەتە ململانێ و شـۆڕش، بەڵام لە سـاڵی ١٢٧٤ک ئەردەلانـەکان توانیویانە بە هـۆی پیلانێکی نامەردانە بەرنامەیەک داڕێژن لە نێوان ئەو دوو تایفە خزمە تێکدەن و خوێن بخەنە نێوانیانەوە.

## بارام بەگی گەورە:

گەورەکانی وەڵەدبەگی، یەک لە داوی یەکدا لە شەڕی بەرگری دژ بە دەسەڵاتی ئەردەلانەکان بە شێوەی جۆراوجۆر کوژراون، کە دەسەڵات دەکەوێتە دەستی بارام بەگی وەلەدبەگی قودرەت و توانای خێڵی وەڵەدبەگییەکان پەرە دەسـێنێت. توحفەی ناسـری دەڵێت: «بارام بەگی سەرخێڵی جوانڕۆ، پەیوەستە بە هێزێکەوە لە تالان و بڕۆی ناوچەی شارەزووردا بووە لەبەر ئەوەی لەژێر فەرمانی «خوسـرەو خانی والی»دا بووە و چاوسـاقی ئەو بووە، کەسێک نەیتوانیوە بەرهەڵستی بکا وردە وردە لەخۆی بایی بووە و ئیدی هیچ باجێکی نەداوەتە دەسەڵاتی والی و لە والی یاخی بووە. والی فەرمان دەداتە لەشـکر و بەرەو ناوچەی گۆران دەکشـێتە خوارەوە، لەشکر بە داویدا دەڕوات و سـەرەنجام بارام بەگ و چەند پیاوخاسـێکی دیکەی جاف دەسـتگیر دەکا و دەیەوێت بیانکوژێت، بەڵام خەڵکی ناسـراوی دوورونزیک دەڕۆنە لای والی و چوار هەزار تمەنی ئەو کاتە

خاوەی لێدەسەنرێت و پەیمانی بێدەنگیش تۆمار دەکا و دووبارە ریاسەتی جافی پێدەدەرێتەوە.

لە کتاوی (لب تاریخ موسەنفولئەردەلان) دەڵێت:
لــە ســاڵی ١٢٤٧ک بــارام بەگی وەلەدبەگی کە شــێری بــەلاوە رێوی بووە و بــە کەڵەپیاوی ســەردەمی خۆی ژمێراوە، شــارەزوور و عەرەبســتانی تاڵان کردووە و ئەوی لای خۆش بووە کردوویەتی و پیاوی بە پیاو نەزانیوە. هەر ئەو نەخوەتە بووە هۆی ئەوەی لە والی خوسرەوخان یاخی ببێت و هیچ باجێک بە والی نەدات.

ئیدی دوای ئەوەی محەمەد پاشا دەبێتە شای قاجار دەسەڵات لە کرماشاندا دەگۆڕێت و لەو هەلومەرجەدا (ســەلمان خانــی گۆرانی قەڵازنجیری) دەکوژێت کە خوشــکەزای بارام بەگ بووە، دیــارە ئەم ســەلمان خانە زوڵم و زۆرێکی زۆری لە یەکێــک لە تایفەکان کردووە بە ناوی «خێڵی قوری»، بەهرام بەگ لە تۆڵەی سەلمان خانی خوشکەزایدا زۆریان لێ دەکوژێت و تاڵانیان دەکات. بەهرام بەگ چەندین ساڵ سەرۆکی دەڤەری جوانڕۆ بووە لەو سەردەمەیدا هیچ کەسێ نەیتوانیوە دەستدرێژی بکاتە سەر ئەو دەڤەرەی.

## سەعید بەگی یەکەم:

کــوڕی گــەورەی بارام بەگ بــووە، دوای مردنی باوکی جێگەی گرتووەتــەوە، کچی ئەحمەد ســوڵتانی هەورامی هێناوە، بەو بۆنەیــەوە خزمایەتی لەگەڵ لهۆنییــەکان پتەوکردووە، لە لایەکی دیکەوە لەگەڵ غەفار بەگی جوانڕۆیی نێوانیان بەرەو چاکی رۆیشتووە و ژن و ژنخوازی کەوتووتە نێوانیانەوە. کچی سۆفی بەگ شووی کردووە بە فەرەجوڵڵا بەگی جوانڕۆ، کە وەکیلی وەخت بووە و برای غەفار بەگی کوژراو بووە.

دوو تیرەی شەرەف بەیانی و سنجاوی کەوتبوونە تەنگەبەریەوە لە لایەکی دیکەوە ئومەرای ئەردەلان هانیانی داوە تا بکەونە بیری لەناوبردنی ســەعید بەگەوە و لە شــەوێکدا دەدەن بەسەر خێڵەکەی سەعید بەگدا و دەیکوژن و سەری دەبڕن.

## عەزیز بەگی سەرخێڵی وەڵەدبەگی:

لە ســاڵی ١٢٥٣ک دوای کوشــتنی ســەعید بەگ کە ژنەکەی لە تیرەی تایشەیی بووە، عەزیز بەگ ئامۆزای ســەعید بەگ بووە، جێگەی ســەعید بەگ دەگرێتەوە و دەبێتە ســەرۆکی خێڵ، زۆر نابا ئەویش دەکوژرێت.

## ڕۆستەم بەگی سەرۆکی جافی وەلەدبەگی:

ئەم ڕۆستەم بەگە، کە بووە بە سەرۆکی وەلەدبەگییەکان جوان خاسێکی تازە پێگەیشتوو بووە، ئازا و شان و مل ئەستوور و سوارکار و ڕم وەشێن. کە بیستوویەتی وا عەزیز بەگ لە لایەن سنجاوییەکانەوە نامەردانە کوژراوە، سەرەتا دەکەوێتە کۆکردنەوەی خزم و خوێشانی، تا تۆڵەی باوکی لە تیرەی شەرەف بەیانی بسێنێتەوە، ئەودەم ئەمیر خان بەگی شەرەف بەیانی، سەرۆکی شەرەف بەیانییەکان دەبێت، بە بکوژی سەعید بەگی باوکی ناسراو بووە، ئەمیرخان بەگ ئازا و شۆڕەسواری دەورانی خۆی بووە، لە ڕووداوێکدا ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، ڕۆستەم بەگ بە زەبری ڕم ئەمیرخان بەگ دەکوژێت، ئەو ڕووداوە بووە هۆی ئاوازەی ناوباوی لە دەوروبەریدا، دوو کەسی بەناوبانگی هۆزی سنجاوی سوهراب خان و سەفەر خانی سنجاوی کە بە سەفەرخانە شەل ناسراو بووە، کە هەردوو ئەو دووانە پیلانی کوشتنی سەعید بەگیان داڕشتبوو. سەرەتا ڕۆستەم بەگ لەگەڵ سوهراب خاندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە و دەیکوژێت و سەفەرخانیش دەستگیر دەکات و جلی ژنانەی لەبەر دەکات و دەینێرێتە ناو سنجاوی، سەفەرخان دووبارە خۆی جموجۆل دەکا و لەگەڵ ڕۆستەم بەگدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، ئەمجارەیان مۆڵەتی ناداتێ و سەفەرخان دەکوژێت. ئیدی دوای ئەو شەڕانە ڕۆستەم بەگ وەک قارەمانێک ناو دەبرا و بەیت و بالۆرەیان پیادا دەگوت:

**دەشتەکەی کەرە گشتی چاڵ چاڵە**
**ڕۆستەم لەشی خست وەکو تەپاڵە**
**سەفەرخانە شەل بۆ ئەوەندە قنجی**
**ڕمی ڕۆستەم بەگ دای لە کولنجی**

لە دوای کوشتنی ئەمیر کەبیر، لە لایەن ناسرودین شاوە، عەشایەری کوردستانی ڕۆژهەڵات کەوتنە شۆڕش و ململانێ. دوو لە خاڵۆکانی ڕۆستەم بەگ کە سانەکانی لهۆن، بوونە لایەن شەرەفولمولکی ئەردەلانەوە دەکوژرێن، وەلەدبەگی و هەورامی و باواجانی و بڕێک لە تیرەکانی وەک قوایی و جوانڕۆیی کۆدەبنەوە و پەلاماری جوانڕۆ و قەڵای جوانڕۆ دەدەن. تاکو تۆڵە لە شەرەفولمولک بکەنەوە، دیارە بەختی هێناوە و لە مردنی حەتمی ڕزگاری بووە و ئیدی دەسەڵاتی ئەردەلان دەکەوێتە کۆکردنەوەی هێز و ناچار دەبن بەرەو شارەزوور کۆچ بکەن. سەرەنجام ڕۆستەم بەگ بە پیلانی سنجاوییەکان بە غەدر لە لایەن خزمەتکارێکەوە بە ناوی قەمەر بە خەنجەر دەکوژرێت..

دوو کوڕ لە ڕۆستەم بەگ بەجێدەمێنێت: محەمەد بەگ کە پاڵەوان ڕەفتار بووە و عەبدوڵڵا بەگ کە دەروێش سیفەت بووە.

## فەتاح بەگی وەلەدبەگی:

دوای چاوەڕوانــی دوورودرێــژ حەبیبوڵڵاخانی باوەجانی، خورشــیدە خانمــی کچی لە فەتاح بەگ مارە دەکا و دەبێتە پاڵپشــتی. وردە وردە دەســەڵات پەیدا دەکا و ئیدی بیروڕای وابووە ئەو ســنوورەی عوســمانی و قاجــاری دایناوە زوڵــم و زۆرە لە جاف و کورد کراوە، ئەوەی ئاســنی سنوور هەیە هەڵیکەندووە و دانی پیادا نەناوە. کە ئەوە سنووری ئەو دوو دەسەڵاتەیە بە غەیری خورشید خانم دوو ژنی دیکەی هەبووە، سەرجەم حەڤدە کوڕی هەبووە و لەسەردەمی دەسەڵاتی فەتاح بەگدا، وەلەدبەگی دیسانەوە بوونەتەوە خاوەنی دەسەڵات.

لەسەردەمی فەتاح بەگی وەلەدبەگیدا رووداوی زۆر و سەیر سەیر روویداوە وەک:

١- شەڕ و تاڵانی شێخ سمایلی
٢- رووداوی بێ نەهر.
٣- رووداوی گردەمو.
٤- رووداوی قەڵاچەرمو.
٥- رووداوی ملە دزگە.
٦- داگیرکردنی دەڤەرەکانی جاف لە لایەن لەشکری رووسیای قەیسەرییەوە.
٧- راپەڕینی مەشرووتییەت.
٨- پەنابردنی سەردار مقتەدری سنجاوی و شەڕی چەرموسوار.
٩- شەڕی مەنمی و گەلباخی.
١٠- دەستگیرکردنی سەرۆکەکانی جافی جوانڕۆ.
١١- داگیرکردنی رەوانسەر.
١٢- دەستگیربوونی سەردار ئەکرەم بەهرام بەگ.
١٣- راپەڕینی سۆفی بەگ و بەبرولسەڵتەنە.

## حاجی یەعقووب بەگی سەردار ئەمجەد سەرۆکی وەلەدبەگی:

دوای ئەوەی ســەرۆکی وەلەدبەگی لە زیندانی رەزا شــادا مردووە، ئەوە بوو دوای سەرۆک عەشیرەتە گیراوەکان لە زیندان ئازاد کران ١٣٢٠ک.

حاجی یەعقووب بەگ دەبێتە ســەرۆکی وەلەدبەگی، حاجی یەعقووب بەگ نازناوی «ســالار ئەمجەد»ی پێ درابوو، بەڵام شەریفولدەولە بۆ دووبەرەکی نانەوە نازناوی «سەردار ئەمجەد»ی

پێ بەخشی، بەڵام ئەو زۆرتر بە حاجی سەردار ناودەبرا.

هیچ کاتێک لەگەڵ دەوڵەتی تاراندا نەدەگونجا و پەیوەستە لێیان بە گومان بووە. لە راپەڕینی دکتـۆر موسـەدەقدا لایەنگیـری ئینگلیزی کرد، یاقوب بەگ لە ژیاندا کۆشـاوە، فەتاح بەگی کوڕی بهێنێتە مەیدانەوە و کارێکی وایکرد فەتاح بەگ هیچ جۆرە نازناوێک قەبوڵ نەکات.

## وەلەدبەگی:

عەلـی ئەکبـەری وەقایع نیگاری کوردسـتانی ناسـراو بە (سـاداتولمولک) کە لـە خەوانینی ئەردەلانەکان بووە و لە سەردەمی دەسەڵاتی ناسرودین شای قاجاردا ژیاوە و لە بارەی هۆزەکانی کوردی نووسیوە (١٢٦٤-١٣١٣ک) لەو رووەوە لە بارەی وەلەدبەگییەوە دەڵێت:

ئەم تایفە شـۆرەتێکی یەکجار زۆریان هەیە، کە چەندە ئازا و پەلاماردەر و دەمڕاسـت بوونە، لە ناو هۆزەکانی دەوروبەریاندا و لە ناو کوردا تێکڕا ئەو شۆرەتەیان بۆ پەنجەمۆرکراوە.

لــە مێـژدا ئەم تیرەیە زۆر بوونە، بەڵام لەبەر ئازایەتی و شــەڕ و شـۆڕی بەردەوام زۆریان لێ کوژراوە و پیاوی گەورە و دەمڕاسـتیان زۆر تیا هەڵکەوتووە وەک: بارام بەگ، سـۆفی بەگ، رۆستەم بەگ. ئەوانە وەک رۆستەمی داستان بوونە.

ئەم تیرەیە ژێردەستەی زۆریان هەبووە، بڕێکی زۆر لە تیرەی تایشەیی کە ئێستا لەژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایانی گۆرانن بەشی کرماشان، بڕێکی دیکەیان ئەوڕۆ لە دەڤەری «ماهیدەشت»ن، بەڵام زۆری بەدوای لەوەرگادا بۆئاژەڵەکانیان دەڕۆنە شـانیگان، کرەوز، بازان زستانانیش دەگەڕێنەوە بۆ دامێنی. میخەو، جێگیران، سورمەر، رازان و ئیلاخ میشی و لەبەر ئەوەی لەسەرەتاوە لە نەتەوە و زادەی پیاوێک بوونە بە ناوی وەلەدبەگ، هەر بەو ناوە ناسراون بە وەلەدبەگی.

وەقایع نیگار دەڵێت:
ئەم تیرەیە ئەوەندە ئازان لایان شوورەییە بە مەرگی خودایی بمرن، زۆربەی زۆریان لەشەڕدا دەکوژرێت و بە داخەوە ئەم تیرەیە ئەوڕۆکە لە باری ئابوورییەوە دەستکورتن و پەریشان حاڵن بەسـەر ئەوەشـدا زۆربەی عەشـایەری جاف و غەیرە جاف ترس و چەکەرەی زۆریان لەم تیرە لە دڵدایە.



محەمەد بەگی بەهرامی
بەگزادەی وەلەدبەگی
١٩٧٤-١٩٠٤



فەتاح بەگی ئەمجەدی
وەلەدبەگی
١٩٦٧-١٨٩٧



حەسەن بەگی ئەمجەدی
وەلەدبەگی
١٩٥٩-١٩٠٠



چەند کەسێک لە بەگزادەکانی وەلەدبەگی
لە چەپەوە:
١- حەسەن بەگی ئەمجەدی
٢- محەمەد بەگی بەهرامی
٣- محەمەد تاهیر بەگی سوڵتانی
٤- حوسێن بەگی ئەرفەعی
دانیشتوان لە چەپەوە:
فەتاح بەگ لە نێوان دوو ئەفسەری
ئێرانیدا.



سەردار ئەسعەدی سەرۆکی وەلەدبەگی



جیهانبەخش خانی وەلەدبەگی
شەوکەت بەگی ئەمجەدی

# شەرەف بەیانی

تیرەی شـــەرەف بەیانی زۆرتر لە ســنووری ئێراقی ئێستادا دەژین تا بەری ئێران. هەرچەندە دێیەکان لە ئێراندا هێشتا ماوەتەوە. ناوچەی تەواجودیان لە باکوورەوە دەربەندیخانە، لە باشوور ئەزگلەیـە، لە رۆژهەڵاتەوە هاوسـێی تاوگۆزین و باوەجانی و رۆژهەڵاتیش شـەقامی جەلاولا و سـلێمانییە، ئەمەش برێک ناوی ئەو دێهاتانەی کە ســەر بە شــەرەف بەیانین: قەیتول، پشتە، گمە، گلەچاڵ، باوەیسـی، هۆرین، شـێخان. شــەرەف بەیانـی تیرە و بەرەبابی زۆری تیـادا نییە، برێک تیـرەی تر لە ژێر چاودێری بەگزادەی شــەرەف بەیانیـدان، دەوڵەتی ئێران بۆ بەربەرەکانی برێک تیرەی تالآنکەری جاف، بەگزادەکانی شەرەف بەیانی بەهێز کردووە، شەرەف بەیانییەکان هاوینان دەڕۆیشتنە بەمۆ و شەواڵدەرە..

## ناوی شەرەف بەیانی:

ئەوسا بە «شەرەوایەنی» ناودەبران، قاجارییەکان بە زاراوەی خۆیان ئەو ناوەیان گۆڕیوە و کردوویانە بە «شــەرەف بەیانی». لە سەردەمی دەسەڵاتی عەبدولحوسێنی فەرمانفەرما شەرەف بەیانـی بە (شـیرخاینی) ناو بـراوە. میرزا جەعفەر خانی موشـیرولدەولە لە نامـە نیگارییەکاندا، شەرەف بەیانی بە «شەرەف یەهائودینی» ناو دەبات.

ســەید تاهیری هاشــمی لای وایە رەگەزی بەگزادەکانی شەرەف بەیانی پەیوەندی بە بەقییەی شــەرەف بەیانییەوە نییە، بەڵکو «شــەرەف» ناوێک خەڵکی بادینان بووە بە (شــەرەف بادینانی) ناوبراوە، دواتر بووەتە «شــەرەوایەنی». ســەید تاهیر چەند بە ئاسان نازناو و رەگەز و بنەچەک دەگۆڕێـت و دەبەخشـێت، هەر لەبەر ئەوەی ناوی «شــەرەف» بووە و بەیانـی بۆ بادینی بێت؟ کەواتــە بیانی ئەو تیرەکــەی جافیش لە بادینانەوە هاتوون. من نازانم لــە رووی چ لێکدانەوەیەک ســەید تایــەر پەنــا دەباتە بەر ئەو جــۆرە بۆچوونانە؟ خودی شــەرەف بەیانییەکان شــەجەرە و رەگەزی باو و باپیرانیان لایە و دەگەڕێنەوە سەر پیاوێک بە ناوی «ئیبراهیم ئیناخ» و بنەچەکەیان دەگاتە پیرخدری شــاهۆ، ســا پیر خدری شــاهۆ ســەید بێت یان ئەهلی حەق دوور نییە ســەیدی

ئەهلی حەق بووبێت، بێگومان ئەو زنجیرەی وا «مەولەوی» دروستی کردووە بڕێک لایان وایە لە راستییەوە دوورە، ئەوە چەندین دیکۆمێنتی مێژوویی لەبەردەستە، جاف دەگەڕێتەوە سەر «جاوان» و جاوان دەگەنە سەر «جاپان» و لە سەردەمی ئیسلامدا، جاوان بڕێکیان ئەهلی حەق و عەلی وەڵڵاهی بوونە. هەردەم لەم روانگەیەوە، میرزا جەعفەر خانی موشیرولدەولە نووسیویەتی: شەمیران کە پەیوەندی لەگەڵ سیرواندا لە رۆژهەڵاتەوە شاخی بەمۆیە و خانەشۆریش لەولاوە هەر هەموو ئەو ناوچانە لەژێر دەستی عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەهائودینداین، مەبەستی لە شەرەف بەهائودین شەرەف بەیانییە. لە سەردەمی ریئاسەتی وەزارەتی ئەمیر کەبیردا، کە سەرەک وەزیرانی ناسرودین شا بووە و لە دواییدا کوشتوویەتی، عەبدوڵڵا بەگی شەرەف بەیانی نازناوی «میرپەنجی» پێدراوە. ئەوی شەڕکەری سوارەی شەرەف بەیانی هەیە وەک سنووردار لە خزمەتی دەوڵەتدا بوونە «د.محەمەد عەلی سوڵتانی».

لە موکاتەباتی ئێراندا، بە چەند جۆر ناوی شەرەف بەیانی هاتووە، وەک: (شەرەف خاینی، شەرەف باینی، شەرەف بەیانی).

## عەزیز بەگی میر پێنج:

دوای مردنی عەبدوڵلا بەگ، عەزیز بەگ جێگەی دەگرێتەوە و نازناوی «میرپێنج»ی پێ دەوترێت، بە دوای ئەودا سلێمان بەگ جێگەی دەگرێتەوە، بەڵام عەلی خان کوڕی دووهەمی عەزیز بەگ پیلانی کوشتنی براکەی دادەڕێژێت و محەمەد ساڵح مستەفا عەلی بەگ هان دەدات، تا سلێمان بەگی برای بکوژێت و دوای کوشتنی جێگەی دەگرێتەوە و ئیدی ئەو وەعدانەی دابوویە محەمەد ساڵح بەگ ئەنجامی نادا و هەر ئەو هۆیە دەبێتە هۆی محەمەد ساڵح، عەلی بەگیش بکوژێت و رابکاتە ناو عوسمانییەکانەوە.

## شەڕی شێخان

وەلەدبەگییەکان هاوسێی شەرەف بەیانییەکان بوونە، لەسەر زەویوزاری دەسەڵاتی ناوچەی ناکۆک دەبن و ئاژاوە دەکەوێتە نێوانیانەوە، سەرەتا پەیوەندی لەگەڵ حەمە ساڵح بەگدا دەکەن و دەڕۆن بۆ شێخان و لە دیوەخانی حەمە ساڵح بەگدا بە خەنجەر و شمشێر حەمە ساڵح و دە کەس لە خزمەکانی دەکوژن.

دوای کوشتنی ئەو ژمارەیە، عەبدوڵڵا بەگی دووەم، لە لایەن وەلەدبەگییەکانەوە دەکرێتە چاوساقی شەرەف بەیانییەکان، لە دوای مردنی عەبدوڵڵا بەگ، کوڕەکەی عوسمان بەگ جێگەی دەگرێتەوە، کە دایکی لە وەلەدبەگییەکان بووە. لە ساڵی ١٩٦٣ پەنای بردۆتە بەر دەوڵەتی ئێران.

# کەمانگەر

تیـرەی کەمانگــەر وەک تیرەکانی دیکەی جاف نین و لە رەگەزدا بۆ ســەر پیرخدری شــاهۆ ناگەڕێنەوە. ئەم تیرەیە لە کۆنەوە لەســەر جاف ژمێردراون و لە کاروکردەوە تێکڕاییەکانی جافدا وەک تیرەیەک لە تیرەکانی جاف هاوکارییان کردووە و لەسەر جافی جوانڕۆ ژمێردراون.

ئەم تیرەیە راســتەوخۆ هەر وەک کەمانگەر ماونەتەوە و تیرەی دیکەی لێ جوێ نەبووتەوە، ئەوانیــش وەک تیرەکانــی کەی جاف، گەرمیان و کوێســتانیان کردووە، هاوینان رۆیشــتوون بۆ: ماراب، گورگان، قەرەوەیسی، سەرچەمی گورگان. کە ناوچەکە لە دامێنی چیای شاهۆدایە. زستانان تا دەڤەری زەهاو رۆیشتوون. هەروا تا سەردەمی «عیمادولدەولە» کۆچەر بوونە. وەک هەر تیرە و هۆزی دیکە لەوەڕگای تایبەتییان هەبووە، رێچکەی هاتوچۆیان دیار بووە. ناوی ئەم تیرەیە لە کەمان ســازەوە هاتووە. لەوەدەچێ لە دروســتکردنی «کەمان»دا وەســتاکار بوونە و شۆرەتیان بەو پیشەوە دەرکردووە، یا لە شەڕدا تیروکەمانیان بەوردی بەکار بردووە و نیشانیان بە هەڵەدا نەرۆیشتووە. وا روون بۆتەوە، ئەم تیرەیە لە دەڤەری هەڵەبجەوە کۆچیان کردووەتە نێو ئێرانەوە یانی سەرەتای ژیانیان لە دەرەشیشی شارەزوورەوە بووە و لە سەردەمی (ئیبراهیمی کەمانگەر) دا ئەو کۆچەیان کردووە.

## کەسایەتییە ناودارەکانی کەمانگەر:

**بەهرام ئاغا:**
بە پێی فەرمانی ئیمام قولی عیمادولدەولە (١٢٦٨-١٢٩٣ک) سنووورداری بڕێک لە سنووری ولایەتی سنە و کرماشانی سپاردووتە «بەهرام ئاغا» و هەروەها سەرۆکایەتی ئەو هۆزەشی سپاردووەتە بارام ئاغا.

## مەحموود بەگ نیزامولمەمالیک:

دوای بەهــرام ئاغا، کوڕەکەی مەحموود بەگ، جێگــەی گرتۆتەوە، کەوتە تەقەللای بەربڵاوی دەسەڵاتداری باوک و باپیرانی و لەچەند لاوە قەڵا و میوانخانە و مزگەوتی دروستکردووە، ڕۆژوو و زەکاتدانی کردە ئیجباری لە ناو خەڵکدا. لە ناو هۆزەکانی دیکەدا ڕێزی لێدەگیرا، دیوەخانەکەی هەمیشە پڕ بووە لە میوان، هەمیشە وەک قسەبیسراو لە ناکۆکییەکاندا دەوری هەبووە، بە تایبەت لــە ناکۆکــی نێوان ســنجاوی و کەلهوڕدا. بەهەمان شــێوە لە ســنەش ڕێزی لێگیــراوە. یەک دوو نازناوی هەبووە وەک (نیزامولمەمالیک و حاجی ئاغا).

مردنی ئەم کەڵە پیاوە بە تراژیدی دەناسرێت.

عەلی ئەکبەر خانی ســنجاوی «ســەردار موقتەدەر» یەکێک بووە لە دۆســتانی حاجی ئاغا، وەک زانراوە عەلی ئەکبەر خان و براکەی بە هۆی حاجی ئاغاوە لە دەست کەلهوڕەکان لە مەرگ رزگاری بــووە کاتێــک فەرمان فەرما لە ســاڵی ١٣٣٠ک دەگاتە ولایەتی کرماشــان، عەلی ئەکبەر خانی ســنجاوی لە هەوادارانی ئەو دەبێت. ئەوی هێزی هۆزی ســنجاوی بــووە لە ژێر فەرمانیدا بووە، عەلی ئەکبەر خان بەرەو شــاری ســنە دەڕوات و هەزاران ســواری لەگەڵدا بووە، دەگەنە دەڤەری خێڵی کەمانگەر و پەیام دەنێرنە ســەر «نیزامولمەمالیک» کە ســەرۆکی هۆزی کەمانگەر کــەوا بەهەزار ســوارەوە میوانە، لەم کاتەدا کۆمەڵێکی دیکە میوانــی دەبێت، وەڵامی عەلی ئەکبەر خــان دەداتــەوە کــەوا ماڵی خۆیەتی و بەخێربێت، با جەنابی عەلی ئەکبەر خان بەســەد ســواری نزیکانی تەشــریف بهێنن بۆ ماڵی ئێمە و ســوارەکانی دیکە لە دێهاتەکانی دیکەدا دابەش دەکەین و ئازووقــە و خــواردن دەنێریــن، تا ئەوی نیازە بکرێت ئەوی خواردنەوە و ئەوی ئالیکی ئەســپ و بــەرزە وڵاخە، دەینێرم بۆ کوێخــاکان، کوڕەکەی و هەناردەی عەلی ئەکبەر خان بۆ ناو دێهاتی دەوروبــەر بۆ ئامادەبووان. لــە یەکێک لەو دێهاتانە لەگەڵ محەمەدخانی کــوڕی نیزامولمەمالیکدا نوێنــەری عەلــی ئەکبــەر خان دەمــی تێدەگیرێت و کابــرا زللەیەک لە کوڕی حاجــی ئاغا دەدات، پیاوەکانــی کــوڕی خان ئەو کــردارە قەبوڵ ناکەن و کابرا دارکاری دەکــەن، کابرا خۆی بە عەلی ئەکبــەر خــان دەگەیەنێــت، عەلی ئەکبەر خانیــش دوور لە لێکدانەوە فەرمانــی پەلامار دەدا و بێ ئەوەی دۆستی ئاشنایەتی نێوانیان لەبەرچاو بگرێت، پەلاماری ماڵی حاجی ئاغا دەدات، کوڕەکەی «عەلی بەگ» کە شــەڕکەر و ســوارکاری ناســراو بووە، لە دەرەوەی دێ دەبێت، کە دەبینێت وا پەلاماری ماڵی باوکی دەدەن، دەڕواتە ســەنگەرەوە و شــەڕ دەست پێ دەکات. کە سوارانی دیکە پەلاماری ماڵی حاجی ئاغای خاوەن دیوەخان دەدەن، لەو شەڕەدا حاجی ئاغا دوو کوڕی محەمەد خان و ئەحمەد خان دەکوژرێن و کوڕێکی کەی منداڵی بریندار دەکرێت و حەوت کەســی دیکەش دەکوژرێن و ماڵ و حاڵی تالان دەکەن.

ئــەو ڕووداوە بووە هۆی بەدناوی و گەوجی عەلی ئەکبەر خان، ئیدی دوژمنایەتی کەوتووتە نێوان کەمانگەرەکان و ســنجاوییەکانەوە، لە شــەڕی چل یاراندا ڕووبەڕوو بوونەتەوە. لە شەڕی چەرموســواردا دیسانەوە عەلی ئەکبەر خانی ســنجاوی، سەرەنجام ناچار دەکرێت پەنا بباتە بەر دەوڵەتی عوسمانی.

شەڕێکی دیکەش لە نێوان هۆزی کەمانگەر و هۆزی کولیاییدا دەقەومێت و سەرەنجام پێکدێن و ناگاتە شەڕی قورستر.

# ئیناخی

ئـەم تیرەیـە بە سـەر سـنووری ئێران عێراقـەوە دەژین، ژیانی ئـەم تیرە جافـە بەڵگەیەکی حاشـاهەڵنەگرە بۆ جەبر و زۆری زەوتی زەمان کە لە کوردی کردووە و سیاسـەتی بێ باوک و دایک هەرگیز بیری لە واقیعیەت و هەست و سۆزی ئینسانی نەکردووەتەوە بەو ئەندازە کۆشاوە بۆ بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندییەکانیان، هەوارگەی ئەم تیرەیە لەمبەر و لەوبەری سـیراون بووە، لەو دەڤەرەدا لە زۆر جێگەیدا سـیروان بە تەنگەبەرێکـدا دەگوزەرێت، بەرد هاوێژێکە. دەگێڕنەوە لە زسـتان و بەهاردا کاتێک سـیروان شـێت دەبوو لافاوی لرفەی دەکرد و بواری دەشـاردەوە. لـەو کاتـەدا ئەگەر یەکێک لە ئیناخییەکان مردبا، ئیناخی دوولای سـیروان، لـە دوولاوە بەرانبەر یـەک رادەوەسـتان و یەکێـک لەوبەرەوە دەیقیژاند: کـوڕە باوکە رۆ. لەم بـەرەوە چەندین کەس وەڵامی دەدایەوە: برای خاسـم رۆ. ئیتر شـیوەنی عەشیرەتی لە دوو بەری سیرواندا بەو شێوەیە دەگێڕرا..

ئێمـەی جاف بـاج و خـاوەی دوژمانیەتی دوو دەسـەڵاتی داگیرکەری زلهێزی سـەفەوی و عوسمانی، هەروەها قاجاری و عوسمانی و ئێران و ئێراقمان بە خوێن داوە و بژاردووە.
ئەم کوشـت و کوشـتارە و تـالان و برۆ و چەپاوکردنـە، ئەم بێ مەبادا لە ئێمە کوشـتنە بە درێژایی سـەدان سـاڵ نموونەیەکی زیندووی حاشا هەڵنەگرە، کە ئەم کوردە چۆن سەر و ماڵیان لە ژێر سمی ئەسپی قزڵباش و سوارەی ئینکیشاریدا پلیشاوەتەوە و دەنگیشی نە بە ئاسمان و نە بە شا و سوڵتان گەیشتووە نە بە وژدان.

مەڕەخێڵ بە هەوارگەی سـەرەکی ئەم تیرەیە دەژمێردرێت، هاوینان بەرەو (لاران، سەریاس، دەوروبەری شمشێر و پاوە) ریشتوون. بەڵام لەوەرگایان ئەو دەم ئەم جێگایانە بووە: ئەنجیرەک، لانوان، ژاڵە ژاڵە، تورکاران، کێڵە کۆن، لەشکرگا.
ئەم تیرەیە بەری شەش بەرەباب بوونە و هەن:
١- سەلیم بەگی
٢- سلێمان بەگی

٣- ئەمیر خان بەگی
٤- یاقوب بەگی
٥- رۆستەم بەگی
٦- رەحمان بەگی

دوو بەرەبابی دیکە لە دەڤەری ئیناخیدا لە پێش (ئیناخ بەگەوە) هەر لەوێدا دەژیان وەک:

١- عوسمان وەلەد خان
٢- ئیلەروتی

ئــەم دوو بەرەبابــە زســتان بەســەر ســیروانەوە دەژیــن و هاوینانیش لە نێــوان جوانڕۆ و هەوراماندان.

ئەدمونس دەڵێت: من ناوچەی ئیناخیم دیوە، ئەم تیرەیە جارەوبار لەســەر جاف دەژمێردرێن (ئــەم وتەی ئەدمونس هەڵەیــە. ئیناخی یەکێکە لە تیرە ســەرەکییەکانی جاف لە بنەچەکەوە جافی رەگەز بوونە).

جــۆری بەڕێوەبردنــی ئەم تیرە لــە ناوخۆیاندا، بەگزادەیان هەیە و ئەوان دەمڕاســتی تیرە و لێپرسراوی کاروباری عەشیرەت بوونە و هەن.

لە ناوچەی «لانوان»دا، تەختەبەردێکی داتاشــراو هەیە، بێگومان دەســتکردی مرۆڤە، وا باوە ئەم تەختە سەنگە کاروکردەوەی میر عەبدوڵڵا ناوێک بووە، کە شاعیری گەورەی ئەدەبی کلاسیکی کورد میرخانی قوبادی وەسفی کردووە، یەکێک بووە لە شازادەکانی سەفەویە. بەڵام لە حەقیقەتدا ئەو جۆرە بەردە داتاشراوانە هی پێش ئیسلامە و ناویشی عەبدوڵڵا نەبووە..

بێگومــان تیــرەی ئیناخــی بــە نــاوی باپیــرە گەورەیانــەوە ناونــراوە «ئینــاخ بــەگ» وەک شــەجەرەنامەکەی شاعیری گەورەی کورد «مەولەوی» ســوورە لەسەر ئەوەی زۆربەی زۆری جاف لە پشــتی پیرخدری شــاهۆن، ئەمە لەگەڵ واقیعیەتی مێژووییدا ناگونجێت، بۆ نموونە: کەس نەیبیستووە یا نووسرابێت (سەید ئیناخ بەگ).

## شەڕی بزن:

لەســەر بزنێک تیرەی ئیناخی و ئیمامی بۆ ماوەی حەوت ســاڵ لە شــەڕدا بوونە، ســەرجەم چل کەس لە ئیمامییەکان و سێ کەس لە ئیناخییەکان کوژراوە، یەکێک لەو کوژراوانە حەمەخان بەگی ئیمامی بووە، دوای حەوت ســاڵ شــەڕ و کوشتن لە لایەن خەڵک و خواوە پێکیان هێناون. شەش ژن لە ئیناخی دەدرێتە ئیمامی لە باتی کوژراوەکان.

## ڕووداوی 1310:

دەوڵەتی ئێران کەوتە گرتنی سەرۆک تیرەکانی کورد، پشکی ئیناخی شەش بەگ بووە:

١- محەمەد ئەمین کەیخوسرەو بەگ
٢- قادر فەتاح بەگ
٣- عەلی ئەحمەد ئەمیر خان بەگی
٤- حەبیب ئیلبەگی
٥- فەتحوڵڵای عوسمان بەگ
٦- عەبدو محەمەدی بارام بەگ

چوار کەس لە گیراوەکان لە زیندانی قەسردا مردوون، تەنیا دوو کەسیان گەڕاونەتەوە-١٣٢٠ک.

جارەوبار ئیناخی لەگەڵ نەورۆڵی و کۆکۆییەکاندا بەشەڕ هاتوون و لە یەکتریان کوشتووە، لەو سەر سنوورە تەنیا ئیناخ بەگ و بەس، منیش وەک خزمە ئیناخییەکانم دەگەڕێمەوە سەر «سەیدی ئەحمەد بەگ» بەندە لە دواییدا بە درێژی باس لەسەر «پیر» دەکەم و بە بەڵگە دەیسەلمێنم، کە تەواوی پیرەکان ئەهلی حەق بوونە، ڕەنگە پیر خدریش هەروا بووبێت.

مێژوو دەڵێت: تیرەی ئیناخی بە ئازا و جوان خاس و سەربەخۆ ناسراون، هەرگیز دانیان نەناوە بە دابەشکردنی دەڤەر و ناوچە و وڵاتەکەیاندا، ئەوی یاساوڵی ئێران و عوسمانی هەیە بە دوژمنیان زانیوە، لە ڕۆیشتنە ژێر فەرمانیانەوە ناوی باوی «کوڕە ئیناخی» لە ناو عەشایەری دوور و نزیکدا شۆرەتی هەبووە.

لە کتاوی توحفەی ناسریدا هاتووە دەڵێت:

سەلیم بەگی ئیناخی لە سەرەدمی موعتەمەدولدەولەدا پڵنگێک لەشاخی شاهۆدا فرسەتی لێ دێنێت و دەپەڕێتە کۆڵی سەلیم بەگ، ئەگەرچی سەلیم بەگ بریندار دەبێت، بەڵام بە خەنجەر پڵنگەکە دەکوژێت. ئەو ڕووداوە دەبێتە هۆی بڕینەوەی مانگانەی بیست تومان لە دەوڵەتی ئێرانەوە. لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا عوسمانییەکان بڕێک لە ناوچەی ئیناخی داگیر دەکەن، سەرەنجام ئەو ناوچانە دەخرێتە سەر هەڵەبجە، دەستی دەوڵەت و دەسەڵاتیان پێ نەگەیشتووە، شۆڕش و یاخیبوونی «ئاغا ڕووتەی ئیناخی» زۆر کەس لەبیریەتی شەهید «نەبەرد جاف» (برای نووسەرە). لە بارەی «ئاغا ڕووتە» لە یەکێک لە ژمارەکانی «مامۆستای کورد»دا نووسیویەتی، هەروەها یاخیبوونی قادری نامدار لە ساڵی ١٣٤٠ک.

## ئاغا رووتەی ئیناخی:

دوای ئەوەی، ئەوی ئاغا و کوێخا و ناسراوانی عەشایەر هەیە لە لایەن دامودەستگای رەزا شاوە دەستگیرکران و بە زیندانی درێژخایان بڕیاریان لەسەر دراوە ئەوی دارایی موڵک و ماڵ و ئەحواڵیان هەبووە، لە لایەن ئەفسەرە دزەکانی سوپای ئێرانەوە تالان و داگیر کراوە، ئیتر زوڵم و زۆر و تالان و بڕۆی ئەو ئەفسەرانە گەیشتووەتە رادەیەک نانیان لە دەمی منالان فڕاندووە.

لە ئاوا هەلومەرجێکدا کابرایەکی ئازا و جەربەزە دەست دەداتە چەک و دژ بە دەوڵەت دەکەوێتە تەقەللاوە، لە یەکێک لە شەڕەکاندا «سەرهەنگ – عەقید- زاویە» دەکوژرێت ١٣١٢ک. جلی سەرهەنگی کوژراو لەبەر دەکا و دوو سێ خاڵی ژاندارمی بەو جلانەوە دەگرێت. وەک هەمیشە دەوڵەت لەگەڵیا دەکەوێتە راوێژەوە، قورئانی بۆ ئیمزا دەکەن و سوێند و پەیمان و شەرەف تا رازی دەبێت بڕواتە ناو دەوڵەتەوە، سەرەنجام هەر کە دەستیان دەکەوێتە سەری قۆڵبەستی دەکەن و بە زیندانی هەتاهەتایی بڕیاری لەسەر دەدەن. دوای هەروژانی شا لە زیندان بەڕەڵلا دەبێت و دەگەڕێتەوە، دوای دوو مانگ دەمرێت.

## شۆڕشی قادری نامدار:

تیرەی ئیناخی چەکیان بەلاوە لە خواردن بە پێویستتر زانیوە، بێ چەک نەیانتوانیوە بژین، قادری نامدار یەکێک بووە لەو کەسانەی دژ بە دەوڵەتی ئێران دەستی داوەتە چەک و ئەوی توانیویە دژ بە دەوڵەت کردوویەتی، سەرەنجام لە یەکێک لە شەڕەکاندا کوژراوە.

# ئێناخییەکان کێن

## بۆ پێیان دەوترێت ئێناخی:

سەید ئیناخ ناوی باپیرە گەورەی ئیناخییەکانە و لە نەوەکانی پیرخدری شاهۆیە، سەید ئێناخ و یەزدان بەخش برا بوون شەمێرانییەکان بە رەچەڵەک دەچنەوە سەر یەزدان بەخش و ئێناخییەکانیش سەید ئیناخ، واتە نەوەی سەید ئێناخن بۆیە پێیان دەوترێت ئێناخی.

## شوێنی ئێناخییەکان

ناوچەکانی ئێناخی دەکەوێتە سەر سنووری عیراق – ئێران و بەری رۆژهەڵاتی رووباری سیروان، سەر بە شارستانی پاوە و پارێزگای کرماشان، سەر بە کوردستانی ئێرانن، هەندێکیشیان پاش جەنگی جیهانی یەکەم، لەبەری رۆژئاوای ئاوی سیرواندا چەند شوێنێک داگیردەکەن و دەمێننەوە، ئێستاش لەو شوێنانە دێهات و باغات و لەوەڕگای ئەوانە و سەر بە ئیدارەی شاری هەڵەبجەی شەهیدن لە کوردستانی عیراق. ئاوایی بەلمۆن و شاخی کولو شارۆچکەی پاینگان دەکەوێتە رۆژهەڵات و باشووری رۆژهەڵاتی ناوچەی ئیناخی و دێهاتەکانی هەورامانی لهۆن و لەوایی بۆینی دەکەوینە باکووری چیاکانی باڵانبۆی مەگرِ و دێهاتەکانی لەینجەڵە و چناری کۆکۆیی نشین دەکەونە باشوور و باشووری رۆژئاوای.

ئێناخییەکان بە هاوینان زۆربەیان دەچوونە لاران، سەریاس، دەوروبەری شمشێر و پاوە لە بناری چیای شاهۆ بۆ بەخێوکردنی مەڕومالات و لەوەڕ خۆری، لە ناوچەکانی گەرمەسێری خۆیاندا دەغڵ و دانێکی کەمی دیکەیان دەکرد بە جووت، لەمەڕە خێڵ و دەگەسیاو وەرەوەشدا باخ و باخاتی هەنار و میوەی تری وەک ترێ و هەنجیریان هەیە.

دێهاتەکانی لەشکر گەرەگیرساو رەزەوە، هەنجیر، وارمحە، لالوان، مەرخێڵ، ژاڵەژاڵە، ژاڵەی رەحمان بەگ، کرکوان، مان، کبێیە کون، هیرتاو زی لەسەری رۆژهەڵاتی ئاوی سیروان و لەو خاکی ئێراندا ئێناخی شنین سۆران و بەشێکی کۆشاون بەم بەری دیوی سیروان و لە ناو خاکی عیراقدا ئێناخی نشینن.

## تیرەکانی ئێناخی

ئێناخییەکان شەش تیرەی پشتاوپشتن، سەلیم بەگ، سلێمان بەگی بەناوبانگ بە ئیلبەگی، ئەمیر خان بەگی، یەعقوب بەگی، رۆستەم بەگی، رەحمان بەگی، تیرەیەکی تر هەن لە دەرەوەی ئەم شەش تیرە، کە ئەوانیش ئێناخی و بە ئێناخی بە ناوبانگن، کە پێی دەچێت نیشتەجێیانی سەرەکی ئەم ناوچەیە بن، پێش نەوەکانی ئێناخ لە کۆتایی دەسەڵاتی ئەفشارییەدا، کە بە عوسمان وڵدخان و عێڵەڕووت ناسراون، هەموو تیرەکانی ئێناخی نزیکەی هەزار خێزانن، محەمەد عەلی سوڵتانی دەنووسێت: (ئێناخییەکان جافن و یەکێکن لە خێڵە سەرەکییەکانی جاف) هەروەها لە مێژووی مەردۆخدا هەر بە جاف ناوهێنراون لەو بارەوە مەردۆخ دەنووسێت (ئیناخی نزیکەی ٥٠ خێزانن لە کەرتی جوانرۆ و هاوینان دەچنە کێوی شاهۆ لە زنجیرەی زاگرۆس).

بەڵام سیسیل ج سی ئەدمۆندز رۆژهەڵاتناس و حاکمی سیاسی لە عێراقدا بە جافی تەواو ناویان نابات لە سەفەرێکیدا بۆ دێی هاوار، کە لە هەڵەبجەوە دەستی پێکردووە، لە بیرەوەرییەکانیدا

دەنووسـێت: ئێناخی یەکێکە لەو هەشـت قەبیلەی بچووکە کە جارجار بە جاف دەژمێردرێن، لەم ناوچەیەدا ئێناخییەکان لە هەردوو بەری ئاوی سـیرواندا دێهاتیان هەیە، ئێناخییەکان حوکمڕانیان خێزانـە بەگزادەکانیانن، بەڵام گوندنشـینەکان رەگەزیان دەبەنەوە سـەر سـەیدی بەناوبانگ پیر خدری شاهۆیی، سازانییەکان خۆیان بە سەیدی لە تیرەی شێخ موئمین (خۆیان بە شێخ و سەید دەزانن) لێرەدا ئەدمونز هەڵەی کردووە، گۆڕستانی ئەو شێخە لەگەڵ رێگەی سازاندا بوو بە لایدا تێپەڕمان کرد، ئەو شـێخە لەسـەر زەوی گۆرانەکانی ئێرانەوە هاتووتە ئێرە و لێرەدا نیشـتەجێ بـووە، دێـی کۆمار پەنجا سـاڵ لەمەوبەر لە لایەن ئاوارەکانی دێی تەشـاری هەورامانی لهۆنەوە ئاوەدان کراوەتەوە، تەشـارییەکان نیوە و ئێناخییەکانی نیوەی تری دانیشـتووانی ئاوایی کۆساوا پێکدێنن)، هەر چەندە سـوڵتانی بڕوای وایە جگە لەوانەی بە عوسـمان وڵدفانی ناودەبرێن شەش تیرەکەی تری ئێناخی لە سەیدەکانی پیر خدرن.

لە دەوروبەری شـەڕی جیهانی یەکەم و حوکمڕانی عوسـمانیدا دوو تیرەی سـەلیم بەگی و ئەمیرخان بەگی سێ جێگەیان داگیرکرد، ئەوانیش: قولی میکەن، لە پەیگە لە بناری ئاوی سیرواندا لەسـەری سـنووری عیراقەوە تا سـەردەمی حکومەتی رەزا شـا ئاگادار کران یان دەبێ ئێراقی بـن یـان چۆڵی بکەن و بگەڕێنەوە بەری ئێران. مانەوە و ئێسـتاش ئەو سـێ شـوێنە لەوەڕگە و دێهاتەکانی خۆیانە (بەڵام پەیگە لە ئەساسدا موڵکی ئێناخی نییە، هی هۆزی موخولە رشە).

## شەجەرەی سەرانی ئێناخی

شـەجەرەی سـەرانی ئێناخی لە پیرە گەورەکەیانەوە دەسـت پێدەکات بەرەو وەچەکانی بەم شێوەیە:

ئێنـاخ، سـەید عەلی، حەمەد بەگ، میرەبەگ، زۆراب بـەگ، حەمەخان بەگ، لە حەمەخان بەگ شـەش کوڕ بووە بە ناوی (یەعقوب بەگ، رەحمان بەگ، سـینان ئیلبەگی، سـەلیم بەگ، رۆستەم بەگ، ئەمیرخان بەگ، هەروەها لە یەعقوب بەگ لەم وەچانە بووە (عوسمان بەگ، فەرەج بەگ، پاش عەبدولرەحمان بەگیش ئەو وەچانە بووە (بارام بەگ، عەبدولرەحمان بارام) لەمیشیان ئیلبگییش لەو وەچانە بوون (کوهرە ئەمین، حەمە ئەمین، محەمەد، سەلیم بەگیش ئەم وەچانە بوون (کیخوسرەو بەگ و براو بەگ داود بەگ، رستەم بەگیش لەم وەچانە بوون (رەزا قولی فەتاح، تەحسین، ئەمین خان بەگیش ئەم وەچانە بوون (ئەحمەد بەگ، وەیس بەگ، حوسێن بەگ، حەمید).

هەروەها لە وەلەدبەگیش پێنج کوڕ بووە، بە ناوی (کەیومەرس، سەرکۆ، برزو بەگ، فەیسەڵ، سەلاح، ناسر).

هەروەها برزو بەگ سێ کوڕی بووە بە ناوی (وریا، سیامەند، کاوە).

# ڕووداو و ڕابردووی ئێناخییەکان

ژینگـەی ئێناخییـەکان لەبـەر ئەوەی سـەخت و قایمە و پڕ لـە داربەڕوو و قـەزوان و زەڕ داپۆشراوە، دەکەوێتە سەر سنووری عیراق- ئێران خاوەن چەندین لووتکەی بەرز و چۆمی قووڵ و نزار و لاپاڵی کەلی و لەوداره دراوسێی هەورامی لهۆنن و لهۆنیش لە سەرەتاوە تا حەفتا ساڵ لەمەوبـەر خۆیان حوکمڕانی ناوچەکەی خۆیان کردووە و ڕازی نەبوون ملکەچی هێچ دەوڵەت و دەسەڵاتێک بن، پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و گەورە لە نێوان ئیناخییەکان و لهۆنییەکاندا هەبووە.

دەسـەڵاتە یـەک لـە داوی یەکەکانی مەرکـەز و هەڵەبجە و لەولاوە ئـەردەلان و لەملا بابان کێشـەیان بۆ ئێناخییەکان دروسـتکردووە، شۆڕشـەکانی ئاغا بەگ و قادری لە ئەمیر و کوشتنی ڕەشەی مولی عەبدولعەزیز قادر قەیتوولی و کارگەری ئێناخییەکان لە حکومەتی بوون شۆڕشی لە حاکمی ئەو دەستدرێژییانە بۆ سەر ئێناخی و ناوچەکەیان.

لـە ڕووداوی سـاڵی (١٣١٠ش) دا بەرامبـەر ١٩٣١ میلادیـدا دەسـتدرێژی هێزەکانی نیزامی دەوڵەت بە ناوی چەککردنی عەشـایەرەوە، بەڵام لە ئەساسدا بۆ دەستگیرکردنی سەرانی ناڕازی دەوڵـەت حـەوت کەس لە سـەرۆک تیرەکانـی ئێناخی گیران و لە قەسـری قەجـەردا بەندکران، ئەوانیش محەمەد ئەمین بەگ کوڕی کەیخوسرەو بەگ، قادر فەتاح بەگ، عەلی محەمەد ئەمیر خان بەگ، حەبیب ئیلبگی، فەتحوڵڵای عوسمان بەگ، عەبدولمەجید بەهرام بەگ، لە ڕەحمان بەگییەکان (ئەمی حەوتەم ناوەکەی بۆ من ئاشکرا نەبوو). چوار کەس لەم بەڕێزانە لە زینداندا مردن و سێ کەسەکەی تریان لە ڕووداوی شبیوری ١٣٢٠دا ١٩٤١، ئازاد کران.

ئێناخییەکان هەمیشـە چەکدار بوون بە چەکی وەرەمەل ڕەشـۆکی، سـاچمەزەن، داوتنەوە و فیشەکی ئەم چەکانە خۆیان ئامادەیان کردووە، ساچمە و کوتلەکەی لە قورقوشمە و بارووتەکەیش لە ئەشکەوتەکانی ناوچەی خۆیاندا.

شێوەی دروستکردنی بارووتەکەش بەم شێوەی خوارەوەیە:

ناوچەی ئیناخی زۆرترین ئەشکەوت و بن زەمەنی تێدایە کە زستانان جێگەی ئاژەڵە، بەهاران تەختی ئەشکەوتەکە گشت دەدرێت و ئاوپرژێنی دەکەن بەجێی دەهێڵن و پاش ماوەیەک دەگەڕێنەوە دەرمان کە لە شێوەی جۆرە قەوچکێکدا دەرهاتووە کۆی دەکەنەوە و لەگەڵ خەڵووزی دار بەڕوو دەیکوتن و دەرمانی ڕەش ی پێدەڵێن.

ئێناخییـەکان ئـەو جـۆرە چەکانە جگە لە ڕاووشـکار و پارێزگاری خۆیان و ناوچەکەشـیان کـردووە، ئێناخییـەکان زۆربەیـان حەز لە ڕاوی بزنە کێوی و کەو هەیـە، لەو بزن و کەوە کە لە ناوچەکەیاندا زۆرە.

زۆرجار هەورامانی لهۆن کە تووشـــی شـــەڕ لەگەڵ دەوڵەت یان هۆز و تیرەکانی تردا بووە، ئێناخییەکان پشـــتگیری لهۆنییەکانیان کردووە، بـــۆ نموونە خۆیان جاف بوون، بەڵام هەورامان و جوانڕۆ بووە بە شەڕیان ئێناخییەکان پشتگیری هەورامانی کردووە، دۆستی و هاوکاری بە هۆی ژن و ژنخوازی بۆ نموونە خێزانی قادر بەگی کەیخوسرەو بەگ کچی ڕۆستەم بەگ خێزانی بەگ جەعفـــەر ریش ســـپی ئێناخی کچی محەمەد تەقـــی بەگی کوڕی جەعفەر ســـوڵتان، هەورامان لەم دۆســـتایەتی و خزمایەتییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ســـەردەمەی کە حەمە سەعید سوڵتانی هەورامانی لهۆن لەگەڵ عەبدولڕەحمانی کوڕیدا لە قەڵای جوانڕۆ لەســـەر ســـفرەی نان و دەعوەتدا لە لایەن شـــرف الملـــک و ســـیفور بەگەوە کـــوژران بە هاندانی فەرهـــاد میرزای قاجار معتمـــد الدوله پاش کوشـــتنەکەیان هەمـــوو ســـەرەک خێڵ و تیرەکان بانگکـــران هەر یەک زەربەیەکـــی خەنجەر بدات لە تەرمی حەمە ســـەعید ســـوڵتان، تەنیا عوســـمان بەگی ئێناخی ئامادە نەبوو خەنجەری لێ بدات گونەکەیان نیوە بڕاو کرد لەسەر ئەو هەڵوێستە مەردانەیەی.

زۆر جاریـــش ئێناخییـــەکان لەگەڵ تیرەکانی دەوروبەریان تووشـــی شـــەڕ بـــوون، بۆ نموونە لەگەڵ ئیمامی شەڕ و دوژمنایەتییان حەوت ساڵ درێژەی کێشاوە، تەبعی عەشایر وایە زۆر جار شـــەڕی منداڵان چوونی  ناو زەرعەت و سەرشـــکان لەوەڕگە، ئاوەخـــوڕە هتد. چەند تیرە دەبێتە شـــەڕیان لە دەســـت دەردەچێت، دەبێتە هۆی کوشتنی چەندین کەس لە هەردوولا زەرەر و زیانی ماڵی زۆریش.

شـــەڕی ئیمامی ئێناخییش یەکەمجار لەســـەر بزنێک بووە، حەوت ســـاڵ درێژەی هەبووە، لە نێوانیاندا ٧٠ کەس کوژراون، ٤٠ ئیمامی و ٣٠ ئێناخی، هەتا لە شـــەڕێکدا محەمەد حەســـەن بەگی باوکی عوسمان بەگی ڕەئیس عەشیرەتی ئیمامی کوژراوە، بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە هەموو سەرەک تایفە و پیرەکانی ناوچەکە بەشداری دەکەن بۆ پشت کردنەوەیان عیلاجی نابێت تا سەید عەبدولڕەحمان هانەســـوورە لە ڕێزدارانی حســـێنی ئەفەرموویێت ئێناخی ســـەیدن قسەی ئێمەیان قبووڵە ئێوەش بە ئەمەیری ئێمە ئەژمێردرێت، نابێت لە قســـەی من دەربچن، ئێمامییەکان بەقســـەی دەکەن، شـــەش کچی ئێناخی دەدەنە ئیمامییەکان ؟؟؟؟ کوژراوە دەکات و دوو کچی کەیخوســـرەو بەگی حەمەخان بەگ، بەمجۆرە ئاشـــتیان دەکاتەوە و ســـوڵح دەکەن، ئەو دوو هۆزە نزیکەی سەد ساڵ پێش لەو شەڕە پێکەوە دەژین و دراوسێش و خەمخۆری یەکترن.

ئەم زانیارییانە برای بەڕێز حەمەی حەمە سەعی بۆی ناردووم.

ژماره ٢٧٦ — کوردستان — لاپەڕی ٧
ڕەزبەری ١٣٧٨ — ئۆکتۆبەری ١٩٩٩

# کۆچی دوایی ئاغە بەگی ئێناخی
## (ئاغە شڕە)

ئامادەکردنی: فەرهاد
«ئامادەکردنی ڕۆستەم فەرەج»

لــە مانگی گەلاوێژی ئەمســاڵدا ئاغەبەگــی ئێناخی لە تەمەنی ١١٤ ســاڵیدا کۆچی دوایی کرد. لــە کاتی خۆیــدا نەکرا هەواڵی مەرگ و کورتەیــەک لە ژیانی ئەم پیاوە نــاودارەی گەلەکەمان بە ئاگاداریی خوێنەران بگەیەنین. هەر بۆیە بە داوای لێبوردنەوە لەم ژمارەیەی «کوردستان»دا، ئەم نووسینە لە بارەی بەسەرهاتی ئەو، بڵاو دەکەینەوە:

ئاغە بەگ کوڕی مەحموود بەگی ســەلیم بەگی ئێناخییە، لە ساڵی ١٨٨٥ زایینی (١٢٦٤)کۆچی هەتاوی لە گوندی «تەرکاران»ی سەر بە ناوچەی ئیچناخی پاوە لە دایک بووە. ئاغە بەگ پیاوێکی بەناوبانــگ، ئازا، نیشــتمانپەروەر، جێــگای ڕێز و متمانەی خەڵکی هــەژار و زەحمەتکێش و دژی چەوسێنەران و ملهوڕان بووە.

ئێناخییەکان لە هۆزی بەناوبانگی (جاف)ی ناوچەی (پاوە)، کە رابردوویەکی پڕشنگداریان لە نیشــتمانپەروەری و بەرەنگاربوونەوەی هەردوو دیکتاتۆریی پاشــایەتی و ئاخوندیدا هەیە و لەو

پێنــاوەدا بــە دەیــان کەس لە پیاوە ئــازا و ناودارەکانی ئەم تیرەیە بە دەســتی ئەو دوو رژێمە لە سێدارە دراون و یان شەهید کراون، یەکێک لەو کەسایەتییە ناودارانە ئاغە بەگە.

ئاغە بەگ لە پێناوی داکۆکیکردن لە خەڵکی هەژار و رەش و رووت بەگژ هێزەکانی رەزا شا چۆتەوە و دەســتکەوتەکانی (خۆراک و کەلوپەل)ی بەســەر خەڵکدا دابەش کردووە و ســیخور و بەکرێگیراوانــی رژێمی لە ناوچەکەدا پاش چەند جار ئاگادار کردنەوە و هەڕەشــە لێکردن، ئەگەر دەستیان لە ئەزیەت و ئازاری خەڵکی و نۆکەرایەتی بۆ رژێم هەڵنەگرتبێ، بە توندی سزا دراوە.

ئاغــە بــەگ پێش ئــەوەی هێرش بکاتە ســەر هێزەکانی رژێم، لە مەبەســتی خــۆی ئاگاداری کردوونەتــەوە و پێــی راگەیانــدوون، کە خۆیان بۆ شــەڕ ئامــادە بکەن و بــەردەوام فەرمانی بە چەکدارەکانی داوە، کە هەتا پێیان دەکرێ دەســت لە ســەرباز بپارێزن و رێگای نەداوە هیچ کەس دیل بکوژێ. ئاغە بەگ جێگای متمانەی خەڵکی بووە و لە کاتی لێقەومان، یان راووڕووتی پیاوانی دەوڵەتدا هانایان بۆ بردووە و داوای یارمەتییان کردووە و ناوبراویش زۆربەی چەتە و ســیخوڕ و پیاوخراپەکانــی بە ســزا گەیانــدووە بەم جۆرە زانیویــە خەڵکی ناوچەکانی پــاوە و جوانڕۆ و هەورامان و سەرپیل و زەهاو و.. بکاتە پشتیوانی خۆی و لە دژی رژێمی رەزا شادا یەکیان خا.

ئاغە بەگ لە هەردوو راپەڕینی گەورەی ئەو کات واتە راپەڕینی شــێخ مەحموود و راپەڕینی جافر ســانی هەورامان بەشــداری کردووە، یەکەم جار لە ســاڵی ١٩٢٥ زایینیدا ســەردانی شــێخ مەحموودی نەمری کردووە و لە لایەن شێخەوە، رێزی لێگیراوە و دەمانچەیەکی دەتیر و تفەنگێکی تەیارە شــکێنی پێشــکەش کراوە و تەنانەت بە پێی هێندێ سەرچاوە لە یەکێک لە شەڕەکانی شێخ مەحمــوود دژی ئینگلیــزەکان، ئاغە بەگ و یەکێک لە ئامۆزاکانی برینــدار بوون، ئاغە بەگ دوایی لــە عیراقــەوە گەڕاوەتەوە لــە راپەڕینی جافەکانی هەورامانیشــدا چالاکانە بەشــداری کردووە و ئازایەتییەکی کەموێنەی لەخۆی نواندووە. بۆیە رژێمی رەزا شــا ترســێکی زۆری لێ نشــتووە و هەوڵــی داوە تــا بــە هەر جۆرێک بووە ئاغەبــەگ لە ناوبەرێ بۆ ئەم مەبەســتەش چەندین هێز و لەشکری گەورەی ناردۆتە سەر ناوبراو بەڵام لە تەواوی ئەو شەڕانەدا هێزەکانی رژێم زەرەر و زیانێکی زۆری گیانی و ماڵییان لێ کەوتووە.

ناوی هێندێک لەو شوێنانەی شەڕەکانیان تێدا قەوماوە بریتییە لە شەڕی هەنجیرێک، لەشکرگا، ماکوان، کەنە، کویا، دەودان و ســەربەردی ماســان (کافرەڕێ) کە بە ناوبانگترین ئەو شــەڕانەیە کە لە نێوان هێزەکانی رژێم بە فەرماندەیی دوو ســەرهەنگ بە ناوەکانی ســەرهەنگ عیسا خان و سەرهەنگ حسێن خان و هێزەکانی ئاغەبەگدا قەوما و هەر دوو سەرهەنگی ناوبراو زیاتر لە ٧٥ کەس لە دەرەجەدار و هێزەکانی رژێمی تێدا کوژران. ئەو ئەفســەرانە، لە شــەڕ دژی (ئاغە بەگ) دا فەرماندەییان کردووە: شــاهەندە فەرماندەری هێزەکانی شــیمال، ســەرتیپ حاجی عەلی رەزم ئارا، ســەرهەنگ ســوڵتان عەلی خان، ســەرهەنگ جەوادی مەنووچەری، ئەحمەد خانی قەســاب، سەرهەنگ سیاپۆش، سەرهەنگ ماندۆرو...

رژێم کاتێک زانی بە شەڕ لە بەرامبەر ئاغەبەگدا هیچی پێ ناکرێ، بۆ کوشتنی ناوبراو پیلانێکی دارشت و سەرهەنگ زەهاویی کردە مەئمووری بەڕێوەبردنی پیلانەکە. بەڵام هێزەکانی ئاغەبەگ بە پیلانەکەیان زانی و شاری نەوسوود کە لە ژێر دەسەڵاتیاندا بوو چۆڵ کرد. لە دەروەی شاردا تووشی سەرهەنگ زەهاوی دەبن و دەیکوژن و پیلانەکە پووچەڵ دەکەنەوە.

بەدوای شکستی ئەم پیلانەدا رژێم پێشنیازی وتووێژی کرد و بەمەبەستی خۆشکردنی رێگا بۆ وتووێژیش دەسەڵاتی شاری پاوە و دەوروبەری بۆ ماوەی ساڵێک بە ئاغەبەگ سپارد، بەڵام لەو ماوەیەدا کێشەیەک لە نێوان ئاغەبەگ و خزمەکانیدا ساز بوو، وا دیارە هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوە کە ئاغەبەگ و دوو کەس لە خزمانی نزیک و جێگای باوەڕی وی بچنە کرماشان و خۆیان تەسلیمی هێزەکانی رژێم بکەن، بەو حاڵەش هێزەکانی رژێم کە ناوبانگی ئازایەتی و دڵقاییمی (ئاغەبەگ)یان بیستبوو نەیانتوانیوە ناوبراو چەک بکەن. بۆیە کاتێک ئاغەبەگ و دوو هاوەڵەکەیان بەرەو تاران بردووە بە بیانووی خۆشوشتن دەستیان بەسەر چەک و چۆڵەکەی داگرتووە و دەستگیریان کردووە، بەڵام دوو هاوڕێیەکەی دیکەی خۆیان دەرباز کردووە و گەڕاونەتەوە کوردستان. لەم بارەیەوە هێندێک بۆچوونی دیکەیش هەیە.

بەدوای دەستگیرکردن یان خۆبەدەستەوەدانی ئاغەبەگدا فەرماندەکانی رژێم، وا لە رەزا شا دەگەیەنن، کە ئاغەبەگیان لە بەرەی شەڕدا دەستگیر کردووە و رەزا شاش دەستوور دەدا هەر بە چەک و چۆڵەکەی خۆیەوە بیبەنە لای. لە سەرەتادا رەزا شا نایەوێ زیندانی کات و تەنیا خراوەتە ژێر چاودێرییەوە، بەڵام چونکە سەری بۆ رژێم نەچەماندۆتەوە و بە دڵی ئەوان نەجووڵاوەتەوە بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ لە بەندیخانەی «کەلات»دا زیندانی کراوە. ئاغەبەگ بە هۆی ئەشکەنجەوە تووشی نەخۆشی فەرامۆشی بووە، ئەمەش بۆتە هۆی مانەوە و ژنهێنانی لە تاران.

لە حاڵەتێکدا خەڵکی زۆربەی ناوچەکانی پاوە، جوانرۆ، هەورامان و سەرپیل و زەهاو نەیاندەزانی کە ئاغەبەگ نەماوە، کەسێک بەناوی حەمەمینی کەیکاوسی ئێناخی بە یارمەتیی دۆستێکی ساڵی ١٣٥٦ی هەتاوی ئاغەبەگ دەدۆزنەوە و ئەم هەواڵە بە خزمەکانی ناوبراو رادەگەیەنن، ئەوانیش بە خاوخێزانەوە دەیبەنەوە بۆ ناوچەی ئێناخی و رێوڕەسمێکی گەورە بەم بۆنەیەوە ساز دەکەن و خەڵکی زۆربەی ناوچەکانی پاوە، هەورامان، جوانرۆ، سەرپیل زەهاو پێشوازی لێ دەکەن، ئاغەبەگ پاش ماوەیەک دەگەڕێتەوە بۆ تاران و سەرەنجام لە رۆژی ٧٨/٥/٦ (٩٩/٧/٢٨) لە تەمەنی ١١٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

رەوانی شاد بێ.

# باوەجانی

تیـرەی باوەجانـی یەکێکە لە تیـرە گەورەکانی هۆزی جاف، ئەگەرچی هـۆزی جاف تێکڕا تا پەنجـا سـاڵ لەمەوبەر زۆربەی زۆریـان کۆچەر بوونە، بـەڵام هەر تیرەیەک بۆخـۆی ناوچە و ڕێچکەیەکی تایبەت و دیاریکراوی هەبووە، ژینگەی باوەجانی وەک جێگە و شـوێنی سـەرەکییان لە کوردسـتانی ڕۆژهەڵاتدان، لە باکوورەوە دەکەوێتە دامێنی چیای ماکوان و باشـووری پاینگان لە ڕۆژهەڵاتەوە زنجیرە چیای شـاهۆ و باکووری جوانڕۆ و لە نزیکەی تیرەی قوبادی «قوایی» و لە باشـوورەوە درواسـێی وەڵەدبەگییەکانن، (کێڵەسـپی، دەروێشی، باوەسـی) و لە ڕۆژئاواوە کوردستانی باشوور.

لە سـەرەتای دەسـەڵاتی قاجارییەوە باوەجانی لە «دۆڵەدەرە»دا دەژیان، کە سەرزەوییەکی بەردەڵانی دوور لە کشـتوکاڵ بووە، بەڵام پڕ بـووە لە لەوەڕی ئاژیلان، کە حەبیبوڵڵاخان دەبێتە سـەرۆکی باوەجانی تا ڕادەیەک جێگە و شـوێنی تیرەکەی دەگۆڕێت و زەویوزاری کشـتوکاڵی دەخاتە ژێر دەستیانەوە.

## حەبیبوڵڵاخانی باوەجانی «نظام الإيالة»:

حەبیبوڵڵاخان یەکێ بووە لە گەورەپیاوانی سەردەمی خۆی، لێزان، هۆشیار، بە حیکمەت، ئازا و کاردان، توانی لە ماوەیەکی کەمدا ئەوی ناکۆکی و دووبەرەکی نێو تیرەکانی جاف هەیە، ئاسان بکا و یەکپارچەییەکی تۆکمە و بەربڵاو لە ناو جافی ئێراندا پێکبهێنێت.

فەتاح بەگی وەڵەدبەگی (صارم المماليک) گێڕاویەتەوە:

حەبیبوڵڵاخـان دەکۆشـا پەیوەندی پتەو لە ناو تیرەکانی جافـدا پێکبهێنێت، بە تایبەت لە ناو بەگزادەکانـی جافـدا، کە ئەوان لە بنەچەکدا کوڕی باوکێک بوونـە، فەتاح بەگ دەڵێت: زۆرم حەز دەکرد «خورشـیدە خانم»ی کچی حەبیبوڵڵاخان بهێنم، بەڵام دایکی کچە نەیدەهێڵا، لەبەر ئەوەی دایکـی کچە «غەفار بـەگ» بە پیلانـی ئەردەلانییەکان لە لایـەن وەڵەدبەگییەکانـەوە کوژرابوو، نەیدەهێـڵا ئەو وسـلەتەی ئەنجـام بگیرێت. ڕۆژێک لـە خزمەتی خاندا بووم، لـە ئێلاخیدا لە ژێر دەواردا بووین، بەرازێک لە پشـتەوە هاتەدەر و ڕوویکردبووە هەوارگە، سـوار بۆی دەرچووبوو بەرازیان نەکوشتبوو، ئەگەرچی دەستم شکابوو لە ملمدا بوو، ئیجازەم لە خان وەرگرت، کەوتمە دوای بـەراز و ئازانـە کوشـتم. کـە گەڕامەوە خان هەسـتا و ماچـی کردم و تەڵاقـی خوارد کە خورشـیدە خانمی کچی پێ بدات. هەروایکرد و خورشـیدە خانمم مارە کرد، حەبیبوڵڵاخان زۆر بیـری لە دەسـەڵات و هەیبەتی ناوی جاف دەکردەوە، توانی دەسـەڵاتی ئەردەلانییەکان بەسـەر هۆزی جافەوە دوور بخاتەوە، (عەلی ئەکبەر خان- شەرەفولمولک)ی ئەردەڵانی لە قەڵای جوانڕۆ وەدەر نـا، نیزامولولایـە لـە ڕووی لێزانییـەوە توانـی ناوچەیەکی پان و پۆڕی جـاف بخاتە ژێر دەسەڵاتەوە وەک:

سەفی ئاباد- قشلان- مەنسوور ئاقایی- دەرمور- بن دڕە- گەڵاڵە- بلەبزان- توڕیاب- نەجار- مـوراد ئاباد- غولادێ- بازیانی سـەرەوە- بازیانی خوارەوە- زلان- نهراب- خانەشـۆر- هولە- تاوگۆزی- کلاشی- ئیناخی- پاینگان تا پشتی ڕەوانسەر.

«تیرەی قوایی» تا چەند ساڵ لەمەوپێش گەرمیان و کوێستانیان دەکرد، زستانان دەڕۆیشتنە «ئەزگلە»، «گاواڕە»، «باندار» و هاوینان دەڕۆیشتنە «نەهراب» ئەم تیرەیە لە ژێر سەرپەرشتی حەبیبوڵڵاخانـدا بوون، هەروەهـا جگە لە «قوایی»، تیرەکانی دیکەی جاف وەک: ڕۆسـتەم بەگی ئێناخی، ئیمامی، کلاشـی، شـەرەفبەیانی، ڕەحمان بەگی و زۆر لە نیشـتەجێبووانی دەوری پاوە هەر هەموویان لەژێر فەرمانی حەبیبوڵڵاخاندا بووە، هەر گرفتارییەک ڕوویداوە دەڕۆیشـتە پاوە، لەوێڕا ئاسـانی دەکرد ئەوی ڕسـومات و سـەرانە بووایە وەریدەگرت و دامودەزگای بەربڵاوی بـووە، چەکداری بووە، شـەحنە و سـەرکار و دیوی تایبەتی میوانـان و هەروەها ژنانی هەبووە، چەندیـن هاوسـەری هەبووە، لە پێش ئەوەی بمرێت مسـتەفا خانی کوڕی کردۆتـە جێگری، بە نەخۆشـی وەسـتانی دڵ مـردووە، کە مردووە بیسـتوچوار کوڕ و شـانزە کچـی هەبووە، دوای

کوڕانی حەمەپاشـای جاف و پاشابوونی مەحموود پاشا سـەرۆکایەتی تەواوی تیرەکانی جاف نێوان حەبیبوڵڵاخان و مەحموود پاشای جاف تێکدەچێت، مەحموود پاشا هەواڵی بۆ دەنێرێت کەوا دەبێت کوترەدار بدەمە سەرشانیا بۆ چای لێنان.. رۆژگار دەگوزەرێت و پاشا و حەبیبوڵڵاخان لە ئیلاخدا ئاشـت دەبنەوە، مەحموود پاشـا لەگەڵ هۆزی جافدا دەڕۆن بۆ کوێستان و حەبیبوڵڵاخان بۆ لای دەڕوا. پاشـا حەبیبولا بە سـوارەکانی دەڵێت: چەند کوترە دارێک کۆبکەنەوە و بیهێنن تا دەگەمە ئەوێ. لەوێرا کە دەگەنە هەوارگەی پاشا حەبیبوڵڵاخان کوترەدارەکان دەداتە بان شانیدا کە پاشـا دێتە پیریەوە دەبینێت وا حەبیبوڵڵاخان کوترەداری بەسـەر شـانییەوەیە. حەبیبوڵڵاخان دەڵێت: پاشا بۆیە وامکرد تا سوێندەکەت نەکەوێت..

ئەمە مشـتێکە لـە خەرواری پیاوەتی و لێهاتوویی ئەو گەورە پیـاوە کە ناوی حەبیبوڵڵاخانی باوەجانی بووە.

## تیرەکانی هۆزی باوەجانی:

١- عالی: هاوینان دەڕۆنە تافگەی چیای سـارابەند و زسـتانان دەکشـێنەوە بۆ دەشتەور و خانە شۆر. کشتوکاڵی گەنم و جۆ دەکەن..
٢- قوچاڵی: لە دۆڵەدەرەدا دەژین و دەڕۆنە خانەشۆر و تەختەقاپۆ.
٣- حەمدە، لە ملەتولات و دەشتەوردا دەژین.
٤- میروەسی: لە دەشتی حور و خانەشوردا نیشتەجێن.
٥- تەمەر خانی: لە دەشتی ور و تەمەر خانیدا نیشتەجێن.
٦- خەسرەوباشە: زستانان دەڕۆنە گاورە، هاوینان میر ئاباد.
٧- میر ئابادی: لە میر ئاباد و تەختە قاپۆدا دەژین.
٨- بەگزادە: هاوینان لە دێی «لوشە» و زستانانیش لە «سەرتاویرە» بەسەر دەبەن.
٩- ئەعزەم خان: زستانان لە هولەدان، هاوینان دەڕۆنە دامێنی چیای سارابەند.
١٠- تەپان: لە دێی تەپاندا دەژین، ئەورۆ خۆیان بە تیرەیەکی سەربەخۆ دەزانن.
١١- زمکانی: هاوینان لە دێی نەیرێژدا دەبەنەسەر و بەدوای لەوەڕدا دەڕۆنە ناوچەی جیگیریان.

ئایەتوڵڵا مەردۆخی کوردستانی و دکتۆر مەسعوودی کەیهان زەنگەنە هەردوو لایان وایە ئەم تیرەیە لە سەر فەرمانی میر تەیمووری گورگانی (تیمور لەنگ) لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوونە و بە فەرمانی ئەو کۆچیان کردووە و هاتوونەتەوە کوردسـتانی رۆژهەڵات، بەڵام ئەم نەزەرە کە ئەو دوو لێزانە دەیفەرموون، مانای ئەوە نییە ئەم تیرە لە جێگە و شوێنێکی دوورەوە کۆچیان پێ کرابێت و گوێزابیانەتەوە جێگای ئێسـتایان، رەنگە مەبەسـتیان لەوەی بێت لە رووباری سـیروان لـەو بەرەوە پەڕیبێتنەوە بەری رۆژهەڵاتی سـیروان، کە هـەر دوو لا بە دەڤەر و ناوچەی هۆزی جاف لەقەڵەم دەدرێت. ئەگەر وەک نیشتەجێ بووبن وەک هاتوچۆ و لەوەڕگا ئەمبەر و ئەوبەری سیروانیان کردووە.

سەیر لەوەدایە مامۆستا مەردۆخ تیرەی قوبادی «قوایی» کە ئەمڕۆ بۆ خۆی تیرەیەکی سەربەخۆیە بە بەشێک لە باوەجانی دەژمێرێ. سەید محەمەد تاهیری هاشمی دەڵێت:

تیرەکانی: قوجالی، محەمەدە، عالی، میروەسی. ئەمانە کوڕی «باباجان» بوونە، کە بکاتە باپیرە گەورەی باوەجانییەکان و لە کۆنی کۆنەوە هەر لەو دەڤەرانەدا بوونە، وا ئێستا تیایدا دەژین. ئەوسا «بەگزادەکانی قوبادی» کە گوایە لە نەوەی پیرخدری شاهۆن، سەرۆکایەتی هۆزی باوەجانییان کردووە، کە نەوەی قوباد بەگی قوایی بوونە، کە جافی جوانڕۆن و دوای لەناوچوونی دەسەڵاتی زەند (١٢٠٠ ک) باوەجانییەکان کەوتنە ژێر فەرمانی قواییەکانەوە.

## شەڕی نێوان باوەجانی و یەزدانبەخشی:

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی فەرهاد میرزا «معتمد الدولە»ی قاجاری شەڕێکی خوێناوی لە نێوان تیرەی باوەجانی و تیرەی یەزدانبەخشیدا روویداوە، چەندین کەس لە یەزدانبەخشییەکان دەکوژرێن. بەو هۆیەوە فەرهاد میرزا حەبیبوڵڵاخانی باوەجانی زیندان دەکات، زۆر کەس دەکەوێتە تەقەڵڵاوە بۆ ئەوەی حەبیبوڵڵاخان لە زیندان دەربهێنێت، یەکێک لەوانە (حەمە پاشای جاف) پێنج هەزار تومانی ئەو دەمە پێشکەش دەکات تا حەبیبوڵڵاخان لە زیندان رزگاری بێت، فەرهاد میرزا ناڕواتە ژێر، سەرەنجام حەزرەتی (کاکە ئەحمەدی شێخ) نامە بۆ «موعتەمەدولدەولە» دەنووسێت و لە زیندان بەرەڵڵای دەکەن ١٢٨٦ک.. یەزدانبەخشی دوای ئەم شەڕە زۆرتر تێکەڵی تیرەی بەیاخی و قادرمیروەسی بوونە، لەو دوو تیرە زۆرتر لەگەڵ تیرەی ئیمامیدا تێکەڵاون، لە شەجەرەنامەکەیدا کە (مەلا محەمەدی قازی جوانڕۆ) نووسیویەتی، بۆ غەفار بەگی وەکیلی جوانڕۆ، دەڵێت: یەزدانبەخشی برای عەلی ئێناخ بووە..

## مستەفا خانی باوەجانی:

دوای مردنی حەبیبوڵڵاخان، مستەفا خان جێگەی باوکی گرتۆتەوە، ئەگەرچی داودەستگای ئەردەلان مردنی حەبیبوڵڵاخان بە هەل دەزانن و دەکەونە پیلان و گێرەشێوێنی و تا ئەو هەیبەت و دەسەڵاتە لەناو ببەن، بەڵام ئازایەتی و بەخشندەگی مستەفاخان بە ئەندازەیەک بووە، ئەردەلانەکان هیچیان پێنەکراوە، هەر وەک باوکی حکومەتی جوانڕۆی بەدەستەوە گرتووە. دەگێڕنەوە کە مستەفاخان سەفەری شاری سنە و شارەزووری کردووە، بەخشندەیی و سەخاوەتی لەو دوو سەفەرەیدا تا بە ئەورۆ دەگێڕنەوە.

مستەفاخانی باوەجانی، نازناوی (مەسعوودولدەولە)ی پێدرابوو و فەرمانی حوکمڕانی پێشکەش

کرابوو، دەسەڵاتی لە سەردەمی باوکیدا زۆرتر بووە ئازایەتیشی سەرباقی، نە پابەندی تاران بووە و نە ملکەچی ئەستەنبۆل. دەگێڕنەوە پەیوەستە دەیوت: سەیرە ئێمە گرفتاری لۆتییەکین لە تاران و دەروێشێک لە ئەستەنبۆل..

لە سەردەمی حوکمڕانی مستەفاخاندا سەرۆکایەتی باوەجانی دابووە محەمەد بەگی برای.

مستەفاخان وەک باوکی وردەکار و لێزان نەبووە، هەر توندوتیژییەکەی بووتە هۆی تۆرانی زۆر لە تیرەکانی کەی ناو جاف، کە لە لایەکی دیکەوە بە هۆی هاندانی عوسمانییەکان لە رووی مەزهەبییەوە لەگەڵ هۆزی سنجاویدا بووەتە هاوپەیمان دژ بە «داودخان ئەمیر ئەعزەم» کە دژ بە عوسمانییەکان لە تەقەللادا بووە تا وایلیهات باوەجانی و سنجاوی پەلاماری هۆزی کەلهوڕ دەدەن و لەو شەڕەدا مستەفاخان دەکوژرێت. دوای کوشتنی مستەفا خان ئەو دەسەڵات و توانایە لەناوچووە، بە تایبەت سەردار رەشیدی ئەردەلانی لەو کوشتنە سوودی زۆری بردووە. ئەو رووداوە لە ساڵی ١٩٠٩دا روویداوە. (سالارولدەولە ئەبولفەتح میرزا) نازناوی (مەسعوودولسەلتەنە) ی بەخشییە ئەحمەد بەگی کوڕی مستەفاخان.

## باوەجانی

عەلی ئەکبەری وەقایع نیگاری کوردستانی ناسروا بە ساداتولمولک دەڵێت:

لە نەتەوەی باوەجان ناوێک بوونە و ئێستا بە باوەجانی ناسراون، ئەوەی ئاشکرایە سەرتاسەری جاف لە کۆندا هەوارگەی سەرەکییان جوانڕۆ بووە، کە پەیوەندی بە ولایەتی کورد و کوردستانەوەیە (مەبەستی سنە)یە، زۆربەیان هەر لەو دەڤەرەدا ژیاون وەک:

روغزایی، گەلاڵی، یەزدانبەخشی، مکەیالی، نەورۆڵی، تەواوی ئەوانە ئاژیلدار بوونە و کوێستان و گەرمیانیان کردووە، هەر یەکە لەو هۆزانە لەوەڕگای خۆیان هەبووە، وەک: بلەبزان، گلال، کلاش، نەورۆل، سەریاس، کە هەر هەموویان لەسەر جوانڕۆ ژمێردراون، بەڵام گەرمیان و کوێستان دەکەن، ئەوە دوانزە ساڵە قەدەغە کراوە، ئەوانەی لەو دیون ناهێڵن بێنە ئەم دیوا. بەڵام ئەوە روونە کە ئەم هۆزانە لەسەر جاف حیسابن، هەر یەکە لەوانە لە وڵاتی ئێراندا لەوەڕگا و هەوارگەیان مەعلوومە، ئەوسا جێگەو ئیلاخی زایەر بەگی جاف باپیرە گەورەی حەمەپاشای جاف، کە چەند ساڵێک لەمەوبەر پەنای هێنابووە ئێران و زۆربەی زۆری سنووری رۆژئاوای ئێرانیان خستبووە ژێردەسەڵاتییەوە، باوەجانییەکان سەرجەم سێ هەزار کەس دەبن، ئەم هۆزەش کۆچەرین هاوینان دێنە ئیلاخییەکانی جوانڕۆ زستانیش دەگەڕێنەوە بۆ گەرمەسێری سەر سنوور، ئەوڕۆ «حەبیبوڵا بەگ» سەرۆکی ئەم هۆزەیە، دوو ساڵ لەمەوبەر لە لایەن والی کوردستان «سنە» حوکمڕانی ناوچەی خۆی پێ سپێردراوە و تەقریبەن دووسەد خێزان لەم هۆزە بە «قوامی» ناسراون و لەگەڵ باوەجانیدا تێکەڵاون لە نێوان (بازان، بەنی کز، ناراو)ی جوانڕۆوە زستانانیش چیای شێخان لە دەڤەری زەهاودا هاتوچۆ دەکەن.



مستەفاخانی باوەجانی- مەسعوودولسەلتەنە

# موئمین بەگی باوەجانی

لــە ســەردەمی ئەمانوڵڵاخانی ئەردەڵاندا، موئمین بەگ ســەرۆکی تیــرەی قوایی و باوەجانی بووە، لە ساڵی ١٣٢٥ کۆچەری والی ناوبراو ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوە، محەمە حەسەن خانی ئــەردەڵان کــە کوڕی ئەمانوڵڵاخان بووە، خۆی دەگەیەنێتە دەڤــەری «موئمین بەگ» و «موئمین بەگ»یش بە تەواوی توانایەوە یارمەتی دەدا..

محەمــەد حەســەن خــان، دەیەوێت شــەبەیخون بکات و بەشــەو پەلاماری لەشــکری باوکی بــدا، ڕێگە ون دەکات و بەشــەبەقدا خۆی لە ناوەڕاســتی لەشــکری باوکیــدا دەبینێتەوە، لە لایەن یەکێک لە ناودارانی لەشکرەوە دەکوژرێت. موئمین بەگیش دەگەڕێتەوە ناوچەی خۆی. کوڕەکەی دیکەی ئەمانوڵڵاخان شایی دەکا، موئمین بەگیش بۆ ئەو شاییە دەعوەت دەکرێت لەگەڵ لەشکری ئەمانوڵڵاخاندا بەرەو شاری تاران دەڕۆن، لەوێدا بەو هۆیەوە ڕمبازی و پێشبڕکێی ئەسپسواری و شمشــێر وەشــێنی دەکرێت «قولی شــا» ناوێک، کە پاڵەوانی شــای قاجار بووە، تیروەشێن و شمشــێر بازی بەناوبانگی ئەو ســەردەمە بووە، دەڕواتە مەیدانەوە و داوا لە تەماشاکەران دەکات ئەوی خۆی بە پیاو و پاڵەوان دەزانێت با بێتە مەیدانەوە، لێرە کابرایەک بە شــێوەیەکی نەناســراو دەڕواتە بەرامبەری رادەوەســتێت و لەپڕ بەیەکدا دەئاڵێن، زۆر ناکێشــێت «قولی شا»ی پاڵەوانی شای قاجار لە لایەن کابرای نەناسراوەوە دەکوژرێت و شا بۆخۆی تەماشاکەری ئەو دوو پاڵەوانە بووە. لە ئەمانوڵڵاخان دەپرسێت ئەو قارەمانە کێیە؟!

بە لای ئەمانوڵڵا خانیشــەوە نەناســراو بووە و والی هەرچی دەکۆشــێت بکوژی «قولی شا» پەیدا کات سەرناکەوێت، دوای مانگێک دەگەڕێنەوە بۆ کوردستان، لە دواییدا دەردەکەوێت، بکوژی «قولی شا» موئمین بەگ بووە، والی بۆ ماوەی یەک ساڵ موئمین بەگ زیندانی دەکات..

دوای ساڵەکە دیسان بەزمێکی ڕمبازی کردن دەبێت، والی، موئمین بەگ، لە زیندان دەردێنێت و پێی دەڵێت: پێم خۆشە بە بەرچاومەوە ڕمبازی بکەیت. موئمین بەگ دەڵێت: بەڵێ قوربان، ئیدی ئەســپێکی بــۆ دێنن، موئمین بــەگ پێی رازی نابێت و دەڵێت: ئەو ئەســپە خراپە. دەڵێن: باشــە چ ئەســپێکت دەوێ؟ دەڵێت: ئەسپەکەی خۆم. کە بۆی دێنن، موئمین بەگ سواری ئەسپەکەی دەبێت و پڕتاو لە مەیدان وەدەر دەچێت و خۆی دەگەیەنێتە ناوچەی باوەجانی..

# قوبادی

ئاشکرایە ناوی ئەم تیرەیە «قوبادی- قوایی» لە ناوی کەسێکەوە هاتووە، کە ناوی «قوباد» بووە، دیارە و حاشـاهەڵنەگرە کەوا ئەم خزمانە ئێسـتا بوونەتە تیرەیەکی سەربەخۆ، دەگەڕێنەوە سەر (سەید ئەحمەد بەگ، سۆفی ئەحمەد بەگ ناسراو بووە بە گەورە)..

ئەم سەید ئەحمەد بەگی گەورەیە، چەندین کوڕی هەبووە. ئەوانەی ناسراوبوونە:

١- هەمیر خان بەگ
٢- تاهیر بەگ
٣- ئیناخ بەگ
٤- وەڵەد بەگ
٥- سەیفوڵڵا بەگ

لێرەدا با ورد بینەوە، ئەم پێنج کوڕەی «سـەی ئەحمەد بەگی گەورە» هیچ کامیان بە سـەید ناو نەبراون، سـەیدبوون واریسـە و بە رەگەز کوڕ و کوڕەزای سەید هەر بە سەید یان شێخ ناو دەبرێن، وەک «بەگ» بوون، دیسـان بە رەگەزە ئیدی ناکرێت «سـەید ئەحمەد بەگ» سەید بێت، نە باوکی سەید بووە و نە کوڕەکانیشی بە سەید ناو براون.

بەندە لە باسـەکانی دیکەدا لەم رووەوە زۆر دواوم. لەوەش دڵنیام کەوا (بەگزادەی جوانڕۆ- بەگـزادەی قوایی و باوەجانـی، بەگزادەکانی وەڵەدبەگی، بەگزادەکانی جـاف، کە بکاتە بەگزادەی کەیخوسـرەو بەگـی و بارام بەگی ئەمانە هەمووی بە یەک بەرەبـاب دەژمێردرێن و هەر هەموو

دەگەڕێنــەوە ســەر «ســەی ئەحمەد بەگی گەورە» لەبــەر ئەوەی زەمانی «ســەی ئەحمەد بەگی گــەورە» زۆر لــە مێژەوە نییە و ژمارەی ئەو بەرەبابە بەگزادانەش زۆر نین و کەم دێنە بەرچاو، بە گوێرەی زەمان و تەمەنی مام ناوەندی، ئەو سەردەمە هەر ئەوەندە دەبن، کە ئێستا هەن. لەبەر ئەوەی ئێمە لە بەشی باسی تیرەی «قوایی» داین، با بگەڕێینەوە سەر ناوی «قوایی».

## ناوی «قوایی»:

«قوبــادی یــان قوایی» ئەم ناوە لە کوێوە هاتووە؟. هەمیر خانی کوڕی ســەی ئەحمەد بەگی گــەورە، کوڕێکــی هەبــووە بە نــاوی «قوباد بــەگ» ئەم قوباد بەگــە، پیاوێکی ئــازا و لێهاتوو و دەستڕۆیشتوو بووە، دیارە لە باوکی بە دەسەڵاتتر و بە تواناتر بووە.

بەگزادەکانی قوایی، قەواڵەی رەشی موڵکایەتی زۆریان بە دەستەوەیە بە ناوی قوباد بەگەوە، بەگزادەکانی قوبادی بە ناوی ئەو زاتەوە نراوە و سەرئەنجام تیرەی قوایی.

## نێوی قوایی:

ئەورۆ ئەم تیرەیە بە یەکێک لە تیرە دیارەکانی ناو عەشیرەتی جاف دەژمێردرێن و وەک هەر تیرەیەکی کەی «جاف» بە گوێرەی جەبری زەمان و ســنووری دروستکراوی نێوان کوردستانی رۆژهەڵات و باشــوور بوونەتە دوو بەشــەوە، بەڵام بەشــی زۆریان لە کوردســتانی رۆژهەڵاتدا نیشتەجێن، ئەم تیرەیە بە گوێرەی ژیان و بگرەوبەردەی زەمانە نەختێک بڵاوبوونەتەوە و چەندین بەرەبابیان لێ پێکهاتووە، وەک:

١- قەڵانی
٢- کۆڕەیی
٣- مەلا زوراوی
٤- میرکی
٥- زەلانی
٦- بازانی
٧- خێڵی فەیاد
٨- خێڵی نەختە
٩- نەویجانی
١٠- تەنگی ئەژدیهایی

وەک لە پێشــدا وتم، بەگزادەکانی قوبادی لەگەڵ بەگزادەکانی جوانڕۆ، وەڵەدبەگی، باوەجانی،

زایــەر بەگــی، کــە بکاتە بەرەبابی ئێمەی (کەیخوســرەو بەگی و بارام بەگی) لــە بنەچەکدا کوڕی یــەک بابین و لە ناو بەگزادەکانی «قوبــادی –قوایی»دا پیاوی هەڵکەتوو و لێهاتووی زۆری تیادا هەڵکەوتووە، جگە لە شاعیری دڵناسکی گەورەی کورد «خانای قوبادی» کە بەندە بە تایبەت چەند پەڕەیەکی جیاوازی لەسەر دەنووسم. ئەمەش ناوی بڕێک لە بەگزادە ناسراوەکانی قوبادییە:

١- خانای قوبادی، زڕ کوڕی قوباد بەگ بووە.
٢- سەید ئەحمەد بەگی بچووک.
٣- شورە بەگ
٤- سمایل بەگ
٥- یوسف ئاغا.

دیارە یوسف ئاغا بە باپیرە گەورەی بەگزادەکانی باوەجانی ناسراوە. بەگزادەکانی قوبادی دەڕۆنە سەر قوباد بەگ، بەڵام سەید ئەحمەد بەگی بچووک کوڕی زۆر بووە، ناوی ئەمانەی خوارەوە بە دەستەوەیە:

أ- پیرە بەگ
ب- موئمین بەگ
ت- هەمیر خان بەگ
پ- خانلەر بەگ

لێرەدا دەمەوێت پەنجە بخەمە سەر چۆنیەتی ئەو ناوانە، بنواڕە چوار کوڕی یەک بەرەباب بە چەند جۆر ناونراون.

«ســەید، ئاغا، بەگ، خان، بەوەشــەوە رانەوەستاون، ناوی لێکدراویشیان تێدا دەبینرێت وەک (خانە بەگ، خانلەر بەگ، ئاغا بەگ) ســەرئەنجام ســەید بەگ. کەواتە لێرەدا ســەید ناو بووە نەک بە رەگەز ســەید بوون. دەمارگرژانی عەرەب بە قەســدی ورک گرانە دەکۆشــن زۆربەی زۆری عەشــایەری کورد ببەنەوە ســەر عارەب، بەڵام هێچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراویش بە دەستەوە نییە، جگە لە بڕێک ناوی ئیســلامی نەبێت، کە ئەو ناوانەش لە ناو کوردا کە زۆربەی زۆری پەیڕەوی ئایینی ئیسلامن، کەم و زۆر بینراوە و بیستراوە و نابێتە جێگەی باوەڕ.

تا ئەم دوادواییەش چەندین کەسی ناوداری بەگزادەی قوبادی ناویان بەسەر زارانەوە بووە، وەک:

١- کەیخوسرەوی کوڕی مەئموون بەگ
٢- عەلی بەگی کوڕی خانلەر بەگ
٣- یوسف ئاغای کوڕی قوباد بەگ

ئێستاش «مەلا حسەینی خەلیفە فەتاح» بە دەمچەرمووی قوبادییەکان دەژمێردرێت و لەسەر

دەماری کوردایەتی ئەوە چەند ساڵە دەربەدەری وڵاتان بووە.

ســاڵح سلێمان حوسێن. ئەم پیاوە ئەوڕۆکە لە ناو تیرەی خۆیدا قسەبیستراوە و ڕێزلێگیراوە، یەکێک بووە لە پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلوول.

کەریمی مەحموودی ئەمین، ناسراو بە کەریمی سەلمە، لە ساڵی ١٩٨٠ کۆچی دوایی کردووە. تیــرەی قوبــادی زۆرتر لەگــەڵ وەڵەدبەگی و جوانڕۆ و باوەجانــی و تاوگۆزیدا تێکەڵاون، زۆرتر تێکەڵاوی (باوەجانی)ن، لەبەرئەوە بە چەند پشت دەچنە سەر یەک.

## دەڤەری قوایی

ناوچەی تیرەی قوایی کە تیایدا دەژین، لە باکوورەوە نزیکی ناوچەی بەگزادەکانی ڕۆســتەم بەگی جوانڕۆیە، لە باشــووری ڕۆژئاواوە نزیکی وەڵەدبەگییەکانن، لە باشــوورەوە نزیکی هۆزی قەڵخانین و لە ڕۆژئاواوە لە دەڤەری ئەزگلەن و لە سنووری باوەجانییەکانەوە نزیکن.

زستانان دەڕۆنە ملە ترشکە و بازان، هاوینان لە ئەزگلەو، گاوارە، قەیتوول و دەربەند هوڵیدا دەژین.

## بەرەبابەکانی قوایی و دەڤەرەکانیان:

١- بەرەبابی قڵانی، لە ناوچەی باخی سەیدخانیدا دەژین.
٢- بەرەبابی کورەیی، لە گاوارەدا دەژین.
٣- بەرەبابی زەلانی: لە بازیان و گاوارەدا دەژین.
٤- بەرەبابی میرەکی.
٥- تایفەی باوە.
٦- پشتماڵەی سەرۆکی ئێڵ.
٧- بەرەبابی حەسەن ئەلی.
٨- بەرەبابی ئەژدیهایی.
٩- بەرەبابی غەلی یاخەیی
١٠- بەرەبابی مەسوور ئاخەیی

١١- سمایل ئاخەیی. ئەم تیرەیە پێنج بەرەبابن:

أ- سمایلی
ب- ئاخلی بیگی
ت- شاوەیسی ئاخەیی
پ- مەسوور ئاخەیی
ج- عەلی ئاقایی

١٢- تیرەی مەنوچەهری
١٣- تیرەی مستەفا بەگی
١٤- تیرەی کلاشی: ئەم تیرەیە ئەوڕۆ خۆیان بە تیرەیەکی سەربەخۆ دەزانن لە ناوچەکانی:

ماکوان، تەرخان ئاباد، قەڵای جوانڕۆ، کرماشان، باوەجانی، زەهاو تەختە قاپودا بڵاوەیان لێکردووە و نیشتەجێن.

## ناوی قوبادی:

ناوی قوایی لە قوباد بەگی باپیرە گەورەیانەوە وەرگیراوە، کە بکاتە کوڕی سەید ئەحمەد بەگی گەورە.

بڕێک سەرچاوە سەرەتای دەسەڵاتی ئەم تیرەیە بە یەکێک لە بەگزادەکانی هۆزی جاف، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی لەناوچوونی زەندییەکان ١٢٠٠ک. یانی سەرەتای دەسەڵاتی قاجارییەکان. سەیدی ئەحمەد بەگی جاف لە ناو هۆزی جاف و غەیری جاف و دەسەڵاتە زلهێزەکانی دوور و نزیکدا ڕێزی لێگیراوە و قسەی لێ بیستراوە، بڕێک لایان وابووە، کە «سەید» بووە، بۆیە لە ناو خەڵکیدا بە چاوساق و ڕێزدار تەمەشاکراوە. بەڵام لە ڕاستیدا ناوی «سەیدی» بووە، ئەگەر سەید بووە ئەی باوکی بۆ بە سەید ناو نەبراوە؟. یان کوڕەکانی؟ ئەوی لە پێش ئەودا بووە هەر بە ئاغا و خان و بەگ و میر ناوبراون، تا دوای ئەویش هەروا ئەو شۆرەتانەی خان و بەگ و ئاغا و میر و پاشا هاوناوی کوڕ و کوڕەزا و نەوەکانی بووە، تا گەیشتووەتە ئێمەی ئەم سەدە، نە بە ڕەفتار و نە بە کردار و نە بە ناو و شۆرەت لە دوای «سەیدی» ئەحمەد بەگی گەورەوە

سەیدێکمان تیادا هەڵنەکەوتووە، لەوانەش گوزەشتە «سەید» بوون، رەگەزە، نازناو نییە، زنجیرە رەگەزێکە هەر دەبێت بگاتە رەگەزی پەیامبەری خوادا، ئەوەی مێژوو و دیکۆمێنت بەدەستەوەیە، میـر و بەگزادەکانی جاف، هەرگیز نەوەک سـەیدێک جوولاونەتەوە، نـە وەک بنەماڵەی ئایینی لە ژیانــی رۆژانەیاندا مامەڵەیان کردووە، بە پێچەوانەوە بە گوێرەی نیازی زەمان و زۆربەی زۆری دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمانە لە هیچ توندوتیژی و ململانێی خوێناویدا درێغییان نەکردووە، ئیدی لە رووی دەمارگرژی خێڵەکییەوە بێت یان بەرژەوەندی خۆی و دەوروبەرەکەی، یان بۆ پاراستنی دەسەڵاتی مەرکەزی و لەشکرکێشیی ئێرە و ئەوێی ئەو وەختانە، ئایا ئاوا دەسەڵاتێک و چۆنیەتی ژیانێک دەکرێت خاوەنی تەکیە و تەهلیلە و خانەقا و مورید و مورشیدی بێت؟!

ســەید ئەحمەد بەگ چەندین کـوڕی هەبووە، هەر هەموویان رەفتــاری میرزادەیان کردووە، کــرداری بەگزادەییان نیشــان داوە، نەدەبــوو یەکێک لەو دە دوانزە کوڕە بۆ خــوا هەر یەکێکیان چاوی لە باوکی کردبا و پەیڕەوی کردبا، وەکو رەوشتی باوکی و سەید مەئابانە رەفتاری کردبا و تەکیە و خانەقایەکی دروستکردبا و مورید و مورشیدی کردبایە پیشە، ئەگەر لە راستیدا باوکی سەید بووایە؟!

بەنــدە وەک نووســەرێک، نەک وەک خوســرەو جاف، کە لە نەوە و نەتیجــەی ئەو زاتەم، کە ناسراو بووە بە «سەیدی ئەحمەد بەگ» بۆ ساتێکیش ناتوانم بیسەلمێنم کە (سەیدی ئەحمەد بەگ) رۆژێک لە رۆژان بەیرەق و خەلیفە و تەپڵی دەروێشی بووبێت، بەیرەقی شەڕ و تەپڵی هەی سوار هەی سواری هەبووە، پەیوەستە نیازی پەلاماری هەبووە، وەکو خەڵکی دیکەی ئەو زەمانە تالانی خێڵ و دەڤەر و شــاری کردووە، تا توانیویە دەســەڵاتی خۆی و خێڵەکانی جافی بەربڵاوکرووە، ئەوەشــی لە باوباپیرانەوە بۆی ماوەتەوە لە ســەردەمی ئومەرای جاوانەوە بیگرە تا ســەردەمی میرزادەکانی چابان و دەرباری ساسانی و فەرماندەرانی. دەسەڵاتی ئەردەلان بەو سوپا و سانەوە پەیوەســتە چاویان بڕیوەتــە مەڕومالاَت و دارای جاف و هۆزەکانی جاف، ســەرکردەکانی جاف کەم و زۆر ئەو رەفتارانەیان قەبوڵ نەکردووە و بەربەرەکانییان کردووە، بەڵام کە حەبیبوڵلابەگی کوڕی محەمەد بەگی قوبادی توانیویە تیرەکانی جاف بە یەکەوە پەیوەست بدا و ئازایانە بەرامبەر دەسەڵاتی ئەردەلان بوەستێت و بتوانێت تۆڵەی کوشتنی باوکیشی بسێنێتەوە. بەگەکانی جوانڕۆی رۆســتەم بــەگ، ئێــل بەگی، وەڵەدبەگــی و ئەمین بەگیدا رێــک بکەوێت و دژ بــە فەرهاد میرزا و لایەنگرانی کەوتە تەقەللاوە و شەڕی نێوانیەوە.

لێرەدا دەمەوێت سوپاســگوزاری کاک ســاڵح، ســلێمان، حوســێن، کیومەرس، کەیخوسرەو بەگی موئمین بەگ بکەم، کە زۆر یارمەتی دام و لە رووی خزمانی قواییەوە زانیاری بە کەڵکی پێدام.

# تیرەی باوا

ئـەم تیرەیە یەکێکە لە تیرە ڕەســەنەکانی ناو هۆزی جـاف، وەک زۆری کەی تیرەکانی جاف ســەرهەڵدانیان لــە دەڤەرەکانی جوانرۆدا بووە، بە گوێرەی زەمــان و ڕووداوەکانی ئەو دەڤەرانە بــە تایبــەت ڕاپەڕینەکانــی جوانرۆ و تیرەکانی کــەی جاف دژ بە دەســەڵاتی پەهلەوی و لە پێش ئەودا قاجاری، دیارە ئەم تیرەیە لەو ڕاپەڕینانەیدا بێ دەنگ و بێ لایەن نەبووە و لەو شــەڕانەیدا بەشــدارییان کردووە و ســەرەنجام کەوتوونەتــە بەر زەبر و زۆری دەوڵەتــی مەرکەزی، ڕەنگە هــۆی دیکــەش هانــدەر بووێــت بۆ کۆچکردنیــان وەک قات و قــڕی یان وەبــا و درم و ئاژیل لە ناوچوون. ئەم تیرەیە تا ساڵانی ١٩٦٧ هێشتا لە ژیانی کۆچەریدا بڕێکیان بەردەوام بوونە و ئەو ڕووداو و کۆچکردنــە بووەتــە هۆی بەربڵاوی ئەو تیرە جافە و لە زۆر جێگە و شــوێندا بڵاویان کردووە، زۆریان هەر لە ناو عەشــیرەتی جافدا ماونەتەوە و لەگەڵ تیرەکانی دیکەی جاف ژیاون و تێکەڵاوییان بەردەوام بووە، بڕێکیان لە ناو هۆز و دەڤەرەکانی جافدا بە دەرچوون و تێکەڵاوی عەشیرەتی دیکە بوونە و هێشتا شانازی بە جافبوونی خۆیانەوە دەکەن.

## ناوی باوا

وشەی «باوا» و «باوە» هەردووکیان یەکن، خێڵی باوا بۆخۆیان دەڵێن ناوی «باوا» ناوێکی کۆنە و لە زەردەشــتییەکانەوە گەیشــتووتە ئەوان، بۆیە وا ناودەبرێن. ئەم بۆچوونە بە لای منەوە سەلماندنی ئاسان نییە، بەڵام بە تەئکید ناوی «باوا» ناوێکی ئیسلامی نییە و سەرەتای ئەو جۆرە ناوانە دەگەڕێتەوە بۆ ســەردەمی دەســەڵاتی ئەهلی حەق و دەوڵەت و مەکنەتەکەی شاخوشین و ســەردەمی «شاخۆشــین» ئەگەر بێتو بەراوردی بکەین لەگەڵ ســەردەمی زەردەشت پەیامبەردا

جیاوازی زەمانیان یەکجار زۆرە، زیاتر لە سێ هەزار ساڵیان نێوانە، لە کاتێکدا سەردەمی «شاخۆشین» دەکا سەدەی چوارەمی کۆچەری، لەوانە گوزەشتە لە دەڤەرەکانی جافدا چەندین مەزار و گرد و لووتکە بە ناوی «باوا»وە ناو دەبرێت وەک: باوەخوشین، باوەمەحمو، باوەیادگار، باوەشاسوار، باوەکوچەک، هتد..

ئێمە ئەگەر بە وردی مێژووی برێک لە تیرەکانی جافدا ورد بینەوە، لە مێژدا تێکەڵاوییەکی زۆرمان هەبووە، لەگەڵ پەیڕەوانی ئەهلی هەقدا، بەندە لە بەشەکانی کەی ئەم کیتاوەدا لەو رووەوە دواوم.

بەسەر ئەو رووداوە گەورانەشدا کە ئەم تیرە جافە پشکی زۆری زوڵم و زۆری بەرکەوتووە، هێشتا وەک تیرەیەکی سەربەخۆی جاف هاوبەستەگی و پەیوەندی پتەویان لەگەڵ یەکدا ماوەتەوە و چەندین بەرەبابیان وەک ئەمانەی خوارەوە ماون:

١- بەرەبابی ئەلماس
٢- بەرەبابی باوە
٣- بەرەبابی باوەقزی
٤- بەرەبابی باوە رەحمان
٥- بەرەبابی باوە جەمشید
٦- بەرەبابی باوە داود
٧- بەرەبابی باوە مورسەل
٨- بەرەبابی باوە ئەڵا موراد
٩- بەرەبابی باوە ئەوڵا
١٠- بەرەبابی باوە زۆراو
١١- بەرەبابی باوە میرە
١٢- بەرەبابی جەلیلە
١٣- بەرەبابی وارانی
١٤- بەرەبابی عەزیز باوە
١٥- بەرەبابی باوە مەحموود فەرهادی
١٦- بەرەبابی محەمەد روبیتنی
١٧- بەرەبابی باوەلی

برێک لەو بەرەبابانە لە ناو غەیری جافدان، بەڵام دەمارگرژی جافایەتییان بەهێزە و شانازی بە جافبوونەوە دەکەن.

سەرجەم ئەم تیرەی جافە جگە لە ژیانی کۆچەری، کە تەنیا بە ئاژیلدارییەوە خەریکن، کاروکردەوەی دیکەیان کردووە بۆ بژێوی ژیان، چەند کەسێکیان تیا هەڵکەوتووە لە «ئاسیاو» نانەوا و لە هەر کوێڕا لە کەسانی دیکە دروستکردنی ئاسیاو عاسی بایە بە لای خێڵی باوەوە ئاسان بووە، (عەبدوڵڵای کەریم و عەلی محەمەد کەریم حەمەی باوە) زۆرتر لە هەمووان چاوساقی ئەو هونەرەی بوونە و زۆربەی کارەکانی دیکەی بە لای کۆچەرییەکانەوە دژوار بووە، باوەییەکان

ئەنجامیان داوە، وەک (هەوجاڕ و قورمە و هەروەها چنینی جاجم و بەڕە و دەوار و چیخ و ئەوی کاری دەستی ئەو سەردەمەی بووە).

ئەم تیرە وەک وەزارەتی پیشەسازی عەشیرەت بوونە و لەبەر نیازیش بووە تیرەکانی جاف و غەیری جاف روویان تێکردووە و نیازیان پێیان بووە.

لە کۆنەوە ئەم تیرەیە مەلا و پیاوانی ئایینییان تیادا هەڵکەوتووە وەک:

١- مەلا عەلی تەیان
٢- مەلا عەزی ئەلی
٣- مەلا عەزیم
٤- مەلا قادر
٥- مەلا حەسەن ئەحمەد
٦- مەلا کاکە خان
٧- مەلا حوسێن و هەروەها برێک مەلای تر.

ئێستاش کە دونیا گۆڕاوە و گەنجانی خێڵی «باوا» زۆرتر لە بواری خوێندندا خەریکن و ئەوڕۆکە گەلێکیان هەڵگری بەڵگەنامەی بەکالۆریۆس و ماجستێر و دکتۆران.

ئەم تیرەیە وەک هەر تیرەیەکی دیکەی جاف، جەبری زەمان کردوونی بە دوو بەشەوە، بەشێکیان لە کوردستانی رۆژهەڵاتن، بەشێکی کە لە کوردستانی باشوورن، جێگەی نیشتەجێبوونیان لە رۆژهەلات لەم شار و دەڤەرانەدان.

١- کرماشان، سەپەل، سەلاسی باوەجانی، جوانرۆ، ئەزگلە، رەوانسەر، پاوە.
٢- کەرکووک، هەولێر، سلێمانی، کەلار، باوەنوور، مەیدان، بەمۆ، دەربەندیخان، هەڵەبجە، زەڕایەن، شارەزوور، بەرزنجە، باوەیەکانی تر زۆرتر تێکەڵاوی ئەم تیرانەن: باوەجانی، قوایی، تاوگۆزی، ئیمامی، وەڵەدبەگی، هاروونی، شەمێرانی، شەرەفبەیانی، تایشەیی.

# کەسایەتییە ناودارەکانی تیرەی باوا



عەبدولقادر فەتاح
١٨٨٨-١٩٨٣



مەجید قازی سلێمان
١٩١٠-٢٠٠١



ئەحمەد حەمەدەمین کامەران جەمشیر
١٩٨٨-١٩٠٧



کوێخا عەول محەمەدی بەلەسۆ
١٩٩٨-١٩٠٤



داود محەمەد عەزەم رەمان
١٩٩٥-١٩٢٦



مستەفای قازی سلێمان
١٩٦٣-١٩٢٦




شەهید ئەنوەر مەجید قازی سلێمان
١٩٩٤-١٩٥٤



ئەسما خانی عەزیز فەتاح ئەلماس
٢٠٠٩-١٩١٠



کوێخا فەتاحی رۆستەم
١٩٠٦-٢٠٠٥



قادر مەحموود کامەران جەمشیر
١٩٠٠-١٩٩٨



حاجی رەشیدی بەلەسۆ
١٩٠٦-١٩٨٩



عەبدوڵڵا وەیس باوەیی
١٩٠٠-١٩٧٦
لە کاتی خۆیدا دەمچەرمووی تیرەی خۆی بووە.



مەحموود عەزیز رەحمان
١٩٢٥-١٩٩٦



حاجی مەحموودی محەمەد کەریم جەمشیر
١٩٢٤-٢٠٠٩

جگە لەو وێنانە، کە لە دونیا دەرچوونە لە ناو تیرەی باوادا دەمچەرموانی زۆریان تیادایە و ئەوڕۆ بە براگەورەی خۆیان دەزانن وەک:
١- حەبیب محەمەد دەروێش ٢- خەلیفە حەسەنی ئەلماس ٣- عەزیز عەلی محەمەد کەریم
٤- مەولود فەرهادی ٥- مەلا بورهان عەزیز
بە تەئکید پیاوماقووڵانی تریش لەم تیرەیەدا زۆرن، من داوای لێبووردن دەکەم، کە ناوەکانیانم نەزانیووە و پێم نەگەیشتووە، ئەوە مانای ئەوە نییە ئەوان نەبن.

# دووڕویی

ئەم تیرەیە ئەوسا لە دامێنی شاخی شاهۆدا دەژیان، لە باکوورەوە تیلەکۆ و لە باشوور بە لونی سادات، لە رۆژهەڵاتەوە ناوچەی شاهینی و تەختەزەنگی و لە رۆژئاواشەوە دەکەونە دامێنی رۆژهەلاتی چیای شاهۆوە.

ئەم تیرەیە لە ناوخۆدا بەسەر چەندین تیرەدا دابەش بوونە.

دکتۆر مەسعوودی کەیهان دەڵێت:
ئەم تیرەیە لە بنەچەکدا لەسەر ئیلەرووتە دەژمێردرێن، کە گەرمیان و کوێستانیان لە نێوان لێواری سیراون و جوانڕۆدا کردووە. بریتین لەم بەرەبابانە:

١- مستەفایی
٢- دوورویی
٣- بێ سەری
٤- بێ یانی

سەرجەمیان لە رەوانسەر و ماهیدەشتا دەژین. دکتۆر بەهمەنی کەریمی لە کتاوی جوگرافیای مێژووی رۆژئاوای ئێراندا نووسیویەتی لای وایە چوار تایفە بە ناوی رەحمان بەگی ناسراون و لەسەر «جاف» دەژمێردرێن. ئەو چوار تیرەیە ئەمانەن:

١- مستەفایی
٢- دوورویی
٣- بێ یانی
٤- بێ سەری.

سەرجەمیان لە رەوانسەر و کەلاتدا دەژین، ئایەتوڵڵا مەردۆخ دەڵێت:

دوورووییەکان سەد خێزانێک دەبن لە جوانڕۆ و رەوانسەردا دەژین، رەحمان بەگی هەموویان لەسەر ئێناخی دەژمێردرێن، تیرەیەکی تر هەن بە ناوی گودرزی کە سەر بە ئێناخی دەژمێردرێن.

## ناوی دووروویی:

لە بەرئەوەی هەوارگەی ئەم تیرەیە لە نزیکی رووباری لێڵە و سیرواندایە بەو ناوە ناسراون، دووروویی لە نووسراوەکانی سەردەمی قاجاریدا بە «دووورودی» ناو براون، تیرەیەکی تر لە نزیکی کرماشـاندا هەن، بە ناوی «دورودی» بە نزیکی تێکەڵاوی رووباری «قەرەسـوو و جاماسب»دا دەژین و لە هۆزی زەنگەنە دەژمێردرێن، هیچ پەیوەندییەکیان بە «دوروی» جافەوە نییە.

با ئەوەش بڵێین، ئەو تیرانەی ناسـراون لە «دووروویی» و ئەورۆ لە ناو هۆزی جاف دان و لەسـەر جاف دەژمێردرێن، چەند تیرەیەکن لە مێژەوە هەبوونە و خاوەنی بوونە، بەڵام کە نەوەو نەتیجە خزم و خوێشـانی پیر خدری بوونەتە هـەر ماونەتەوە، بەڵام تواونەتەوە لە ناو ئەو هێزە تـازە پێگەیشـتووەیدا، توانەوەی ئەو تیرانە وەک تیرەی سـەربەخۆ نـەک لە ناوچوون و جێگە و شـوێن و هەوارگەی گەرمیان و کوێسـتانیان کە لـە مێژەوە هەیانبووە، پاراسـتووە. بۆ نموونە، ئەوانەیان بەرەو ناوچەی گۆران کۆچیان کردووە و بە (جافی گۆران) ناسراون..

حەبیبوڵڵاخانـی باوەجانـی «نیزامولوەلایـە» باوەک لە ناو هۆزی دورووییەکاندا شـەڕکەر و سـوارەی ئـازای زۆری تیادا بـووە، بەڵام جوانی و زەرافەتی ئافرەتـی دورویی بەناوبانگ بووە، بۆیـە داوای (زەینـەت خانمی کچی مەلا قادری دورویی) کـردووە و مارەی کردووە، ئەو ئافرەتە بە کەژاوە نەبێت هاتوچۆی نەکردووە، مەلا قادر میرزا بنووسی نیزامولوەلایە بووە، دەڵێت لە ناو جافدا ئەو ژنە زۆرتر بە ناوی «بەلقیس» ناو دەبرا، ئەو ژنخوازییە بووەتە هۆی پتەوی دەسەڵاتی دورووییەکان و دوای مردنی حەبیبوڵڵاخان هێز و یەکێتی جاف روو بە کزی و لاوازی رۆیشتووە. کاتێک «سەردار رەشید» کەوتووتە کۆکردنەوەی سوارەی عەشایر «فەرەجوڵڵا بەگی دورویی» برازای مەلا قادر، کە ناسـراو بە «فەرەج فەتاح» بە خۆی و توانایەوە دەبێتە چەکداری سـەردار رەشید (د. محەمەد عەلی سوڵتان).

## شەڕی مایدەشت

دوای مردنـی حەبیبوڵڵاخـان، نیزامولوەلایە، مسـتەفا خانـی کوڕی، «مەسعودولسـەلتەنە» جێگەی دەگرێتەوە، لەو سـەردەمەدا شـێخ قادری بەرزنجی ناسـراو بە «گوللەنەبڕ» پەنا دەباتە ناو ئێران دەسـت بە گەڕان و دەف و دایەرە نیشـاندان دەکا و خەڵکێکی زۆری لێ کۆدەبێتەوە، باوەجانـی لەگـەڵ سـنجاویدا دەبنە هاوپەیمان لـە رووی مەزهەبییەوە (دیارە شـێخ قادر زۆرتر ئەو شـەڕەی هەڵگیرسـاندووە) لەگەڵ هۆزی کەلهوڕدا بەشـەڕدێن، لە پێش ئەو شـەڕەدا، شـێخ قادر زەینەت خانمی بێوەژنی حەبیبوڵڵاخان مارە دەکات، لەو شـەڕەیدا مسـتەفا خانی باوەجانی مەسعودولسەلتەنە دەکوژرێت و هێزی جاف و سنجاوی لە لایەن کەلهوڕەکانەوە ئابڵۆقە دەدرێن، لەو شەڕەشـدا کەلهوڕەکان سەرکەوتنی گەورە بە دەست دەهێنن. وا دیارە شەڕکەرانی دورویی بێ یەک و دوو لەژێر فەرمانی سـەردار رەشـیددا بوونە، ئەودەم فەرەجوڵڵا بەگ و ئەمین بەگ سـەرکردەی دوروییـەکان بوونە و پەلاماری سـوارەی دورویی بۆ سـەر تایفـەی «دولابی» و «سەرسوری» بە ئەمری سەردار رەشید بە وردی ئەوەی دەردەخات کە سەری رمی دەسەڵاتی سەردار رەشید دورووییەکان بووە.



زەینەت خانمی مەلا قادری دورویی
«بەڵقیس»

# تیرەی ئیمامی

داستان زۆرە لە بارەی رەگ و رەگەزی تیرەکانی جاف، لە زۆر رووەوە دەستکاری لە چۆنیەت و حەقیقەتی مێژوویی کراوە، سا لە رووی بەرژەوەندی کەسێکەوە یان میرێکەوە یان سەر عێلێک، چوزانم، شێخێک، مەلایەک، بەگوێرەی نیازی زەمان زۆر شتیان گۆڕاوە و ئیدی دەماودەم وتراوە و تا گەیشتووتە ئێمە، بەندە لام وایە تیرەی ئیمامی یەکێکە لە خالیسترین تیرەی جاف و زادەی ئەو چیا و دۆڵ و دەربەندەیە، کە تیادان و سەدان ساڵیشە هەر لەوێدا بوونە و هەبوونە و خاوەنی دەسەڵات و کەسایەتی خۆیان بوونە و لە ناو تیرەکانی کەی جافدا حیسابیان بۆ کراوە و پرسیان پێکراوە.

وەک وتم، لە بارەی رەگەز و ناوی تیرەکان داستان زۆرە و حیکایەتی جۆراوجۆر دروستکراوە و سنگ بە سنگ گەیشتووتە ئێمە، یەکێک لەو داستانانەی لە بارەی رەگەز و ناوی ئیمامی دەڵێت:

باپیرە گەورەی ئیمامییەکان کەسێک بووە بە ناوی «ئیمام» خەڵکی شاری ئەسفەهان بووە ئەودەم یانی لە پێش دەسەڵاتی «سەفەوییە»دا شاری ئەسفەهان و دەوروبەری سوننی مەزهەب بوونە، کە شمشێری دەسەڵاتی سەفەوییە دەکەوێتە کار و بە زۆری کوشتن و بڕین، خەڵکی دەکەنە شیعە مەزهەب، ئەم «ئیمام» ناوە زۆر بەوە نیگەران و پەریشان دەبێت، کە بە زۆر بکرێتە شیعە و واز لە مەزهەبی خۆی بهێنێت، لەو کاتەدا سەید محەمەدی میر عەبدوڵڵا یەکێک بووە لە سوارەی ناوچەی جوانڕۆ و لە لەشکری دەوڵەتدا دەبێت، لەگەڵ ئەو «ئیمام» ناوەیدا دەبێتە دۆست

و ئاشـنا و ئیمام باسـی دەردی دڵی خۆی بۆ دەکا و داوای ڕێنمایی لێدەکا «سـەید محەمەد» لە وەڵامیدا دەڵێت: هەستە لەگەڵما وەرە بۆ جوانڕۆ، لەوێدا زیندەگیت دەچەرخێنن و ژنێکت لێ مارە دەکەیـن، کـە ناوی «خانم»ە و برازامە و لـەوێ بە ئازادی مەزهەبی خۆتیش ناگۆڕیت و ترس و تۆقانیش لە گۆڕێدا نییە. «ئیمام» لەگەڵ «سەید محەمەد»دا بەرەو دەڤەری جوانڕۆ دەکەوێتە ڕێ و سـەید محەمەد خانمی برازای لە ئیمام مارە دەکا و دوو جێگەی بۆ تەرخان دەکات، «میگوری هانە سەلمان».

ئیمـام لە خانم حەوت کوڕی دەبێت، لەو حەوت کوڕەی شەشـیان بە نەخۆشـی جۆراوجۆر دەمرن، ئەوی دەمێنێتەوە ناوی عەلی بووە، خانمی کوڕ مردوو، زۆر پەریشانی منداڵە مردووەکانی دەبێت و پەیوەسـتە لە شـیوەن و زاری بووە.. ئەودەم شێخێک هەبووە، بە ناوی «شێخ موئمینی سـازان» ڕۆژێک شـێخ، خانم دەبینێت و سەرزەنشـتی دەکا و دەڵێت. چییە هەمیشە وەک گورگ دەلووریێـی، خانم لەوەڵامیدا دەڵێت: من لە حەوت کوڕ، تەنیا «عەلی»م بۆ ماوەتەوە، نەگریم چی بکـەم؟! شـێخ وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: بە لای خواوە هیـچ نییە لەو تەنیا کوڕەت هەزار خێزان پێکبێت.

لەو «عەلی»یە حەوت کوڕ دێنە دنیاوە:

میرزا، ڕۆستەم، ئاقا، محەمەد، حەیدەر، سەفەر، مستەفا.

١- لە میرزا ناوەکە: بەرەبابی عومەرییەکانی کلور پێکدێن.
٢- لە ڕۆستەمیان: بەرەبابی فەقێ و مەحموودی کانی سالار پێکدێت.
٣- لە محەمەد: کە نیشتەجێی لاوەران بووە، لاوەرییەکان دێنە کایەوە.
٤- لە حەیدەرەکە: کوڕی نەبووە، تەنیا کچێکی لێکەوتۆتەوە.
٥- لە سەفەر: سێ کوڕ بووە، بە ناوی میکایل، سمایل، ئەحمەد.
٦- ئاقا ناوەکە: وەجاخ کوێر بووە.
٧- مستەفا ناوەکە: لە ناوچەی ئیمامیدا ئەولادی هەبووە.

ئەودەم ئیمامییەکان لەژێر سوڵتەی «مەحموود بەگی سلێمان بەگی یەزدان بەخشیدا» بوونە. ناکۆکـی دەکەوێتە نێوانیانەوە، لەو شـەڕەدا مەحموود بەگ دەکوژرێـت، ئیمامییەکان ئەو دەڤەرە چۆڵ دەکەن و دەڕۆنە سەرپیلی زەهاو. زۆر ناخایەنێت دووبارە دەگەڕێنەوە هەوارگەی خۆیان و وەک ئەوسا گەرمیان و کوێستانی خۆیان دەست پێدەکەنەوە، هاوینان دەڕۆنە دامێنی چیای ماکوان زسـتانان دەگەڕێنەوە بۆ لاوەران. لەو دەور و زەمانەیدا تفەنگ تەنیا سـاچمەژەنی و ڕۆشـۆکی بەدەستی خەڵکەوە بووە، «شێخ عەلی عەبابەیلی» کە دەسەڵاتدار بووە، برایەکی هەبووە، بە ناوی «شێخ مستەفا» ئەم مستەفایە تازە تفەنگی «ورندل» هاتبووە مەیدانەوە.

یەکێک لەو تفەنگانە دەسـێنێت و دەڕوا بۆ سـازان، لەو دوورەوە ڕێبوارێک ڕێ دەکات شـێخ بـە هاوەڵەکانـی دەڵێت من دەقێنمە ئەو ڕێبوارە، بزانم ئەم تفەنگەی پێدەگات، هەروا دەکات، کابرا کە ناوی مەنسـوور بووە، هەر لەوێدا دەکوژرێت و لە تیرەی ئیمامی بووە، مەنسـووری ڕێبوار بـە خـاک دەسـپێرن و ئەو ملەیە تاکو ئەمڕۆ ناسـراوە بە ملەی مەنسـوور.. سـاڵ دەگوزەرێت،

مەنسووری کوژراو کوڕێکی منداڵی هەبووە، گەورە دەبێت، کوڕە زیت و زرنگ بووە، لەگەڵ چەند کەسـێکدا دەبێتە ناکۆکی و تانەی لێدەدەن و پێی دەڵێن، ئەگەر ئەوەندە پیاوی بڕۆ حەقی باوکت بسێنە، کوڕە کە ناوی «خودا مروەت» بووە، دەکەوێتە پرس و جۆی ئەوەی کێ باوکی کوشتووە، تا بۆی دەردەکەوێت «شێخ مستەفای برای شێخ عەلی» بکوژی باوکێتی.

خودا مروەت، تفەنگە رەشـۆکییەکەی باوکی هەڵدەگرێتن مامەشـی لەگەڵدا دەڕوات، کە ناوی «براکە» بووە، بە ڕێگەدا تووشی زەوارێک دەبن، کە لە شارەوە هاتوون پرسیاری شێخ مستەفا دەکەن، لە وەڵامیدا دەڵێن: ئەوی عابای سـورمەی لەسـەر شـانە و سواری ئەسپێکی کوێتە ئەوە شێخ مستەفایە..

خوادا مروەت فرسەت لە شێخ دێنێ تەقەی لێدەکا دەیکوژێت و دەرباز دەبێت. بەڵام «براکە»ی مامی دەستگیر دەکرێت و دەیبەنە لای شێخ عەلی، کە لە ڕووداوەکە دەپرسێت بۆ شێخ مستەفاتان کوشـتووە.؟ براکە دەڵێت: ئەوی شێخ مسـتەفای کوشتووە کوڕی مەنسوورە. شێخ ڕووداوەکەی بەبیردێتەوە. فەرمان دەدا هیچ لە براکە نەکەن و دەڵێت: لێی گەڕێن خوێن بە خوێن ناشۆرێتەوە، بە ئاو دەشـۆرێتەوە، مامی خوادا مروەت بەرەڵڵا دەکات، بەڵام ئیمامییەکان بەو بەخشـینە دڵنیا نابـن جێگـە و شـوێنی خۆیان بە جێ دەهێڵن، ئیدی چەند سـاڵێک دەربـەدەر دەبن تا «عومەر» ناوێک کە ئەودەم سـەرۆکی ئیمامییەکان دەبێت، دەڕوات بۆ لای سـەلیم بەگ ناوێک، کە بە لای شـێخ «عەلـی»ەوە ڕێزدار بووە، دەڕۆنە دیوەخانی شـێخ و دوایی شـێخ دەزانێت ئەو گەورەی ئیمامییەکانـە، هەر لەوێدا سـوڵحی تێکڕایی دەکەن، لە پایـزدا ئیمامییەکان دەگەڕێنەوە لاوەران و عومەری سـەرۆکی ئیمامییەکان دەڕوات بۆ لای شـێخ و دەعوەتی لێ دەکات بۆ ڕاوکردن و ئەو کێشەیە بۆ هەمیشە لەناودەچێت.

ئەم تیرەیە بە ئازایی شۆرەت و ناوباویان هەیە، چ لە کۆنا یان لە سەردەمی پێشمەرگایەتیشدا کوڕی نەترس و ئازای زۆریان لە ناو پێشمەرگەی ئەیلوول و گوڵاندا هەبووە.

ئیمامییەکان لە ناوچەکانی باوەجانیدا هاتوچۆیان هەبووە، «فاتمە خانمی» ژنی حەبیبوڵلاخانی باوەجانـی بە میوانی دەڕواتـە ماڵی (حەمەخان بەگ)ی ئیمامی، کە دەگەڕێتەوە بە حەبیبوڵلاخانی مێـردی دەڵێـت: حەمە خان کچێکی زۆر نازدار و سـەلاری هەیە، با مارەی بکەین بۆ مسـتەفای کوڕمان. حەبیبوڵلاخان، دەڕوات بۆ دیتنی کچەکە، هەر لەوێدا لە خۆی مارە دەکا و لەو ژنە شەش کوڕ و کچێکی دەبێت..

ئیمامییەکان بەسەر سنووری ئێراق و ئێرانەوە دەژین، لەو سنوورەدا کێشە و هەرای سەیریان بۆ دروسـتکراوە، یان خۆیان دروسـتیان دەکرد. قائیمقامی هەڵەبجە «مسـتەفا بەگ» ناوێک بە هێزێکی زۆرەوە دەڕوات بۆ لاوەران تا چەند کەسێکیان لێ دەستگیر بکات. لەو شەڕەیدا مستەفا بەگی قائیمقام دەکوژرێت و تەرمەکەشـی بەجێدەمێنێت و لە دواییدا بە هەوڵی خەڵکی تەرمەکەی دەگێڕنەوە.

شـەڕێک لە نێـوان ئیمامییـەکان و تاوگۆزییەکانـدا ڕوو دەدات، چەندین کـەس دەکوژرێت، سەرەنجام سوڵح دێتە مەیدانەوە و کچەزای «مەولەوی»ی بەناوبانگ دەدەن بە «عوسمان بەگی ئیمـام» لـەو کچە چوار کوڕی دەبێت بە ناوی: حاجی یەعقـووب بەگ، ئەحمەد بەگ و مەحموود بەگ، سۆفی بەگ.

شەڕی نێوان ئیمامی و ئێناخی بۆ خۆی مەلحەمەیەکی دووردرێژ بووە.

دیـارە تیرەکانـی تر هانی ئـەم دوو تیرەیەیان داوە بۆ بەردەوامی شـەڕ. جوانڕۆ لایەنگیری ئێناخییەکانیـان کـردووە، هەورامـی و باوەجانـی بـە لای ئیمامییەکاندا کێشـاویانەتەوە، شـەڕ هەڵدەگیرسێت، دوو لا سەنگەر لە یەک دەگرن، هەر لەو کاتەدا هێشتا تەقە دەستی پێ نەکردووە، ریش سـپییەکی ئیمامی هەڵدەسـتێت لە سـەنگەرەکەیەوە دەڵێت: ئەریٚ ئێناخی ئێمە ئەم شـەڕە لەسـەر چی دەکەین؟ ریش سـپییەکی ئێناخی وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: لەسەر هیچ. هەر لەوێڕا سـەنگەر بەجێدەهێڵن و ئاشـت دەبنەوە. سەرچاوەی تر زۆرە لە بارەی سـەرەتای ئیمامییەکان، یەکێک لەو سـەرچاوانە دەڵێت: ئیمامییەکان سـەرەتا لە ناو تیرەی مەنمـی و گەڵباخییەوە بەرەو خوار بوونەتەوە و گەیشـتوونەتە لاوەران و دەڤەرەکانیان. پیاوی ئازایان زۆر تیادا هەڵکەوتووە وەک:

محەمەد خان بەگ لە بەرەبابی ئاخە.
عوسمان بەگ محەمەد بەگی کوڕی عوسمان بەگ.
مەلا حەمە ڕەشید، مەلا محەمەد ئەمین، مەلا مەحموودی کەریمی ئیمامی.
میرزا عەبدولمەجید.

عەلـی ئەکبەر «وەقایعی نیگار» ناسـراو بە سـاداتولمولک هەڵگری نازناوی «ئەفسـەر» لە سەردەمی ناسرودین شای قاجاردا ژیاوە، کە کتاوچەیەکی مێژوویی نووسیوە بە ناوی «عەشایر و ئیلات و طوائف کرد».

ئـەم نووسـەرە سـەر بـە ئەردەلانـەکان و ئامـۆزای شـاعیر و مێژوونووسـی بەناوبانگ «مەستوورە»ی کوردستانی لە بارەی تیرەی ئیمامی دەڵێت:

دیارە ئەم تیرەیە باپیرە گەورەیان ناوی ئیمام بووە، سەرەتا لەسەر تیرەی «یەزدان بەخشی» ژمێردراون، کە یەزدان بەخشـییەکان گواسـتوویانەتەوە بۆ ژێر دەسـەڵاتی عوسمانی، لەگەڵیاندا نەڕۆیشـتوون و لـە دەڤـەری جوانـڕۆدا ماونەتەوە، گەورە و سـەرۆکیان محەمـەد خانی بەگی مەحموود بەگە. ئەم تیرەیە گەرمیان و کوێستان دەکەن.

# تایشەیی

بەندە وەک مێژوونووسێک باس لە تەواوی بۆچوونەکان دەکەم و لەم رووەوە لە زۆر کەس دەپرسم و زۆر سەرچاوەش تاوتوێ دەکەم تا ئەوەی راستییە دەری بخەم.

یەکێک لە سەرچاوەکان لە بارەی تیرەی تایشەیی دەڵێت:

باپیـرە گەورەی ئەم تیرەیە ناوی «فەقێ مسـتەفا» بووە. ئـەم تیرەیە لە کۆنەوە لە زەهاو و داڵەهودا ژیاون و لەم فەقێ مستەفایە کوڕێک هاتۆتە دونیاوە بە ناوی «مارف سوڵتان» و عەلی سـوڵتان، کوڕی مارف سـوڵتان بووە و ئەحمەد عەلی سوڵتان کوڕی عەلی سوڵتان بووە، کوێخا مەحموودی نەزەری نەوەی فەقێ مستەفایە..

مستەفا بەگی جاف لە بارەی تایشـەیی دەیوت:

لەم تیرەیەدا چوار بەش هەن: ئەلیارکی، خاڵە، وارژەئی، داردەرویشی، تیرەی ئەلیارکی زۆرتر تێکەڵی سنجاوییەکان بوون لە دواییدا گەڕاونەتەوە ناو تایشەیی.

خالەیـەکان لـە بنەچەکدا لە تیرەی مکەیاڵین و رۆیشـتوونەتە ناو تایشـەی. واژەیی لە مێژدا لەسەر نەزەر سوڵتان دەژمێردران.

# کڵاشی

ئەم تیرەیە لە بنەچەکدا لە سەر تیرەی قوایی دەژمێردران، بەڵام ئەمڕۆ خۆیان بە تیرەیەکی سەربەخۆ دادەنێن، هەر وایشە ئەوڕۆ تەواوی مەرجەکانی تیرەیەکی سەربەخۆیان پێوە دیارە، زۆرتر لە سەر جافی کوردستانی ڕۆژهەڵات حیسابن و لەم ناوچە و دێهاتانەی خوارەوەدا نیشتەجێن و دەژین.

ماکوان
تەرخان ئاباد
قەڵای جوانڕۆ
کرماشان
باوەجانی
زەهاو
تەختە قاپی
کڵاشی
لەم تیرەیەدا مەلای بە توانا تیادا هەڵکەوتووە وەک: مەلا محەمەد ئەمینی کڵاشی.

## ناوی کڵاشی:

ناوی ئەم تیرەیە «کڵاشی» لە ڕاستیدا لە «کەڵ ئاشییەوە» وەرگیراوە، گوایە لە کۆندا یانی دوو سەد ساڵێک لەمەوبەر فەرماندەیەکی ئێرانی لەگەڵ سوارەکانیدا بەفر دایان دەگرێت و ڕێگە و بانیان لێ دەبەستێت و ناچار دەبنە میوانی خێڵێکی جاف، ئیدی خزمەتیان دەکەن و نیوەڕۆ و شەو گۆشتیان دەدەنێ تا فەرماندەی میوان لە خانەخوێکەی دەپرسێت چییە بۆ هەر گۆشت..؟

خانەخوێ لە وەڵامیدا دەڵێت: ئێمە خێڵێکی ڕاوچین، ئەو گۆشتە دەرخواردی ئێوەی دەدەین ئاشی گۆشتی کەڵە کێوییە.

کابرای فەرماندە وەڵامی دەداتەوە: کەواتە ئەوی خواردوومانە هەمووی «کەڵە ئاشی» بووە.
ئیدی ئەو خێڵە لەو ڕۆژەوە بە خێڵی «کەڵ ئاشی» ناو براوە و بە گوێرەی زەمان «کەڵ ئاشی» گۆڕاوە بە کڵاشی.

# قادر میروەیسی

ئەم تیرەیە لە سەرتاسەری دەڤەرەکانی جافدا لێرە و لەوێ بەدی دەکرێن، ئەگەرچی لەسەر جافی جوانڕۆ دەژمێردرێن، بەڵام لە نێو جافی مورادیشدا وەک تیرەیەک حیسابیان بۆ دەکرێت و لە ئێراندا لە ناو هۆزی کەلهوڕدا بڕێکیان هەن و بە تیرەی «بەوداق بەگی» ناو دەبرێن، لە پێش مەشرووتییەتدا ئەم تیرە بۆ خۆیان سەربەخۆ دەژیان، بەڵام لە دواییدا لە سەردەمی فەتاح بەگی وەڵەدبەگی «صارمولدەولە»دا هاتنە ناو وەڵەدبەگییەکانەوە. ئەودەم کوێخا حەسەنی قادر میروەیسی سەرۆک خێڵیان بووە و فەتاح بەگی وەڵەدبەگی کچەکەی لە کوڕەکەی کوێخا حەسەن مارە کردووە کە ناوی «کوێخا عەلی حەسەن پوور» بووە. ئەم تیرەیە هاوینان دەڕۆیشتنە «شانەڕەش» و زستانانیش دەگەڕانەوە «تەپەڕەش» لە ناوچەی سەر قەڵا. دوا کوێخای ئەم تیرەیە «عەلی حەسەن» بووە لە ساڵی ١٣٧١ک مردووە.

لە بارەی هەر تیرەیەکی جاف چەند سەرچاوەی جۆراوجۆر هەیە، ئەم سەرچاوەیە دەڵێت:

قادر میروەیسی باپیرە گەورەیان ناوی «مورادی وەیس» بووە و بە یەزدان بەخشی ناسراوە، دوو کەسی ناودار لەم تیرەیەدا هەبووە، بە ناوی کاکەخان سوڵتان و مستەفا سوڵتان.

دەڤەری گۆران حەوت سوڵتانی هەبووە، لەو حەوتە چواریان لە جاف هەڵبژێردراون، یەکێکیان قادر میروەیس بووە، جێگەی سەرەکی ئەم تیرەیە سەرقەڵا و جێگیرانە.

کوێخا عەلی حەسەن پوور کوڕی عەلی قادر بەگ یەکێک بووە لە دەمڕاسانی ئەم تیرەیە.

# ئەلیاسی

وا زانــراوە ئــەم تیرەیە نەوە و ئەحفادی کەســێک بوونە بە نــاوی ئەلماس، ئەم ئەلماس ناوە نــۆ کوڕی بــووە بە ناوی: قــادر، محەمەد، مەحموود، عەلــی، ڕەحیم، نادر، مســتەفا، عەبدوڵڵا و عەبدولڕەحمان. لەم نۆ کوڕە لە دەڤەری ئەلیاســدا ئەم تیرەیە پێکهاتووە. سەرەتا تیرەی ئەلیاسی لە: کفرو، ســەرزل، پشــت تەنک، داڵەهۆدا دەژیان، گەرمیان و کوێستانیان کردووە، لە داڵەهۆدا لە بناری چیای یالاندا دابەزین، چەندین ئاواییان هەبووە، وەک:

- دێی کوێخا ئەحمەدی ئەلیاسی
- دێی خەلیفە عەلی ئەلیاسی
- دێی عەبدوڵڵای کەریم ئەلیاسی
- دێی خەلیفە حسێن ئەلیاسی

تــا چەند ســاڵێک لەمەوبەر، کوێخا مەحموودی ئەلیاســی براگەورەیان بــووە. دیارە لە کۆندا تیرەکانی جاف تا ناو جەرگەی داڵەهۆ ڕۆیشــتوون و شان بەشانی گۆرانەکان چوار تیرەی جاف ژیاون، هەر یەکە لەو تیرانە وەک گۆرانەکان سوڵتانی خۆیان هەبووە.

- سوڵتانی تایشەیی
- سوڵتانی قادر میروەیسی
- سوڵتانی بیویانی
- سوڵتانی نیرژی

تیرەی ئەلیاسی لەو چوار تیرەیە لە ژمارەدا کەمتر بوونە. ئەمانەش ناوی چەند دەمڕاستێکی تیرەی ئەلیاسییە: کوێخا قارەمانی ئەلیاسی، کوێخا مەحموودی ئەلیاسی، کوێخا ئەحمەدی ئەلیاسی، کوێخا خەلیفە عەبدولڕەحیمی ئەلیاسی، کوێخا نادری ئەلیاسی.

# کەشکی

ئەم تیرەیە بە ژمارە زۆرن و لە دەڤەری کامیاراندا دەژین، زۆر بەزمدار و قسەخۆش و میوان نەوازن، لە ناو تیرەکانی باوەجانی، وەڵەدبەگی جوانڕۆدا زۆریان نیشتەجێن.

«عەزیز ئەوکر» پیاوێکی ناسراوی ئەم تیرەیە.

داراخانی کەشکی پیاوێکی ناوداری ئەم تیرەیە بووە، کە برای ژنەکەی سۆفی بەگی وەڵەدبەگی بووە.

تیـرەی کەشـکی ئـازا و دلێر و ناسـراون، لـە دێهاتەکانی تـەروەرزدا ژیـاون، دوو پیاوی هەڵکەوتوویان تیادا ناسراو بووە:

١- زەرغام لەشکر
٢- ئەمین سوڵتان

سـەردار رەشید حیسابی لێکردوون، لەبەر ئەوەی ئەم تیرەیە مەڕوماڵاتی زۆریان هەبووە و زۆرتر بەرهەمی کەشکیان هەبووە، وەستاکارانە کەشکیان وەبەرهەم هێناوە. سەرتاسەری تیرەکە ناونراون بە «کەشکی»..

# میراولی

ئـەم تیرەیـە یەکێکە لـە تیرەکانی جاف، لەگەڵ هـۆزی «میراودەلی»دا جیـاوازن، زۆرتر بە ئاییینەوە خەریکن، قورئانە رەشەکەی «حەمەی میراولی» شۆرەتی هەیە.

محەمـەدی میراولی، لە سـەردەمی دەسـەڵاتی سـەفەویدا ژیـاوە و پیاوێکی ناسـراوی ئەو سەردەمە بووە، ئەگەرچی جاف بووە، زۆرتر خۆی بە سەید زانیوە، بەڵام نەیتووە دەگەڕێتەوە سـەر پیرخدری شـاهۆ، لەم تیرەیەدا چەند کەسـێکیان تیادا هەڵکەوتووە، خۆیان بە سەید داناوە، وەک:

سـەید مەحموود، سـەید کەریم، سەید ئەحمەد، سەید رەسـول. رەنگە لە بنەچەکدا جاف نەبووبن و ئیـدی بـە گوێـرەی زەمان لە ناو هـۆزی جافدا ژیـاون و بوونەتە تیرەیەک لە جاف و سـەید بوونی خۆشـیان پاراسـتووە. یەک دوو دێیان بە ناوی خۆیانەوە هەیـە. لەگەڵ تیرەی نەورولێدا تێکەڵاون.

# یوسف یار ئەحمەدی

ئەم تیرەیە بۆخۆی حیسابی تایبەتی بۆ دەکرێت لە دەڤەرەکانی جوانڕۆدا و بڕێکیان بڵاوەیان کـردووە، لــە ناوچەکانی ســەرقەڵا و جێگیران، کرماشــان، ســنجاویدا دەژین. ئــازا و لێهاتوو و بەخشندە و میواندارن.
براگەورەیان حاجی عەبدولعەزیزە.

# بلەیی

ناکرێت بڵێین وەک تیرەی گەورەی ناو جاف وان، بەڵام بە کۆمەڵەیەکی سەربەخۆی ناوچەی جوانڕۆ دەژمێردرێن. لە بنەچەکدا لە دەڤەری کوردستانەوە «سنە»وە هاتوون بۆ جوانڕۆ.

لە نێوان قوایی باوەجانیدا هەروەها سەربێلی زەهاودا دەژین.

# گاخۆری

ئەم تیرەیە هەمیشــە دراوســێی تیرەی گود بوونە، وا ناســراوە تیرەی گاخۆری لە مێژدا لە کەرکووک و دەوروبەرییەوە هاتبن. لە سەرقەڵا و جێگیراندا نیشتەجێ بوونە.
ئێســتا لە چەند دێدا دەژین، بە ناوی «ئیمام عەباســی ســەروو و خواروو و کانی شــیرین و تووەوشکە و گردەنو.. بڕێکی تریان لە ناو باوەجانیدا بڵاوبوونەتەوە..

ئەمانەش ناوی چەند پیاوێکی ناسراوی گاخۆرین:

کوێخا حاجی حسێن مەتاعی گاخۆری
کوێخا غەفووری گاخۆری
دەروێش محەمەد پالانی
حاجی قادری گاخۆری
مەلا رەشیدی پالانی
حەبیب گاخۆری

ئەم تیرەیە یەکێکە لە تیرە کۆنەکانی ناو جاف، تا بە ئەوڕۆش لە دەوروبەری قەرەتەپەدا دێ و دەڤەرێک بە ناوی گاخۆرییەوە هەیە و ناودەبرێت.

# گورگ کوژ

یەکێکن لە تیرە کۆنەکانی ناو جافی جوانڕۆ زۆرتر تێکەڵاوی وەڵەدبەگییەکانن، بەڵام سەردەمێک لەسەر «جافی گۆران» دەژمێردران.

گورگ کوژەکان لە گەرمەسێردا هەروەها لە ئیلاخشیدا کشتوکاڵیان کردووە، لە کوڕکوڕە و چەوتە، قەڵا سپی، حەسەن ئاباد، شانە رەش دەژین.

کوێخاکانیان:

١- محەمەدی جوانڕۆیی

٢- محەمەدی میرزایی

٣- محەمەدی وارانی. لە کاتی خۆیدا دەمڕاستی ئەم تیرەیە بوو.

٤- محەمەدی عەلی.



محەمەدی وارانی

# تیرەی عیسایی

تیرەی عیسایی، یەکێکن لەو تیرە جافانەی زۆرتر لە ناو خزم و خوێشەکانیان نیشتەجێ بوونە و لە دەڤەری شیروانە، ژاڵە، باوەنوور، بانمیل، سەید مەحموو، بییەڕەشدا دەژین.

فـەرەج عەلی میرخان، پیاوێکی ناودار و سـەرۆکی ئەم تیرەیە دەژمێردرا و قسـە بیسـتراو بووە.
ئەم تیرەیە زۆرتر تێکەڵاوی تیرەی شاترین.



فەرەج عەلی میرخان

# عەلیاخەیی

عەلی ئاقایی- یان عەلیاخەیی

ئەم تیرەیە لە تیرەی گەورەی عەلی یاخەیی قوایی جوێ بوونەتەوە، لە سەردەمی سەرۆکایەتی جەبیبوڵلاخانی باوەجانیدا ڕۆیشـتوونەتە ناو وەڵەدبەگییەکان، ئیدی ئەوە نزیکەی دوو سەد ساڵ دەبێت.

زسـتانان دەڕۆنە: تیلەکۆ، تووەوشکە، دارەوەن، کەریم ئەوڕەحمان، سیوەرەهوار، تەپەڕەش، تەقتەقی نادر، دۆڵەوشکە، کوێخا عەزیز، سەر قەڵا.

هاوینان دەڕۆنەوە بۆ شەش دارەبی، هلول، نەیرێژ، ملە لو..
ریشچەرموانیان ئەمانەن:

١- حاجی سەید ئەحمەد سان ئەحمەد.
٢- کوێخا عەولعەزیزی محەمەد قادر.
٣- کوێخا کاکە حەسەن
٤- کوێخا غەفووری یوسف
٥- کوێخا حەسەن ساڵح وەلی.
٦- کاکە حوسێن.
٧- کوێخا سەید ئەحمەدی سان ئەحمەد.

# زیران

ئــەم تیرەیــە لە ناو جافدا ناســراون، خۆیان دەڵێن لە ناو بەختیارییــەوە هاتوونەتە ناو جاف، کوێخا محەمەد، کوێخا نادر، کوێخا فەتحوڵڵا، کوێخا کاکە عەولا، هەمیر خان.. پیاوانی ناســراوی ناو زیرانن..

عەلی ئەکبەری زیرانی هونەرمەند لەم تیرەیەیە.
لە دەوروبەری هەڵەبجەدا زۆریان نیشتەجێن.

# (مەزیری)

ئەم تیرەیە زۆرتر لەگەڵ «زەردویی» و «ساتیاری»دا تێکەڵن، چەندین مەلای زانا و لێهاتوویان تیادا هەڵکەتووە، وەک:

مەلا ئەحمەدی یاوکی میرزا عەبدوڵڕەحمان.
مەلا نوورەدین
محەمەدی مەلەکی
ئەمینی مەلەکی

# (تفەنگچی)

ئەم تیرەیە سەرەتا بەشێک بوونە لە تیرەی تاوگۆزی و لە وان جیابوونەتەوە و ئەودەم لە جێگیران و نزیکی کرند دەژیان، لەسەر «جاف»ی مورادی لە کۆندا دەژمێردران. ئازا و دیوەخاندار بوونە.

# (کاکە رەشی)

ناتوانین ناوی تیرەیان لێ بنێین، چەند سەد ماڵێک دەبن، زۆربەیان لە دەوروبەری «زەکان»دا دەژین و لە زۆر جێگەدا پشک و بڵاون، کۆمەڵەیەکی تر کە هاوسێی «کاکە رەشەییەکان»ن، بە ناوی زەکاتی زۆر تێکەڵاون و پێکەوە دەژین و جارە و باریش ناکۆک دەبن.

# (تین)

لــە نێو ئەم تیرەیەدا لە ســەردەمی مەغۆلدا ئافرەتێک لــەم تیرەیە هەڵکەوتووە بە ناوی «دایە هاجەر» کە بۆ خۆی خاوەنی توانا و دەسەڵات بووە، فەرامەرزبەگ لە نەتەوەی ئەو شێرەژنەیە، کە بۆ خۆی بووە بە دەسەڵاتدارێکی دەرباری قاجاری. ئەم تیرەیە سێ بەشن:

١- فەرامەرزی
٢- عەزیزی
٣- قەرەوەیسی

تێکەڵاوی زەردوویی و کۆکۆیین.. لە دەڤەرێکدا دەژین خاوەنی دیمەنی جوانە.

دیارە فەرامەرزییەکان زۆرتر رۆیشــتوونەتە لای قەڵەم و خوێندندا، بۆیە مەلای شایســتەیان زۆر تیادا هەڵکەوتووە وەک: مەلا عەبدولڕەحمانی تین.

ســێ پیر لە دەڤەری «تین»دا نێژراون، بڕێک بە ســەیدیان دەزانن و بڕێکی تر بە پیرەکانی ئەهلی حەقیان دادەنێن.

١- پیر ئاقا موحسن.
٢- پیر محەمەد
٣- پیر ئەحمەد

دوو کەســایەتی کــەی ئەو دەڤەرە کــە لەبیرنەچوونەتەوە: دەروێش بابایــی و بارامی رۆئین تەن بوونە.

# سایتاری

ئـەم تیرەیە زۆرتـر لە دەڤەری جوانڕۆدا دەژین، بەڵام لە رەوانســەر و کرماشــاندا زۆریان نیشتەجێن، رەنگە ناویان زۆرتر لەبەر چیای «سایتار» ناو نرابێت کە ئەو چیایە کەوتووتە دەوڵەت ئــاواوە. وا زانــراوە کە ئەو تیرەیە لە تیــرەی کەمانگەر جوێ بوونەتەوە لەگــەڵ زەردوویيەکاندا تێکەڵاون، دوو کەسایەتییان تیادایە بە دەمسپی خۆیانیان دەزانن.

١- کوێخا حەمە رەشید
٢- حاجی ئەحمەدی ساتیاری

# ئاخە سووری

وەقایع نیگار دەڵێت:

ئەم تیرەیە بەشێکن لە تیرەی مەنمی، زۆر نین، رەنگە دووسەد و پەنجا کەسێک بن، گەرمیان و کوێستان دەکەن.

ئەوڕۆکە ئەم تیرەیە بە تیرەیەکی ســەربەخۆ دادەنرێــت لە ناو هۆزی جافدا لە رووداوەکاندا پرسیان پێ دەکرێت.

# گوێ کوڕی

زۆرتر هەر لە گەرمەسێردا دەژین. زەهاو، قەسری شیرین، سەرپێلی زەهاو. لە کۆندا گەرمیان و کوێستانیان دەکرد، کوێخا سالحی گوێ کوڕی پیاو ماقووڵێکی ئەم تیرە ناسراوەیە...

حەمەڕەشــیدی گــوێ کوڕی، کوێخا نامداری گوێ کــوڕی، دەروێش کاکە عەلی ریگان لە ناو تیرەی گوێ کوڕیدا جێگە و شوێنی خۆیان هەیە.

# (گود)

ئــەم تیرەیــە لە باری ژمارەوە زۆر نین، بەڵام یەکێکن لە تیرە هەرە کۆنەکانی جاف. لە کۆندا لە دەڤەری باخی سەیدخان و دامێنی بەمۆدا دەژیان «یەعقووب بەگی گود» شاعیری ناسراو لەم تیرەی جافەیە. دەروئی لەم تیرەیە جیابوونەتەوە.



شاعیری بە توانا یەعقووب بەگی گود

# بیویانی

بە یەکێک لە تیرەکانی جافی جوانڕۆ ناسـراوە، یەکێک لە حەوت سـولْتانی گۆران لەم تیرەیە دەستنیشـان دەکرا. فەیزوڵڵا بەگی بیویانی، بە پیاوێکی گەورەی ئەم تیرەیە ناسـراوە، کوڕەکەی، ڕەزا سـولْتان، یەکێک بووە لە حەوت سـولْتانی گۆران و دوو کوڕی هەبووە بە ناوی شوکروڵڵا سولْتان و فەیزوڵڵا سولْتان، کە دەمڕاستی زەمانی خۆیان بوونە.




فەیزوڵڵا بەگی بیویانی

# نەدری- نەبیری:

ئــەم تیرەیــە یەکێکن لە کۆنترین تیرەکان، لــەم رووەوە دکتۆر مەســعود کەیهان و ئایەتوڵڵا مەردۆخ باســیان کردووە، کە گوایە پاشــماوەی مادەکانن. یانی زۆرتر لە دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر، لە بەردە نووسراوەکانی سەردەمی دەسەڵاتی ئاشووردا باس لە تیرەی «نەدری» هاتووە. هەتاوەکو مێجەرسۆن دەڵێت:

ئەگــەر بنوارینە مێژووی کۆن، ناوی «نەدری» وەبەرچاو دەکەوێت، ئازایی و لێهاتوویی ئەم تیرەی جافە لە مێژووی کۆندا بەناوبانگە و لەسەر تاتە بەردەکان نووسراوەتەوە و تا رادەیەکی وا دەوڵەتیان دروست کردووە. شەڕیان لەگەڵ دەسەڵاتدارێکی وەکو «تکلات بالازار»دا کردووە، بە درێژایی فەرمانڕەوایی بیست و سێ فەرمانڕەوایی دەسەڵاتی نەدری بە تایبەت شەڕی خوێناوی مەزگرد. ئەو شەڕە لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا باسکراوە، یانی ٩١٠ ساڵ پ.ز..
نەدرییەکان چقڵی چاوی گەورەترین دەسەڵاتی دنیا بوونە، کە ئەودەم دەسەڵاتی ئاشوور بووە (سەیر لەوەدایە ئەم تیرە ئازایە کە بە باوکی مێژوو دەژمێردرێن و کوردن، ئێستاش تیرەیەکن لە هۆزی جاف، مێژوونووســانی کورد ناویان ناهێنن. من نازانم لەبەر نەزانینە، یان وەک زۆر شتی دیکە کەمتەرخەمییە لە بەرانبەر حەقایقی مێژوو، هەر کامیانی بێت نەشیاوە و ناپەسندە).

وادیارە مێژوونووســانی بیانی زۆرتــر پابەندی وردەکاری مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاســت و دەوروبەرەکەیــن، بۆیــە بــە درێژایی لە دەســەڵاتی نەدرییەکان نووســیویانە، وەک لەو بەردە نووسراوانەدا دەرکەوتووە، تەواوی هۆز و عەشایەرێک لە ولایەتی (دیاربەکر، خەرپوت، دەرسیم) دا دەژیان.
بە لای ئاشوورییەکانەوە بە نەدری ناسراو بوونە، تا گەیشتووتە چیای بتلیس وتوروس، ئەو دەڤەرانە دوای لەناوچوونی دەســەڵاتی ماد بە ناوچەی کوردان ناســراون و بە نەژاد و رەگەزی کوردی ئێستا دەژمێردرێن، ئەمەش مایەی شانازی ئێمەی هۆزی «جاف»ە کە تیرەی «نەدری» ئــەورۆ یەکێکــە لە تیرەکانــی ئێمەی جاف. ئەورۆ ئەم تیرەیە لە دەڤــەری «جوانرۆ»دا دەژین، بە تایبەت لە دێهاتی وەک: کمشتەر، پیرۆزە، نەهرئاوی، گراب، دەوڵەت ئاباد، سادق ئاباد، رەوانسەر و لە دێهاتەکانی وەکو: تورکەپان، کەلی، بیاشوش، کانی گوڵ، کەولسەوە. لە هاویناندا لە: پشتیلکە، بەمۆ، کامیاران، چرسانە، زیوتە، قلاداراخاندا دەژین.

پیاوە ناودارەکانی ئێستایان:
١- مــەلا عەبدولمەجیــدی موەحەدی نەدری، کــە بۆخۆی مەلایەکی بەناوبانگی ســەردەمی خۆی بووە.
٢- خەلیفە حوسێنی بان چیا.
٣- مەلا ئەحمەدی نمایندە.
٤- کوێخا مستەفای سادق ئاباد

٥- مەلا ئەحمەد لە پیرۆزە
٦- خەلیفە حەسەن
٧- کوێخا وەلی
٨- خەلیفە عەبدوڵڵا
٩- کوێخا کاکە ئەحمەد
١٠- حاجی ئەحمەد و زۆری تر.

## (کۆیک)

لە کۆنەوە ئەم تیرەیە هەر بەم ناوەوە ناسراون، لە ناوچەی داڵەهۆ و سیاوانەدا دەژین. لەناو تیرەکانی دەوروبەریاندا بە ئازا و حەق نەخوراو ناسراون.

کوێخا عەزیزی سەیفوری پیاوێکی ناسراوی ئەم تیرەیە بوو، حاجی بەکر، کوێخا عەزیز بەگ، کوێخا کەریمی موتاعی. پیاوانی ناسراوی کۆیکن..




کوێخا عەزیزی سەیفوری

# نیرژی

ئەم تیرەیە دەگەڕێنەوە سـەر «سەفەر وەیس سـولّتان» کە یەکێک بووە لە حەوت سولّتانی گۆران، تا خوا حەز بکات کوڕەکەی کە ناوی «یاروەیس سولّتان» بووە، ئازا و دلاوەر بووە.

ڕەزا خانی نیرژی کوڕی یاروەیسی سولّتان یەکێک بووە لە ئازا و دەمڕاستانی زەمانی خۆی، دیـارە دوای ئەو کەڵەپیاوە، پیـاوی کەی لەو بابەتە لە ناو «نیرژی»دا هەڵنەکەوتووە، ئەو تیرەیە لە زۆر جێگەدا ئەورۆ بڵاوەیان کردووە، ئەورۆ پیاوێکی ناسراو لە ناو نیرژیدا خزم و خوێشانی قسەی لێ دەبیستن، «کوێخا مورادی نیرژی»یە، «مەلا محێدینی ساڵحی)یە.

# بەڵگەنامەکان

هۆزی جاف بە پێی ڕووداوە مێژووییەکان قوربانی زوڵم و زۆری دەسەڵاتی ڕۆم و عەجەم بووە، ئەم هۆزە لە خاکی کوردستاندا ژیاون، سەدان ساڵ و بگرە هەزاران ساڵە دەسەڵاتە گەورە و زلهێزەکان بە تایبەت عوسمانی و سەفەوی لەگەڵ یەکدا دوژمنایەتییان کردووە، تەواوی شەڕ و شۆڕی نێوانیان هێناوەتە نێو کوردستانەوە و لەبەر ئەوەی ئەم هۆزە لە ئەزەلەوە هەر لە جێگەی خۆیاندا بوونە و ئەو دوو دەسەڵاتە بە پێی بەرژەوەندی خۆیان و لە ڕووی دەسەڵاتەوە لە ناوچە و دەڤەرەکانیاندا وەک دەسەڵات هەبوونە، زۆر جاریش شەڕی قورس و گران لە نێوانیاندا لەو دەڤەرانەدا ڕوویداوە و زەرەر و زیانەکەشی بۆ خەڵکی دەڤەرەکە ماوەتەوە، هۆزی جاف بە گوێرەی درێژی زەمان هۆزێکی کۆچەر بوونە و ڕێچکەی هاتوچۆیان دیار بووە و هەرگیز دانیان بە سنووری نێوان ئەو دوو دەسەڵاتەیدا نەناوە و لە هاتوچۆی خۆیاندا بەردەوام بوونە و هەرواش ژیاون، بەڵام دوای دروستبوونی دەوڵەتی ئێراق و دەستنیشانکردنی سنووری ئەو دوو دەوڵەتە تازەیە، کۆچەری جاف زۆرتر دەکەونە تەنگەبەری نێوان دەسەڵاتەکانەوە و وردە وردە وای لێدێت خێڵە کۆچەرییەکان ناچاری نیشتەجێبوون دەکرێن.

ئەم بەڵگەنامانەی لەبەر دەستتاندایە دیکۆمێنتی مێژوویینە لە نێوان دوو دەوڵەتی گەورەی ئەو کاتە (ئێرانی قاجاری و دەوڵەتی عوسمانی) ڕەدو بەدەل کراوە، کە تەواوی ئەوانە لە بارەی هۆزی «جاف»ە و بەندە بە زەحمەت و دژوارییەک بە دەستم هێناون.

## بەڵگەی ژمارە یەک (1)

بابەت/ هۆزی جاف
مێژوو/ ٢٨ موحەڕەم ساڵی ١٢٧١

نامەی میرزا ئاقاخان سەرۆک وەزیران بۆ حەیدەر ئەفەندی سەفیری عوسمانی..
دوو سێ رۆژ پێش ئەوەی یەکتر ببینین دەربارەی هۆزی جاف دواین و لە لایەن کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانییەوە چەکدار و سەرباز بۆ دامرکاندنی جاف ئامادە کرابوو، ئێمە بە لای خۆمانەوە فەرمانمان داوە، بە سنووردااران کە رێگە بەو هۆزە نەدەن بێنە ناو ئێرانەوە و ئەگەر هاتو هاتن، ئێمە بە زۆر دەیانکەینە دیوی لای ئێوەدا و بە چاکمان زانی نامەی رەسمی بنووسین و بزانن دەوڵەتی ئێران بەم جۆرە کارە رازی نابێت کە سەربازی دەوڵەتی عوسمانی پا بخاتە ناو سنووری ئێرانەوە.

دووهەم: لەبەر ئەوەی ئەو هۆزە ئێمە و ئێوە کێشەمان لەسەریان هەیە، جارێک خۆیان بە ئێرانی دەزانن و جارێکی کە بە عوسمانی، بوونەتە مایەی کێشە و فەساد و زەرەر و زیانیان بە هەردوو لا گەیاندووە، بۆیە پێموایە ئەدەب کردنیان کەوتووتە ئەستۆی هەر دوو دەوڵەت، ئێمە وا دەبینین کە زۆرتر ئەو ئەرکە کەوتۆتە گەردەنی دەوڵەتی عوسمانییەوە لەبەر ئەوەی ئەو هۆزە زۆرتر لەوێرا بۆ ناو ئێران دێن.

یەکەم: دەمانەوێت زەرەر و زیانی خەڵکی لای ئێمە ببژێرن و ئەو زەرەرە دەبێت لە ئێڵی جاف بسێنن..
دووەم: ئەگەر ئەو هۆزە لەسەر سنوور دوور خەنەوە و لە داهاتوودا دەستدرێژی نەکەنە ناو دێ و ئازار و ئەزیەتی خەڵکی نەدەن، ئەوا مایەی رەزامەندی ئێمەشە. لەبەر ئەوەی ئەو هۆزە هێشتا ئێمە هەردوو لامان کێشەمان لەسەریان هەیە و بە پێی یاسای دەوڵەت و میللەت و عەدل و ویژدانیش ناکرێت دەستدرێژی بکرێتە سەریان، ئەگەر دەرکەوت، کێشە و گرفتاری لەوانەوە بەدوور بووە.
لە ٢٨ مانگی موحەڕەم ساڵی ١٢٧١ نووسراوە.
روونکردنەوە:

١- حەیدەر ئەفەندی، نێوان ساڵانی ١٢٧١-١٢٧٣ سەفیری دەوڵەتی عوسمانی بووە لە ئێران..
سەنەدەدانی سەرۆک وەزیرانی ئەستانبول ئیدارەی دەرەوە ش ٥٦٨٨ برگ ١

## بەڵگەی ژمارە 2

بابەت/ هۆزی جاف
مێژوو/ غرەی سەفەر ١٢٧١ ک
نامەی حەیدەر ئەفەندی بە میرزا ئاقاخانی نووری

چەنـد رۆژێـک لەمەوبـەر، لـە چاوپێکەوتنێکی ئـەم دواییانـەدا دەربارەی شـکاتێ لە لایەن کاربەدەسـتانی ئێرانـەوە دەربـارەی زەرەر و زیانێـک هۆزی جاف گەیاندوویـە، وا بڕیارە کەوا هێز و دەسـەڵاتێک بنێرین بۆ ئازار و ئەزیەتیان، ئەگەر هاتو لە سـنوور پەڕینەوە و پەنایان بردە فەرمانڕەوای «سنە» با رێگەیان پێ نەدا و بیانگێڕێتەوە، ئەگەر وانەکات بۆ ئێوە زەرەرمەندە، ئەو دەمەش بە دەمی فەرموون کە ئێمە لێناگەڕێین بگەڕێنەوە بۆ ناو خاکی ئێران، لە نامەی مێژووی ٢٨ مانگی موحەڕەمدا نووسیبووت دوو خاڵ هەیە:

یەکەم: دەربارەی ناسنامەی ئەم هۆزە هەڵە روویداوە.

دووەم: هەردوو دەوڵەت رۆژ بە رۆژ هەسـت بە پتەوی نێوان دوو دەوڵەتە دەکەن و لەبەر ئەوەی دەوڵەتی ئێران خوازیاری ئازارگەیاندنە بەم هۆزە، ئاشـکرایە لەم رووەوە حاکمی «سنە» با پەنایان نەدا و نەهێڵێت بڕۆنە نێو خاکی ئێرانەوە، با ئیتر نەبنە هۆی ناڕەحەتی، و لەبەرئەوەی ئێوە خوازیاری ئازاردانی ئەم هۆزەن هەرواش دەکرێت...

## بەڵگەی ژمارە ٣

بابەت/ هۆزی جاف
مێژوو/ ١١ مانگی سەفەری ساڵی ١٢٧١ک
(نامەی میرزا ئاقاخان بە حەیدەر ئەفەندی)

دەربارەی هۆزی جاف دووبارە نامەی جەنابت گەیشتە دەستم، لە مێژووی مانگی سەفەر، کە تیایدا نووسیبووت کە ئەگەر هۆزی ناوبراو هاتنە ئەو دیودا حاکمی کوردستان ڕێگە بەوانە نەدا و بیانگێڕێتەوە، ڕەنگە بەڕێزتان بە وردی لەوە تێنەگەیشتبن ئەو ڕۆژەی یەکترمان دی و دەربارەی جاف دواین بڕیار درا، لەو ڕووانەوە با بەشێوەی نووسراو بێت باشترە، تا ئێمە بتوانین وەڵامتان بدەینەوە، دوای خوێندنەوەی نووسراوەکەت لە مێژووی ٢٨ مانگی موحەڕەمدا وەڵام دراوەتەوە، بەڵام دەربارەی هەڵەیەک کە جەنابتان باست کردبوو جێگەی سەرسامییە، ئەگەر دەربارەی دووبەرەکی ئێمە لەبەر هۆزی جاف ئەو باسە با ئەمڕۆ باسی لێوە نەکەین، بەڵام ئەوە ئاشکرایە ئەم هۆزە بە هەوەسی خۆی جارەوبار خۆیان بە لای ئێوەدا کشاندووە. وە لەو ڕووەوە ئەو نامانەی بۆ سەفارەتی دەوڵەتی عوسمانی نووسراوە ئەو مەسەلەیەی بە وردی تیادا ڕۆشن کراوەتەوە، بەڵام وا دیارە ئەو کارە لە کاروباری دایەرەی جەنابتانەوە دووربێت، ئەگینا بۆ جەنابت لەم ڕووەوە دووبارە نامەمان بۆ دەنووسیت، کە ئەدەبکردن و ئازاردانی ئەو هۆزە لە بەرژەوەندی ئێمەیە، دەوڵەتی ئێمە چۆن باوەڕتان پێ بکات کە ئەو هۆزە ئەمە چەند ساڵە تاڵان و بڕۆی لە ناو خەڵک و خوای میللەتی ئێمەدا بەردەوامە و زەرەر و زیانی زۆریان گەیاندووتە خەڵکی کوردستان.

ڕوونکردنەوە:

ئەم نامەیە سەرۆک وەزیرانی دەوڵەتی ئێران بۆ سەفارەتی دەوڵەتی عوسمانی نووسیویەتی..
لەو دەمانەدا ئەمانوڵڵاخانی ئەردەلان حاکمی کوردستان بووە.

## بەڵگەی ژمارە (30)

بابەت: پەڕینەوەی عەشایەری مەزرەکی عوسمانی بۆ ناو خاکی ئێران
مێژوو: دووەمی رەبیعولئەوەلی ساڵی ١٣٢٣ ک
کارتۆن: ٣٢
دۆسیەی: مەتنی تەلگورافی وەزارەتی دەرەوە (ئەرفەعولدەولە) سەفارەتی ئێران لە ئەستەنبۆل
نمرە: ٢٦٥

بە پێی راپۆرتی «خوی» کە راستەوخۆ گەیشتووتە پێشگای شاهەنشاهی، هەشتا چەکداری تیرەی مەزرەکی لە خاکی عوسمانییەوە هاتووەتە ناو خاکی ئێرانەوە بۆ تاڵان و بڕۆ، پێویستە ئەوەی دەکرێ دەربارەی بەرگری ئەوانە ئەنجام بدرێت تا دووبارە ئەو جۆرە هەوڵانە نەگاتە پێشگای شاهەنشا.

جافی مورادی عوسمانی کە لەگەڵ هۆزی گۆرانی ئێراندا دوژمنایەتییان هەیە و هاتوونەتە ناو لەوەڕگای گۆرانەکانەوە دەبێ ئەوانە بە زووترین کات بگەڕێنەوە خاکی عوسمانی سیفەتولمولک بۆ بۆچوونی بەڕێزتان دەربارەی محسن خان سوپاسگوزارە وا چاکە لە پایاندا هەواڵی ئەحواڵی بپرسن

نەسروڵڵا

سند شماره: سی (۳۰)

موضوع: عبور عشایر مرزکی عثمانی به خاک ایران

تاریخ: ۲ ربیع‌الاول ۱۳۲۳ هـ. ق

کارتن: ۳۲

پرونده:

سواد تلگراف رمز وزارت خارجه به ارفع‌الدوله (سفارت ایران در اسلامبول)

نمره: ۲۶۵

از قرار راپرت خوی که مستقیماً به عرض خاکپای همایونی رسید، هشتاد نفر پیاده از طایفه مرزکی برای شرارت و غارت از خاک عثمانی به این طرف آمده‌اند. لازم است اقدامات مؤثره در تنبیه آنها به عمل آورده تا درین باب موکب مبارک این اتفاقات تکرار پیدا نکند.

جاف مرادی عثمانی که با طایفه کوران ایران سابقه عداوت دارند، این اوقات به مراتع کوران آمده تجاوز، بیم مفسده عمده‌ای است اقدامات فوری برای جلب آنها به خاک عثمانی لازم است. ثقه‌الملک از توجهات جناب‌عالی درباره محسن خان متشکر است گاهی در ذیل تلگرافات اشاره[ای] از حالات او بفرمایید. نصرالله

- ۲۹۳ -

## بەڵگەی ژمارە (31)

بابەت: دەستدرێژی و داواکردنی بڕێک لە کوێخا و جافەکانی سەر بە عوسمانی کە لە ئێراندا موڵکیان هەیە..
ژمارە: ١٢١
مێژوو: ٢٧ ١٣٣٨ ک
کارتۆن: ٤٠
دۆسیەی: ٥

نامەی فەرمانداری کوردستان بۆ وەزارەتی دەرەوە بۆ جێگەی بەرز و باڵای وەزارەتی دەرەوە لە مێژدا لە نامەی ژمارە ٩٣دا لەم رووەوە باسم کردبوو کە کوێخاکانی جاف کاتێک دەهاتنە ئەم دیودا بە دوای لەوەڕگادا دەگەڕان، بە زۆر چەندین موڵکیان لە بڕێک خاوەن موڵکی هەژار سەندووە و بڕێک سەنەد و بەڵگەیان بەدەست هێناوە، بەڵام بە مۆری ساختە و نەناسراو باوەک ئەو جۆری بەڵگە و سەنەدانە لە دادگاکاندا هیچ قیمەتێکیان بۆ دانانرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو هۆزە گرفتاری بۆ خەڵکەکە دروست نەکەن، تکایە لەگەڵ سەفارەتی عوسمانیدا پەیوەندی بکرێت و تەلگوراف بۆ فەرمانداری سلێمانییە بکرێت هەواڵ بدەنە جافەکان هەر بەڵگە و سەنەدێکیان هەیە با بێن و رووی بکەن ئەوەی راست بێت لە دایەرەکاندا قەبوڵ دەکرێن یان پارەکانیان بۆ دەگێڕینەوە و دەستبەرداری موڵکەکانیان بن، لەم رووەوە زووتر بجووڵێنەوە.

ئیمزا و مۆر
فەرماندەی کوردستان
٣٠ ئەسەد/ ٩٩ نمرەی
١٧٦١ زیلقعدە ٣٨

حاشیە:
لەم رووەوە باسێک بۆ سەفارەتی ئینگلیز بنووسرێت

سند شماره: سی‌ودو (۳۲)

موضوع: ادعای مالکیت بعضی از قرأ کردستان توسط کدخدایان جاف تبعه عثمانی

نمره: ۵۷۶۳ ـ ۱۸۲۴

تاریخ: ۱۶ ذی‌حجه ۱۳۳۸ هـ . ق

کارتن: ۴۰

پرونده: ۵

نامه وزارت خارجه به سفارت انگلیس

از کردستان راپورتی رسیده مبنی بر این که کدخدایان جاف در موقع عبـور از سرحد که برای علف‌چرانی به خاک کردستان می‌آمدند، چنـد قریـه از محـال خرخره (خورخوره) و سقز را به قوه جبریه از مالکین بی‌بضاعت گرفته و از قـرار معلوم برای بعضی از دهات هر قسم اسنادی را با مهار اشخاصی مجهول‌الهویه ترتیب داده که به وسیله آن ادعای استملاک نماینـد. اگرچـه در صـورت وجـود چنین اوراقی به هیچ وجه نمی‌توان اعتباری برای آنها تصور نمود. مع‌هـذا بـرای این که مشکلاتی در آتیه تولید نشود، از آن جناب مستطاب خواهشمند است به حاکم سیاسی سلیمانیه تعلیمات لازمه صادر نمایند که به عـشایر جـاف اخطـار نمایند هر گونه اسنادی راجع به املاک کردستان دارند باید به سنندج آورده بـه استحضار حکومت و عدلیه و کارگزاری رسیدگی و صحت و سـقم آنهـا تعیـین گردد. در این موقع احترامات فایقه را تجدید می‌نماید. امضا

## بەڵگەی ژمارە سی و دوو (32)

بابەت: موڵکداری کوێخاکانی جاف سەربە عوسمانی لە دێهاتی کوردستانی ئێراندا
ژمارە: ٥٧٣- ١٨٢٤
مێژوو: ١٦ زیلحیجەی ١٣٣٨ ک
کارتۆن: ٤٠
دۆسیە: ٥

نامەی وەزارەتی دەرەوە بۆ سەفارەتی ئینگلیز

لە کوردستانەوە «سنە» هەواڵمان پێگەیشتووە کە ئەو دەم کوێخاکانی جاف دەپەڕینەوە ئەمدیوی سنوور بە دوای لەوەڕدا چەندین دێهاتیان لە دەڤەری خڕخڕە و سەقز بە زۆر لە خەڵکی فەقیر و هەژار سەندووە و ئیمزاشیان پێکردوون و مۆر و واژووی کەسانێکی نەناسراویش بە سەنەدەکانیانەوەیە و ئێستا داوای خاوەنبوون و موڵکداری دەکەن، باوەک ئەو سەنەدانە هیچ نرخ و بایەکی یاساییان بۆ دانانرێت، بەسەر ئەوەشدا بۆ ئەوەی گرفتاری دروست نەبێت، تکا لە رێزدارتان دەکەین داوا لە حاکمی سلێمانیە بکەن کە بەو جافانە راگەیەنن ئەوی داوای موڵکداری دەکات با بێت بۆ «سنە» و سەنەدی خۆی رووبکات تا راست و درۆ جیا بکرێتەوە لەگەڵ رێزدا.

واژوو

## سند شماره: سی‌وسه (٣٣)

British Legation,
Tehran.
10th November, 1920.

Your Excellency,

With reference to Your Excellency's predecessor's memorandum No. 50763 dated Zil Hijjah 16, 1338, I have the honour to inform Your Excellency that the Political Officer at Sulaimania reports that the statement that the chiefs of Jaf have taken forcible possession of villages in the Khurkhur and Saqiz districts is devoid of foundation.

The chiefs of Jaf were directed this year to take their documents with them when they entered Persia, as it was understood that this was the wish of the Persian Government, but as the province of Senna has been in a disturbed condition and the officials of the Government have had no authority, no steps could be taken towards the verification of the documents.

I avail myself of this opportunity to renew to Your Excellency the assurances of my high consideration.



سند شماره: سی‌وسه (۳۳)

موضوع: تصرف قرأ خُرخُر و ناحیه سقز به وسیله رؤسای جاف

تاریخ: ۲۸ صفر ۱۳۳۹ هـ. ق (۱۰ نوامبر ۱۹۲۰)

کارتن: ۴۰

پرونده: ۳

نامه سفارت انگلیس به وزیر خارجه

آقای وزیر

نظر به یادداشت سلف جناب مستطاب عالی مورخه شانزدهم ذی‌حجه ۱۳۳۸ نمره ۵۰۷۶۳ ، شرف دارم خاطر جناب مستطاب عالی را مستحضر سازم که صاحب‌منصب سیاسی انگلیس مقیم سلیمانیه، اطلاع می‌دهند که این که گفته شده است رؤسای جاف قرأ واقعه در ناحیه خرخر و ناحیه سقز را جبراً تصرف کرده‌اند، بی‌مأخذ می‌باشد.

به رؤسای جاف امسال دستورالعمل داده شده بود که اسناد خود را وقتی که به خاک ایران می‌روند همراه ببرند و از قرار معلوم این مسأله موافق میل دولت علیه بوده است ولی چون ناحیه سنه در حال اغتشاش بوده و مأمورین دولت اقتداری نداشته‌اند، ممکن نبوده است اقدامی برای رسیدگی به اسناد مزبور به عمل آید.

موقع را مغتنم شمرده احترامات فایقه خود را تجدید می‌نمایم.

- ۳۰۰ -

## بەڵگەی ژمارە (33)

بابەت: داگیرکردنی دێهاتی خوڕخوڕە و سەقز لە لایەن سەرۆکەکانی جافەوە
مێژوو: ٢٨ سەفەری ساڵی ١٣٣٩ ک (١٠ نۆڤەمبەری ١٩٢٠ز)
کارتۆن: ٤٠
دۆسیە: ٣

نامەی سەفارەتی ئینگلیز بۆ وەزارەتی دەرەوە

وەزیری بەڕێز

پەیڕەوی نامەی جەنابتان لە شانزەهەمی مانگی زیلحیجەی ١٣٣٨ ک ژمارە ٥٠٧٦٣ گەیشتە دەستمان تیادا دەمەوێ ئاگادارتان بکەین کەوا فەرمانڕەوایی سلێمانی، ئینگلیز تیادا ئاگادارمان دەکاتەوە کە گوایە سەرۆکەکانی جاف خوڕخوڕە و سەقزیان داگیر کردووە، پۆی بە حەقیقەتەوە نییە و بێ ئەساسە.

بە سەرۆکەکانی جافمان راگەیاندووە کاتێک هاوین لەگەڵ ئەمدیودا ئەوی سەنەد و قەواڵەیان هەیە، لەگەڵ خۆیاندا بیهێنن و لەبەر ئەوەی دەڤەری سنە ئاشوفتە و نا ئارام بووە، نەیانتوانیوە بڕۆنە لای لێپرسراوانی دەوڵەت تا لە رووی سەنەدەکانیانەوە بدوێن.

بە هەلی دەزانم رێز و سڵاوی فراوانم بگەیەنم و دووبارەی بکەمەوە.

سند شماره: سی‌وچهار (۳۴)

موضوع: در باب تجاوزات ایل جاف

نمره: ۱۲

تاریخ: ۴ حمل ۱۳۰۱ هـ. ش (۱۳۴۱ هـ. ق)

کارتن: ۴۰

پرونده: ۳

نامه وزیر جنگ به وزارت خارجه

وزارت جلیله امورخارجه

نظر به این که ایل جاف همه ساله در موقع مراجعت از خاک عثمانی به خاک ایران مرتکب شرارت و نهب اموال و مواشی رعایای آن حدود می‌شوند و فعلاً به پاره ملاحظات اعزام قشونی به سردشت برای جلوگیری از تجاوزات ایل مزبور غیرمقدور می‌باشد، لذا مقتضی است مقرر فرمایند هرچه زودتر در این باب با مقامات مربوطه داخل مذاکره و مراجعت ایل مزبور را تحت ترتیبات و شرایطی معین قرار دهند که در موقع ورود به خاک ایران اسباب زحمت و خسارت اهالی را فراهم نیاورند و نیز مقرر فرمایند نتیجه اقدامات آن وزارت جلیله را در این باب اطلاع دهند که بر طبق آن به لشکر غرب دستور داده شود.

وزیر جنگ و فرمانده کل قشون ـ رضا

- ۳۰۲ -

## بەڵگەی ژمارە (34)

بابەت: دەربارەی دەستدرێژی هۆزی جاف
ژمارە: ١٢
مێژوو: ٤ کاوری ١٣٠١
کارتۆن: ٤٠
دۆسیە: ٣

نامەی وەزیری شەڕ بۆ وەزارەتی دەرەوە

بەڕێز وەزارەتی دەرەوە

بە پێی ئەوەی هۆزی جاف هەموو ساڵێک لە گەڕانەوەیاندا بۆ وڵاتی عوسمانی تاڵان و بڕۆی خەڵک و خوای سنوور لە تواناادا نییە تا بەرگری لەو دەستدرێژییانە بکرێت وا پێویستە لەگەڵ کاربەدەستانی ئێرەدا لەم رووەوە وتوێژ بکرێت تا ئەو هۆزە لە گەڕانەوەیاندا ئەو کارە نەشیاوە و ناشایستانە نەکەن و وا باشە ئاکامی ئەم جوولانەوەیە بە وەزارەتی ئێمەش راگەیەنن تا لەو رووەوە فەرمان بە لەشکری رۆژئاوا بدەین.

وەزیری شەڕ و فەرماندەی گشتی «رەزا»

پەراوێز:

تکایە لەگەڵ سەفارەتی عوسمانیدا گفتوگۆ بکرێت و لەم رووەوە نامە نووسراوە بۆ «مفخم الدولە» وە تەلیفونکردن بێ سوودە. پێنج شەممە ١٥ ئەم مانگەدا لەگەڵ نائیبی یەکەمی سەفارەتدا قسەم کردووە و بەڵێنی دا تەلوگراف بۆ ئەنقەرە بکا، وا چاکە بە ئیدارەی یەکەمیش یاداشت بنووسرێت رەنگە ئەو دەڤەرانە بە دەستی ئینگلیزەکانەوە بێت.

[حاشیه:]

- مقرر فرمودند با سفارت کبرای عثمانی مذاکره شود، برای آقای مفخم‌الدوله چون اعتبارنامه فرستاده شده مخابره این موضوع بی‌فایده خواهد بود. ۳۰۲/۱/۱۰

... *

- پنج‌شنبه ۱۵ برج جاری با نایب اول سفارت کبرای عثمانی مذاکره و وعده داد مراتب را تلگرافاً به آنقوره مخابره نماید. مع‌هذا مقتضی است به اداره محترمه اول هم یادداشتی نوشته شود، اقدام نمایند چون محتمل است نقاط مجادله با سردشت در دست انگلیسی‌ها باشد. ۱/۱۷

* خوانده نشد.

## بەڵگەی ژمارە (35)

بابەت: دەربارەی دەستدرێژی هۆزی جاف
ژمارە: ١٥٠
مێژوو: ١٤ کاوری ١٣٠٢ ک
کارتۆن: ٤٠
دۆسیە: ٣

نامەی وەزارەتی شەڕ بە وەزارەتی دەرەوە

ڕێزدار وەزارەتی دەرەوە

دەربارەی بەدواداچوونەوەی نامەی ژمارە ١٢ مێژووی ٤ کاور دەربارەی بەرگری لە دەستدرێژییەکانی هۆزی جاف، لەبەر ئەوەی گەڕانەوەیان بۆ وڵاتی ئێران نزیکە وا چاکە لە ئێستاوە دەستبەکاربن و نەتیجەمان پێ ڕابگەینن.

وەزیری شەڕ و فەرماندەی گشتی
«ڕەزا»

سند شماره: سی‌وپنج (۳۵)

موضوع: در باب تجاوزات ایل جاف

نمره: ۱۵۰

تاریخ: ۱۴ حمل ۱۳۰۲ هـ. ش (۱۳۴۲ هـ. ق)

کارتن: ۴۰

پرونده: ۳

نامه وزیر جنگ به وزارت خارجه

وزارت جلیله امور خارجه

در تعقیب مراسله نمره ۱۲ مورخه ۴ حمل در خصوص جلوگیری از تجاوزات ایل جاف چون موقع مراجعت آنها به خاک ایران نزدیک می‌باشد، مقتضی است تأکید فرمایید اقدامات سریع‌تری به عمل آورده، نتیجه را به وزارت جنگ مرقوم دارند.

وزیر جنگ و فرمانده کل قشون ـ رضا

[حاشیه:] اداره اول، سابقه نیست ۱۴ حمل

- ۳۰۵ -

سند شماره: سی‌وشش (۳۶)

موضوع: در باب مراجعت ایل جاف از خاک عثمانی

نمره: ۲۷۱

تاریخ: ۲۷ حمل ۱۳۰۲ هـ. ش (۱۳۴۲ هـ. ق)

کارتن: ۴۰

پرونده: ۳

نامه وزارت خارجه به وزارت جنگ

به وزارت جنگ

دو فقره مرقومه مورخه ۳ و ۱۴ برج جاری نمره ۱۲ و نمره ۱۵۰ راجع به مراجعت ایل جاف از خاک عثمانی به خاک ایران، زیب وصول داد به طوری که تقاضا فرموده‌اند با سفارت کبرای عثمانی مذاکرات لازمه به عمل آمده وعده دادند مراتب را تلگرافاً به آنقوره اطلاع بدهند. اسحق

- ۳۰۷ -

## بەڵگەی ژمارە (36)

بابەت: دەربارەی گەڕانەوەی جاف بۆ ناو ئێران
ژمارە: ٢٧١
مێژوو: ٢٧ کاور ١٣٠٢
کارتۆن: ٤٠
دۆسیە: ٣

نامەی وەزارەتی دەرەوە بۆ وەزارەتی شەڕ

دوو دانـــە نامـــەی مێژووی ٣ و ٤ ژمارە ١٢ و ژمـــارە ١٥ دەربارەی گەڕانەوەی هۆزی جاف لە خاکی عوســـمانییەوە بۆ ناو خاکی ئێران وەک داواتان کردبوو لەگەڵ ســـەفارەتی عوســـمانیدا گفتوگۆمان کردووە و بەڵێنمان داوە تەلگوراف بۆ ئەنقەرە بکەین و وەڵامان بدەنەوە.

«ئیسحاق»

**سند شماره: سی‌وهفت (۳۷) بازخوانی ندارد**

مجلس النواب العراقي

العدد — ١٠٨

التاريخ — ٣٠/٥/١٩٥٨

ان سعادة الشيخ داود الجاف الملصقة صورته أعلاه نائب عن لواء كركوك في الدورة الانتخابية السادسة عشرة .

عبد الوهاب مرجان

رئيس مجلس النواب

- ٣٠٨ -

## بەڵگەی ژمارە (37)

پەرلەمانی عێراقی
ژمارە: ١٠٨
مێژوو: ١٩٥٨/٥/٢٠

بەڕێز داود بەگی جاف وێنەکەی لەسەرەوەیە نوێنەری لیوای کەرکووکە لە خولی هەڵبژاردنی شانزەهەمدا.

عەبدولوەهاب مەرجان
سەرۆکی پەرلەمان

## سند شماره: سی‌وهشت (۳۸)



شماره:
تاریخ:
پیوست:

تشریفات کل شاهنشاهی

آقای سردار جاف

آجودان کشوری اعلیحضرت همایون شاهنشاه آریامهر

نظر باینکه بر حسب امر مطاع مبارک اعلیحضرت همایون شاهنشاه آریامهر بسمت آجودان کشوری مفتخر و مباهی گردیده‌اید اینک فرمان مبارک ملوکانه با کمال خوشوقتی بشما ابلاغ میگردد . موفقیت شما را در خدمت به اعلیحضرت همایون شاهنشاه آریامهر از خداوند متعال خواستارم .

رئیس کل تشریفات شاهنشاهی - امیر اصلان افشار

سند شماره: سی‌وهشت (۳۸)

موضوع: انتصاب سردار جاف به سمت آجودان کشوری محمدرضا شاه پهلوی (شاه سابق)

تاریخ: ۲۵۳۶/۷/۲۲ = ۱۳۵۶

امضا: امیر اصلان افشار

آقای سردار جاف     آجودان کشوری اعلیحضرت همایون شاهنشاه آریامهر

نظر به این که بر حسب امر مطاع مبارک اعلیحضرت همایون شاهنشاه آریامهر به سمت آجودان کشوری مفتخر و مباهی گردیده‌اید، اینک فرمان مبارک ملوکانه با کمال خوشوقتی به شما ابلاغ می‌گردد. موفقیت شما را در خدمت به اعلیحضرت همایون شاهنشاه آریامهر از خداوند متعال خواستارم.

رئیس کل تشریفات شاهنشاهی ـ امیراصلان افشار

- ۳۱۰ -

## بەڵگەی ژمارە (38)

بابەت: فەرمانی هاوڕێبوونی دەوڵەتی سەردار جاف بۆ شاهەنشا محەمەد رەزا پەهلەوی
مێژوو: ٢٥٣٦/٧/٢٢ = ١٣٥٦ ک
ئیمزا: ئەمیر ئەرسەلان ئەفشار

بەڕێز سەردار جاف هاوڕێی دەوڵەتی عەلا حەزرەتی همایۆنی شاهەنشا ئاریامیهر

پەیڕەوی فەرمانی پیرۆزی عەلا حەزرەت همایۆنی شاهەنشا ئاریا میهر بەڕێزتان هەڵبژاردران بە هاوڕێتی دەوڵەتی و جێگەی شانازییە ئەوەسا ئەو فەرمانە شاهەنشاییە بۆ بەڕێزتان رادەگەیەنین. سەرکەوتنی بەڕێزتان لە خزمەتگوزاری ئەلا حەزرەت همایۆنی شاهەنشا ئاریا میهر لە پەروەردگار داوا کارین.

سەرۆکی گشتی دایەرەی تەشریفاتی شاهەنشایی
ئەمیر ئەرسەلانی ئەفشار

**سند شماره: سی‌ونُه (۳۹)**

**موضوع: فرمان انتصاب سردار جاف به سمت آجودان کشوری**

**تاریخ: سوم اسفند ۲۵۳۶ = ۱۳۵۶**

**امضا: محمدرضا پهلوی**

**نظر به لیاقت و شایستگی که از سردار جاف مشهود گردیده است، به موجب این فرمان مشارالیه را به آجودانی کشوری منصوب، مقرر می‌داریم که در انجام دادن وظایف محول اقدام نماید. کاخ نیاوران. به تاریخ سوم اسفندماه ۲۵۳۶ شاهنشاهی**

- ۳۱۲ -

## بەڵگەی ژمارە (39)

بابەت: فەرمانی بە هاوڕێبوونی دەوڵەتی سەردار جاف
مێژوو: سێهەمی ئەسفەندی: ٢٥٣٦ = ١٣٥٦ ک
ئیمزا: محەمەد رەزا پەهلەوی

لەبەر لێهاتوویی و شایستەگی کە لە سەردار جافدا دەبینرێت، بە پێی ئەم فەرمانە ناوبراو دەکرێتە هاوڕێی دەوڵەتی و بڕیارمان دا کاروباری دەست پێ بکات

کۆشکی نیاوەران
سێهەمی مانگی ئەسفەند
٢٥٣٦ شاهەنشاهی

# میرزادە وارامی جاوانی

ئـەم زاتە، وارامی کوڕی محەمەدی ناسـراو بە «ئەبو فەراسـی جاوانـی» بە پیاوێکی ئازا و لێهاتوو و کارزان ناسـرابوو، لە سـاڵی ٣٩٧ک بە سـوپایەکی گەورە و گرانەوە شـاری بەغدای ئابڵوقە داوە، دوای شـەڕ و کوشـت و کوشـتاری فراوان (٣٦٣-٣٨١ک) خەلیفەی عەباسـی دانی بە دەسـەڵاتیدا ناوە و بووە بە فەرمانڕەوای «حیلە». ئەو فەرمانە لە زەمانی خەلیفەی عەباسـی «تالیعولـلا»دا دەرچـووە، دوای ئەوەی قادر بیللای عەباسـی بووەتـە خەلیفە، کەم و زۆر دژ بە خەلیفـە دەسـت لـەکاردا بووە، کاتێک «تەنش» ویسـتی بەغدا بگرێت خەلیفـە داوای یارمەتی لە وارامـی جـاوان کـردووە، تا یارمەتی بدات و «وارام» ڕۆیشـتووەتە هانای خەلیفەوە کە سـاڵی «٤٢٠ک» غەزەنەوییەکان پەلاماری «مووسـل»یان داوە دیسـان ئەمیر وارام پەلاماریانی داوەو راویانی ناوە..

ئەمیر وارامی جاوانی باپیرە گەورەی جافەکانی ئێسـتایە «بەندە (خوسـرەو جاف) چوومەتە سـەر مەزارەکەی کە لە ناو شـاری حیلەدایە لە سـەردەمی سـەدامدا ویسـتم مەزارەکەی نوێ بکەمـەوە، حکومەتی بەعس نەیهێڵا. ئێسـتاش ئەگەر مەرگ مەودای دا ئـەو کارە دەکەم..» وەک سەرچاوەی جۆراوجۆری دیکە مێژووی ئەوڕۆکە بە دەستەوەیە. هۆزی جاف ئێستا دەگەڕێنەوە سـەر هۆزی «جاوان» و ئەو هۆزەش دەگەڕێنەوە سـەر «جاپان»ەکانی سـەردەمی دەسـەڵاتی ساسـانییەکان کە لە شـەڕی «قادسـیە»ی نێوان عارەب و ئێرانییەکان. «جاپان» یەکێک بووە لە سـەرکردەکانی لەشـکری ساسانی و یاریدەی ڕۆستەمی فەروخزاد بووە، لەو شەڕەدا بە داخەوە «جاپان» شەهید کراوە و بووەتە قوربانی خاک و وڵات و بیروباوەڕی.



میرزادە وارام «بەهرام»ی جاوانی
مەزارگەی لە شاری «حیلە»دایە

# ئەبولفەتحی کوڕی وارامی جاوانی
# 449-455ک

بە فەرمانی خەلیفەی عەباسی لە ساڵی ٤٤٩ بووە بە فەرمانڕەوای دەڤەری حیلە، ئازا و کارزان و لێهاتوو بووە، سوپا و سانێکی باشی پێکهێناوە، ئیبراهیم یەنالی، برای توغرولی سەلجووقی پەلاماری داوە و بە ناچاری شاری حیلەی بەجێهێڵاوە، بەڵام لە دواییدا توانی پەلاماریان بدا و راویان بنێت، لە ساڵی ٤٥٠ک، کاتێک توغرولی سەلجووقی لە بەغدا بووە، رۆیشتووە بۆ دیتنی، زۆری رێز لێگرتووە. ئەم میرزادە «جاوانییە_ جافە» لە ساڵی ٤٥١ک لە شەڕێکدا دەستگیر دەکرێت و لە دواییدا ئازاد دەکرێت. لە ساڵی ٤٥٥ک لە شاری بەغدا دەمرێت و لە دەڤەری جرجرایای کوت دەنێژرێت.



میرزادە ئەبولفەتحی جاوانی

# میر موهەلهەلی کوڕی عەسکەری جاوانی
# 517-554ک

لە لایەن موستەنسیری عەباسییەوە کراوەتە فەرمانڕەوا، عەشایەری عارەب پەلاماری شاری حیلـە دەدەن بـۆ تاڵانکردنـی، ئـەم میرزادەیە تەفروتوونایـان دەکات، کاتێک هێزی سـەلجووقی پەلاماری بەغدا دەدات، بەرەنگاریان دەبێتەوە و بە چاکی راویان دەنێت.



میرزادە موهەلهەلی جاوانی لە شەڕی سەلجووقییەکاندا

# وارامی ئەبو فەراسی جاوانی
# 457-462ک

ئـەم میرزادەیە لـە لایەن خەلیفەی بەغـداوە دامەزراوە و فەرمانی میرنشـینی بۆ دەرچووە، لێزانێکی بە توانا و شـەڕکەر بووە، پەلارماری تکریتی داوە و گرتوویەتی، گەلێک تەوحی بۆ لای ساختمانسازی دروستکردنەوە بووە. کاروانسەرا و مزگەوتی زۆری سازاندووە.



میرزادە وارامی ئەبو فەراسی لە یەکێک لە جەنگەکانیدا

# نەبەردی جوانەمەرگ

لە زەمانی پاشایەتی ئێراقدا باوکم بە چەپگەرا و ناسیۆنالیستێکی دیموکراتیخواز ناسراو بوو. لەبیرمــە چەندین جار لە لایەن ئەو دەم (التحقیقات الجنائیە)ی دەوڵەتەوە دەهاتن و کتاوخانەکەی بابمیــان دەپشــکنی. چەند جارێکیش ئەمــر قەبزی بابم دەرچوو، بۆ شــەوان نەبێت رۆژان لەگەڵ چەند سوارێکدا لە دەوروبەری کەلاردا رۆژی دەبردەسەر، داود بەگی جاف ئەو دەم یەکێک بوو لە نائیبە دەمڕاستەکانی پەرلەمانی ئێراق، دەکەوتە تەقەللای بۆ بەرێکردنی گرفتارییەکەیەوە. بەندە زۆر لــە تێکۆشــەرانی وڵاتم وەک راکردوو لە ماڵــی خۆماندا دیوە و چەندین مانگ لە ماڵی ئێمەدا شــاراونەتەوە. جگە لە نیشتمانپەروەرانی خۆماڵی، دوو ساڵ (خوسرەو روزبە) سکرتێری حیزبی (تــودە)ی ئێــران بەناوی (عەلــی تورکە) لە ماڵی ئێمــەدا بووە. بە غەیری بابم کەس نەیدەناســی. کتاوخانەکەی بابم (حەمە ســەعید جاف) هەوارگەی عوشــاقانی خوێندنەوە و رۆشنبیری بووە لە زۆر لاوە بۆی دەهاتن. ئێمەی منداڵانی ئەو ماڵە لە ئاوا دەوروبەرێکدا پەروەردە بووین.

نەبــەردی برام چوار ســاڵ لە بەندە منداڵتر بوو، هەر لە منداڵییــەوە خاوەنی حاڵەتی تایبەتی خۆی بوو. کەمەکێک مۆن و گۆشەگیر، زۆر لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنی خۆیدا نەدەجۆشا. سەرجەم ئارام و بێ ئازار و رۆژانی بە خەیاڵەوە دەبردە ســەر، خوێندنی ســەرەتایی لە کەلار و خانەقی و بەغدا بردووەتە ســەر، لە شەســتەکاندا کە لە بەغدا بوو، لە رێکخراوی لاوانی کوردستاندا ئەندام بــوو. ئەودەم بەندە پێشــمەرگە بووم، چەندین جار خــۆی گەیاندە لای من و بەزۆر دەمگێڕایەوە. ســانەوی تەواو کرد و رۆیشــتە کۆلیژی ســەربازییەوە. کە تەواوی کرد، ئەویش هات و بوو بە پێشــمەرگە و لە دواییدا بڕیاری دا دیســانەوە بڕواتەوە زانکۆ. ئەم جارەیان کۆلیژی ئەدەبیاتی لە زانکــۆی تــاران تــەواو کرد و ژنی هێنا، کچێکی بە ناوی (شــەم) دوو کوڕی بە ناوی (شــوان) و (شەن)ەوە هەیە و لە وڵاتی نەرویژدا دەژین. چەندین ساڵ لە وڵاتی ئێراندا ژیاوە. دوای شۆڕشی میللەتی ئێران وەک ســەدان و هەزاران کورد ئەویی بەجێهێڵاوە و گەڕاوەتەوە بۆ ئێراق و لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی زەق لە بەغدادا ماوەتەوە.

لە دواییدا بووە بە مستەشــار، هەرچی کۆشــام لەو کارە وەدوور کەویتەوە، بە گوێی نەکردم و دەیــوت: لێگــەڕێ جووجەڵــەکان لە ئاخیــری پایــزدا دەیانژمێرین. زۆری نەخایانــد بە خۆی و ٧٦٠ کەســەوە گەڕایەوە ناو ریزی پێشــمەرگە. لەو دەمەدا ئەو ژمارە چەکدارە کە چوونە ریزی پێشــمەرگەوە تــەرازوو تێکچوو. بــوو بە هۆی تێکچوونــی زۆر موعادەلــەکان. دەوڵەت بەندە و کیســرای برامیان گرت و قۆڵبەســتیان کردین. دەڵە دوژمنانی من و ئێمە کەوتنە تەقەلاوە، ئەگەر پیاوچاکێک نەبووایە بڕیاری ئیعدامەکەیان بەســەرماندا جێبەجێ دەکرد. بەختێکی بچووک کەوتە

کار و بەرەڵڵا کراین. نەبەرد وەک تەواوی شۆڕشــگێڕەکانی کوردســتان ئەویش بۆ حەسانەوە و ژیانی ئاســایی رۆیشــتەوە ناو شــاری تاران. وردە وردە گرفتاریی لابەلای بۆ دروست کرا و بە ناچاری وەک هەزاران کوردی ئاوارە خۆی و خێزانی کۆڵەباری بەســت و بەرەو هەندەران و لە وڵاتــی نەرویــژدا گیرســایەوە، راپەڕین کرا. بەندەش خۆم گەیاندە شــاری لەندەن وەفدی حیزبی عەشــایەر هاتن بــۆ بەریتانیا. هاتنە لام و داوایان کرد نەبەرد هاوکارییــان لەگەڵدا بکا، وەڵامیانم داوە کە نەبەرد حیزبییە و ناکرێت لە دوو حیزبدا بێت. وتیان ئەگەر رازی بێت ئێمە حیزبەکەمان دەکەینە رێکخراو. نەبەرد هات و لەگەڵیاندا دانیشــت و بڕیاریان دا لەوێش بڕۆن بۆ عەرەبســتانی ســعودی، هەرواشــیان کرد، لەوێ دەچنە لای (ئەمیر تورکی) کە ئەودەم سەرپەرشــتی ئاسایشی وڵاتی ســعودیە بووە، نەبەرد لە ســعودییەوە تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی: کاکە ئەمانە هی ئەوە نین پیاو هەنگاویان لەگەڵدا بنێ. دەیانەوێت کەســێک. جێگەیەک.. دەوڵەتێک بیانکاتە (چەکوش) و هەر وەخت ویســتیان بزمارێک لە وڵاتدا داکوتن، جا من پەیوەندیم لەگەڵیاندا بڕیوە و وا دەگەڕێمەوە کوردستان. ئەودەم جۆش و خرۆشی راپەڕین لە هەموو شارەکانی کوردستان وەک دیاردەیەک دەبینرا. نەبەرد هۆشــیارانە هەنگاوی دەنا. پوختە تەرازووی هەڵدەسەنگاند. دۆستی تەواوی بەرە سیاســییەکان بــوو، بــە لای تەواوی حیــزب و لایەنەکانەوە رێــز و حورمەتی دەگیــرا. بە وردی جێگەی لە دڵ و دەروونی خەڵکدا دەبۆوە، دەوڵەتی بەعســی کەوتە تەقەلاوە تا فرســەتیان هێنا و ژەهرچێژیان کرد و وەک هەزاران شوهەدای میللەت بوو بە قوربانی خاک و وڵاتی کوردستان.

ئەوە دیوانی (بەغا)تان لەبەردەســتدایە. بەغا بارو وەزنێکی پڕ لە رۆشــنبیرییە. هەڵسەنگادنە. ئەگــەر دەســتی دوژمنی کــورد نەنرایەتە بینی نەبــەرد جاف، دەیتوانی لە رێزی کەڵە شــاعیرانی میللەتەکەیدا ناوببرێت. مەخابن دوژمنانی کورد نامەرد پیشــەن، لە پشــتەوە خەنجەر دەوەشێنن. تینووی خوێنن. مەرگ روێنن. ئەگەر بتوانن..

**خوسرەو جاف**
**٢٠٠٨/٣/٩**
**هەولێر**

## نەبەرد جاف
Neberd caf

- ساڵی ١٩٤٨ لە شارۆچکەی کەلار لەدایک بووە.
- ساڵی ١٩٦٧ کۆلیژی سەربازی تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٧٢ لە زانکۆی تاران بەشی زمانی ئینگلیزی و ئەدەبی فارسی تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٧ چۆتە ریزی پێشمەرگەی کوردستانەوە.
- لە رۆژنامەی (کەیهان) چاپی لەندەن و (مامۆســتای کورد) چاپی ســوید و گۆڤاری (کاروان)دا بەرهەمی جۆراوجۆری بڵاوکردۆتەوە.

## دیوانە چاپکراوەکانی:

* هەرگیز نالێم پەشیمانم - شیعر ١٩٨٨ نەرویژ
* بارانی مەرگ - شیعر ١٩٨٨ نەرویژ
* چروستان - شیعر ١٩٨٨ نەرویژ



شەهیدی جوانەمەرگ نەبەرد جاف
ڕۆژی دەرچوونی کۆلیژی ئەدەبیاتی زانکۆی تاران ١٩٧٦

# حەبیبە خانم
# 1924-1997ز

حەبیبە خانم، دووهەمین کچی کەریم بەگی جاف بوو، سوارکار و جارەوبار تفەنگی بەکاردەهێنا. شـیعری دەهۆنایـەوە، بۆخۆی خاوەنـی دیوەخان بوو، جوانی و خانومانی حەبیبە خانم بەسـەر زارانەوە بوو، هەتاوەکو برێک لە هونەرمەندانی ئەو کاتە گۆرانییان پیا هەڵداوە. گۆرانی «حەبیبە خان» یەکێکە لە گۆرانییە بەناوبانگەکانی دەڤەری گەرمیان.

حەبیبە خانم شووی کردبووە مەحموود بەگی ئامۆزای و لەو هاوسەرییەدا چوار کوڕ و دوو کچی هەبووە. بەنەخۆشی شێرپەنجە کۆچی داویی کردووە. پووری بەندەش بوو.



حەبیبە خانمی کچی کەریم بەگی جاف
١٩٢٤-١٩٩٧

# مەحموود پاشای جاف
# «1921-1846»ز
# «1339-1261»ک

ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا

بەشی یەکەم



مەحموود پاشای جاف یەکێکە لەو پیاوە گەورانەی کە خزمەتێکی زۆری پێشکەش بە نەتەوەکەی کردووە و هەر لە پێناوی ئەو خزمەتکردنەدا گەلێک ئازار و گیروگرفت و دەربەدەری و دەردەسەری چەشتووە. ئەم پیاوە مەزنە لە کاتێکدا بە پەرۆشەوە زۆربەی تەمەنی خۆی

بەخشـیوە بە ئـەدەب و کەلەپـووری ئەدەبی نەتەوەکەی کـە بەدەگمەن کەسـانێک هەبوون بیر لەوە بکەنەوە ئەو سـامانە گەورە نەتەوەییە بپارێزن جگە لەوەی کە ژیانی خێڵەکی و گەرمیان و کوێستانکردنی هۆزی جاف بارێکی ئارام و جێگیربوونێکی تەواوی نەڕەخساندووە کە ئەم دڵسۆزە بـەو شـێوەیە هەموو مەبەسـتەکانی خۆی بەدی بهێنـێ جگەلەوەی کە نەزانیـن و دواکەوتوویی نەتەوەکەی لە لایەک و بڕوبیانوو شەڕ پێفرۆشتنی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێران بە کورد لە لایەکی ترەوە کەمتر ئەو دەرفەتەیان داوەتێ و بۆ کارکردن لە پرۆژە گەورەکەیدا، کەچی لەگەڵ ئەوەشـدا لەو سـەردەمە تاریکەدا تەنیا کەسێک و دڵسـۆزێک بووە کە سەدەها لاپەڕە لە شیعری کوردی بە خەتە خۆشەکەی خۆی بنووسێتەوە و ئەو چەند کەشکۆڵێکی نایابی لێ دروست بکات بەرهەمی زیاتر لە چل شاعیری کوردی لە فەوتان رزگار کردووە. ئەگەر کەشکۆڵەکانی مەحموود پاشـا نەبوونایە هەرگیز ئێمە بەم شێوەیەی ئێسـتا شیعری مەولەوی و وەلی دێوانە و بێسارانی و ئەحمـەد بەگی کۆماسـی و حەمە ئاغـای دەربەند فەقەرە و مەلا وڵەخان و چەندین شـاعیری گەورەمان دەستگیر نەدەبوو.

مەحموود پاشـا هەر لە منداڵییەوە، لە ناو هۆزێکدا چاوی کردۆتەوە و پێگەیشـتووە کە شیعر و کۆڕی شـاعیرانی لە هەموو شـت زیاتر تێدا بووە، بە تایبەتی شیعرەکانی شاعیرانی هەورامان و زەنگەنە.

لە لایەکی تریشـەوە گیانی نەتەوەیی و گەڕان و سـەفەرکردنی بۆ ئەسـتەمبۆڵ و رووسیای ئەوکاتە، بە تایبەتی کە ئەسـتەمبۆڵ کانگای شارسـتانی و پێشکەوتن و شیعر و مۆسیقا و هونەر بـووە کارێکـی زۆر گەورەیان بووە بە پەروەردەکردنی زەوقی ئەدەبی و هەسـتی نەتەوەیی ئەم پیـاوە نەمـرەدا. ئەوە بـوو کە لە تورکیـا گەڕایەوە لە پێنـاوی خزمەتکردنـی نەتەوەکەیدا وازی لـە پلـەی –متصرقی شـاری –ئورفە– هێنـا. لە شـارەزووردا کەوتە پەیوەنـدی لەگەڵ هۆز و تیرەکانی عەشایەردا لە سەرانسەری کوردستاندا کۆکردەوە هەتا بتوانن بەرانبەر دەسەڵاتی ئێران و دەوڵەتی عوسـمانی بوەسـتنەوە و جۆرە سـەربەخۆییەک بۆ خۆیان بەدەست بهێنن، ئەوەبوو کۆنگرەی کەناری زەڵم یاخود (دوو ئاوان)ی پێکهێنا، ئەو کۆنگرەیەی کە دوایی باسـی دەکەین و تەواوی کێشەکە لە یاداشتەکانی پیرەمێرددا باس کراوە. مەحموود پاشا زۆر باش لەوە گەیشتبوو کـە هەر نەتەوەیـەک خوێندەواری و رۆشـنبیری تێـدا بڵاونەبێتەوە ئەوا ئـەو نەتەوەیە هەرگیز پێشناکەوێ و بە ئاواتەکانی خۆی ناگات.

لە پێناوی ئەم راستییەدا مەحموود پاشا کەوتە کۆکردنەوە و سەرلەنوێ نووسینەوەی شیعری هەرچی شاعیرانی کورد هەیە ئەوانەی کە دەستی کەوتووە، تەنانەت کەشکۆڵەکانی لەگەڵ خۆیدا بردووە بۆ تورکیا و کاتێکیش بە ناچاری چۆتە چیای زمناکۆ لەوێش هەر لەگەڵ خۆیدا بردوونی و هەرچی شـاعیر و خوێندەوار و نەخوێنەوارێکی تووش هاتبێ پرسـیار و هەواڵی شاعیرانی لێ پرسـیوە و لە دەمی ئەو کەسـەوە پاشا شیعرەکەی راگوێزتۆتەوە ناو کەشکۆڵەکەیەوە، هەروەها ناوی شاعیرەکە و جێگا و کاتی نووسینەکەشی دیاری کردووە.

ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکن لەم بابەتە کە نووسیویە:

١– «نووسرایەوە لەبەر دەستنووسەکەی شێخ موحسینی کوڕەزای شێخ قادری سنەیی»(١)

٢– «ئەم تەختەیەم لەبەر نوسخەکەی شێخ محەمەدی شێخ کەریمی سەرکۆیی قەرەداغ نووسییەوە

له ئەستەموڵ له ١٠ی محەرەمی -١٣١١-دا»(٢)
٣- «میرزا محەمەدی یاقوو ئەم شـیعرانەی بە گۆرانی بۆ وتم و منیش نووسـیومەوە بە -١٥-ی ڕەمەزانی -١٣٠٩-دا له زمناکۆ له کاتی قاچاخیمدا که له ئەستەموڵ هەڵاتبووم»(٣)
٤- «لـه ١٢٧٩-دا لـه کانـی چەقەڵ- جەنابی سـەید فەتاحی جەبـاری لەبەر ئەم شـیعرانە بۆی خوێندمەوە و منیش نووسیمەوە»(٤)
٥- له بەهاری -١٢٨٢-دا بۆ جۆماڵ و پاککردنەوەی دەڵێن جۆگەکانی تری شارەزوور له بەکراوا بووم کاک ئەحمەدیش هاتبوو ئەم پێنج شیعرەی سەرەوەی وت»(٥)

کاک ئەحمەد مەبەسـت له شـیعری ئەحمەدی خوسرەو چاوەش –یاخود ئەحمەد پریسییە که نازناوی – مەجزووب- بووە سـەبارەت بە ژیان و سـاڵی لەدایکبوون و کۆچی دوایی مەحموود پاشا گەلێک بیروڕا هەیە و چەند مێژوونووس و ئەدیب و شاعیر لەم بارەیەوە زانیارییان داوە بە دەسـتەوە ئەگەرچی زانیارییەکان کەم یاخود ناتەواویش بن، بەڵام جێگای خۆیان هەیە و سـوود دەگەیەنن.

مێژوونووسـی مەزن- محەمەد ئەمین زەکی بەگ- له کتێبی _تاریخی سـلێمانی و وەڵاتی-دا نووسـیویە «مەحموود پاشـای جاف کوڕی – محەمەد پاشـا-یە. له ساڵی ١٢٦١ هیجری هاتۆتە دنیـا لـە پاش کوژرانی باوکی کرا بە ڕەئیسـی جـاف و قائیمقامی هەڵەبجـە و ڕوتبەی – میری میران-ی درایە. له ساڵی ١٣٠٦ عوسمان پاشای برای کرد بە ڕەئیسی جاف و قائیمقامی هەڵەبجە و مەحموود پاشـا کرا بە موتەسـەریفی- ئورفە-، بەڵام قبووڵی نەکرد. چوو بۆ ئەسـتەمبۆڵ سێ ساڵ تیا مایەوە له نهایەت بەدزییەوە بەسەر ڕووسیەدا فیراری کرد و هاتەوە شارەزوور، دوای بەینێک بە ڕوتبەی- بەگلەربەگی کرا بە ڕەئیسـی عەشیرەتی جاف و دەوامی کرد تا هەڵگیرسانی حەربی گەورە.

مەحموود پاشـا زۆر موحبی شـیعر و شـوعەرا بووە، دیندار بووە، زۆر مزگەوتی کردووە. (ڕوتبەی –خان-ی درابوویە) له ساڵی ١٣٣٨ی هیجریدا له هەڵەبجە وەفاتی کرد. له _قزلەرەبات- دفـن کـرا لەو مزگەوتەی که خۆی دروسـتی کـردووە. ئەم زاتـە حەزی له یەکێتـی قەومەکەی ئەکـرد»(٦). ئـەم بیـروڕا و زانیارییانەی ئەمیـن زەکی بەگـی مێژوونووس هەتـا بڵێی جوان و سوودبەخشـە بە تایبەتی که بە ڕسـتەیەکی پڕ مانا لایەنێکی گەورە و پڕ بایەخی مەحموود پاشا بـاس کردووە که نووسـیویە- ئـەم زاتە حەزی له یەکێتی قەومەکەی کـردووە- له چەند خاڵێکدا وەک ساڵی لەدایکبوون و مردن و مانەوەی له تورکیادا جیاوازی دەبینرێ له نێوان بیروڕای ئەم و چەند نووسەرێکی تردا.

لـە بارەی ژیانی مەحموود پاشـاوە سـەرچاوەیەکی گرنگ و پڕ بایەخمان لەبەر دەسـتدایە، ئەویش بەشـێکە له یاداشـتەکانی خوالێخۆشـبوو کەریم بەگی فەتاح بەگ، که تیایدا نووسراوە له سـاڵی -١٩٢٠-ی کۆچیدا والی بەغدا مەحموود بەگی کوڕی محەمەد پاشـای بانگ کردە بەغدا و داوای جێگیربوونی جافی لێکرد مەحموود بەگ وەڵامێکی تەواوی نەدا بەدەستیانەوە و گەڕایەوە لەسەر ئەمە محەمەد پاشا له حکومەتی عوسمانی کەوتە شکەوە و بە خۆی و جافەوە ڕوویکردە ئێران بەڵام مەحموود بەگی کوڕی لەگەڵی نەچوو گەڕایەوە بەغدا محەمەد پاشا کرا بە سەرۆکی گشتی عەشایری جوانڕۆ و ڕابەری باقی عەشیرەتی جاف خاکی عوسمانی واز لێهێنا و چووە لای

محەمەد پاشـا، مەحموود بەگ کوڕی لە بەغدا جێگیر ئەبێ وردە وردە ئەرازیەکی زۆر لە قەزای خانەقین و کفریدا ئەکڕێ والی بەغدا تەحسین پاشا بۆ هاتنەوەی محەمەد پاشا بۆ وڵاتی سلێمانی هەوڵ ئەدا و سێ جار مەحموود بەگ ئەنێرێت بە شوێنیا سەرئەنجام فەرمانی قائیمقامیەتی هەڵەبجە و سـەرۆکایەتی جاف و هەندێ زەوی بۆ ئەنێرێ، محەمەد پاشـا ئەگەڕێتەوە وڵاتی سـلێمانی تا ساڵی -١٢٩٩-ی کۆچی ئەم جۆرە مایەوە لەم بەروارەیدا لە کاتێکدا کە محەمەد پاشا بێ ئاگاداری لـە چیمـەن ئیبراهیم سـەمین دا ئەبێ تیرەیەکی شـاتری بە ناوی کەرەم وەیسـی- کە هەندێ لە پیاوەکانی لە حەپسـی محەمەد پاشـادا مردبوون ئەچنە سـەری و ئەیکوژن، مەحموود پاشـا بۆ سـەندنی خوێنی باوکی لەشـکر ئەکا و بەشوێنی عەشایەری هەمەوەند و هەموو قاتڵەکانی باوکی لەناو ئەبات، مەحموود پاشا لە دوای باوکی ئەبێتە سەرۆکی جاف و قائیمقامی هەڵەبجە و لە دوای دوو ساڵ، یانی لە -١٣٠٢-دا روتبەی میری میرانی بۆ دێ لە -١٣٠٧-دا کە نامق بەگی میر ئالای بۆ تەشکیلاتی- سەنیە- و چەند راپۆرتێک کە دژی مەحموود پاشا درابووە سوڵتان عەبدولحەمید دێتە شارەزوور، لەو راپۆرتانەدا مەحموود پاشا ئیتیهام کرابوو کە سەرۆک عەشائیرەکانی کورد هان ئەدات کە لە دەوڵەتی عوسمانی یاخی ببن و، گوێ نەدەن بە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی، مەحموود پاشا روو ناداتە نامق بەگ بە پێچەوانەی ئەو عوسمان بەگی برای زۆری خزمەت ئەکا. لەسـەر تەلگرافی نامق بەگ قائمقامی هەڵەبجە لەگەڵ روتبەی -میری میران- ئەدرێ بە عوسمان بـەگ و مەحموود پاشـاش ئەکرێ بە موتەسـەریفی -ئورفە-. مەحموود پاشـا سـاڵی دوایی لە بەهاردا لەگەڵ محەمەد عەلی بەگی برای ئەچێتە ئەسـتەموڵ، لە ئەسـتەموڵ دەستبەسەر ئەکرێت، دوو سـاڵێک لەوێ ئەمێنێتەوە، لە دواییدا هەلێکی بۆ رێک کەوت بەسـەر روسـیادا دەرچوو هاتە رەشت و لەوێش هاتەوە ناو جاف، بەڵام زۆری پێنەچوو دوو هەزار سواری دەوڵەتی عوسمانی هاتنە سەر هەڵەبجە بەڵام مەحموود پاشایان دەست نەکەوت و مەحموود پاشا بە هێزێکی جافەوە لە حکومەتی عوسـمانی یاخی ئەبێت. دوایی مەحموود پاشـا تەوەسوتی بە نەسرەت پاشا کرد بۆ لێبووردنی و چووە بەغدا بەڵام بۆ چوونی بۆ ئەسـتەموڵ زۆر ئیسـرار کرا بە کورتی مەحموود پاشـا خـۆی لە بەغـدا دەرباز کرد و هاتە ناوچـەی -قەرەتەپە- لەوێ لەشـکری جافی بۆ ئامادە کرابوو لەگەڵیا چوو بۆ -کانی چەقەڵ- لە دواییدا جارێکی تر سەربازی کرایە سەر و تەنگیان پێ هەڵچنی و دایە شاخی زمناکۆ.

ئەمە ئەو بەشـەی یاداشـتەکانی کەریم بەگی فەتاح بەگ بوو کە هەمیشـە بۆ ئەوە دەسـت دەدات ببێتە سـەرچاوەیەکی روون بۆ مێژووی گەلی کورد و مێژووی هۆزی جاف بە تایبەتی و بەشێک لە ژیانی پڕ لە هەوڵ و تێکۆشانی محەمەد پاشا بۆ خزمەتکردنی نەتەوەکەی. ئەوەی لەم یاداشتەدا هەستی پێدەکرێت ئەوەیە کە گیانی نەتەوەیی و عاشقبوونی سەربەستی لای مەحموود پاشـا لـە پێش هەموو شـتێکەوە بـووە، رازی نەبوون و قەناعـەت نەبوونی مەحموود پاشـا بە هەریەک لە دەسـەڵاتی ئێران و دەوڵەتی عوسـمانی یەکێک بووە لەو بنەما و هۆ ئاشکرایانەی کە هەسـتی نەتەوەیی لای مەحموود پاشـا دەردەخات. لێرەدا بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیانی هۆزی جاف، کە ژیانی مەحموود پاشـا لە منالییەوە تێکەڵ بەو ژیانە بووە و پەیوەندی راسـتەوخۆی بە باسەکەمانەوە هەیە لە چەند سەرچاوەیەکی روونەوە پێشکەش ئەکەین، عەلی بەگی حسێن بەگی جاف، لە وەڵامی پرسیارێکماندا لەم بارەیەوە دەنووسێت:-

«جـاف هۆزێکی گەورە و فراوانن و دوای ئەوە لە سـەردەمی سـوڵتان موڕادی عوسـمانیا لە ناوچەی جوانڕۆوە هاتوونەتە کوردسـتانی ئەو سـەردەمە کە بەشکراو بوو لە نێوان دەوڵەتی

عوسمانی و ئێراندا لەسەر هەندێ هۆی تایبەتی ئەو سەردەمە لە ناوچەی – دزیایش– دەربەندیخانی ئێستا–دا نیشتەجێ بوون دوایی پەرەیان سەند، وردە وردە دەستیان گرتووە بەسەر شارەزوور و گەرمیاندا، گەرمیان و کوێستانیان کردووە. دوای پەرەسەندن و و گەشەکردنی و زۆربوونیان و هاتنی دەستە دەستەی تیرەکانی جاف لە ئێرانەوە بۆ ئەم ناوچەیە و دەوری –زاهیر بەگ–ی سەرۆکی جافی ئەو سەردەمە و دامەزرێنەری جافی مورادی و باپیرە گەورەی بەگزادەی جافی مورادی، کە جاف بەم پێیە دوو بەشن جافی جوانرۆ لە ئێران و جافی مورادی لە عیراق، جافی ئێمە لە دوای ئەمەی لە سەردەمی مەدحەت پاشای والی عوسمانی بەغدادا کە زەوی و زاریان ئەفرۆشت و بە نیازی نیشتەجێی هۆزە گەرمیان و کوێستانکارەکانی ئەو سەردەمە حەمە پاشا و مەحموود پاشای کوڕی کەوتنە کڕینی هەرچی زەویوزاری قەڵەمڕەوی جاف هەیە ئێستایش لە سەنەدەکانی زەمانی عوسمانی بەناو سنوور و نرخی کڕینیانەوە هەمووی تیایە و زۆری لە لایەن نەوەی خاوەنەکانیانەوە پارێزراوە. ئیتر جاف لە سنووری –جەبەل حەمرین–ەوە تاکو–شلێر و ناوخوان– هەمووی بوو بە موڵکی تاپۆی بەگزادەکانی جاف بێجگە لە هەندێ جێگای تایبەتی کەم نەبێت یان بەدەست میرییەوە مایەوە یان کەسانی تر خاوەن تەکیە و پیاو ماقووڵانی ئەو سەردەمە کڕییان یاخود میری پێی بەخشیون.

ئیتر جاف لە –قزرەباتەوە– کەوا دامێنی کوردستانە تاوەکو شلێر و ناوخوان بەشی کوردستانی عێراق و لەو دیو سنووریشەوە هەتا ناوچەی مەریوان گۆلی زرێبار و لای خوارووی قزرەبات و شێروانە و کەلار، پێباز وە شارەزوور و پێنجوێن و ئەودیو سنووریش ئەوانی سەرەوە بە زستان و بەهار و هاوین و پایز هاتوچۆیان تیا کردووە. بۆ چەسپاندنی ئەوەش کە جاف چۆتە ناو ئێرانیشەوە هەتا موڵک و زەویوزاریشیان لەوێ کڕیوە و هەیانە، بە تایبەتی ئاغاکانی گەلاڵی ئەوەی –کلۆدیۆس ریچ– لە گەشتنامەکەیدا دەڵێت «کە چوومە ماڵی کەیخوسرەو بەگی سەرۆکی هۆزی جاف هاوینی – ١٨٢٠– لە کاتیکدا ئەچووم بۆ سنە بۆ دیدەنی ئەمانوڵلاخانی والی ئەردەڵان لە سنە ماڵی کەیخوسرەو بەگ لە نزیکی گۆمی زرێبارەوە بوو، ئەو میوانداریيەم هەتا مردن لەبیر ناچێتەوە» بەم بۆنەیەوە جاف بەشێکیان پەڕیونەتەوە ناوچەی دووکان لە پارێزگای سلێمانی کە ئەوانیش سمایل عوزەیری جافە رەشکەن. ئەوان لەو ناوچەیەوە لە کاتی خۆیا گەرمیان و کوێستانیان کردووە، ئێستاش خۆیان بە جاف ئەزانن، گەرمیان و کوێستانیان ئەکرد، هەر نەشبوایە تاکو ناوچەی پێنجوێن ئەچوون بۆ لەوەڕخۆری. هەر چەند ماڵ لە گەرمیان جێگیر بووبوو بەڵام هاوینان ئاژەڵەکانیان شوان کەژاوکەژ ئایانبردن و خۆشیان بە بەنە –واتە ماڵی سووک و کەم– بە لۆری یان عارەبانەی تراکتۆر لە گەرمیانەوە ئەهاتنە شارەزوور یان چاوەڕوانی ئاژەڵەکەیان ئەکرد یان لەوێ لایان ئەبوون بەو نیازەی بەڵکو ئەگەر میری عێراق و ئێرانیش وەکو جاران ڕێگەیان نەدەن بۆ لەوەڕخۆری بچنە ئێران بەڵکو بچنە ناوچەی پێنجوێن جا بەو بۆنەیەوە ئەم شیعرەی مەولەوی –کە وا ئەزانم یا لە شینەکەی– ئەمنە خانی ژنی بارام بەگدایە یان لە شینەکەی قادر بەگی کەیخوسرەو بەگدایە کە ئەڵێت:

**زیڕەی تەڵمیت با کج نەوهاڵان**
**تەئسیرمیش نیەن ئەم ساڵ چون ساڵان**

داخ و حەسرەت بۆ کزبوون و ئاڵۆزاوی ڕێ کۆچی ئەو ساڵە ئەخوازێت، هەروەها بۆ زیاتر شارەزابوونمان لە مێژووی جاف و دەوربینینیان لە کێشەکانی ئەو سەردەمە با تەماشای چەند لاپەڕەیەک بکەین لە یاداشتەکانی کەریم بەگی فەتاح بەگ، کە بەڵگەنامەیەکی زیندووە

لـەم بارەیەوە «جافی موورادی لە سـەردەمی سـوڵتان مورادی چوارەمـدا هاتوونە خاکی -بەبە- ١١٤٥ی کۆچی ماوەیەک لەوێ ماوەتەوە لە پاشدا چووەتەوە جوانرۆ لە جێگەیاندا لە شارەزوور عەشـیرەتی گەلاڵی ئەمێنێتەوە لە دواییدا -زاهیر بەگ و تاهیر بەگ- کوڕانی یار ئەحمەد بەگ کوڕی سـەیفوڵڵا بەگی کوڕی سـەید ئەحمەد بەگی سـەرۆکی جاف بە چوارسـەد ماڵێکەوە دێتە -بانـی خێـڵان کە لە قەزای سـەلاحیە- دایـە. ١١٥٠ی کۆچی لەم بەروارەدا شـارەزوور بەدەس عەشایری گەلاڵی -مەنمی- کەڵهوڕ -گەڵباخی- تیلەکۆ و بڵباس-ەوە دەبێ. زاهیر بەگ بەرە بەرە بـە کۆچەرانـی جافی جوانـرۆ هێز پەیدا ئەکا و هـەزار ماڵێک پێکەوە ئەنێ و لە هەلێکدا لەسـەر داواکردنی حاکمی بەبە ٤٠ جەردەی ئەو ناوە ئەکوژێ و حاکمی بەبە لەسـەر ئەم خزمەتە -بانی خێڵان و دزیایش- یان ئەداتێ و لەوێ جێگیر ئەبێ ئێستەش لەوێ نەتەوەی ماوە.

لە کوڕانی زاهیر بەگ: سلێمان بەگ و قادر بەگ لە شەڕێکدا عەشایری شارەزوور ئەشکێنن و جێگەکەیان لێ زەوت ئەکەن و لە دوای ئەمە -عەشایری جافی جوانرۆ- نزیک پانزە هەزار ماڵێک دێنە شارەزوور جێگیر ئەبن. لە دوای سلێمان بەگ ئەم دوو سەرۆکە هاوچەرخی سلێمان پاشای باوکـی ئەحمەد پاشـای بابان بوون ١٢٤٣_١٢٥٤ی کۆچی لە دوای کەیخوسـرەو بەگ سـلێمان بەگـی کوڕی بۆتە سـەرۆک و لە دەوروبەری -١٢٤٥-دا کە لەشـکری ئـەردەڵان و ئێران هاتنە سەر سلێمانی عەبدوڵڵا بەگی برای سلێمان بەگ بە دوو هەزار سواری جافەوە دێت بۆ یارمەتی سـلێمان پاشـای بابان و لە -گرۆێ- نزیکی سـولەیمانی ئەشـکێ و عەبدوڵڵا بەگی کەیخوسرەو بەگیش زامدار ئەبێ و هەر بەو زامەشـەوە کۆچی دوایی ئەکات. لە دوای ئەم شـەڕە ماوەیەکی درێژ سـەرۆکایەتی سـلێمان بەگ دەوام ئەکا و قادربەگی برای بۆ جێگیربوونی عەشیرەتی جاف خزمەتێکی زۆر ئەکا لە دوای سلێمان بەگ سەرۆکایەتی جاف ئەکەوێتە دەس محەمەد بەگ برایان کە هێشتا مناڵ ئەبێ -١١٤٨- کۆچی وا دیارە کە ئەحمەد پاشای بەبە لەگەڵ محەمەد بەگدا بەینی چـاک نەبـووە و ویسـتوویەتی ئەحمەد بەگی وڵەوبەگ کە خاڵۆی بوو بکا بە سـەرۆکی جاف بۆ ئەم مەبەسـتە ویسـتوویەتی بە فێڵێک محەمەد بەگ بگرێ و دەعوەتی کردووە بۆ سلێمانی بەڵام محەمـەد بـەگ نەچووە و چەند بەگزادەیەکی خزمی ناردووە ئەحمەد پاشـا ئەم بەگزادانە ئەگرێ و لـە کۆیە حەپسـیان ئەکات. بەرامبـەر ئەمە محەمەد بەگیش ئەحمەد بەگـی وڵەوبەگ ئەگرێ و ماڵەکـەی تالان ئەکات و لەگەڵ عەشـایری جاف دەڕواتە ئێران بـەڵام بەهۆی خزمایەتی ئەحمەد بەگ وڵەوبەگ و والی ئەردەلان لەوێ گونجانیشـی نابێ و دێتە دەوری -قزرابات و خانەقین- و خۆیشـی ئەچێتە لای والی بەغدا حکومەتی بەغدا زۆر ڕێزی ئەگرێ و لەگەڵ عەشـایەری جافدا لە دەوری -قزرابات- جێگیریان ئەکات لە دوای سـێ سـاڵ لەگەڵ ئەحمەد پاشـای بابان ئاشتیان ئەبێتـەوە و دێتەوە شـارەزوور تـا دوای هاتنـی ئەمارەتی بەبە -١٢٦٤-ی کۆچی بەم شـێوەیە دەوامی کرد کاتێک کە سـەردار-عومەر پاشـا- بۆ دروسـتکردن و ڕێکخسـتنی بەڕێوەبەرایەتی هاتە خاکی بەبە ویستی ڕەسمێک بخاتە سەر عەشایری جاف و هەڕەشەی لە محەمەد بەگ کرد لە پاشـا لەسـەر ڕەسـمێکی چل یەکی لەمەڕ و بزن ڕێککەوتن بەم جۆرە سـەرۆکایەتی جاف و قائمقامیەتی هەڵەبجە تا -١٢٩٠-ی کۆچی بە دەستیەوە مایەوە.

بۆ زیاتر شـارەزابوون لـە مێژووی جاف و قووڵبوونەوە و پەلهاویشـتن لەم بوارەدا کورتە نووسـینێکی پیرەمێـرد هەیە کە گەلێ لایەنی گـەش و نوێمان بۆ دەردەخـات، پیرەمێرد لەڕیزی ئەو نووسـینەدا کە بە زنجیرە لەژێر ناوی -تأریخ و أشـخاص-دا بلاوی کردۆتەوە، نووسـیویە -ئێمـە ڕێزمـان لێگرتووە ئەمانەوێ ئەم ئێل و تیـرە کۆنانە بهێنینە ریز و زنجیرەی تەئریخەوە با هەموو لایێکی بە ڕێکوپێکیش ئەزانین بەڵام ئەوی خۆمان ئاگادارین ئەینووسـین و ئەوی لە ئێمە

شارەزاترە چینێکی تری لێ هەڵچنێ، ئەمجارە لە ئێلی جاف ئەدوێین:-

وەکـو لـە هەندێ تەئریخا بۆمان دەرکەوتووە ئەم شـارەزوورە بەر و دوای تەئریخ پڕ بووە لـە ئێـلات و هەر حوکمدارێک کە زۆر و دەسـەڵاتێکی پەیدا کردبێ بـەو ئێلاتەوە بووە وەکو بابا ئـەردەڵان کـە بە تەنهـا هاتووەتە شـارەزوور و لەناو ئێلاتا خۆی شـیرین کـردووە بەرە بەرە هەموویان یەک خسـتووە حکومەتێکی لە شـارەزوور و زەڵمدا دامەزراندووە کە یەکە حکومەتی تەئریخی کوردانە.

ئێستایش جاف ناوی تەنها عەشیرەتێک نییە ناوی شیرازەی جزوبەندی عەشایرێکی زۆرە کە ئەمانە پێش زەمانی ساسانیش تیرە تیرە و بەش بەش لە شارەزووردا بوون، گاە لە ژێر حوکمی شـاهانی ئێراندا گاە لە سـایەی پادشاهانی عوسمانیدا هەڵیان کردووە تا سوڵتان موڕادی ڕابع کە هـات بۆ سـەفەری بەغدا ئەم ئێلاتــەی کۆکردەوە، وڵەدبەگی باپیرە گـەورەی برایم بەگی کرد بە ڕەئیسـیان و بەنـاوی ئێلـی موڕادییەوە هێنانیە ئینتیزامەوە کە ئـەو تەئریخە نزیک بە -٣٠- تیرە و عەشـیرەت بوون -میکائیلی، روغزادی، شاتری، نەورۆڵی، سەعیدانی، گەڵاڵی، تەرخانی، چنگی، هاروونی، پشـتماڵی، ڕیش و بۆری، کەمالی، بەداخی، یەزدان بەخشـی، ئەخە سـووری، یوسـف جانی، باشکی، سۆفی وەند، وینمەوەند.

چونکە ئەم ئێڵە زۆر بوون و لە شیروانەوە تاپشتی سنە خێڵەڕێ گەرمیان و کوێستانی ئەوان بوو، تەنها ڕەئیسـێک ئیدارەی پێ نەدەکرا، خێڵ خێڵ و بەش بەش دایاننە دەسـت چەند ئەمیرێک و ئەو ئەمیرانە لە ئیدارەی مونفەریدی بەشی خۆیاندا سەربەست و لە کولیاتدا تابیعی ڕەئیسێکی عموومی بوون هەر وەکو -Fedrasyon- فیدراسـیون. لەم دواینەوە کەیخوسـرەو بەگیانی تیا هەڵکەوت، باوی لە هەموویان سەند بە سیاسەت و ئیدارەی سەردار عەشرەتی و سەرئێڵی وەلەد بەگ سست کرد ئەوجار محەمەد بەگی کوڕی کە لە ڕۆم و عەجەمدا بە پیاوێکی هوشیار و نامدار دانرابوو لەگەڵ دوو دەوڵەتا پەنجەی لێ ئەدا، خۆی بە عەقڵ و سیاسـەت و کیاسـەت، قادر بەگی برای بە شـەجاعەت و بەسـالەت ئێلی جافیان گەیاندە هەژدە هەزار خانە، حەتتا یەکێ لە ئاساری فەراسەتی محەمەد بەگ ئەمە بوو کە لە حدوودی بەغداوە تا پشتی شاری سنەی تاپۆ کرد بە پێی بـەدەل وەختـێ محەمەد بەگ لەگەڵ والی بەغدا لێیان بوو بە ناخۆشـی ئەو هەموو ئێڵەی بارکرد چووە ئێران، ناسـرەدین شـا زۆری حورمەت گرت، هەموو بەرەی زەهاو و جوانڕۆ و قەسـری شـیرینی دایە تا عوسـمانی مەجبوور بوو دڵنەوایی کرد، هێنانیەوە کە هیچ تەکلیفیان لەسەر نەبێ تەنها لە ئەغنام چل یەکی عەینی شـەرعی و سـاڵی هەرماڵێک خەرجێک بدا، محەمەد پاشا -١١- کوڕی بوو، مەحموود پاشا، عوسمان پاشا، حەسەن بەگ، سلێمان بەگ، فەتاح بەگ، محەمەد عەلی بـەگ، قـادر بەگ و کێ و کێ.. قادر بەگیش تایفەی بارام بەگی لێ کەوتەوە کە ئەوانیش زۆربەی ئێلاتیان بە دەسـتەوە بوو بەڵام ڕەونەق و دەبدەبە و ئیداراتی جاف بەسـەر ئێلی مەحموود پاشا ئەمیری عەبدوڵڵا پاشـا بوو وەسـمان پاشـا کە لەسـەر ئێلییەوە بوو بە ئاقمقام لە ئێڵ و برا و لە هەڵەبجە لە سایەی سەڵتەنەتی خانمدا بەختیار ژیا».

پیرەمێـرد تەنها ئەم بەشـەی لە زنجیرەی مێژووی جاف و مەحموود پاشـا بڵاو کردۆتەوە، لەوە دەچێت لەبەر سەرقاڵی و زۆری بابەتی ڕۆژنامەکەی لە یادی چووبێت ئەم زنجیرەیە تەواو بکات و تەواوی مەبەسـتە مێژووییەکە بدات بەدەسـتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا ئەو بەشە کەمە

گرنگییەکی زۆری لە مێژووی هۆزی جافدا هەیە.



مەحموود پاشای جاف ساڵی ١٨٧٨ز ئەودەمەی لە سوڵتانی عوسمانی یاخی بوو و بەو جلوبەرگەوە لە ئەستەنبوڵەوە رایکرد و لە شاری «باکۆ» ئەم وێنەیەی گرتووە.

## تەمەن و ساڵی لەدایکبوونی مەحموود پاشا و کۆچی دوایی

لە ئەنجامی ئەو زانیارانەی ئێمە بەدەستمان هێناوە مەحموود پاشا -٧٥- یاخود -٧٧- ساڵ ژیاوە، مێژوونووس -ئەمین زەکی بەگ- نووسیویە: ساڵی -١٢٦١-ی کۆچی واتە -١٨٤١-ی زایینی لە دایک بووە، عەلائەدین سەجادی لە مێژووەکەیدا نووسیویە -١٨٤٦- لە دایک بووە، هیچ کامیان جێگای لەدایکبوونەکەی نەنووسیوە، هەروەها ئەمین زەکی ساڵی -١٣٣٨-ی کۆچی بە ساڵی کۆچی دوایی داناوە واتە ساڵی -١٩١٨-ی بە ساڵی کۆچکردنی داناوە، بە بڕوای من ئەو مێژووەی کە مامۆستا سەجادی دایناوە نزیکتر و راستترە و دەکرێت پشتی پێ ببەستین. پاشا لە شاری هەڵەبجە کۆچی دوایی کردووە و لە قزرابات لەو مزگەوتەدا کە خۆی دروستی کردبوو بە خاک سپێرراوە.

## مەحموود پاشای شاعیر

گومانی تێدا نییە کە یەکێکی وەک مەحموود پاشا زەوق و حەز و ئارەزوویەکی ئەوەندە زۆر و بێ سنووری لەگەڵ شیعردا هەبووبێ دیارە ئەگەر شاعیرێکی گەورەش نەبووبێ هەر دەبێت کۆمەڵێ شیعری بووبێ، ئەم گومانە مایەوە و چەندین بیروڕا هەبوو لەسەر ئەوەی کە ئایا مەحموود پاشا شیعری هەیە؟ دەبێ چەند شیعری هەبێ؟ هەتا ئەم دواییە کە چەند کەشکۆڵێک دەستاو دەست هاتوو گەلێ کەس بە وردی کەوتە خوێندنەوە و تاوتوێکردنیان وەک کەشکۆڵی -کەریم بەگی فەتاح بەگ و رەزا بەگی فەتاح بەگ- کە بەخەتێکی خۆش شێوەیەکی جوان سەدەها شیعری مەولەوی و وەلی دێوانە و بێسارانی و خاناو...هتد. لەو کەشکۆڵانەدا نووسراوەتەوە، زۆربەی شیعرەکان شیعری شاعیرانی ناوچەی هەورامانن، لە ریزی ئەوانەدا شیعرێکی مەحموود پاشا هەیە، کە بەو شێوە زمانە نووسیویەتی شیعرەکە شیوەنی مەحموود پاشایە بۆ مەرگی براکانی بەڵام ئەم شیعرە بە هەڵە لە -دیوانی پیرەمێردی محەمەد رەسول هاوار- دا دراوەتە پاڵ پیرەمێرد و لە لاپەڕە -٣٣٨- دا بڵاو کراوەتەوە، بە ناونیشانی -یادی مەحموود پاشای جاف- کە گوایە پیرەمێرد ئەو شیعرەی لە یادی مەحموود پاشادا وتووە، وە پیرەمێرد لە شێوەی گۆران- هەورامییەوە وەریگێڕاوەتە سەر شێوەی سلێمانی و دەستکاری شیعرەکەی کردووە.

مەحموود پاشا شەش برای هەبووە کە بریتین لە: وەسمان پاشا، حەسەن بەگ، حەمە عەلی بەگ، سلێمان بەگ، فەتاح بەگ، قادر بەگ. ئەم قادر بەگە ئەوە نییە کە مەولەوی شیعرێکی شین و لاواندنەوەی زۆر بەرزی لە کارەساتی کۆچکردنیدا وتووە، بەڵکو ئەمیان برای مەحموود پاشا بووە قادر بەگی لای مەولەوی مامی مەحموود پاشا بووە، شیعرەکە خۆی بیست و پێنج بەیتە پیرەمێرد لە وەرگێڕانەکەدا کردوویە بە نۆزدە بەیت، وە هەندێ دەستکاری تێدا کردووە،

مەحموود پاشا لە شیعرەکەیدا ناوی هەرسێ براکەی نووسیوە کە شیوەنی بۆ کردوون، کە بریتین لە فەتاح بەگ، حەسەن بەگ، قادر بەگ و مەحموود پاشا کوڕە گەورەکەی حەمە پاشای جاف بووە لە دوای هەر شەش براکەی کۆچی دوایی کردووە لێرەدا دەقی شیعرەکەی مەحموود پاشا و وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد دەنووسین:

**وادەی خێڵە و خوار ئێلاخ بێزانەن**
**وادەی گەرمەسێر سەحرای شیروانەن**
**براکانم هیچ کەسیان نییەن دیار**
**وەک جاران سوارین بۆ راو و شکار**
**هانا هاسێ بەور، سێ نامدارم رۆ**
**سێ پڵەنگ هیممەت شێر کردارم ڕۆ**
**سێ شاهێن، سێ باز، شیروان ماوام ڕۆ**
**سێ بڵەن نەهیب، وەقت داوام رۆ**
**سێ -سەعد وەقاص- سەر ئاوردەم رۆ**
**سێ رم نەزوڵفان داخان بەردەم رۆ**
**ئیلاّ -سولەیمان- ئەو بێ ئەندێشە**
**ئەو جەهد و غیرەت عەداوەت کێشە**
**ئەو شمقارِ شۆخ نەریمان شیعە**
**ئەو مەرد مەیدان بێ خەوف و بیمە**
**ئەو شۆڕە سوارە گورجی نەزینە**
**ئەو حاتەم هیممەت سەدر نشینە**
**هاڕەی یەدەکان نیهاش وەتاو بی**
**سەر زەمین بە عەشق هات هات ڕاو بی**
**ئیستە نادیار رووی سەر بیساتەن**
**تالعیش نەگێج نەر نا هاتەن**
**نە ئەو فەتاح بەگ ئەو رۆستەم ڕەنگە**
**ئەو پیلەتەن تەن بورز و نەهەنگە**
**ئەو هەڵۆ هیممەت قەهار قینە**
**ئەو دەست و بازووی شۆخ و رەنگینە**
**سەرتاپا تەیار وێنەی فلاّمەرز**
**جەسەهمش ماتەن زەوارەی گۆدەرز**
**ئیستە نادیار دەشتی شیروانەن**
**داخ ئەو سەرمەشق کول دەورانەن**
**نەنە حەسەن بەگ ئەو نەو جوانە**
**ئەو شێوەی شیرین، ئەو میهرەبانە**
**ئەو میرمەزن ئەو تووڵ لاوە**
**ئەو باهوو بەدەن ئەو چەرخ چاوە**
**ئەو فەغفور نەژاد مانشووری جەعام**

**دنیای پڕ مەینەت وەنەش نە داکام**
**نەنە قادر بەگ ئەو تەیار شەختە**
**ئەو کەس بێ کەس یانەش دەربەستە**
**خانمان خەریک نەهاتی دەردەن**
**ئێش فەتاح بەگ عەلاوەی گشتەن**
**جەزوبان لاڵ بم کەچەن کارتان**
**مەندەن وەبێ سەر دەستی سوارتان**
**فەڵەک هانە فیکر سەودای مەکروفەن**
**خاک وەبێ زنجیر شێر مکەرۆبەن**
**دەی کی بۆ چیرەنگ سایە نیشانتان**
**هۆردارۆ ماردم ئاتەش ئەفشانتان**
**وەڵڵا ئەو فەڵەک براییش ممەرد**
**یاچون تۆ ئاه سەرد مکەرد**
**ئەویش سفتەی جەرگ وێش مشنەفتەوە**
**تا ئەبەد جەمەرگ دوور مکەفتەوە**
**برا جوون فەڵەک کەسش نەمەردەن**
**مەرگ جوانان وەعادەت کەردەن**

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

**وادەی خێڵە و خوار، ئێلی جافانەن**
**دەمی گەرمەسێر دەشتی شیروانەن**
**لە براکانم کەسیان نییەن دیار**
**وەک جاران سواربن بۆ راو و شکار**
**هانا برایان شوێن نادیارم رۆ**
**سێ پڵنگ هەیبەت شێر شکارم رۆ**
**سێ شاهین، سێ باز، شیروانی ماوا**
**فەڵەک لە زۆریان کەوتبووە داوا**
**ئای سلێمان بەگ عەدالەت پیشە**
**لەو دێوی کێوی قاف بێ ئەندێشە**
**ئەو شۆڕە سوارە زیننەتی زینە**
**ئەو حاتەم هیممەت سەرحەد نشینە**
**چابوک سواری بەناو و داو بوو**
**لە شیروانەدا هات هاتی ڕاو بوو**

**ئێستا نادیار سەر ڕووی بیساتە**
**لە دوای ئەو عەشرەت ڕووی لە نەهاتە**
**هێجگار فەتاح بەگ ئەو ڕۆستەم ڕەنگە**
**ئەو پیلەتەنەی شێوەی نەهەنگە**
**ئەو شاباز هیممەت ئەو هەڵۆ قینە**
**ئەو شانو باهو سەهم ڕەنگینە**
**سەرتاپا بڵند وێنەی فەرامۆش**
**ئەهاتە لەرزە لە نەعرەی ئەلبورز**
**ئەوی تیانییە دەشتی شیروانە**
**بۆیە لەلای من چۆڵ و وێرانە**
**ئاخ بۆ قادر بەگ دۆستی مەولەوی**
**گەردن کەچی بوون شێری سەر زەوی**
**هەر ئەو زانیویە شینی بۆ بکا**
**هەر بەیتێک جامی فرمێسک لە تەکا**
**خانمان خەریک شین و هاوارە**
**داخی فەتاح بەگ لەسەر گشت بارە**
**ئاخ لاڵ بم لە کوێن شۆڕە سوارانیان**
**بێدەنگ و ئاهەنگ گەلی یارانیان**
**بەو خوایە فەلەک گەر برای ئەمرد**
**بە ناڵە دنیای هەراسان ئەکرد**
**دەستی نەئەچووە مەرگی جوانانمان**
**وێران نەئەبوو جێی خان و مانمان**
**خۆی کەسی نییە و جەرگی بێ ئێشە**
**مەرگی مەردانی کردووە بە پیشە**

دوای خوێندنەوەی ئەم شیعرە دەتوانین بڵێین، هەر چەندە مەحموود پاشا وەک شاعیرێک نەناسراوە و شیعرەکانی ناگاتە وردی و وەستاکاریی شاعیرێکی وەک مەولەوی بەڵام سۆز و دارشتنێکی شاعیرانەی تێدایە و هەر دێینەوە سەر ئەوەی کە بڵێین لەوە ناچێ کە مەحموود پاشا هەر ئەم شیعرەی هەبووبێ و من دڵنیام گەلێ شیعری هەبووە بەڵام یا خۆی نەیویستووە بڵاوبنەوە یاخود لە ماوەی ئەم هەموو ساڵانەدا فەوتاون و لەناوچوون.

لە لایەکی کەشەوە دڵسۆزیی مەحموود پاشا بۆ شیعر و ئەدەبی نەتەوەکەی بە ڕادەیەک بووە کە شیعری هەموو ئەو شاعیرانەی کۆکردۆتەوە و نووسیونیەتەوە و لە خۆی بە پێشتری زانیون، ئەمە لە لایەک، من ئەم زانیارییەم لە یەکێک لە نووسینەکانی نووسەری جوانە مەرگ «ئومێد ئاشنا»وە وەرگرتووە روح و رەوانی شاد.

# پەیوەندی نێوان پیرەمێرد و مەحموود پاشای جاف

پیرەمێرد لە سـەرەتای تەمەنی لاویی خۆیدا، واتا پێش ڕۆیشـتنی بۆ ئەسـتەموڵ، لە نزیکەوە مەحموود پاشای ناسیوە و تێکەڵی و هاودەردی و هاودەمییەکی زۆر لە نێوانیاندا هەبووە.

ئینجـا ئەوەنـدەی کـە پیرەمێرد مەحموود پاشـای بە گـەورەی جاف و پیاوێکـی زانا و دانا زانیـوە، مەحمود پاشـاش پیرەمێردی بە لاوێکـی زیرەک و هەڵکەوتوو داناوە، بۆ ڕاسـتیی ئەمە متمانـە و باوەڕپێکردنی مەحمود پاشـایە بە توانای ڕۆشـنبیریی پیرەمێرد لـەوەدا کە مەحموود پاشـا پرس و ڕای کۆنگرەی زەڵم و دانانی پەیڕەو و یاسـای کۆنگرەکە بە پیرەمێرد دەسـپێرێ کـە بەنـدە سـەرەکییەکانی دابنێت و تەواوی ئەم باسـە مێژووییە لـە دوای کەمێک باس دەکەین ئێسـتا با تەماشـایەکی یاداشتەکانی پیرەمێرد بکەین، هەتا بزانین ئەم شاعیر و نیشتیمانپەروەر و ڕۆژنامەنووسە گەورەیە لە بارەی مەحموود پاشاوە چی بۆ نووسیوین، پیرەمێرد دەنووسێت:

«زۆر جار لە خزمەتی مەحموود پاشـادا بووم، کەشکۆڵەکەیشـم لەلایە، کە بە ئاخ و داخەوە تەئریخی مەرگی براکانی تیا نووسـیوە خۆم کوڵەباڵی کورکم لەبەر مەحموود پاشـادا دیوە کە بۆ ڕاو لەبەری ئەکرد، پێڵاویش خۆ دیارە کەوش بوو.

ئێمـە باسـی حەیاتی ئەدەبی مەحمود پاشـا ئەکەیـن، زۆر کەس هەن کە ئەم سـەرلەوحەیە ئەبینـن هەڵدەوەسـتنەوە! مەحمود پاشـاو حەیاتی ئەدەبی؟! چونکو تا ئێسـتا کـە وتبێتیان جاف کوردێکی خێمە نشـنین، سـەحرا نەوەردک خێڵە و خوار و خێڵە ژوور، سـوار ماینی ڕەسـەن و تفەنـگ و فیشـەک و تیپی سـوارە و ئاژەڵی زۆری ڕەوگ و ڕانی هاتۆتـە خاترەوە هەرچەند لەم دواییەدا یەکدوو کەسـێکی شـاعیر لە نـەوەی بەگزادە پەیدا بوون، ئەوانـە لەناو جافدا پەروەردە نەبـوون، کوڕە قائمقام بوون، لە مەرکەزی قەزادا، بەڵام مەحموود پاشـا بە هەموو مەعنایەکەوە سەرداری عەشرەتێ بوو سوار چاک و سیلاح شۆڕ و جەنگ ئاوەر و هەمیشە لەگەڵ کاروباری عەشائردا خەریک بوو بە خەیاڵی کەسدا نەدەهات مەحموود پاشا ئەم خزمەتە گەورەیەی کردبێ، تا وەفاتی کەسـێ نەیزانیبێ، لە سلسـلەی هەموو حوکمدارانی - بەبە - و نامدارانی ئەم خاکەوە تا ئەمڕۆ کەسـێ نەبوو بەقەد مەحموود پاشـا عومری خۆی لە خۆشـی و تاڵی و دەربەدەری و فیراری ئەستەمولدا، لە کۆکردنەوەی ئەشعاردا و ئەدەبیاتی کوردیدا خەرج کردبێ، لەو تەئریخەوە دسـتی قەڵەمی گرتووە، تا وەفاتی بەخەتی خۆی هەرچی ئاسـاری کوردی هەیە نووسیویەتیەوە،

ئەوەندەیش بە سەلیقە و دیققەت نووسیویە لەو هەموو ئاسارە بگەڕێ غەڵەتێکی تیا نییە، خەتێکی خـۆش خوێــن، نازانــم لەم هەموو کاری حکوومەتی و عەشـائری و دەوڵەت و حسـاباتی خۆیدا چۆن پەرژاویەتیە سەر ئەمانە، دیوانی –سالم–ی لێرە نووسیوەتەوە، لە ئەستەموڵ لای –ئەحمەد کامـل–ی نـازری گومرگ کە کوڕی –وەسـمان موراد– بوو نوسـخەیەکی تری دەسـتکەوتووە، دیسـان بەخەتی خۆی نا تەواوییەکانی نووسـیوە سێ سـاڵ من بە شوێن نوسخەیەکی مەولەوی دا گەڕام، دەسـتم نەکەوت، کەچی هەرچی مەولەوی وتوویە ئەو قەیدی کردووە، حەتتا ئەوی بە خەتی خۆی بۆ ئەوی نووسیوە عەینەن چەسپاندوویە بە کەشکۆڵکەیەوە.

با ئێستا زۆر دوور نەچین دیوانی سالم، کوردی، نالی، مەولەوی، بە تەواوی ئاساری خانای قوبـادی، ئەحمەد بەگی کۆماسـی، بیسـارانی، فەخرەدین عولەماء، مەلا وەڵەدخـان، وەلی دێوانە، حەمــە ئاغـای دەربەند فەقەرە، حەسـەن کەنۆش، جنوونـی، زەڵمی، سـەرعی، ڕەنجووری، والی غولام، شاخان، میرزا یوسف، میرزا یاقو، شەفیع، نەجەف، مەولانا خالید خانەگایی، مەلکە کلاشی، قەمەر عەلی، عەبدولخالقی پاوە، داخی، زەنووری، مەلا ساڵحی تەڕەماری، شێخ مستەفای شەهاب، میرزا مووسـا، وەلحاسـڵ ئەمانە هەمووی خۆی نووسیونیەوە. بەڵام درێغ و واوەیلا ئەو هەموو سـەروەتی بێ سـامان و موڵکی ڕووی جیهانەی بەجێهێشـت یەکێ تەنها بۆ ئەمەی ئەم ڕەنجەی بەبا نەڕوا چاپی نەکرد.

مەحموود پاشـا کتێبی ئەوتۆی بووە فرۆشـراوە بە شەش سەد ڕوپیە و لە قەشقەی بەغداوە تا حدوودی عەجەم موڵکی بەجێ هێشـتووە، لای خوێندەواران و قەدر شوناسـان ئەو خزمەتەی ئەو کردوویە لە هەموو ئاساری بابان و ئەردەڵان پێشترە.

وەک پێشـتر باسمان کرد مەحموود پاشای جاف مرۆڤێکی نیشتیمانپەروەر و دڵسۆزی خاک و نەتەوەکەی بووە، ئەو هەموو خزمەتانەی پێشـکەش بە نەتەوەکەی خۆی کردووە ڕاسـتی ئەم بیروڕایە دەسەلمێنن، مەحموود پاشا تەنیا بەرپرسیار و سەرەک هۆزێکی گەورەی کورد نەبووە بەڵکـو خـۆی بە بەرپرسـیار و خزمەتگوزارێکی نەتەوەکەی زانیوە، بـە تایبەتی کە چەند جارێک سـەری لە مەڵبەندە ڕۆشـنبیرییەکانی ئەو سەردەمە داوە وەک ئەستەموڵ و ڕوسیای ئەو کاتە و بەغدا و گەلێ شوێنی شارستانی، کە ئەمە لە خۆیدا بیری نیشتیمانی و نەتەوەیی ئەوی بەرفراوان و پتەوتر کرد.

ئەوەبوو کاتێ لە پلەی – موتەسـەرف–یەتی شاری ئورفەی تورکیا گەڕایەوە بۆ کوردستانی عیراق و لە کەمتوانایی دەسـەڵاتی دەوڵەتی عوسـمانی گەیشتبوو، دەیویست دەسەڵاتێکی کوردی دابمەزرێنـێ و بـۆ ئەمەش هەنگاوی گەورەی نا و لە کەنـاری زەڵم بە ئامادەبوونی هەموو پیاوە بەناوبانگەکانـی کورد کۆنگرەیەکی گەورەی بە سەرپەرشـتی خۆی پێکهێنا و بەرنامە و یاسـای تایبەتی بۆ ئەو دەسـەڵاتە دانا، لەلایەکی تریشـەوە ئەگەرچی ئەم هەوڵە مەزنەی مەحموود پاشـا سـەری نەگـرت، بـەڵام بوو بە جێی شـانازی بۆ ئەو پیـاوە گەورەیە و جێی ڕێـزی نەتەوەکەی هیوادارم مێژوونووسـانی کورد لە دەرگای ئەم کورتە زانیاریسانەی ئێمەوە بتوانن بچنە ناو ئەو باسـە مێژووییەوە و زیاتر ڕۆشنایی بخەنەسەر، ئەوا لێرەدا سەبارەت بە مەحموود پاشای جاف کۆنگرە پڕ بایەخەکەی زەڵم تەماشای یاداشتەکانی پیرەمێرد دەکەین کە نووسیویەتی:

هەر سـەبارەت بە کورد و ئەو کۆنگرانەی بۆ دەستخسـتنی مەوجوودیەتێک بۆی بەستراوە، کۆبوونەوە گەورەکەی کەنار زەڵم و هەوڵی مەردانەی مەحموود پاشام دێتەوە بیر، ساڵی -١٨٨٩- لە هەڵەبجە لەسـەر ئەرازی –سـەنیە- بووم، زۆرتر مەحەبەتی مەحموود پاشـام بوو، ئەگەرچی وەسـمان پاشا قائمقام بوو، مەحموود پاشـایان کردبوو بە -موتەسەرفی-ی ئورفە نیازی نەبوو بچی، تا شـەوێکی ٢٥ی رەمەزانی ١٣٠٦- لە کەناری زەڵم مەحموود پاشـام ئیقناع کرد کە بچێ بۆ ئەستەموڵ.

هەر ئەو شەوە سوار بوو رۆیی، چەند ساڵ دوای ئەمە گەڕایەوە بە بەری باکووردا هاتەوە و دنیای تەرەبە کرد لە -١٥ی شەوالی ١٣٠٨- و - یەکی مایسی ١٢٠٩- چووەوە، ئەمجا بە عەفوو ئیعـادەی روتبە و نیشـانەوە لە -٢ی جەمادی یەکەمـی ١٣١٢- دا هاتەوە، لەم هەموو تەجرەبە و چاو پێکەوتنە نەگبەت و سەعادەتەدا هاتبوو بە خەیاڵیا کە حکومەتی عوسمانی حوکمی نەماوە و ئەو ئیدارەیەک تەشـکیل بکات، بەو خەیاڵەوە هەرچی ناودار و سەر کۆماری کوردستانی ئەملایە کۆی کردنەوە و لە کەناری زەڵم کۆنگرەیەک بەسـترا، زۆر ئومێدی بە من بوو قانوونی ئیدارە و تەشـکیلی حکومەتە تازە پێگەیشـتووەکانی بۆ کۆبکەمەوە و بیکەن بە دەسـتووری ئیدارە، منیش لە هەموو تەرتیباتێکدا ئوسـووڵی - فیدراسـیۆن-ی - برنسـی بسـمارک -م پەسەند کردبوو کە تەشکیلاتی ئەساسیەی -جاف- عەینی ئەو قانوونە بوو، تا دوایی رۆژ بانگی کردم فەرمووی «بێنە بزانم چیت هێناوەتە قەڵەم؟» منیش وتم «پاشـا بەخۆڕایی خۆم ماندوو ناکەم»، زۆر تووڕەبوو، ناهەقیشی نەبوو، دوایی عەرزم کرد «پاشا تەشکیلی ئیدارە سەهلە و قانوون نامەکەیشی حازرە، بەڵام لێکی بدەرەوە کێ دەبێتە رەئیسـی ئیدارە، سـلێمانی لە ئیبتیدای تەشـکیلیەوە هەرچی ئەبوو بە حکومدار برا بچووکەکەی دەری ئەپەڕان، راوەسـتە تا هۆشی برایەتی و یەکیەتی دێتە کەلەوە ئەوسا سەهلە»، هەناسەیەکی هەڵکێشاو وازی هێنا(١٧).

## مەحموود پاشا و سەرچاوەیەکی روون لەبارەی کەشکۆڵەکانییەوە

زۆرجار ناوی کەشکۆڵەکانی مەحموود پاشای جاف دەبیستین و گەلێ دەقی شیعر و زانیاری گرنگمان لەو کەشکۆڵانەوە دەست کەوتووە، خوێنەری وریا هەست دەکات، ئەم کارەی مەحموود پاشای جاف کە ناو و بەرهەمی ئەو هەموو شاعیرەی بۆ تۆمار کردووین و لە فەوتاندن و کەمی و ناتـەواو رزگاری کـردوون چەنـدە خزمەتێکی گەورەیە بە ئەدەبی کـوردی و چۆن بۆ هەموو سەردەمێک دەبێتە گەنجینەیەکی مێژینەی رۆژگارێکی ئەم ئەدەبە بەرز و جوانە، ئینجا بۆ ئەوەی لە سەرچاوەیەکی روونەوە ئەو زانیارانە بە دەست بێنین سەبارەت بە ژیانی ئەدەبی و زۆر لایەنی گرنگ و شـاراوەی کەشـکۆڵەکانی مەحموود پاشا، ئەم بیر و رایانەی بەڕێز عەلی بەگی حوسێن بەگی جاف تۆمار دەکەین، هیوادارین لە داهاتوودا کۆیان بکاتەوە و سەبارەت بە مێژووی هۆزی

جاف و مەحوود پاشا و کەشکۆڵەکانی بەرهەمێکمان پێشکەش بکات.

عەلی بەگ لەم بارەیەوە نووسیویە: مەحموود پاشای جاف کوڕە گەورەی حەمە پاشای جاف بووە، حەوت برا بوون.

بە پێی ناوچە و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و دیمەنی جوان و ڕەنگینی کوردستان بە تایبەتی ئەو هێڵ و ناوچەیەی هۆزی جاف تیایدا ئەژین و لە کاتی خۆیا تاوەکو ئەم ساڵانەی دواییەش گەرمیان و کوێستانیان تیا ئەکرد، لەناوچەی قزرەبات و کفری لای سەرەوەی ناوچەی مەریوان و دامێنی هەرێمی سنە جوانترین ناوچە ئەژمێردرێت لە وەرزەکانی ساڵدا چونکە چ کاتێ ئەم ناوچانە جوان و ڕەنگین و دڵگیر بوون ئەمان لەو کاتانەدا تیابوون و هاتوچۆیان تیاکردووە بە وێنە گەرمیان لە زستاندا جوان و خۆشە تیابوون شارەزوور لە بەهار و پایزدا ڕەنگین و کانی خێر و پیت و بەرەکەت بووە. کوێستانیش لە هاوینا ڕەنگین و دڵفڕێن و دڵگیر بووە، کاتیان تا بەسەربردووە و هەر لە کۆنیشەوە لە پێش ئەوەی بەگزادەی جاف و هۆزەکەیان بێنە بەشی عوسمانی لە کوردستانی عیراق لە ناوچەی جوانرۆ و باوەجانی و قوبادیا کە لە بنەچەدا یەک پشتن ئەو ناوچانە بە بە بەهەشتی سەر زەمین دائەنرێن و ئیتر چ لە کۆن و کەلەپوور و بنەڕەتە و چ لە شێوەی تازەیشا لە ناوچەیەکدا ژیاون هەڵخەڕی بیری ناسک و بەجۆش و خولیای ئەدەب و ئەدەب دۆستی لە ناخی دەروونیانا و لەناو ڕەگ و هەست و دەماریانا گەشەدار و جێگیر بوو. لە لایەکی تریشەوە بە پێی دەست ڕۆیشتوویی و دۆخی ئەو سەردەمە بە پێی پلەی کۆمەڵایەتییان کە پەیوەندییان هەبووە بە بابان و ئەردەڵانەوە لە کۆن و بە ئێران و عوسمانییەوە لەو سەردەمەدا و باری خوێندن و خوێندەواری ئەو سەردەمەیش لە سەرتاوە منداڵ گۆش کراوە بە ئامۆژگاری و شیعرەکانی حافز و سەعدی و کلیم و شاعیرانی ناوداری ئەوسا و ئێستایش و ئەو مامۆستایانەی کە کوڕە بەگزادەکان لایان خوێندوویانە بە هەڵکەوتوو و بلیمەتی سەردەمی خۆیان ژمێردراون لەبەرئەوە بووە کە منداڵێک بەو جۆرە لەم ناوچانەدا و لەو چوارچێوەدا پەروەردە دەبێت چۆن خولیای ئەم جۆرە شتانە ناکەوێتە سەری و ئەبێت بۆچی خۆی پێوە خەریک نەکات؟!

من لە باوکم بیستووە ئەیوت: کاتێ بەگزادەی جاف گەرمیان و کوێستانمان ئەکرد لەگەڵ جافدا کوڕە بەگزادە شەوانی هەوار و ڕێ کۆچ کاتی خۆمان بە شەڕە شیعر و قسەی خۆش و نەستەقەوە بەسەرئەبرد، کتێبە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەمان ئەخوێندەوە، ئەبووین بە دوو دەستە، شەڕە شیعرمان ئەکرد و کاتی وابوو هەوارە و هەوار بەردەوام ئەبوو هیچ لایەک لایەکەی تری بۆڕ نەئەدا، ئەوەندە شیعریان لەبەر بوو، هەروەها بێجگە لەمانەش بە بیری من پەیوەندی بەگزادەی جاف لەگەڵ زانایانی ئەو سەردەمەی کوردستان و تێکەڵی و کارتێکردنی ئەدەبی ئەودیو و بوونی کەشکۆڵی کۆن وای لێکردوون نەک هەر تەنیا مەحموود پاشای جاف کەشکۆڵی بێت، بەڵکو ئەوانەی من بزانم، کەریم بەگی فەتاح بەگ و عەبدولقادر بەگی سلێمان بەگ و ڕەزا بەگی فەتاح بەگ کە هەرسێکیان برازای مەحموود پاشان کەشکۆڵیان هەیە و من دیومن.

نەک هەر تەنها ئەمانە بەڵکو بارودۆخی لەباری ئەو سەردەمە تایبەتییە وای لە دەور و پشتی بەگزادەی جاف کردووە هەتا یەکێکی وەکو حاجی مەحموود یار وەیس پیاو ماقووڵی مەحموود پاشا ئەویش کەشکۆڵی هەیە و من دیومە.

کەشــکۆڵەکەی مەحمــوود پاشــا هەتــا خۆی لــە ژیاندا بــووە لای خۆی بووە هەتــا لە کاتی دەستبەســەری و ئاوارەییا هەر پێی بووە و ئەو شــیعر و باس و خوازانەی تیا نووسیوەتەوە، بۆ وێنــە کە لە ئەســتەموڵ هەڵدێت و دەچێتە خاکــی رووس و لەوێوە بۆ ئێران ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ کوردســتان، لە -باکۆ- لە بەرگی ســیاحەت و گەشــتا حەتتا مەلا محەمەدی سنەیی پیاوی بووە ئەو جلی باشــی لەبەرکردووە و خۆی بەرگی خراپ وەکو خزمەتچی ئەو تاکو نەیناســن. لە باکۆ وێنەی خۆی ئەگرێ و لەژێریا ئەم شیعرەی مەولەوی ئەنووسێ:-

**داخۆ چەرخ چەپ چەواشەی چەپگەرد**
**پەی کام دەردی سەرنگەهداریم کەرد..؟**

دوای خۆیشــی، وەک لە خوالێخۆشبوو -حەسەن فەهمی بەگی جافی کوڕەزایم بیستووە- کە عەلی بەگی باوکی حەسەن بەگ کۆچی دوایی ئەکات کەشکۆڵەکە ئەکەوێتە دەستی حوسێن بەگی مامــی ئەویش لەبــەر ئەوەی کەمتر تاقەتی ئەو جۆرە شــتانەی بووە، پیرەمێــرد بە ئەمانەت لێی وەرئەگرێت، دوایی حەسەن بەگ وتی ئەو کاتە کە باوکم وەفاتی کرد تەمەنم -١٦-١٧- ساڵ بوو بەڵام وا نەبووم کە زۆر خۆم بەمانەوە خەریک بکەم، هەرچەند کەشکۆڵەکەم ئەخوێندەوە لەکاتی خۆیا خووم لەگەڵیا بوو بەڵام لەبەر مامم ئەوەندە لەسەری نەرۆییم تاکو لە سەرەتای سییەکاندا هەســتم کــرد و داوایم کــردەوە، ئەویش ئەمرۆژ بۆ ئەورۆژ کاتی بەســەر ئەبرد و منیش وەڕس بووم ناچار هادی ئەفەندیی خوشــکەزای پیرەمێردم راســپارد و لەگەڵیا رێککەوتم بە ٢٠ دیناری ئەوکاتە بۆم بێنێتەوە بەوجۆرە دەســتم کەوتەوە. لەوکاتەیشەوە هەر لای حەسەن فەهمی بەگ و ئەویش هەموومان ئەزانین یەکێک بوو لە هەرە ئەدەب دۆســت و ئەدیبە ناســەکانی کورد، هەتا لە شەوق و تەوژمی ئەدەب و ئەدەب دۆستیا شیعریشی هەیە، ئێستاش دوای مەرحومی حەسەن بەگ لای هۆشمەندی کوڕیەتی کە تەمەنی درێژ و بەختەوەر بێت، زۆر لە ڕەوشتی پاراستنی ئەو جۆرە شتانەی لە باوکی و باپیرەیەوە بۆ ماوەتەوە و پاراستوونی، بە تایبەتی کتێبخانە گەورەکەی باوکی کە ئێستاش لایەتی و خەڵک زۆر کەڵکی لێ وەرئەگرێت.

کەشــکۆڵەکانی مەحموود پاشــا تەنها لە ئەستەموڵ و زمناکۆ نەنووســراونەتەوە بەڵکو پاشا بــۆ هەر کوێ چووبێت کەشــکۆڵەکەی لەگەڵ خۆیــا بردووە، بۆ وێنە بە ئەرمەنســتاندا تێئەپەڕن مەلا محەمەدی ســنەیی پیاوی شاعیر بووە و کچە ئەرمەنی جوانیان دیوە هەندێ شیعری جوانی وتووە، ســێ چوار بەیتێکی کە مەرحومی باوکم لە بیری مابوو نووسیومەتەوە هەر لەلامە»(١٨). ئەمە ئەو زانیارییە پڕ نرخ و بایەخەی عەلی بەگە سەبارەت بە کەشکۆڵی مەحموود پاشای جاف و گەلێ لایەنی شاراوەی بۆ دۆزینەوە هەروەها بەڕێزیان ئەوەندە دڵسۆزی شیعر و ئەدەبی کوردین کە هەر نووسەرێک ویستبێتی لەم بارەیەوە بنووسێت ئەوا یارمەتی داوە.

# مەحموود پاشای جاف لە یادەوەرییەکانی زێوەردا

شاعیری نیشتیمانپەروەر و خاوەن سرووده بەرزەکانی قوتابخانەکانی کوردستان مامۆستا زێوەر لە یاداشتەکانی خۆیدا گەلێ زانیاری نوێ و بەڵگەی بە نرخی لەبارەی مەحموود پاشای جافەوە بۆ تۆمار کردووین، زێوەری شاعیر گەلێ جار لە کۆڕی ئەدەبی و لەتەک گەورە پیاوانی بەگزادەی جافدا ئامادە بووە و لە نزیکەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووە و ئەو ڕووداوانەی کە بۆیان گێڕاوەتەوە و ئەو سیفەتە جوانانەی مەحموود پاشای هەموو تۆمار کردووە. ئێمە لێرەدا نەمانتوانی هەرچی کە زێوەر سەبارەت بە مەحموود پاشا یاداشتی کردووە بنووسین، یەکەم لەبەر ئەوەی باسەکەمان زیاد لە ڕادەی خۆی بەرفراوان دەبێت و دووەمیش ئەو بڕگانەمان هەڵبژارد کە زۆر گرنگ وە لە جێگای دیکەدا دووبارە نەبوونەتەوە.

زێوەر نووسیویە: «مەحموود پاشا زاتێکی بە ئیعتیبار، بە تاعەت، بە عیبادەت، بە ئیحسان، بە ئینعام، بە عەدالەت و بە حوکم بوو، عادەتی وا بوو کە نوێژی بەیانیانی ئەکرد لەسەر بەرماڵ هەڵنەدەستا، قورئان و دەلایلی ئەخوێند هەتا هەتاو گەرم ئەبوو، ئەوسا سوننەتی ئیشراقی ئەکرد، لەپاش وێرد و سوننەتکردن و قورئان خوێندن تەشریفی ئەهاتە مەجلیس، سەماوەر حازر بوو، میوانی سوسووسی لە خزمەتیا کۆئەبوونەوە، ئیش و کاری عەشایر ئەگەر ببوایە ڕێکئەخرا.

ئەم زاتە دوو دەفعە لە تەرەف سوڵتان عەبدولحەمیدەوە تەکلیفی وەزیری لێکرا، قبووڵی نەکرد، مانگی پەنجا لیرەی لە تەرەف حکومەتەوە هەبوو، ئەو مەعاشەی بۆ تەخسیس کرابوو کە ئیتاعە بە حکومەت بکا، با وجود عەقیدەی کورد ئەوسا وابوو کەسێ بچێ بەگژ حکومەتا و خەلیفەی ئیسلاما کافر ئەبێ، وەئیللا مەحموود پاشا ئەیتوانی لە هەورامانەوە هەتا مووسڵ داگیری بکا، لەگەڵ ئەو هەموو نفووزەی وەک شەخسێکی بێ دەسەڵات تابیعی ئەمری حکوومەت بوو سەبەبیش دیانەت بوو. لە خسووسی ئیحساناتەوە من لە سەد پێنجی نازانم، هەر ئەوە مەشهوور و لەبەر چاو بووبێ نووسیومە، لە قزراباتەوە هەتا مەریوان، ئەو دێیانەی قەڵەمڕەوی

جاف بوو، مەعاش بۆ مەلا، وەقف بۆ مزگەوتەکانیان لەتەرەف پاشاوە مەعلوم کرابوو، لە نەفسی سولەیمانیدا هەموو مەلا و مودەریس و زۆر ساحێب خانەدانی لێقەوماو مووچە و بەراتیان هەبوو. جگە لەم ئیحسانە دائیمییەی هەر شێخ و مەلا و دەروێش و فەقیر کە رووی بکردایەماڵی، بە مەحروومی نەدەگەڕایەوە، هەموو ساڵێ چەند کەسێ موراجەعەتیان پێ ئەکرد بۆ چوونە حەج، پارەی حەجی ئەدانێ مەئیووسی نەدەکردن(١٩).

لە برگەیەکی کەی یاداشتەکاندا زێوەر باسی چەند رووداوی خۆش دەکات، وەک ئەوەی کە رۆژێکیان سەیدێک دێت بۆ خزمەت پاشا بەڕێکەوت دوای ئەو کابرایەکی دەهۆڵ و زوڕناژەن دێت کە لەوکاتەدا پێیان وتووە -لۆتی- ئینجا زێوەر دەنووسێت:- پاشا ئەمینداری خۆی بانگ کرد گوتی بچۆ پەنجا قڕان بۆ سەید و سەد قڕان بۆ لۆتی بێنە، سەید توورە بوو، وتی پاشا بەخوا نامەوێ، بە من کە سەیدم ئەولادی پێغەمبەر، پەنجا قڕان ئەدەی، سەد قڕان بە لۆتییەکە؟! پاشا فەرمووی «ئەو لۆتییە زەممان ئەکا، زۆر جێگا ئەچێ، لەهەرلایەک قسەیەک بکا ئابڕوومان ئەبا(٢٠)!»...

هەروەها زێوەر سەبارەت بە پیاو چاکی و کردارە جوانەکانی مەحموود پاشا نووسیویە «ئیحسان و خێراتی مەحموود پاشا زۆرە، لە گەرمیان لە کەلار لە دەکە، لە قەرەداغا لە تەکیە، لە نەفسی قەرەداغ لە زۆر جێگای تر مزگەوت و ئەوقافی هەیە. مەدرەسەیێکی لە قزراباتا کردووە وەک مەدرەسەی نیزامییەی -نیزام الملک- ئەبێ.

چاکی و مەردی مەحموود پاشا ئەوەی من بیستوومە نووسیومە وە ئیللا سەد چەندانە زیاترە، جارێک ئەچێتە بەرزنجە، ئەبینێ ئاوی مزگەوتەکەیان کەمە، دەستبەجێ هەزار قڕان تەسلیمی شێخەکان ئەکا کە کارێز کەن بخەنە سەر بیری کارێزەکەی پاکی بکەنەوە و فەرمووی ئەگەر ئەم میقدارە بەشی نەکرد جواب بنێرن چەندی لازم بوو پارەتان بۆ ئەنێرم.

مەلا عەبدولڕەحمانی پێنجوێنی کە لە عیلمی عەقلییە و نەقلییەدا هاوتای نەبوو لە پێنجوێن تەدریسی ئەکرد. ئیدارەی خۆی و تەلەبەی لە تەرەف بەگزادەی جافەوە تەئمین کرابوو. لە کۆتایی ئەم نووسینەدا سەبارەت بە مەحموود پاشا و دەوری ئەم پیاوە گەورەیە لە ژیانی رۆشنبیری نەتەوەکەیدا هیوادارم سوودێکم بە مێژووی رۆشنبیریمان گەیاندبێ و لەم بوارەدا خزمەتێکی بچووکم کردبێ.

ئەم زانیارییەم لە نووسینەکانی نووسەری جوانەمەرگ ئومێد ئاشنا وەرگرتووە.

# تایەر بەگ و زایەر بەگ

لەم رووەوە سەرچاوەی جۆراوجۆر بەدەستەوەیە، یەکێک لەوانە دەڵێت: ئەم دوو ناوبراوەلە برازاکانی سەید ئەحمەد بەگی گەورە بوونە لەگەڵ (ئەحمەد بەگ، مەحموود بەگ، عەلی بەگ) کە ئەوانە ناسراون بە بەگزادەکانی گویل و بە سەرۆکی تایفەکانی جاف ناسراو بوونە و لە شمشیری باوی ئێستادا ژیاون. تایەر بەگ و زایەر بەگ لەگەڵ روئەسای وەختدا بەشەڕ دێن و لەو شەڕەدا راودەنرێن و ناچاری کۆچکردن بۆ شارەزوور دەکرێن، بەڵام دوای حەوت ساڵ دیارە شەڕێکی تر قەوماوە و ئەمجارەیان بەگزادەکانی گەویل ناچاری راکردن دەکرێن و خۆیان دەگەیەننە دەڤەری «گەهوارە»ی گۆران و لەدواییدا بە بەگزادەکانی «یاسەمی» دەناسرێن، کە مێژوونووسی بەناوبانگ «رەشیدی یاسەمی» لەو بنەماڵەیە. بنەماڵەی گویل ئەمڕۆ پەخش و بڵاون، برێکیان لەناو عەشیرەتی سنجاویدان و برێکی تریان هەر لە شمشیردا ماونەتەوە.

# مەلا و زانایانی دەڤەری جوانڕۆ

## 1. میرزا عەبدولقادری پاوەیی:

سەرەڕای مەلابوونی شاعیریش بووە، کۆچی تیرەی شێخ سمایلی لە ناو جوانڕۆدا دەگوزەرێت کەژاوەی ژنی سەرۆکی تیرەی شێخ سمایلی لەپێش ماڵی وەکیلی جوانڕۆدا تێدەپەڕێت چەند کەسێک لەوێڕا وەستابوونە، ژنە لەکەژاوە سەر دەردێنێت و سڵاویان لێ دەکات. یەکێک لەوانە میرزا عەبدولقادر دەبێت وەڵامی دەداتەوە:

**عەلەیکە سەلام فریشتەی ئەنوەر**
**رشتەی نەقاشی حەق حەبی تواناگەر**
**وەش ئامای وەخەیر ئەی بەرگوزیدەم**
**قەدەم باوەرو وەبان دیدەم**
**ئێران و توران دنیا سەرانسەر**
**پایەندازت بۆ شولەی ناز پەروەر**
**حەلەب وەحەلقەی نیم نیگای نازت**
**بەغداد پێشکەش وەدیدەی بازت**
**من رۆژی قیبلەم سەلامم کەردەن**
**زندەگیم نەما تاوەروی مەردەن**
**قادر وێنەی تەیر بیمە دامەوە**
**تا مەحشەر منم وەر سەلامەوە**

دیارە ئەو خانمە خاوەن زەوقی ئەدەبی بووە، کە میرزا دەست بەو شیعر (في البداهة) دەکات بە دەمیەوە راوەستێت کە شیعرەکانی تەواو دەبێت ئەو خانمە پاداشتێک لە کەژاوەوە فڕێ دەدا بۆ میرزا عەبدولقادر.

### 2. مەلا مەحموودی جوانڕۆیی:

یەکێـک بـووە لە زانـا بەناوبانگەکانی ناو هۆزی جاف و مەلایەکی وا بووە لە سەرتاسـەری کوردستانەوە فەقێی بۆ رۆیشتووە. دەرسی پێ وتوون، لە بەدلیس و کوردستانی بەناو «ئێراق» و سنە و مەریوان و مەهابادەوە فەقێی بۆ رۆیشتووە، یەکێک لەوانە ئامارێکی لە قوتابیان و چۆنیەتی ئـەو مەدرەسـەیە نووسـیوە، دیارە ئەو ئامـارە وەک کتاوچەیەک بڵاوبووتەوە بـە ناوی «دلائل الخیرات» لە لایەن حەیدەری کوڕی قەنبەری کوڕی حەیدەر، ناسراو بە کەمانگەر (١٢١٩ک).

### 3. بنەماڵەی مەلا یەحیای جاف

ئـەم بنەماڵەیـە، لە کۆنەوە هەر بە زانیاری ئایینـی و کۆمەڵایەتییەوە خەریک بوونە و مەلای بەناوبانگیـان تێـدا هەڵکەوتـووە. وەک: مەلا ئیسـحاق، مـەلا یەحیا، مەلا عەبدوڵـڵای کوڕی مەلا ئیسـحاق، مەلا مسـتەفای کوڕی عەزیـز جوانڕۆیی، مەلا ئەحمەد و مـەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی مـەلا ئەحمەد، مەلا مسـتەفای کوڕی مـەلا عەبدوڕەحیمی نەوەلی، مـەلا فەتحوڵڵای نەوەلی، مەلا عەبدوڵڵای نەوەلی.

### 4. بنەماڵەی زانایانی دەڤەری کلاش:

مەلا باشی، مەلا عەبدوڵڵا، مەلا عیسا، مەلا ئەحمەد.

### 5. بنەماڵەی مەلا مەحموودی قازی جوانڕۆیی:

بڕێـک مـەلای بەتوانایـان تێدا هەڵکەوتـووە وەک: مەلا محەمەدی قازی، مـەلا فەخرەدین کە خزمی مەلا مستەفای «بێسارانی» بووە و لەدەڤەری جوانڕۆدا وەک قازی شەرع ناسراو بوو.

### 6. مەلا مەحموودی جوانڕۆیی:

لـە سـاڵی ١٣٠٠ک دا، لـە جوانـڕۆ هاتۆتە دنیـاوە و لە شـاری کەرکووک بـەلای حیکمەت ئەفەندییەوە ئیجازەی وەرگرتووە. (١٢٣٠ک). خۆشنووسـێکی ناسـراو بووە، ئاگاداری ئەدەبیاتی فارسی بووە..

لەبەر ئەوەی لە ناوچە و دەڤەرەکانی جوانڕۆدا مەلا و مامۆستای ئایینی زۆری تیا هەڵکەوتووە، جگە لە سـێ کەڵەشـاعیر و شەمعی شەبستانی دنیای شـیعر و عیرفان، کە ئەوڕۆ دوای ساڵانی زۆریش هێشـتا هەڵبەسـتەکانیان، حیکمەتەکانیان، وردەکاری نێو داڕشتنەکانیان دەستە گوڵی نێو کۆڕ و کۆمەڵی عوشاقانی ئەدەب و دنیای رۆشنبیرین و لام وایە بۆ هەمیشە لە بیرناچن وەک:

١- مەولانا مەولەوی تاوگۆزی.
٢- مەلا مستەفای بێسارانی.
٣- خانای قوبادی.

مـەلای زۆری کـە، لەو دەڤەرەیدا لە تاریکستـانی جەهل و نەخوێندەواریدا مۆمی زانسـت و مەعریفەتیان هەڵگرتووە، بەندە ناتوانم ناویان نەبەم و رۆشـنبیرانی کورد و هۆزەکەم نەیاننناسن، جا لێرەدا تەنیا ناویان دەهێنم وەک:

مەلا مەحموودی جوانڕۆیی، ساڵی ١٣٠٠ک لە جوانڕۆدا هاتۆتە دنیاوە.
مەلا مستەفای کوڕی عەزیز جوانڕۆیی، لە سەردەمی ناسرودین شادا ژیاوە
مەلا عەبدولڕەحمان مورادی جوانڕۆیی، کوڕی مەلا ئەحمەد. کە لە سورسوری سنەدا مردووە.
مەلا ئەحمەدی نەوەلی لە ناوچەی مەهاباد.
مەلا مستەفای عەبدولڕەحیمی نەوەلی کە لە سولەیمانیدا ژیاوە.
مەلا محەمەدی قازی جوانڕۆیی خۆشنووسێکی بەناوبانگ بووە.
مەلا عەبدوڵڵای مەلا باشی لە کلاش
مەلا عیسا و مەلا شێخ غەفووری بەناوبانگ لە سەردەمی حەبیبوڵڵاخانی باوەجانیدا ژیاوە.
مەلا محەمە ئەمینی کڵاش
مەلا مەجیدی نەدری لە دەوڵەت ئاوا
مەلا مەحموودی فەتاحی غەفووری مودەریس لە رەوانسەر
مەلا محەمەدی موختاری، گوایە گەلێک ئازا و نەترس بووە.
مەلا فەتاحی باینگانی
مەلا حەکیمی باینگانی

گەلـێ مـەلای دیکـە هەبوون لە جوانـڕۆدا، رەنگە من نـاوی زۆریانم لەبیر نەبێـت، ئەوانەی بەدەستم کەوتوون ئەمانەن:

مەلا محێدین فەخۆی، مەلا عەبدولڕەحمانی قازی، مامۆستا عەلی فەخری، مەلا ئەحمەد فەخۆی کوڕی مەلا عەبدوڵڵا، مەلا حەسـەنی یاری، مەلا محەمەد ئەمینی ئیمامی، مەلا یوسـفی ئەینی، مەلا عەبدوڵڵای کاکە رەزا، مەلا مەحموودی مەنوچەهری، مەلا محەمەدی سورسوری، مەلا ئەحمەدی فولادی...

## لە دەڤەری وەڵەدبەگیدا:

مـەلا فەتاحـی دەروێـش، مـەلا کەریمی دەروێـش، مەلا کاکـە ئەحمەد، مـەلا محەمەدی پیر خدری، مەلا مستەفای دورویی، مەلا ئەسعەدی مەعازی، مەلا حوسێنی موغازەیی، مەلا سەعیدی سەربایان..

### لە ڕەوانسەر:

مەلا ئەسعەدی مەعازی، مەلا عەبدوڵڵای نەوەلی، مەلا فەتحوڵڵای سەبادی، مەلا زەیدی، مەلا ئەحمەدی خوڕەم ئاباد، مەلا ڕەشیدی تەختی، مەلا کەلانتەری، مەلا خەلیفە کەرەم، مەلا ئیسماعیل سادق، مەلا محەمەدی موڕادی زادە، مەلا عەبدولڕەحمانی درکەیی، مەلا عەبدولڕەحمانی پیرانی یان شلەیی.

### لە دەڤەری قوبادیدا:

مەلا مستەفای قوبادی، مامۆستا شێخ عەلی، مەلا ئەسعەدی پیر، مەلا عەبدولکەریم، مەلا محەمەدی نبڕە، مەلا عەزیمی خیلی، مەلا سوهراب، مەلا عەزیم خێڵ بانا، مەلا حوسێنی برانی، مەلا محەمەدی برانی، مەلا حاجی فەرەج..

### لە ناوچەی باوەجانیدا:

مەلا حوسێنی نامدار، مەلا محەمەدی سۆفی، مەلا عەبدولکەریمی زلان، مەلا عەزیزی خومین، مەلا ناسری محەمەدی، مەلا محەمەدی زناوی، مەلا محەمەدی جوانڕۆیی لە خانەقین دەژیا.

### شاعیرەکانی دەڤەری جوانڕۆ:

لە ناوچەی جوانڕۆدا شاعیری زۆری تیادا هەڵکەوتووە، بڕێک لەوانە بە ڕەگەز جاف نین، وەک «برزەلەک» و «گروسی» و «بێسارانی» باوەک مەلا مستەفای بێسارانی لە چەند لاوە هاوخوێنی تیرەکانی جافە و هەر لە سەر جاف دەژمێردرێت، بەڵام نازناوی «بێسارانی» و پلەی بەرزی شیعرەکانی وایکردووە حەیفە تەنیا بە شاعیری یەک عەشیرەت لەقەڵەم بدرێت، بەڵکو ئەو یەکێکە لە شانازییەکانی دنیای ئەدەبیاتی کوردی.

برزەلەک لە قەسیدەیەکدا دەڵێت:

**شەو چراخەنی، شەو چراخەنی**
**پەی شەوق جەمین شەو چرا خەنی**
**ئەگەر ناکەسی بەد ئوجاخەنی**
**یاسەجەنی مان بە دەما خەنی**

# ئەمیر ئەبو شوجاعی عاسمی جاوانی
# 467-462ک

ئەمیـش وەک خزمەکانی فەرمانی میرنشـینی لە لایەن خەلیفەی بەغـداوە بۆ دەرچووە، زۆر ئیماندار و خواپەرست بووە، حەزی لە راو دەکرد بە تایبەتی راوەشێر، دیارە ئەو سەردەمە شێر لە دەڤەری حیلەدا زۆر بووە، لە شەڕکردندا بە توانا و کارزان بووە.



میرزادە ئەبو شوجاعی عاسمی جاوانی

# کوێخا سمایلی تەڵان



کاتێـک دەربـارەی هۆزی جاف بنووسـرێت ئەویش لەم کات و زەمانـەدا ناکرێت دەربارەی «کوێخا سـمایل» نەنووسـرێت، لەم کاتەیدا ئەم بابەتەی دەنووسم «مام کوێخا» بینایی لەدەست داوە و تەمەنێکـی زۆری لـێ گـوزەراوە، من دوعای بەردەوامی بۆ دەکـەم، حەزم دەکرد زۆرتر دەربارەی ئەو بنەماڵەی بنووسم، لەو رووەوە چەندین جار لەگەڵ کوڕەکانی مام کوێخادا (ئەحمەد و مەحمـوود) دا دواوم تـا چەند لاپەڕەیەک دەربارەی بنەماڵەکەیان بنووسـن و بۆم بنێرن. ئیدی نەیان نارد، بەڵام ئەوەی ناگەیەنێت بە گوێرەی زانیاریم و ئاشـنایەتیم دەربارەی کوێخا بابەتێک نەنووسم.

کوێخا سمایل لە ناو خزمان و خوێشان و تیرەی خۆیی و هەروەها عەشایەری غەیرە جاف و تیرەکانی کەی جافدا قسەبیسراوە، باوەڕپێکراوە، هەروەها بە لێزان و چاوساق ناسراوە لە ئارمانی میللەتەکەیـەوە دوور نەکەوتووەتەوە وەک پێشـمەرگەیەکی ئەیلوول لە خەباتی پێشـمەرگایەتیدا بەشـداری کردووە، زەرەر و زیانی دیوە، دەوڵەتی ئێراق دووری خسـتۆتەوە، دەسـتی بەسەردا گرتووە.

کوێخا ئێسـتاش لەم تەمەنەیدا کە لە هەشـتا بە بانە قسە خۆش و خۆش مەشرەبە، مەجلیس ئارا، هۆشـیار و ئـاگادار لە تەواوی رووداوەکانی دەوروبەر. لەوانە گوزەشـتە ماڵ و دیوەخانی کوێخا سمایل هەمیشە بە رووی میوانانەوە ئاواڵەیە.

# تابان جاف

یەکێ بوو لە خانمە ناودارەکانی ناو بنەماڵەی بەگزادەی جاف، کچی داود بەگی جاف و لە خاوەر خانمی هاوسەری بووە، کە لە بنەماڵەی شێخانی تاڵەبانی بووە.

تابان، هەمیشە لە خزمایەتی و مرۆڤ دۆستی دوانەکەوت و لە کار و کردەوەی خێردا چەندین هەنگاو لەپێشی خەڵکیدا بوو. تەواوی کاتی بە دوای خێری خەڵکدا سەرف دەکرد و لە یارمەتیدانی بێ دەنگی خەڵکیدا هەرگیز کۆتایی نەدەکرد و بە دوای سوپاسگوزاری خەڵکیدا نەدەگەڕا. ئەم ئافرەتە ڕەوشت جوانە، پەسند ڕەفتارە، شووی کردبووە «سەرتیپ جاف» و لەو هاوسەرییەی کوڕێک و چوار کچی بووە. بەداخەوە بە مەرگی کتوپڕی خوێن ڕێژی مێشک لە شاری عەماندا کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەشی گەیاندرایە گۆڕستانی باوباپیرانی لە دەڤەری شیروانە و شاری کەلار.



تابان خانمی داود بەگی جاف

# حسێن بەگی جوانڕۆ
# 1914-1988ز

تیـرەی جوانـڕۆ یەکێکە لـە تیرە ناودارەکانی هـۆزی جاف، بەگزادەکانـی جوانڕۆ زۆرتر بە «وەکیل» ناودەبران و لە ئازایەتی و ململانێدا شـۆرەتی بەربڵاویان هەبووە، سـەریان بۆ زوڵم و زۆر دانەنواندووە. (تکایە بگەڕێرەوە بۆ بەشی جوانڕۆ)...

حوسـێن بـەگ یەکێـک بووە لـەو ناودارانە کە پەیوەسـتە دژ بە زوڵم و جـەور لە جەنگ و ململانێی چەکدارانەدا بووە. دژی حکومەتی ئێران.



حوسێن بەگی وەکیل

# زیبا جاف
# 1974-1920ز

زیبا خانم، کچی گەورەی کەریم بەگی جاف بوو، مێردی کردووتە نووسەری دنیای ئەدەبی کوردەوای «محەمەد سەعید جاف»ی ئامۆزای. لەو هاوسەرییەدا پێنج مندالّی بووە، سێ کوڕ و دوو کچ. (خوسرەو، نەبەرد، ژیان، کیسرا، جوان).

زیبا خانم، تەواوی ژیانی پرۆژەیەک بووە بە خێرخوازی و لەخۆبوردن و خزمەتگوزاری خەلّک و خوا، بە تایبەت هەژاران و لێقەوماوان، چەندین مندالّی هەتیوی بێ دەرەتانی بەخێو کردووە، چەندین کچە عازەبی بێ پشت و پەنا، بەشووی داوە و یارمەتی داوە، لە ناو عەشایەردا هەمیشە دەرگای مالّەکەی بۆ میوانانی نەناسراو ئاوالّە بووە، دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ١٩٥٨ز، بارودۆخی ولآت ئالّۆزا، بۆ پەڕگرتن لەو بگرە و بەردەیە مالّیان بۆ شاری بەغدا گوێزایەوە. لەوێشدا هەمان شێوەی بەکاربردووە، بڕێک لە قوتابیانی هەژاری کوردی کۆلێژەکان نان و خوانیان لە مالّی ئەم خانمەدا بۆ ئامادە دەکرا بەوە رانەدەوەستا رۆژانی هەینی دەڕۆیشت بۆ مەزاری شێخ عەبدولقادر «غەوس»، یان ئیمام موسای کازم و شێخ مارفی کەرخی، لەگەلّ خۆیدا کوردی زیارەتکەری نەخۆش و پەککەوتووی لەگەلّ خۆیدا دەهێنایەوە. لە حەفتاکاندا بەغدای بەجێهێلاوە و گەیشتە ناو شۆڕش و لەوێڕا گەیشتە شاری تاران، بە لای مێردەکەیەوە «محەمەد سەعید جاف» بە مەرگی کتوپڕی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی «بەهەشتی زەهرا» لە شاری تاراندا نێژراوە.



# کەریم بەگی جاف
# 1949/7/1-1889ز

کوڕی فەتاح بەگی حەمەپاشای جاف بووە، لە حوجرە خوێندوویەتی، فارسی و عارەبی و تورکی زانیوە. ماوەیەک لە سلێمانی لە ماڵی خاڵیدا «ئەوڕەحمان ئاغای عەوڵائاغا»دا نراوەتە بەر مەلا و قورئان و ئەدەبیاتی فارسی خەتم و تەواو کردووە، فەتاح بەگی باوکی لە ساڵی ١٩٠٨ز مردووە و جێگەی باوکی گرتۆتەوە، لە ساڵی ١٩١٩ز بە شێوەیەکی فەرمی بووە بە سەرۆکی تەواوی هۆزی جاف و هۆشیارانە و لێهاتووانە کاروباری عەشیرەتەکەی بەڕێوەبردووە..

کەریم بەگ، لە سەخاوەتدا، حاتەم ئاسا ڕەفتاری دەکرد، دیوەخانەکەی هەمیشە پڕ لە میوان و لێقەوماوان بووە، تەواوی ڕووداو و گرفتاری تیرەکانی جاف و غەیری جاف لە حزووری ئەودا ئاسان دەکرا. تا بڵێی حەزی لە قسەی نەستەق و شۆخی کردن و وەڵامی زیرەکانە و نوکتە بووە، قسەخۆش، بەگوزەشت، دەستبڵاو، ڕووخۆش، میوان نەواز، پیاوی خوا و بە ئیمان و سەرەنجام وڵات پەروەر. لە ڕووداوەکاندا هەمیشە پشت و پەنای لێقەوامان بووە، ناچار نەبووایە توند و تیژی بەکارنەدەبرد.

کەریم بەگ لەو سەردەمی تاریکستانەدا بیری لە نووسین و ڕۆشنبیری کردۆتەوە، کتاوی «تەئریخی جاف»ی نووسیوە و بڵاوی کردۆتەوە. هەر کەسێکی لە هۆزی جافی بدیبایە، ناوی باوکی لێ دەپرسی، ئەودەم مێژووی باو و باپیری بۆ هەڵدەدا، ئەویش بە وردەکاری و ڕووداوەکانەوە..

کەریم بەگ، سەرەڕای گرفتارییەکانی گەلێک غەمخواری پەرپووتی و نەهامەتییەکانی میللەتەکەی بوو، لە زۆر جێگەدا ئاماژەی بە دەوری عەشایری جاف داوە، کە چۆن ئیمارەتی بابانیان پاراستووە، لە کتاوەکەیدا «تەئریخی جاف» دەڵێت:

«پاشا و ئومەرای کورد، بایەخیان بە مێژووی کورد نەداوە، بۆیە رابردووی کورد ڕۆیشتووەتە ژێر خۆڵەوە..»

کەریم بەگ، نێوانی لەگەڵ شێخ مەحموودا زۆر گەرم بووە، لە شەڕی ئاوباریکدا، بۆخۆی و داودبەگی برای و مینەجافی کوڕیەوە، بەشداری کردووە و قارەمانانە شەڕیان کردووە، بەڵام بە داخەوە وەک هەمیشە تەواوی قارەمانییەتەکە بۆ شێخ بووە و ناوەکانی کەی ئەو پەلامارانە خراونەتە لیستی سەربازە بێ ناوەکانەوە. بۆیە دڵنیام مێژووی کورد دوور لە دەمارگرژی و شارچێتی و حیزبایەتی و زۆر شتی تر، دەبێ دووبارە بە چاک و خراپییەوە بنووسرێتەوە. کاتێک کەریم بەگی سەرۆکی جاف، کۆچی دوایی دەکات لە ١٩٤٩/٧/١ز، پیرەمێرد کۆچی دوایی کەریم بەگی جاف بەم شێوەیە تۆمار دەکات:

**ئیلهامی خوا کەریمە لە رووی خۆشەویستییە**
**مژدەی کەریمی ئەوبوو کەریمی بەهەشتییە**

(کە بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە: ١٣٦٨ک) بە زایینیش بەم بەیتە تۆماری کردووە:
«کەریم بەگ ئیلەکەت شینیە لە شوێنت» ١٩٤٩ز، وەنەبێت هەر تەنیا پیرەمێرد شینی بۆ کەریم بەگ کردبێت بەڵکو شاعیرانی تریش وەک: عەلی کەمال باپیر، شێخ سەلام، شێخ ئەحمەدی شاکەل. هەر یەکە و بە جۆرێک شیوەنیان بۆ نووسیوە.
کەریم بەگ سێ ژنی هێناوە:

١- دورسن خانمی کچی حەمە هەسەنی سەرۆکی تیرەی تەرخانی.
٢- فەهیمە خانم کچی عەبدولکەریم ئەفەندی وەنداوی.
٣- ناهیدە خانم کچی وەسمان پاشای جاف.
لەم سێ ژنە: پێنج کوڕ و سێ کچ بووە، دیارە ناهیدە خانم منداڵی نەبووە.



# حەمە بەگی فەتاح بەگی حەمەپاشای جاف
# 1904-1934ز

سـێهەمین کوڕی فەتاح بەگ بوو، ئازا و لێهاتوو و خوێندەوارێکی وا داسـتانی نووسـیوە و بیری لە نەتەوایەتی و ڕۆژی ڕەشـی میللەتەکەی کردۆتەوە، لەو داسـتانە درێژەیدا، کە بە ناوی «تاهیـر و تاهیرە»دایـە، بـە وردی بیـروڕا و جۆری ژیانی ئەو سـەردەمەی کـوردەواری تیادا دەرخستووە، بەڵام دوای خۆی حەمەسەعی بەگی کوڕی، منداڵ بووە و باوکی مردووە، کەسێکی تریش لە بنەماڵەی ئەوەندە پابەندی نووسین و ڕۆشنبیری نەبوونە و ئەو داستانە وەک زۆر شتی تر تیاچووە.

حەمە بەگ، لەساڵی ١٩٢٩ز، بوو بە ئەندامی پەرلەمانی عێراق بە نوێنەرایەتی لیوای کەرکووک و لـە شـاری بەغدا پەیوەندی پتەوی لەگـەڵ خوێنەوارانی کوردی ئەو دەمەدا پەیدا دەکا و لەگەڵ چەند کەسـێکدا، یاداشـتێک دەنووسـن بۆ (عصبة الامم). لەو یاداشتەدا داوای حوکمی فیدراڵی بۆ گەلی کورد دەکەن. کاتێک «محسـن السـعدون» سـەرۆکی وەزیرانی عێراق بووە، یاداشـتێک لە لایەن ئەو بەڕێزانەی خوارەوەی پێ دەگەیەنن، داوای جێبەجێکردنی حوکمی زاتی بۆ کوردسـتان دەکەن:

١- محەمەد بەگی جاف/ نوێنەری کەرکووک.
٢- عەبدوڵڵا محەمەد موفتی/ نوێنەری لیوای مووسڵ.
٣- جەمال بابان/ نوێنەری لیوای هەولێر.
٤- محەمەد سەعید حاجی حوسێن/ نوێنەری کەرکووک.
٥- سەیفوڵڵا خەندان/ نوێنەری سلێمانی.
٦- سەبری عەلی ئاغا/ نوێنەری سلێمانی.

لە مانگی شـوباتی سـاڵی ١٩٣٠دا، هەر ئەو کۆمەڵە، یاداشتێکی تریان داوەتە مەندوبی سامی

(بڕوانــە: ڕۆژنامــەی العهد الجدید، ژمارە: ٢٨٥، ٢٣ی گەلاوێژی ١٩٨٣ز، عەبدولڕەزاق حەســەنی، مێژووی عیراقی نوێ، ل٣١٢).

هــەر لــەو بارەیەوە، نامەیەکــی تریان بۆ ســەرەک وەزیرانی وەخت نووســیوە، حەمە بەگی جاف، ئەگەر مەرگی کتوپڕی دووچاری نەبووایە، یەکێک دەبوو لەو کەسانەی دژ بە داگیرکەرانی کوردســتان بێدەنگ نەدەبوو. تەنیا بە یاداشــتێک نووسین رازی نەدەبوو، ئەگەر هێمنی و هێوری کەریــم بەگی براگــەورەی نەبووایە ململانێی چەکدارانەی دەســت پێدەکرد. حەمە بەگ و ئەحمەد موختار جاف، لە ناو بەگزادەکانی جافدا هاوبیر و هاوفکر بوون، کەوتبوونە خولیای شۆڕشــێکی چەکدارانەوە.

شــاعیری نیشــتمان پەروەری کورد «ئەســیری» لە بارەی ئەو نوێنەرە کوردە بە غیرەتانە دەڵێت:

**شەش مەردی نیشتمان لە شەش گۆشەی وەتەن**
**هێشکگرن بە گیان و بە دڵ هەوڵ و رەنج دەدەن**
**سەردەستەیە سمایل سۆران، جەمال بابان**
**نەوزادی پشدەر ساڵح بەگی جوان**
**بێتو کەسێ بڵێ. چنە حەمەد بەگ؟**
**سەرداری جافە، نایەوێ گوفتار و ناوونیشان**

حەمە بەگ و ئەحمەد موختار جاف ئامۆزای یەک بوون و پێکەوە خەریکی تەدارەکی شۆڕشی چەکدارانە بوون، لە عوســبەتولئومەم و مەندوبی سامی، نائومێد بووبوون، وەک ئەحمەد موختار لەم رووەوە دەڵێت:

**ئەم قەراری عوسبەیە خەڵقی ئەڵێن بۆ کورد ئەبێ**
**هەر قسەی رووتە و قسەش ناچێتە ناو گیرفانەوە**

حەمە بەگی جاف، کاتێک ئەندامی پەرلەمانی عێراق بووە، لەگەڵ مەعرووف جیاوکدا یاداشتێکی تــری ناڕەزایی بە مەندوبی ســامی دەدەن، کە ئەو دەم «ســیر فرانســیس همفریــز» بووە، تیایدا هاتووە:

«فەخامەتی مەندوبی سامی فرانسیس همفریزی مەزن:

لە پاش عەرزی ئیحترام..

بەنــاوی میللەتی کورد عەرزی خۆش ئامادەیی جەنابــی گەورەتان ئەکەین، ئومێدەوارین ئەم عەرزەمان لە لای فەخامەتتان بە زیرای قەبوڵ بێ و بە حوسنی نیەتتان تەئویل بکرێت.

ئێمــە کە نێردراوی «مەندوب»ی کوردین، بــە لازممان زانی ئەوی لە هەناوی هەر کوردێکدا ئەکوڵێ و جۆشــانەیە عەرزی جەنابی گەورەتانی بکەین، مەعلومی جەنابی عالیتانە کە کورد لەو

ڕۆژەوە خۆیان خستە پەناهی حکومەتی بەریتانیای گەورەی دایم موتەرەقیبی سیاسەتی بوون و بەو بۆنەیەوە هەرگیز موخالفی ئەم سیاسەتە چشتێکتان لێ پەیدانەبووە بە ئیعتیقادی کەم ئەم سیاسەتە دەستگیری حقوقی کوردان ئەبێ، ئەم حقوقە کە بە موعاهەدات و موقەرەراتی (عصبة الامم) موئەید بووە، دیسان هەر کوردێک وای ئومێد ئەکرد و ئێستەش ئەمەل ئەکا کە ئەم حقوقەی موقەرەری بە ئاهەنگ و تەوازنێکی راست و موفید زۆر ڕووناک و صەریح بچێتە پێشەوە..

فقط چی سوود لەم کودەتەی چەند ساڵە و خصوصەن لەم ڕۆژانە صەدای هات و هاواری قەومەکانی تر و تەوەقوف و تاریکی سیاسەت هەموو کوردێکی پەشۆکاندووە، چونکە لەم تەوار و وەضعیەتە وا وەفام دێتەوە کە حقوقی کوردان زۆر لە سستیەوە بە زوبانێکی فەصیح لە دائیرەیەکی تەنگ و تاریک لەژێر بارێکی زۆر گران ناڵانە.
میلەتیش کە خزمەتکاری سیاسەتی فەخیمەیە بە دڵێکی ئاتەشین و سوزان مونتەظیری لوطفی عالیتانە، هەرچەندە ئەسلافی فەخامەتتان وەکو (سیر هازی دوبسن) بە موژدەی خۆش میللەتی سەبر و تەسکین کردبوو، ئومێدمان وایە کە عەهدی جەنابی سامیان بە عینایەتی گەورەییتان عەهدی حقوقی کوردان بێ.

ئیتر زۆر حورمەت و ئیشی کوردان پێویستی مەرحەمەتی جەنابی گەورەییتانە.

**ناردراوی کەرکووک**<br>**حەمە جاف**

**ناردراوی هەولێر**<br>**مەعرووف جیاوک**

ساڵی ٢٠٠٤ز، بەندە ئەندامی پەرلەمانی ئێراق بووم، لەگەڵ ئەندامێکی دەمارگرژی عارەبدا، لە بارەی ماددەی ٥٨ دەمم تێگرا و نەڕاندی، تۆ چ پەیوەندییەکت لەگەڵ کەرکووکدا هەیە؟. بەندەش «جنسیە»ی لیوای کەرکووکم لە ساڵۆنی پەرلەماندا دەرهێنا و وتم: من کوڕەزای یەکەمین نوێنەری لیوای کەرکووکم «محەمەد بەگی جاف»، لە یەکەمین پەرلەمانی ئێراقدا تۆ نازانیت خەڵکی کوێندەریت و لەچی وڵاتێکەوە هاتوویت.

حەمە بەگی جاف، لە ڕۆژی ١٩٣٤/٥/١ز، لە تەمەنی سی ساڵیدا بە خوێنڕێژی مێشک کۆچی دوایی کردووە و ئارەزووی سەربەخۆیی وڵاتەکەی بردۆتە ژێر گڵەوە. حەمە بەگی جاف، باپیری بەندەیە (خوسرەو حەمەسەعید محەمەد بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف).



حەمە بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف
١٩٠٠-١٩٣٢

# بەدیع باوەجان

هونەرمەندێکی دەست و پەنجە ڕەنگینی کوردە، لە شاری کەرکووکدا هاتۆتە دنیاوە، باوکیشی هەر لەو شارە لە دایک بووە، دەڕواتە فێرگەی لەشکری عوسمانییەوە رشتەی پزیشکی تەواو دەکا و لە ناو شاری سلێمانیدا چەند ژوورێک تەرخان دەکات بۆ دیتنی نەخۆش.

هونەرمەند «بەدیع» لە ساڵی ١٩٤٥دا دەڕواتە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا.
مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی، لە گۆڤاری «ڕەنگین»دا دەربارەی هونەرمەند بەدیع باوەجانی دەڵێت:

«قوایی و باوەجانی دوو تیرەی گەورەی عەشیرەتی «جاف»ن، خانای قوایی کە شانازیی ئەدەبیاتی کوردە، کوڕی ئەم باوەجانی عەشیرەتی جافەیە..»

ئەم هونەرمەندە دیارە هاودەوری هونەرمەندانی گەورەی دیکەی دنیای شێوەکاری بووە، وەک: فایەق حەسەن، جەواد سەلیم، خالید ڕەحال، ئیسماعیل شێخلی، شاکر حەسەن ئال سەعید و ناسراوانی تر..

پووترەی شاعیرە کلاسیکییەکانی دنیای ئەدەبی کوردی بە ڕێنمایی و چاوساقی مامۆستا عەلائودین سەجادی. لە لایەن ئەم هونەرمەندەوە هاتووتە کایەوە.

بەدیع باوەجان، وەک زۆربەی زۆری هونەرمەندانی دیکەی کورد، مەودای خۆی وەرنەگرتووە و بۆی نەڕەخساوە دەست و پەنجە ڕەنگینەکەی لە بوارەکەیدا بخاتە کار و جوانتری بسازێنێت.
هونەرمەند، بەرگی زۆر لە کتاوە چاپکراوەکان و گۆڤارە کۆنەکانی کێشاوە.
بڕێکی زۆری نەخشە و دیزاینی پارەی مسین و زیوینی (وردە) لە لایەن ئەم هونەرمەندەوە ئەنجام دراوە.

هونەرمەند شیعری نووسیوە و لە گۆڤارەکاندا بەرهەمی بڵاوکردۆتەوە، هەندێ لە شیعرەکانی بە تورکی نووسیوە.

# تۆفیق وەهبی وتی:

مستەفا بەگی کەریم بەگی جاف دەڵێت:

لە خوالێخۆشبوو کەریم بەگی باوکم بیستووە کە ئەودەم بە شێوەیەکی فەرمی سەرۆکی عەشایەری جاف بووە، کە «تۆفیق وەهبی» نووسەر و سیاسەتمەداری ناسراوی کورد کە ئەفسەری عوسمانی بووە لە شەڕی شوعەیبەدا بەشداری کردووە، هاتووە بە (کەریم بەگی جاف و شێخ مەحموودی حەفید و محەمەد عەلی بەگی جاف)ی وتووە: ئێوە تەرازووەکە باش هەڵناسەنگێنن و لە رووی لێکدانەوەیەکی بێهوودەوە گەنجی کورد بۆ عوسمانی بە کوشت دەدەن..

هەر ئەو دەمارگرژییەی کە لە بارەی ئایینەوە ئەو ناودارانە هەیان بووە، پاڵی پێوە ناون لەگەڵ هێزی رووسیای قەیسەریشدا بەشەڕ بێن و بوونە پاڵپشتی لەشکری عوسمانی، بە حیساب ئیسلام و خەلیفەی سوڵتانی عوسمانی، دەوڵەتی عوسمانی داوای لە مەحموود پاشای جاف کرد، کە شەڕی دژ بە رووسیادا لەگەڵ هۆزەکەیدا هاوکاری لەشکری عوسمانی بکات.

لەشکری جاف، بە سەرۆکایەتی مەحموود پاشای جاف کە دەبێتەوە و بە بەشداری تایەربەگی عوسمان پاشا «شاعیر» و عەلی بەگی مەحموود پاشا، حوسێن بەگی مەحموود پاشا، حەسەن بەگی مەحموود پاشا، حوسێن بەگی حەسەن بەگی جاف، حەمەسەعید.

# سالار جاف
# 1941-1979ز

سالار کوڕی سێیەمی داود بەگی جاف بوو، لە دێی کەلار هاتووتە دنیاوە، هەر لە منداڵییەوە ڕەفتار و کرداری پیاوانە و لێهاتووانەی پێوە دەرکەوتووە.

سالار جاف هەمیشە بێ بەرامبەر لە خزمەتی خەڵکیدا بووە، دەستی بە ئەندازەیەک بڵاوبووە هەرگیز وشـەی نییە و نیمەی لەدەم وەدەرنەهاتووە، قەرزی دەکرد بە خەڵکی دەدا، شـەو و ڕۆژ بەدوای کار و کردەوەی خەڵکیدا عارەقڕێژ بووە.

قسەخۆش، دەم بە پێکەنین، ڕووح سووک، حازر وەڵام، ئازا و نەترس و لێهاتوو قسەسوار و بـە مەنتیـق، لە هەر کوێدا با، خەڵکێکی زۆری لێ کۆدەبووەوە، لە ناو تیرەکانی جافی ئێراندا زۆر خۆشەویست بوو.

بە ڕاستی میرێکی بێ فیز و ئەدا بوو، بەو ئەندازەیە سەرفراز بەرامبەر ملهوڕان و جەبباران، تەوازوع و پیشە بەرانبەر هەژاران.

دوای شۆڕشـی خەڵکی ئێران و بگرە بەردەی جەمهوری ئیسـلامی، بەر شەپۆلی توندوتیژی ڕۆژانی یەکەمی ئەو سـەردەمە کەوت و بێ هیچ تاوانێک تیرۆرکرا و ڕۆژگاریش وەدەری خسـت کە ئەو قارەمانە چ بێ تاوان لەناوبرا. مەزارەکەی لە بەهەشتی زەهرای شاری تارانە.



شەهید سالار جاف

# محەمەد سەعید جاف

کوڕی حەمە بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جافە. باوکی هەربە گەنجی کۆچی دوایی کردووە و لەبەر خۆشەویستی و جوانەمەرگی باوکی کە لە تەمەنی سی ساڵاندا جوانە مەرگ بووە، مامەکانی لە قوتابخانە وەدەری دێنن و بە پێی ڕەسم و ڕەواڵی خێڵ و عەشایەری پەروەردەی دەکەن، ئەم مێردمنداڵە هەر لەو کاتەوە خولیای خوێندن و خوێندنەوە و کتاو و ئەوەی نووسرابێت لە ئارەزوویدا دەق دەبەستێت و هەر لەو سەردەمەوە دەکەوێتە کۆکردنەوەی کتاو و پەرتووک و نووسراوی ئەو سەردەمەیە و بەوەش ڕاناوەستێت پەیک بە هەر چوار لادا دەنێرێت بۆ بەدەستهێنانی چاپەمەنی جۆراوجۆر و وردە وردە خۆی فێری خوێندنەوەی فارسی و هەرچی نووسینی دەکا و ڕۆژنامە و گۆڤاری ئەو سەردەمە هەیە وەک: سیاوسفید، تهران مصور، ترقی، اسیای جوان. هتد بەدەست دێنێ و ئابوونەی مانگانەیان دەدات و لە ڕێگەی قەسری شیرینەوە بۆی دێنن، هەر لەو ڕێگەیەوە ئەوی بڵاوکراوەی حیزبی «تودە»ی ئێران هەیە بەدەست دێنێت. ئیدی بیروڕای چەپگەرایی دەکەوێتە خولیایەوە و لەگەڵ زۆربەی نیشتمان پەروەرەکانی چلەکان و پەنجاکان پەیوەندییەکی پتەو پەیدا دەکات، بەندە «نووسەری ئەم دێرانە» لە بیرمە چەند کەسێکی ڕاکردووی سەر بە حیزبی شیوعی ئێراقی لە ماڵی ئێمەدا لە دێی کەلار خۆیان شادربوویەوە..

حەمە سەعید جاف لە ساڵانی پەنجاکان و شەستەکاندا بووە خاوەنی گەورەترین کتێبخانەی تایبەتی لە لیوای کەرکووکدا. لەبیرمە چەندین جار کتاوخانەکەی کەوتە پشکنینی دەستگای «تحقیقات الجنائیة»، کە ئەو دەم ئەمنی سەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی بەو ناوە ناودەبرا، کابرایەک لە ماڵی ئێمەدا بوو، ئێمە پێمان دەوت «عەلی تورکە»، ئەم عەلی تورکەیە، کرێکارێکی قوڕکاری ناو ماڵی ئێمەی دەکرد و هەر کە «تحقیقات جنائي» بۆ پشکنینی کتاوخانەکەی باوکم دێن، ڕێکەوت باوکم لە ماڵدا نابێ و کەسێکی ئاواش نەبوو ئاگاداری کتاو و پەرتووکە قەدەغەکراوەکان بێت. دایکم دامابوو، نەیدەزانی چۆن و بە چ شێوەیەک ئەو کتاوە یاساغانە لە کتاوخانەکەی باوکم دەربهێنێت. ئێوارە درەنگ بوو لە بیرمە عەلی تورکە بۆ لای دایکم هات و بە تورکی پێی وت نیگەران مەبە، من دەتوانم ئەو کتاوە یاساغانە وەدەربهێنم..

دایکم زۆری پێ سەیر و سەمەرە بوو، بەڵام لە پەریشان و پەشۆکاویدا سەرەتا هیچی نەگوت. (لۆکیس)یان هەڵکرد و چوون بۆ ناو کتاوخانەکە، منی منداڵیش لەگەڵیاندا چووم، زۆری نەخایاند تەواوی کتاوە یاساغەکانی لە کتاوخانەکە دەرهێنا و دایە دەستی دایکمەوە و وتی: دڵنیابە ئیدی جێگەی مەترسی نییە، هیچیان دەست ناکەوێت..

لە دواییدا دایکم، عەلی تورکەی خستە ژێر پرسیارەوە، کە چۆن توانیویە ئەو کتاوە یاساغانە دەستنیشان بکات..؟.

عەلی تورکە، لە وەڵامدا وتبووی: کەوا نەختێک خوێندەواری هەیە و برایەکی لەو جۆرە کتاوانەی هەبووە...

عەلی تورکە گەڕایەوە بۆ ئێران. ڕۆژگار هات و چوو، دەرکەوت «عەلی تورکە» سکرتێری حیزبی «تودە»ی ئێران بووە، «شیوعی» بووەو بە ئاگاداری حیزبی شیوعی عێراقی لە ماڵی

ئێمەدا بووە..

عەلی تورکە لە لایەن دامودەستگای ئەمنی ئێرانەوە دەگیرێت و ئیعدام دەکرێت. ناوی راستەقینەی عەلی تورکەی لای ئێمە «خوسرەو روزبە»ی بە ناوبانگە، کە سکرتێری گشتی حیزبی «تودە»ی ئێران بووە..

حەمە سەعید جاف، لە زۆربەی ژمارەکانی گۆڤاری «گەلاوێژ»دا بابەتی جوان و بەپێزی زۆری نووسیوە، وەک چیرۆک و وەرگێڕان و باس و بابەتی جوگرافیای شار و دێی کوردستان پەیوەستە پەیوەندی پتەوی لەگەڵ خەباتکەران و ئازادیخوازانی کورد و گەلانی دیکەدا هەبووە، یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی رۆژنامەی «برایەتی» لە ساڵی ١٩٦٩ز، بەشداری شۆڕشی گەلەکەی کردووە، چەندین جار کتێبخانەکەی سووتێنراوە و تاڵانکراوە، بە تایبەت لە کۆچ وبە کۆچی گەلی کورد، ئەو کتێبخانەیە وەک دەستنیشان کرابێت لە پێش زۆر شتدا بەر شاڵاو دەکەوت.

تا یەک رۆژیش پێش مردنی، لە کاروکردەوەی خوێندنەوە و نووسین نەکەوت و دەستبەردار نەبووە.

کتێبێکی گەلێک بە نرخی لە دوو بەرگدا بە چاپ گەیاندووە بە ناوی «ئاوارە».

حەمە سەعید جاف، زیبا خانمی کچی کەریم بەگی جافی مارە کردووە، کە ئامۆزای بووە، لەو پەیوەندییە پێنج منداڵی بووە:

١- خوسرەو جاف

٢- نەبەرد جاف

٣- کیسرا جاف

٤- ژیان خانم

٥- جوان خانم



حەمە سەعید جاف

# مستەفا بەگی جاف

دووهەمیـن کوڕی کەریم بەگی جافە، یەکێک بووە لە ناودارەکانی بەگزادەی جاف، راسـتگۆ، شۆخ، قسەخۆش، بەگوزەشت، هەر لە سەرەتاوە خولیای کوردایەتی بوو، لەبیر و فکریدا هاتووتە جـۆش و خـرۆش، بووە بە ئەندامی حیزبی «هیوا» و بە پێـی فەرمانی ئەو حیزبە لە «موئتەمەر قەنیلـە»دا چەندیـن مەخفـەری دەوڵەتی داوەتە بەر تەقە و تا هێرشـی دڕندانەی سـەر دەڤەری بارزان کەم ببێتەوە. یەکێک بووە لە راپەڕینە چەکدارانەکەی سەرەتای شۆڕش لە دەربەندیخان و لە دواییدا زیندانی کراوە و لە کوردستان دوور خراوەتەوە بۆ خوارووی ئێراق.

زۆرتر لە سـێ سـاڵ پێشـمەرگایەتی کردووە، دوای غەدری ۱۹۷٤ز لە وڵات دەرچووە و لە شاری تاراندا نیشتەجێ بووە.

مستەفا بەگ و شۆرەتی قسەخۆشەکانی لە ناو خەڵکی کوردستاندا بەناوبانگە. بەندە رۆژێک لە رۆژە هەرە گەرمەکانی گەرمیان. مانگی رەمەزان بوو لە خزمەتیدا بووم، گەرما هێڵەی دەکرد، مسـتەفا بـەگ بـە رۆژوو بوو، هەمـووی یەک چارەکی مابـوو بۆ بانگدان، گەلێـک تینووی بوو، بـە تووڕەبوونــەوە وتــی: بڕۆن ئاوم بۆ بێـرن. بەندەش وتـم. خاڵۆ تەنیا دە دەقیقـەی ماوە، بۆ رۆژووەکەت دەشکێنی؟! وتی خاڵۆ: سبەی لە تینوویدا کوێربم بەڵێ دوو چاوی ترم دەداتێ، بڕۆن ئاوم بۆ بێنن. بە گەورەیی خۆی قەسەم ئەگەر هەر ئێستا بمخاتە بەهەشت دەیشکێنم. بڕۆن ئاوم بۆ بێرن.

مستەفا بەگ لە سەردەمی پێشمەرگایەتیدا لەو هەردەی بنارەی جافە تووشی دەبێتە تووشی کابرایەکـەوە دەنواڕێـت تفەنگێکی پێیە، توڵەیەک، تانجییەک، کیسـەی تووتـن و چەخماخەیەک و گالۆکێکی درێژیش. مستەفا بەگ لە کابرای جافە دەپرسێت: کێیت و چ کارەیت؟

دەڵێت: قوربان راوچیم و راوە رێوی دەکەم. دەڵێت باشـە ئەم هەرا و بەزمە چییە لە خۆتت ئاڵاندووە..؟

دەڵێـت: قوربان ئەگەر لە حوکمی تفەنگدا بێت تەقەی لێ دەکەم. ئەگەرنا تانجی تێ بەردەدەم. ئەگـەر رۆیشـتە کونەوە ئەم توڵەیەم بـۆ ئەوەیە و بەم گالۆکەش دەی ئاخنمـە ناو کونەوە. هەر نەهاتە دەرەوە ئەم چەخماخە ئاگر دەکەمەوە و قانگی دەدەم.

مسـتەفا بـەگ لە وەڵامـدا دەڵێت: ئەگەر مـن رێوی بم دەسـتەوبرد خۆم تەسـلیم دەکەم و تەواو.

# عەبدوڵڵا جافی فەرماندە

دوای مرنــی مەلیکشــای ســەلجووقی، زۆرتر وا دیــارە ژەهرچێژ کرابــوو، ژنەکەی بە ناوی «تــورکان خاتــوون» لە جوانی و نازداریدا ســەرتەلی تەواوی نازدارانی ســەردەمی خۆی بووە، ئەودەم ململانێی دەســەڵات لە ناو دەرباری ســەلجووقیدا شمشــێرەکانیان لا لا مووی کردووە و هەر گرووپ و دەســتەیەک بە تەمای دەســەڵاتی زۆرتر بووە، بە تایبەت دەرباری شــادا پیلان و داو و کەپکــە نانــەوەی خوێناوی کارو کردەوەی رۆژانەی ناو دەربــار بووە، لە ئاوا رۆژگارێکدا «تــورکان خاتوون» دەکەوێتە تەقەلای بەدەســتهێنانی تاجی شــاهی بــۆ محەمەدی کوڕی، بەڵام رووبەڕووی تەقەلا و بەربەرەکانێی دەسەڵاتەکانی ناو بنەماڵەی ئومەرای سەلجووقی دەبێتەوە.

تورکان خاتوون، بنە و بارەگای پێچایەوە و بیست هەزار چەکداری پۆشتەی خستە تەک خۆی و لە بەغداوە خۆی گەیاندە ناوچەی کرماشــان، کە مەنزڵگا و هەوارگەی راستەقینەی عەشایەری کــوردی ئەو وەختەی بووە. تا یارمەتی لە دوو عەشــیرەتی دەســەڵاتداری ئــەو دەمە وەربگرێت «کەلهــوڕ و جاف» و عەشــایەری دیکــەی ئەو دەڤەرە. تێکڕای عەشــایەر بڕیــاری یارمەتیدانی «تورکان خاتوون»یان دا و بیســت هەزار چەکداریان لە دەوری کۆکردەوە. هەر ئەو هێزە ترس و چەکــەرە و تۆقیانیــان خســتبووە دڵــی تەواوی دەســەڵاتدارانی دوور و نزیکــەوە و «تورکان خاتوون» یەکێک بووە لەو کەسانەی دامودەزگای «حەسەن سەباح» دەکۆشا لە ناوی ببەن، ئەوە بــوو یەکێــک لە فیداییەکانی خۆیــان بۆ لەناوبردنی تەرخان کرد و لە تەقەڵلایەکدا ســەرنەکەوتن، تەنیا رانی تورکان خاتوون بریندار کرا و بەو زامەوە نەمرد و برینەکەی چاک بوویەوە و تورکان خاتوون کەوتە کۆششی لەناوبردنی حەسەن سەباح، نەوەد هەزار دیناری زێڕی دا بە «نووردین کەلهوڕ»، کە ئەوکات ســەرۆکی عەشــایەری کرماشــان بوو، تا پەلاماری حەســەن سەباح بدات، بەڵام «نوورەدین» پارەکەی وەرگرت و ئەو کارەشی نەکرد. بە فەرمانی تورکان خاتوون، واعیز ئەولحەسەن فەرماندەی تێکڕای لەشکر، کەوتە فکری تیرۆرکردنی «نورەدین»ەوە و لەو کارەیدا سەرکەوت و نوورەدین کوژرا..

دوای کوشتنی نوورەدین کەلهوڕ، عەبدوڵڵا جاف بەهێزترین کەسایەتی عەشیرەتی و مەیدانی کرماشـــان بوو جێگەی نورەدینی گرتەوە. لەو بیگرە بەردەی بەدەستهێنانی دەسەڵاتدا و ململانێی نێوان «ئەلەموتیان» و تورکان خاتووندا، چەندین فەرماندەی دیکەی ناو عەشـایەری کرماشـــان تیرۆر کران، تەنیا کەسێک لەو بکوژبکوژ و هەرا و خوێنڕشتنەیدا توانی خۆی بپارێزێت، «عەبدوڵڵا جـاف» بـوو. توانی بکوژی نوورەدین کەلهـوڕ، کە بە رەگەز عارەب بوو، فەرماندەی سـەربازە عارەبەکان لایەنگیری تورکان خاتوون دەستگیر بکات، بەڵام لەو کاتەدا تورکان خاتوون دەمرێت و «عەبدوڵڵا جاف» دەبێتە فەرماندەی گشتی تەواوی لەشکر و سوپا، هەر لەو کاتەدا «بیرکیارک» جێگەی مەلیکشای سەلجووقی گرتەوە و هەر لە شاری ئەسفەهاندا فەرمانڕەوایی دەکرد، عەبدوڵڵا جافی فەرماندەی گشتی پەیامی نارد بۆ «بیرکیارک» کەوا تەرم و دارایی تورکان خاتوون چی لێ کات؟. لەوەڵامدا دەڵێت: تەرمەکەی لەوێدا بنێژن و دارایی و ئیرسەکەی بداتە خزم و خوێشانی.

عەبدوڵـــڵا جاف هەر وا دەکات، بەڵام لە پێشـدا مەعاش و مافی سـەربازە عارەبەکان دەدات و دەیاننێرێتـەوە بۆ بەغدا فەرماندەکەیان «واعیز ئەبولحەســەن» لە تۆڵەی کوشـتنی «فەریدون کەلهوڕ»دا سەردەبڕێت.



عەبدوڵڵا جافی فەرماندە

# عەزیز پشتیوان

ئــەوەی نــاوی خانەقیــن و مێژووی «خانەقــی» زانیبێت، نــاو و دەوری کوردایەتی «عەزیز پشتیوان»یش بەشێکە لەو زانیارییانەی.

عەزیــز پشــتیوان، یەکێک بووە لــە ئەندامانی حیزبی «هیــوا» و لە ســەرەتای ژیانیدا ئەوی پێــی کراوە بۆ کوردایەتی کردوویەتی لــەو رێگەیەدا زەرەر و زیانی ماددی و ئازاری گیانی زۆر دیوە. لەبیرمە ســاڵانی ١٩٥٨-١٩٥٩ز، لە شاری خانەقیندا قوتابی بووم، گەرمەی بگرە و بەردەی «لاوان- گەنجان» بوو، شــەڕی رۆژانەی شار پەیوەستە بەردەوام بڵێسەی دەسەند. هەر بۆخۆم لەو شــەڕانەدا چەندین جار ســەرم شــکاوە. عەزیز پشــتیوان، دوو کوڕی لە پێناوی کوردستاندا شــەهید بووە، هەرچەندە ئەو پیاوە هێندە بایەخی بە تیرە و عەشــرەتگەرییەوە نەداوە و نەدەدا، بەڵام جارەوبار دەیوت: من لە عەشیرەتی جافم و لە تیرەی نەورۆڵی..

# حسەینی ئەحمەد بەگ

ڕەنگە بە باشی نەتوانم دەربارەی کەسایەتی ئەم پیاوە بنووسم و حەقی خۆی بدەمێ، ئەمەش دەکەوێتە سەر ئەوەی کە بۆخۆی لە بیروڕایەکدا بوو کەوا لە هەموو شتێکدا بەش خوراو و حەقی پامالّ کراوە، وەک لێی بیستراوە گوتوویەتی:

«کە مردم، بەدواما دەنێرن. خودا بەسەر عەرشەوە دانشتووە، چەندین مەلایکە دەوریان داوە، کە دەڕۆمە ژوورەوە، خودا دەفەرموویێت: ئەمە کێیە؟. دەڵێن: پەروەردگارا ئەمە حسەینی ئەحمەد بەگە. جا خودا دەفەرموویێت:

لێی گەڕێن با بڕوا بۆ بەهەشت، لە ژیاندا زوڵمی زۆری لێکراوە..

ئەگەر نەداری و بێ دەرەتانی سەری لێ نەشێواندایە دەیتوانی وەک دیاردەیەکی فەلسەفی و عیرفانی ناوی هەمیشە هەبووایە، حسەین تا بڵێی وردەکار و زیرەک و قسەخۆش و خاوەن بیروڕای تایبەتمەندی خۆی بوو.



حسەینی ئەحمەد بەگ
١٩٩٥-١٩٣٦

## حوسێنی ئەحمەد بەگ دەیوت:

خودا ئەندازەیەک خواردن و خواردنەوەی بۆ هەر مرۆڤێک داناوە، برێک بە پێی نیاز و لەسەر خۆ سوودی لێ وەردەگرێت و تەندروست دەمێنێتەوە و تەمەنی درێژ دەبێت و برێکی تریش وەک نەدیو و بدی، زیادەڕەوی دەکا و تەندروستی تێکوپێک دەچێت و زوو دەمرێت.

حوسێن لە بازاڕی لەنگەدا پانتۆڵێکی سەند و بەهەر جۆرێک بوو فرۆشتییە یەکێک لە خزمانی بە سبەینێدا خزمەکەی هات و وتی: کاک حوسێن بە نیوە قیمەت دەتدەمەوە وەڵامی دایەوە:
«ئەو پانتۆڵە بە ئاگری جەهەنەم ڕۆڵەی دە تەنی گەرم کەیت ئوتو نادرێت. ئەوە هەر لایەقی تۆیە. قیرسپی بوو تا فرۆشتمە تۆ، لاچۆ بەولاوە»

## قسە خۆشەکانی خوالێخۆشبوو
## حسێن بەگ

١- ئەیوت: ئەگەر خزمی قەحپەباب بهێڵێت خۆم هیچ موشکیلەیەکم نییە..

٢- ڕۆژێک دەچێتە لای ئافرەتێک، هیچی بۆ ناکرێت، دەست دەکات بە جنێودان بە خزم، دەڵێت: ئەگەر ئەوان نەبوایەن بۆ وام لێ دەهات، ئەوەندە بێ فیتامینم کێشا کێرم هەڵناسێ.

٣- ڕۆژێ لە کفری لەگەڵ دووکاندارێکدا کەوتە قسە وتی دایی من لە پەنجاکانەوە ئەم دووکانەی تۆ دەبینم، ئەوە پەنجا ساڵە هیچ گۆڕانکارییەک نەهاتووە بەسەر شتەکانتا، ئەویش وتی: میران چی بکەم. ئەمیش وتی: تورەکە لای ڕاستەوە بخەرە لای چەپ، تەماتە لای چەپەوە بخەرە لای ڕاست، پەتاتە لە دەرەوە داینێ، پیاز بخەرەوە سەرەوە. کابرای دووکاندار دەستی بە پێکەنین کرد.

٤- لە بانسنوق ژن بە ژنێ کرا، حسێن ڕۆیشت سەیری بووکی کرد وتی: بە قەبری ئەحمەد بەگ مەیموون بە ژنتان کردووە، لەبەر ئەوەی یەکێکیان جوانە و ئەوی تریان ناشیرینە..

٥- ڕۆژێک بانسنوقییەک وتی: ئەرێ حەسەن بەگ تۆ گەورەی یا حسێن بەگ؟
ئەمیش وتی: من و حەسەن بە قەبری ئەحمەد بەگ عەلی بەگمان بینیوە بە باوەش حەسەنەوە ژێری دەکردەوە.. (عەلی بەگ باوکی حەسەن بەگ بووە).

٦- جارێک مدیر شارەوانییەکان گلەیی لە حسێن دەکات دەڵێت: شارەوانی قەرەداغ زۆر پەرپووتە،

ئەویش دەڵێ قوربان مەعاشەکەم جوانە هیوامان هەیە جەنەڕاڵ کەناس سێ ئەوەندەی من وەردەگرێ، منیش بە گوێرەی مەعاشەکەم خۆم هیلاک دەکەم.

٧- ئێوارەیەک وتی: با بڕۆین بۆ نادی، منیش وتم ئەمشەو جومعەیە نایەم، وتی: ئەی کێ دەزانێ لەوانەیە ئەمشەو سێشەممە بێت.

٨- خزمێک داوای کچێکی خزمی کردبوو، کچەکە وتبووی شووی پێناکەم باڵای کورتە، حسێنیش ئەیوت .........؟

٩- حەزی لە کچێ دەکرد، ئێواران بە بۆنەی قاوە خواردنەوە دەچووین بۆماڵیان، حەسەن وتی: حسێن جومعەی سەید ناجح بووە لە دووی سەرەتایی با بڕۆین بۆ ماڵیان بۆ پیرۆزبایی. حسێن دەگەیشتە هەر کەسێک دەیوت: بڕۆین بۆ ماڵی سەید، خەڵکەکە ژمارەیان گەیشتە ١٥-٢٠ کەس، حسێنیش زۆر پێی ناخۆش بوو، وتی: ئەرێ حەسەن بۆ دەکرێ جومعەی خوێڕی جامعەی ئۆکسفۆردی تەواو کردووە، بە قەبری ئەحمەد هیچ تەواو ناکا، ئێستا جومعە کرێکارە لە کەرکووک.

١٠- رۆژی جەژن لە ماڵی عەلی بەگ لە بانسنوق نانی جەژنمان دەخوارد، حسێن بەگ وتی: وەڵڵا لە ئێستاوە هۆڵی ساڵێکی ترم لێهاتووە، ئەوەندە دەترسم لە رەمەزان. پیاوێکیش لەوێ بوو، ناوی حەمەی ئەمنە بوو، ئەم پیاوە تاقمێ دانی لە دەمدا بوو، تاقمەکە تازە بوو، نەیدەتوانی باش قسە بکات، حەمە وتی: وەڵڵاهی حسێن بەگ حەزم دەکرد ئەی رەمەزانە بیایە بە دوو مانگ، حسێن بەگیش یەکسەر وتی: یارەبی تۆیش تا ماوین دەم و پلت هەر وابێت، فڵتە فڵت..!!

١١- رۆژێک لە سلێمانی دیم، دوای چۆنی چاکی، وتی: وەڵڵا سەیران کوڕێکی لەبار چووە، ئەگەر بمایە وەڵڵاهی بە کەبسە لە ئاسمان تۆپی دەتەقان. (سەیران ژنی بوو).

١٢- لە بانسنوق شەوان لەسەر پشت دەکەوت بە پەنجە لە بۆشایی ئاسمان شتی ئەنووسی و ئەیسڕیەوە. حەسەنیش ئەیوت: خوا خراپت بۆ بکا لەم ئاسمانگە پان و بەرینە بۆ ئەیسڕیتەوە خۆ تەختەڕەشەکەی مەکتەب نییە، ئەویش ئەیوت: وەڵڵاهی وا ئەزانم ئاسمان تەختەی مەکتەبە..

١٣- ئەیوت: بۆ بژێوی ژیان لە «تحت التکیەی» بەغا کراس و پانتۆڵ و پاڵتاوم ئەهێنا بۆ فرۆشتن، هەرچی خراپ بوایە جیام ئەکردەوە، ئەموت: خالی بەگ ئەوانە نافرۆشم هی خۆمن، خاڵی بەگیش ئەیوت: وەڵڵاهی منیش ئەوانەم دەوێ، بەو جۆرە سەرفم دەکرد.

١٤- رۆژێک لە ئاوایی زەرداو، ئاوی بۆ ئەهێنن، لە دوای خواردنەوە ئەڵێت: دادەگیان ئێوە خوێ ئەکەنە چێشت. ژنە دەست ئەکا بە پێکەنین..

١٥- رۆژێک پارچەیە قوماشی لەگەڵ حەسەن گۆڕییەوە داوای باقی لە حەسەن ئەکرد، حەسەنیش وتی: قوماشەکەی من لەوەی تۆ باشترە، حسێنیش وتی: وەڵڵاهی ئاوی «بحر الابیض المتوسط» رۆڵەی جادەکوتانەوە لە ئاگری جەهەنەم سووری بکەرەوە بەسەریا بڕوا وتوو ناکرێ.

١٦- ڕۆژێک پاڵتۆیەکی فرۆشتە حەسەن، دوای چەند ڕۆژێک بە حەسەنی ئەوت: ئەوە چی ئەکەی لەناو ئەو پاڵتاوەدا. چونکی زۆر گەورە بووە.

١٧- حەمەی برایم لە زەنگاوات لە خوارووی بانسـنوق دادەنیشـت کچی شێخ حسێنی هێنابوو بۆ ئەوەی بڵێن فێری کوردی کوردی ڕەسەن بووە کە قسەی ئەکرد (ئەیوت لەتەک عاسمە پێکەوە چیمان بۆ مەحەتە (مەحەتەی قیتار).

١٨- ڕۆژێک منالێکی بچووک ئەبینێ ئەڵێت: بە قەبری ئەحمەد بەگ ئەو منالە سـیحربازە چونکی گوەکەی لە خۆی گەورەترە.

١٩- حەمــەی عەلی بەگ لە خانەقییەوە ئەهات بۆ بانسـنوق بـۆ داوای واردات، هەموو جارێ کە ئەهات پیاوێکی لەگەڵ خۆی ئەهێنا، ئەو قسـەی ئەکرد چونکی حەمە بەگ زۆر فەقیر بوو، ڕۆژێ حسـێن بـەگ لەوێ بوو کە حەمە بەگ دەرئەکەوێ حسـێن بەگ ئەڵێ ئـەرێ وەڵڵا حەمە بەگ و زوانەکەی هاتن..

٢٠- ئەیـوت لە مردن ناترسـم، لەوە ئەترسـم کە معـەوەق بم.. ئاخر لەو دونیا لـە تەعزیبدا خوا ناناسن.

٢١- برادەرێک ناوی شەفیق بوو، کوڕەکەشی ناوی شیڤان بوو، حسێن ئەیوت بە قەبری ئەحمەد بەگ لە خۆمەوە تا سەید ئەحمەدی باپیرم ئەوەندە نوقتەیەمان تیا نییە.

٢٢- پیاوێـک ئەیـوت من ٤ کچم بوو کوڕمان نەدەبوو، سـاڵێک خـوا کوڕێکی پێ داین، یەک دوو سـاڵی پێ چوو حسـێن بەگم دی وتی: هەر ئەو کوڕەتان هەیە فلان کەس؟ وتم ئەرێ، جا حسێن بـەگ وتـی: دەئەزانی چی بکە بـۆ ئەوەی کوڕێکی تریتـان ببێت. وتم چی بکـەم؟ وتی: هەر بەو ئیتیجاهــە کـە کوڕی یەکەمتان بـوو ڕەوانەی کە. منیش وتم وەڵڵاهی حسـێن هەر لەبیرم نەماوە ئیتیجاهەکەی...

٢٣- ڕۆژێکیان فەیمە خان لێی تووڕە ئەبێ، ئەرێ حسـێن دنیا ئەپڕخێنێ کەس باسـیان ناکات بۆ تۆ دنیات لە من پڕ کردووە کە ئەپرخێنم. ئەویش ئەڵێ ئاخر مامۆژن گیان خەڵک شەهیقی پڕخەیە تۆش شەهیق و زەفیرت پڕخەیە..

٢٤- لـە وەختی عەبدولکەریم قاسـم جوندی ئەبێـت لە بەغا، ئەچێتە ئاودەسـتی زابتەکانەوە، کە دەرئەچێت پشـتی ملی ئەگرن و ئەیبەن بۆ لای ئامر. ئامریش ئەڵێت مەسـەلە چییە؟ سەربازەکان ئەڵێن: چووەتە ئاودەسـتی زابتەکانەوە، بە حسـێن ئەڵێ تۆ چی ئەڵێیـت؟ ئەمیش ئەڵێت: وەڵڵاهی سەیدی پیسی من لە هی ئەوان پاکترە، بۆنیشی نییە، چونکی من مەشروب ناخۆمەوە، ئامر دەست بە پێکەنین ئەکات ئەڵێت: من الآن فصاعداً خلو يخرّي بمرحاض الضابط.

٢٥- ڕۆژێک مسـتەفا بەگ و خالید بەگ و حسـێن بەگ و عەلی بەگ بەیەکەوە ئەڕۆن بۆ ماڵێک، مسـتەفا بـەگ ئەڵێت: خاڵی ئەوە بۆ دوا ئەکەوی؟ حسـێن ئەڵێت: بەرخـێ لە ناوگەلانیدایە هەر وا

ئەتوانێت رێ بکات.

٢٦- یەکێک مردبوو، ئەوانەی لەوێ بوون ئەیانگێڕایەوە وتیان مریەم حەشری کرد بە خۆ کوشتن. حسێنی برایشی وتی: وەڵڵاهی گۆڕباتشۆف بمرێ هەر وای بۆ ئەکات.

٢٧- رۆژێ ئەیـوت: حەقە زیباخان و مهتاوەخان و دڵســتانی حســێن بەگ مریەمی خوشکیشــم تەبەرع بکەینە مەرکەزی ئەقمار بۆ ئەوەی بۆ تەجروبە بیاننێرین بۆ فەزای خارجی.

٢٨- رۆژێ جەماعەت یاری وەرەقە ئەکەن، حسێنیش متفرج ئەبێت یاری ناکات، لەناکاو یەکێکیان داوای پارەی لێ ئەکات، ئەمیش ٣٠ دیناری سویســری پێ ئەبێت، لە شەســتەکان، پارەکە رۆیشت چەند جارێک داوای کرد بێ سوود بوو، جا بە منی ئەوت بە قەبری ئەحمەد بەگ بەم نەوعە یاری بکەم لە مونتی کارلۆ یاری ئەکەم.

٢٩- لە پرســەیەکدا حەمەی ئەحمەد بەگ خەڵکەکەی ئەخســتە گریان، حسێنیش ئەیوت بە قەبری ئەحمەد بەگ چلتوک بدەرە چاویا تۆزی لێ هەڵئەسێ ئەم خەڵکەش ئەخاتە گریان.

٣٠- حسێن ئەیوت، ژنی سلێمانی کە ئەچنە تەعزیە هەر ئەڵێن وش وش وش، هەروا دانیشی ئەوە هەموو رستەکەیەتی.

٣١- رۆژێک حســێن جگەرەی تەرک کردبوو، جا ئەوەی جگەرە تەرک بکات حەزی لە شــیرینییە، لــە جــادەی ئوروزدی کابرایەک گەزۆی ئەفرۆشــت، حســێنیش گەزۆیەکی هەڵگــرت، تومەز لەو گەزۆیانەیە کە دان بەرنادا، لەو ساتەدا دولستان خان تێپەڕ بوو وتی: حسێن بەگ چۆنی باشی؟. حســێنیش گــەزۆ دانی گرتــووە، هەر چی ئەکا ناتوانێ جوابی دولســتان بداتــەوە، دوورکەوتەوە تووڕە بووبوو، ئەیوت ئەرێ ئەم ناشیرینە لە کوێوە پەیدابوو..

٣٢- رۆژێک باسی هێلکەمان ئەکرد، یەکێک لە دانیشتوان وتی وەڵڵاهی من ساڵێ ٥ هێلکە ناخۆم، حســێن بەگیش وتــی: وەڵڵاهی من ئەوەندە هێلکــەم خواردووە لە توێکڵەکەی تەســبیتی حدودی عێراق و ئێرانی پێ ئەکرێت.

٣٣- رۆژێ کەریمی حەمە بەگ، زۆر ئەخواتەوە، حسێن بەگ ئەڵێ بە قەوری ئەحمەد بەگ لە ناو مەعیدەی کەریمی حەمە بەگا مێز دانراوە و سێ چوار کەس ئەخۆنەوە، کەریمیش مەشروبیان بۆ ئەکاتە خوارەوە.

٣٤- لــە رەوەکدا لە نەوســو بووین، بارانێ زۆر بە لێزمە تەواو بــێ تاقەت بووبووین، رۆژێکیان ســەعاتێ دووان ســایەقە بوو، لە ناکاو هەورێکی بچووک هات ئەوەندەی فەرشــێ ئەبوو، حسێن بەگیش وتی: وەڵڵاهی ئەو تۆزە هەورە ئەوەندەی بەحری ئەبیەزی متەوەست ئاوی پێوەبوو..

# مەلا قادری حەمە سەفەر
## 1953-1867ز

لە دێی ژاڵەی هۆرێندا هاتووتە دونیاوە، هەر بە منداڵی دەخرێتە حوجرە، لە تیرەی «وەلی»یە، وەک هــەر فەقێیەک شــەیدای خوێندن، مزگەوتی شــاران گەڕاوە، لە هــەر باخێک گوڵێکی چنیوە. لە مزگەوتی گەیلانی، مەریوان، بیارە خوێندوویەتی، هەر لە وێڕا خەرقەی ســۆفیەتی لەبەر دەکا دەبێتە پەیڕەوی تەریقەتی نەقشبەندی.

# لیزا جاف

لیزا خانمی جاف، یەکێک بووە لە سەردەمدارانی ئەهلی حەق و شیعری وتووە و «تەمورە»شی جوان لێداوە، ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی:

**حەیدەر سەراف حەیدەر سەراف**
**چەندی نەعینە ییم نە کچ قاق**
**ئەیەسا واچان یەنم کچە جاف**
**قەباڵەی مارەی نەتاش مەساف**

ئەم خانمە جافە، لە ســەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاوە و لە ســەدەی پێنجەمدا «بابا نائوسی» جــاف، گــەورەی یرێکی ئەهلی حەق بووە، ژیــاوە و پەیڕەوانێکی زۆری لــە دەور کۆبوونەتەوە، عابدینی جاف کە لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا ژیاوە، ئەمیش یەکێک بووە لە پیرە بەناوبانگەکانی ئاینی ئەهلی حەق.

# میرزاد ئەبولهەیجای کوڕی عەبدوڵڵا جاوانی
# 559-554 ک

کـوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جارسـی جاوانی بـووە، لە لایەن خەلیفەی ئـەو وەختەوە زنجیرە دەسـەڵاتی عەباسـییەوە دەکرێتە فەرمانڕەوای دەڤەری حیلە، دیارە ئـەم میرزادەیە لاواز و کەم لیاقـەت بـووە و بڕێکی دیکە لە خزمانی جاوانی فەرمانیان بە ڕێگەوە نەبردووە و بە دوای ئەودا ئیدی میرنشینی جاوانی لە ناوچووە و جاوانییەکان وردە وردە گەڕاونەتەوە کوردستان.



میرزادە ئەبولهەیجای کوڕی عەبدوڵڵای جاوانی

# ئەمیر سەیفولدەولەی جاوانی
# 487-367 ک

کوڕی وارامی جاوانییە، لە لایەن خەلیفەی عەباسـی «موقتەدا» بە ئەمری خودا ٤٦٧–٤٨٧ک کراوەتە میرنشـین، زۆرتر حەزی لە شـیعر و ئەدەبیات بووە، دیوانەکەی پڕ بووە لە شـاعیر و ئەدیب، کە مردووە تەرمەکەیان لە تیسفون نێژراوە، کە نزیکی نوعمانییەی ئێستایە.



میرزادە سەیفولدەولەی جاوانی

# ئەمیر فەخرودینی ئەبو محەمەدی عەنتەری جاوانی
# 495-517 ک

لە لایەن موســتەزهەر بیللای عەباسییەوە کراوەتە فەرمانڕەوای حیلە، لاشەڕ و گۆشەگیر و دیندار بووە، تەنیا لە شەڕێکدا بەشداری کردووە، کۆمەڵێک پەلاماری بەغدا دەدەن، ئەم میرزادەیە دەڕواتە هانای خەلیفەوە.



میرزادە فەخرودینی ئەبو محەمەدی عەنتەری جاوانی

# میرزادە زیائودینی موهەلهەلی جاوانی
# 472-495 ک

کوڕی ئەبو عەسـکەری جاوانی بووە، ئەویش دیسـان بە فەرمانی خەلیفەی عەباسی بووە بە میرنشین، هیچ ڕووداوی گەورە لە سەردەمی ئەم میرە «جاوانی- جاف»ەدا ڕووینەداوە.



میرزادە زیائودینی موهەلهەلی جاوانی

# ئەبو نەجمی جاوانی
# 457-455 ک

دوای مردنی ئەبولفەتح، براکەی دەبێتە فەرمانڕەوای میرنشینی جاوانی و تەنیا دوو ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە، ئازا و لێزان و بە تەگبیر بووە، دیارە لە لایەن خەلیفەی عەباسییەوە خۆشەویست نەبووە و لابراوە و وارامی کوڕی ئەبوفەراسی جاوانی جێگەی گرتۆتەوە.



میرزادە ئەبونەجمی وارامی جاوانی

# ئەمیر ئەبو دەلەفی کوڕی قاسمی محەمەدی جاوانی
# 439- ؟

دوای مردنی براکەی ٤٣٩ ک بە پێی فەرمانی خەلیفەی عەباسی «قائم بە ئەمری خوا» ٤٢٢–٤٦٧ک، کرایە میری میرنشینی حیلە و دەوروبەری، سەرەتا کەوتە کۆکردنەوەی سوپا و سانەوە لەو کاتەیدا سوپای «غەز» پەلاماری حیلەی دا و ئەمیر ئەبو دەلەف کەوتە بەرەنگارییانەوە و راویانی نا ٤٣١ک. جەلالودەولەی بوەیهی لەشکرەکەی لێ هەڵگەڕابوویەوە پەنای هێنایە بەر ئەم میرە جاوانییە و لەشکرێکی خستە تەکی و دووبارە دەسەڵاتی بەدەست هێنایەوە ٤٣٢ک. حوسامولدەولە ئەبوشوک لەگەڵیدا بوو بەهاوپەیمانی شاری بەندەینج کە بگاتە شاری مەندەلی ئێستایان گرتووە ٤٤٤ک. و سەعدی ئەبوشوک پەلاماری حیلەی داوە و ئەمیر ئەبودەلەف نەیتوانیوە بەرگری لێ بکات و حیلەی بەجێهڵاوە و دوای ماوەیەک گەڕاوەتەوە شاری حیلەی گرتووەتەوە، ئەم دەسەڵاتە کوردە جافە ١٦٢ ساڵ فەرمانڕەواییان کردووە.



میرزادە ئەبودەلەفی کوڕی قاسمی محەمەدی جاوانی

# سەردار جاف

سـەردار جاف تەواوی مەرجەکانی فەرماندەیی و سـەرۆکایەتی تیادابوو، لە تەنگانە و بۆنە هاتنەکاندا شاسواری مەیدان و پاڵپشتی کەسایەتییە هەژارەکان بوو، تەواوی شیرازەکان لە گێژەنگە و تەرازابوون، بێ خێوی و خاوەنی لەناو تەواوی هۆزی جافدا ریشووی داکوتابوو. دەستە دەستە بەندی و حیزب و حیزبایەتی و لایەنداری زۆر لە دەڤەرەکانی بەسـەریەکدا هاڕاندبوو... سـەردار جاف توانی لە ئاوا ئاشوفتە و بازاڕێکدا زۆر گفتاری ناو عەشیرەت ئاسان بکا.

سـەردار کوڕی گـەورەی داود بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشـای جافە، دایکی لە شـێخەکانی تاڵەبانی بوو، لە دوای هەرووژانی پاشـایەتی لە ئێراق لەگەڵ باوکیدا بەرەو ئێران کۆچ دەکەن و لەوێدا دەگیرسـێنەوە. محەمەد رەزا شـای پەهلەوی شای ئەو وەختە نەوازشێکی زۆر و رێزێکی بەربڵاوی زۆری لێدەگرێت.

سەردار جاف، کە بۆ ئێران رۆیشت، ناوەندی تەواو کردبوو، لەوێڕا دەڕواتە کۆلێژی زانیارییە سیاسییەکانەوە و بەکالوریۆس و دواتر ماجستێر لە هەمان رشتە وەردەگرێت.

کاتێـک لـە زانکۆدا بـووە، لەگەڵ زۆربـەی قوتابییـە خوێنگەرمەکانی کـوردی ئێراندا تێکەڵ دەبێـت و ئـەوی لە توانایدا بووە بـۆ رێبازی کوردایەتی کردوویەتی. بەندە لە سـاڵانی ٦٢-٦٣دا بە پێشـمەرگەیەتی رێم کەوتە ئێران و لە گەڕانەوەدا زیاتر لە باری دە هێسـتر دەوا و دەرمانی کۆکراوەی هاوڕام کرد و هێنامەوە بۆناو پێشـمەرگە، ئیدی ساڵانێک لەو جۆرە خزمەتگوزارییەی بـەردەوام بـوو. دوای هەرووژانی شاهەنشـای ئێران و ئیعدامکردنی «سـالار جاف»ی برای لە لایەن جەمهوری ئیسلامییەوە گەڕایەوە بۆ وڵات.

هەزاران کەسـی لە عەشـیرەتی جافی لەگەڵدا گەڕایەوە بۆ عێراق. کاتێک شەڕی نێوان ئێران و عێراق دەسـتی پێکرد، چەند سـاڵێک بەهێزەوە لەگەڵ جەمهوری ئیسلامیدا بەشەڕ هات و لەبەر ئەوەی حکومەتی بەعس ویسـتی ئەو هێزەی بەدەسـتی سەردار جافەوە بوو، بۆ شەڕی ناوخۆی براکوژی بەکاری ببات، سەردار جاف رازی نەبوو و لەو شەڕە کشایەوە ئەوی لایەنگیرانی بوون، دووریان خستەوە بۆ سارای دەوروبەری رەمادی.

سـەردار جاف، ئازا بوو، سـەخی بوو، هێمن و لەسـەرخۆ بوو، رۆڵەی مەیدان بوو، کوڕی تەنگانە بوو، ئیدی هەڵکەوتووی سـەردەمی خۆی بوو. بە دەردێکی کوتوپڕ کۆچی دوایی کرد و لە ئەمریکاوە تەرمەکەی بۆ وڵات هێنرایەوە. لە شاری کەلار نێژراوە.

# عادیله خانم
# 1924-1859ز



عادیلـه خانم، ژنی دووەمی عوسـمان پاشـای جـاف و کچی عەبدولقادر بەگی سـاحێبقرانی شاری سنە بووە، ئافرەتێکی زیرەک و لێهاتوو کاردان و بەهێز و توانا، دۆستداری شیعر و شاعیر و ئەدەب، بەخشندە و دەست بڵاو و بەهیممەت.

عادیلە خانم، قەدەغەی کردبوو لە دیوەخانەکەیدا بە زمانی تورکی بدوێن، کاتێک ئینگلیز عێراق داگیر دەکەن و دەسـەڵاتی کوردسـتان بە دەسـتەوە دەگرن، عادیلە خانم ئەوەی بۆ دەرکەوتووە

کەوا دەسەڵاتی دواکەوتووی عوسمانی کاتیان بەسەرچووە و ژیان و گوزەرانی دنیا وا پێویست دەکات لەگەڵ ئەو قودرەتە تازەیەدا مامەڵە بکرێت و لە دەست بە یەخەیی میللەتەکە بە دوور بێت. لە لایەکی ترەوە لەسەر موڵکداری و ناکۆکی موڵکایەتی و دەسەڵات لەگەڵ شێخ مەحموودی حەفیدا، ناڕێکی دەکەوێتە نێوانیانەوە، ئەو ناکۆکییە رۆژ بە رۆژ پەرە دەسێنێت.

مینۆرسکی دەڵێت: لە ساڵی ١٩١٤دا رێگام کەوتە شاری هەڵەبجە چوومە خزمەتی عادیلە خانم، بە چاکی زمانی ئینگلیزی دەزانی، شاژنێک بوو بۆ خۆی، دیوانەکەی لە دیوانی شازادەکانی عەباسی دەچوو، تەواوی دەست و پەنجەی پڕ بوو لە ئەنگوسیلەی زێڕ و ئەڵماس، عادیلە خانم دایکی شاعیری نەمر ئەحمەد موختار جاف و تایەربەگی جاف بووە.



عادیلە خانم لە نێوان ئەحمەد موختار جافی کوڕیدا و حەسەن فەهمی جافی کچەزایدا

# حەسەن فەهمی جاف
# 1973-1906

حەسەن بەگ کوڕی عەلی بەگی مەحموود پاشایە، لە دایکەوە کچەزای عوسمان پاشای جافە لە چوار تەنیشتێکی پڕ لە دەسەڵات و ئوروستوکراتیدا پەروەردە بووە، زۆر پابەندی خاڵوانی «تایەر بەگی جاف و ئەحمەد موختار جاف» بووە، هەر لە منداڵییەوە عیشقی خوێندنەوە و ئەدەبیاتی بە لاوە گەلاڵە بووە..

فارسی، عارەبی، تورکی زانیوە. چەندین دەورە بووە بە نائیب لە پەرلەمانی ئێراقدا.

حەسەن بەگ، چەندین کتاوی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی هەیە لە بواری مێژووییەوە. بەندە زۆربەی ئەو کتێبانەم فۆتۆکۆپی کردووە و پاراستووە. حەسەن بەگ لەگەڵ زۆربەی نووسەران و مێژوونووسانی سەردەمی خۆیدا دۆستایەتی پتەوی هەبووە.



مەلیک فەیسەلی دووەم
حەمە ئاغای عەبدولڕەحمان ئاغا
حەسەن فەهمی جاف

# زایەر بەگی جاف

لە مێژووی هۆزی جافدا، زایەر بەگ یەکێک بوو لە ئازا و نەترس و ململانێکەری سەردەمی خۆی، دوای پەلاماری دەسەڵاتی ئەردەلان بۆ سەر هۆزی جاف، لە دەڤەری جوانڕۆ و غافڵگیرکردنی جاف، لەو شەڕەدا سەرۆکی هۆزی جاف و کوڕەکەی دەکوژرێت، ئەو شەڕە دەبێتە هۆی پەرتەوازە بوونی هۆزی جاف و بڕێکی زۆر لە تیرەکانی جاف، جوانڕۆ بەجێدەهێڵن و بەرەو ژێر دەسەڵاتی بابانەکان دەکەونە ڕێ و لەوێ نیشتەجێ دەبن. ئەو کۆچە بە کۆمەڵە، بە سەرۆکایەتی زایەر بەگی جاف بووە..

دوای ماوەیەک خان ئەحمەد خانی ئەردەلان، کە یەکێک بووە لە ئومەرای بە دەسەڵاتی ئیمارەتی ئەردەلان و دەستە راستی «نادر شای ئەفشار» بووە. لەگەڵ نادر شادا تێکدەچێت و بە سوپا و سانو تۆپ و لەشکرێکی زۆرەوە روو دەکاتە وڵاتی بابان، نادر شا نامە دەنووسێت بۆ زایەر بەگ بۆ بەرەنگاربوونی و توانا و رازاوەبوونی لەشکری ئەردەلانی پێ نەزانیوە، لەگەڵ خان ئەحمەد خانی ئەردەلاندا بەرەنگار دەبێت و لەو شەڕەدا دوو هێزی نابەرانبەر دەکەونە شەڕەوە، لەو شەڕەدا لەشکری جاف دەشکێن، زایەر بەگ لەو شەڕەدا دەستگیر دەکرێت و لە لایەن خان ئەحمەد خانەوە ئیعدام دەکرێت و مەزارەکەی لە چەمەرگەی لای شاری دەربەندیخانی ئەورۆیە.



زایەر بەگی جاف

# داود بەگی جاف
# 1905-1966ز

داود بەگی جاف، شیرین کەلام، رەفتار بەرز و پەسەند، ئازا و نەترس، حازر وەڵام، جوان خاس و شۆخ و شەنگ و جلوبەرگ رازاوە و بۆن خۆش، زمانی عارەبی، فارسی، تورکی بە باشی زانیوە، دەنگی زۆر خۆش بووە..

یەکێ بووە لە شۆڕەسوارانی شەڕی ئاوباریک، کە لەگەڵ کەریم بەگی برای مینە جافی برازایدا قارەمانانە جەنگیون. داود بەگ لە ناحیەی سەرقەڵا «مستەر لاین و قائیمقامی کفری دەستگیر کردووە و مەرجی بەڕەڵاکردنیانی بە ئازادکردنی براکانی لە کفری داناوە. کە لە لایەن دەوڵەتەوە گیرابوون». بەڕەڵای نەکردن تا براکانی لە زیندان ئازاد کران. داود بەگ لە چلەکاندا، دوای کۆچی دوایی کتوپڕی حەمە بەگی برای، دەبێتە نوێنەر لە پەرلەمانی ئێراقدا، لە پەرلەماندا هەمیشە بوێر و راستەوخۆ راستییەکانی درکاندووە، هەمیشە پشت و پەنای لێقەوماوان بووە. دوای لەناوچوونی دەسەڵاتی پاشایەتی لە ئێراق، لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمدا نێوانی تێکدەچێت، لە ساڵی ١٩٥٩ وڵات بەجێدەهێڵێت و دەڕوا بۆ ئێران و لەوێڕا رێزێکی زۆری لێ گیراوە.

داود بەگ لە ژیاندا سێ ژنی هێناوە:

١- خاوەر خانم، لە بنەماڵەی تاڵەبانییەکانە.

٢- مەلیحە خانم، کچی حسێن بەگی مەحموود پاشای جافە.

٣- رەعنا خانمی ئەحمەد بەگی جاف.

لەو سێ ژنە، نۆ کوڕ و چوار کچی بووە.



داود بەگی جاف

# عەباسی کەمەندی

کاتێک باس دێتە سـەر هونەرمەندێکی بە توانای وەک کەمەندی، بەلامەوە تۆزەکێک سـەخت و گرانە، تەنیا ئەوە بنووسـم لە هۆزی جافە. کەمەندی کوردە، کەمەندی مرۆڤە، کەمەندی موڵکی تەواوی خاوەن زەوق و شەوقی گەلانی دوور و نزیکە..

کەمەنـدی تابلۆکێش، کەمەندی غەرقـی دنیای رەنگاوڕەنگ، کەمەندی شـەیدای دەنگوڕەنگ، کەمەنـدی سەرسـوپوردەی ئـاوازە زەریفەکان و عاشـقی دنیای پڕ لە عیشـق و عاشـقی. خودا بیپارێزێت. ئەگەر کەمەندی دەردی کوردبوونی نەبووایە ئەوڕۆ لە دنیای پێگەیشتوو و تێگەیشتوودا هونەرەکانی عالەم گیر دەبوو..

ئـای دەردە «کورد»بـوون، چ دەردێکی بێ ئامانیت. من نازانم چەند، بەڵام زۆر لە لێهاتوویی کورد بەو دەردەوە لە دنیای فەرامۆشی و بێ دەرەتانیدا سەریان ناوەتەوە..

عەباسی کەمەندی، لە هۆزی «جاف»ە و لە تیرەی قەڵقاڵییە.

ئەم هونەرمەندە لە چەندین بواردا سەر رشتەی وەستاکارانەی هەیە جگە لە ئاواز و گۆرانی و مۆسیقا و شێوەکارێکی زەبردەستە، ئاهەنگ سازە، پەیکەرتاشە لە شیعر و هەڵبەستیشدا توانای دەرخستووە.

ئەم زاتە لە تیرەی قاڵقاڵی عەشـیرەتی گەورەی جافە، ئەگەرچی کەم لە خەڵوەتگای هونەری خۆی وەدەردەچێت پێوەستە لە دونیای هونەردا خەریکە و سەرکەوتووانە بەردەوامە.



هونەرمەند عەباسی کەمەندی

# تارا جاف

تارا جاف هونەرمەندێکی ئەم سەردەمەیە لە شێوەی کاریدا ئەوڕۆ ئاماژەی بۆ دەکرێت. ئەم خانمــە جافــە هونەرمەندە کچی جەلال بەگی حامید بەگی مەجید بەگی وەسـمان پاشـایە، دایکی خانمێکــی تورکی ئەســتەنبۆڵە بە ناوی «تــورکان» لام وایە زۆربەی هونەردۆســتانی کورد ئەم خانمە هونەرمەندە جافە دەناسن و ئاگاداری هونەرەکەی هەن، ئێستاش لە کاری هونەری خۆیدا بەردەوامە، بەتەمای کاروکردەوەی هونەری گەورەیە لە ئاستی جهانیدا.

تارا جاف کچی جەلال بەگی حامید بەگی مەجید بەگی عوسمان پاشایە، دایکی ناوی «تورکانە»، بە رەگەز تورکە، ئەم کچە هونەرمەندە بەگزادەیە هەرگیز لەناو بنەماڵەی بەگزادەی جافدا نەژیاوە و پەروەردە نەبووە، سەرتاسەری ژیانی لە ئەوروپادا گوزەراندووە، باوکی بەوەی رازی نەبووە گۆرانیبێــژی بکاتە پیشــە، بەڵام عشــقی ئەم کچە هونەرمەنــدە بە دنیای هونــەر و موزیک، هێڵە سوورەکانی تێک و پێکداوە و لە کولتوورێکی دامەزراوی چەند سەد ساڵە یاخی بووە و بە پەنجە هونەرمەندەکانی گوێگر دەباتە دنیای خەیاڵ و تێڕامان.

تــارا جاف، دیاردەیەکی تایبەتمەندی هونەرییە بــۆ خۆی رێگەیەکی گرتووە تا بە ئەوڕۆ هیچ هونەرمەندێکــی کــوردی پێدا نەچووە، ئامێری «چەنگ» یەکێکە لــە ئامێرە هەرە کۆنەکانی دنیای هونەر، زۆرتر لە دەربارەکانی شا و ئیمپراتۆرییەتەکاندا هونەرمەندان دەیانژەند..

لێــرەدا من پرســیارێکم بۆ پێــش دێت: «تارا جاف» بۆچــی تەنیا لە دنیای بەیــت و ئاهەنگە هەورامییەکاندا دەخولێتەوە، خۆ ئەو کارەی کردووە ئافەرین و ماڵی ئاوا، بەڵام خودی عەشیرەتەکەی خۆی خاوەنی هەزاران بەیتی خۆماڵی و پڕ لە مانایە، ســەدان گۆرانی تایبەتمەندییان هەیە، چەند جوان و ســەرکەتووتر دەبوو لە زندووکردنەوەی ئەو کولتوورە دەوڵەمەندەیدا دەســت بەکار با. ئەوی من ئاگاداربم تەواوی ئەو بەیتە هەورامییانە لە (بەهیە خانم)ی پوورییەوە فێر بووە.

مــن وەک کوڕە جافێک گلەییەکەم زۆرتر لە (بەهیە خانمی کچی حامید بەگی جاف)ە، دەبوایە بڕێک لە بەیت و باڵۆرەکانی ناو جافی فێرکردبا، تا وا نەزانرایە «تارا» خەڵکی هەورامانی تەختە، خۆ «تارا» کارێکی چاکی کردووە، بڕێک گۆرانی هەورامی بەو شــێوازە خســتووتە ســەر زاران، خۆزگە بڕێک لەم بەزم و گۆرانی ناو عەشیرەتە مەزنەکەی خۆشی بەو زمانەی خۆیەوە دەخستە روو، مەخابن..؟.

# بەهمەنی قوبادی

ئەوانەی ئاگاداری دنیای هونەری سینەما و وردەکاری فیلمسازییە دەزانن کاروکردەوەی ئەم هونەرمەندە گەیشتۆتە ئاستێکی جیهانی و ئەوڕۆ لە دنیای هونەری سینەمادا بەهمەنی قوبادی پەنجەی بۆ درێژ دەکرێت.

بەهمەن، تا ئێستا چەندین گرەوی گەورەی جیهانی دنیای کاری سینەمای پێدراوە و لە فیستڤاڵەکاندا کارەکانی لەسەر ئاستی جیهانیدا ناودەبرێن و رێزی لێ دەگیرێت.

ئاوا، هونەرمەندێکی گەورەی کوردە لە عەشیرەتی جافە لە تیرەی قوایی «قوبادی»یە، خۆیشی دەگەڕێتەوە سەر شاعیری هەمیشە زیندوو «خانای قوبادی».

ئاواتەخوازین نموونەی بەهمەن لەنێو میللەتەکەماندا هەر نەبێت چەند کەسێکی چون ئەوی تیا هەڵکەوێت...



# پەیوەند جاف

پەیوەنـد کوڕی بـارام بەگی جافە و یەکێکە لە هونەرمەندانی دنیای ئەمڕۆی ئاواز و مۆزیکی کوردی، هونەری کردۆتە پیشـە و ڕۆژ و شـەو بەو کارەوە سەرقاڵە و توانیویە لە دنیای ئاواز و گۆرانی کوردیدا ئەمڕۆ پەنجەی بۆ درێژ بکەین.



# عوسمان جاف
# 1998-1946ز

عوسـمان کوڕی عەبدولڕەحمان بەگی جاف، هەر لە منداڵییەوە سەروکاری لەگەڵ کاروباری هونەریدا بووە و ڕەنگ و پەڕەمووی بە دەستەوە گرتووە، لە قوتابخانەدا کاری هونەری نواندووە. بۆی نەڕەخسـاوە لە بـواری هونەردا درێژە بـە خوێندنی بدا. دەڕواتە کۆلیژی سـەربازییەوە و دەبێتە ئەفسـەر و کاری هونەری و تابلۆکێشانیشـی خۆشی ئەنجام داوە، ئەوڕۆکە گەلێک تابلۆی جۆراوجۆری لێ بەجێماوە و لە زۆر جێگە و شـوێندا هەڵواسـراون، حەیف مەرگ مەودای نەدا و بە نەخۆشی شێرپەنجە جوانەمەرگ بوو.

# شەهریار جاف

شـەهریار جـاف کـوڕی داود بەگی جافە و خاوەنـی پەنجەیەکی هونەرمەندانەیـە، لە دنیای ڕەنگدا هەنگاوی باشی ناوە و خاوەنی تاقیکردنەوەی خۆیەتی لە کێشانی دنیای سروشتدا دەستی بـاڵای هەیە. ئەمڕۆ لە شـێوەکاریدا پەنجەی بۆ درێژ دەکرێـت و ڕێبازێکی تایبەتی خۆی هەیە لە شێوەکاریدا.

# شوکور خەیات

ئـەوی نـاوی گەرمیانی بیسـتبێت، ئای ئایەکانـی دەروونی هەڵقڕچاوی شـوکور خەیات، بە بەشێکی سەرەکی ژیانی پڕ لە میحنەتی ئەو دەڤەرە دەزانێت.

شـوکور، هونەرمەندێکی خوداداییە بەهرەمەندێکی زگماکییە، شوکور نموونەی لێهاتوویەکی بـێ پشـت و پەنای کوردێکـە تەنیا بە ناڵە پڕ لـە ئازارەکانی خۆی دەلاوێنێتەوە، شـوکور ئەگەر پاچکەی مەکینەی دوروومانەکەی نەبێت موحتاجی نانی شەو دەبوو.

شـوکور لـە تیرەی «روغزایی» عەشـیرەتی جافـە و دوور لە تیرەکەی پـەروەردە بووە و سەرکەوتووانە تاکو ئەمڕۆ شێوەیەکی ڕەسەنی هونەری کوردی پاراستووە و لە کاروکردەوەکانیدا سەرکەوتووانە بەردەوامە.

# عەزیز وەیسی

ســاڵ ســاڵی ٢٠١٠ی زایینییە، گەورە و بچووک هومەنەرمەند «عەزیز وەیســی» دەناسێت، زۆربــەی زۆری خەڵکەکــەش تەوح و حەزیان لە شــێوەی گۆرانیەکانێتی، ئــەدا و ئەتوارەکانی بە لای خەڵکەوە دڵنشــینە. برێک شــێوەی ئەم هونەرمەندەیان لا ناپەسندە، سا لە رووی لێکدانەوەی ئەکادیمییەوە بێت یان ئیرەیی و حەســادەت، هەر کامیان بێت «عەزیز وەیســی» دەق شــکێنە و داهێنەرە، لە دنیای هونەردا هەمیشە وابووە، ئەوانەی رچەشکێنن و لاسایی کەسیان نەکردۆتەوە و شتی تازە بابەتیان نوواندووە سەرکەوتوو بوونە، مەرج نییە پەسندی تێکڕای خەڵک بن.

ئەشــهەدو «عەزیز وەیســی» رچەشکێنە و هونەرمەندە. ئەم هونەرمەندە لە تیرەی باوەجانی هــۆزی جافــە و وەک هــەر هونەرمەندێکــی کوردەواری کوێــرەوەری و بۆنەهاتــی زۆر دیوە و گەیشتووتە ئەم پلە و ئاستە. بۆیە شیاوی رێز و حورمەتە.



# مەولەوی تاوگۆزی

ڕەنگە دێرزەمان بخایەنێت تا ڕۆژێک لە ڕۆژان دیسان دونیای عیرفان و عالەمی سومەعەسەرایی ئەدەبیاتی کوردی شاعیرێکی کەی وەک مەولەوی تاوگۆزی تیا هەڵکەوێتەوە. بەندە لەوەی دوودڵم ئەو ڕووداوە دیسان ڕووبدا و میللەتەکەم دووبارە بێتەوە خاوەن شاعیرێکی کەی لەو بابەتە..

بەندە چۆن لە باوەڕێکدام سەردەمی پەیامبەران بەسەرچووە و پەیامبەرێکی ئاسمانی لە سەردەمی ئێمە و ئەوانی داهاتوودا ڕەنگە مەحاڵ بێت لەوەی دڵنیام سەردەمی پەیامبەرانی دونیای ئەدەبیش وەک مەولەوی، نالی، مەحوی، سالم، تایەربەگ و شێخ ڕەزا بەسەرچووە.

مەولەوی لە دونیای وردەکاری و فەلسەفە و عیرفانی ئیلاهیدا تا قووڵایی ئاسمان ڕۆیشتووە لە وردەکاری و زەرافەتکاری ئەدەبیدا شۆڕەسوارێک بووە بە تەواوی تواناوە ئەسپی ڕەسەنی خۆی تاو داوە، مەلەوانێک بووە لە قووڵایی دەریای هەزار بە هەزاردا دوڕ و مەرجانی غەواس ئاسا وەدەرهێناوە. پەکۆ لەو هەموو مەعریفەتە. ئافەرین بۆ عەقڵی پێگەیشتوو و تێگەیشتووی ئەو کەڵەشاعیرە، کە چەندە لە دەوروبەر و زەمانی خۆی گوزەراوە. بۆیە ئەو ناوە تا بە ئەوڕۆیش بە لای هۆشیارانەوە ناوێکە لە بیرنەچووە تۆمارێکە ئەزەلی شاد بێت رووحی ڕەوانی.

# شاعیره بەناوبانگەکانی هۆزی جاف

١. مەولانا خالید، لە تیرەی مکەیالی.
٢. نالی، مەلا خدری ئەحمەد شاوەیس.
٣. ئێل بەگی جاف.
٤. وەلی دێوانە.
٥. مەولەوی تاوگۆزی
٦. تاهر بەگ.
٧. ئەحمەد بەگی «موختار».
٨. مەلا مستەفای جوانڕۆیی.
٩. بێسارانی.
١٠. یوسف باسکە.
١١. گۆران.
١٢. محەمەد خانی حاجی ئەلوەند.
١٣. خانای قوبادی.
١٤. یەعقوب بەگی گود.
١٥. محەمەد ئەمین بەگ «مینە جاف».
١٦. حاجی برایمی شاتری.

# تایەر بەگی جاف
# 1917-1875ز



تایـەر بەگـی جاف، کوڕی عوسـمان پاشـای جاف بـووە و دایکی نـاوی «عادیلە خانم»ی بەناوبانگ، هەڵگری نازناوی «خان بەهادر خانم». کە لە لایەن دەوڵەتی ئینگلیزەوە پێی دراوە..

شیعرەکانی تایەر بەگی جاف، پڕ لە ریتم و موسیقایە، تا بە ئەوڕۆیش زۆربەی هونەرمەندانی کورد دەکۆشـن شـیعرەکانی بکەنە ئاهەنگ و گۆرانی، وەک لە سـەرەتاوە هونەرمەندی گەورەی کورد «سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی» زۆر لە شیعرەکانی کرودوەتە گۆرانی..

تایەر بەگ بە باشی «فارسی، عارەبی، تورکی، فەرەنسی» زانیوە.

**ترازا بەندی سوخمەی ئاڵی گوڵناری بە ئاهی من**
**کەچی دەستی لەسەر دانا و لەسەیری باخی بەی کردووین**

بەندە ئەم بەیتەم کردووەتە تابلۆ.

**قوربانی روخت بم کە شکستی بە قەمەردا**
**حەیرانی لەبت بم کە رەواجی بە شەکەردا**
**هەر لەحزە ئەدەی وەعدەی وەسل و نیە ئەسڵی**
**کارت وەکو دونیا هەر ئەمرۆیە بەفەردا**
**مەقسوودی لەسەر کوشتنی عوشاقی زەعیفە**
**وەختێ کە دەکا خەنجەری تیژی بەکەمەردا**
**هەر چەندە دەکەم سەعی لەبەر خوێنی سورشکم**
**خاکێ نیە بیکەم بە هەوەسی گاهێ بەسەردا**
**دایم لەسەفەردایە ئەگەرچی لەحەزەردا**
**مەیلت هەیە «تاهیر» کە بپرسی لە بیرینم**
**بڕوانە کە ئەو شۆخە چ تیری لە جگەردا**

# گۆران



ئـاخ مـردن بـۆ ناتگەمێ..؟ بـە خوا مردن بۆ بـە ئاکامی دڵ گەیشـتینە وە لە خەم خسـڵەتە چونکە رابواردنی عومری ئەم دەورەی سەعادەتە هەر وەک تیجارەتە سەرمایەی ئەو تیجارەتەش تەحصیلی عیلم و مەعریفەتە کە ئەم تەحصیلەش لە حاڵەتی صەبابەت و شەبابەتدا تەواو ئەکرێ، مـن کە ئێسـتا خەریکم سـنی گەنجێتی ئیکمـال ئەکەم لەبەر بیرچوونی سـەعی و تێکۆشـان لە وەختاندا زۆر نادم و پەشـیمانم. فەقەت چ فایدە. تفی رووکارو قوت نادرێتەوە. عومری عەزیزی تێپەڕیویش ناگەڕێتەوە بۆچی ئەگەر هەموو بەحر و موحیتەکان زووخاو بوونایە بە قومێ وشکم نەئەکردن..؟

حاصڵاتی هەر پێنج قتعەکەم غەم بووایە خواردنێکم بە ژەمی یەکەم ئەزانی ئاخ تا ئەو ڕۆژەی لنگی لێ ڕانەکێشام هەر ئاخ هەر داخ بۆ ئەم تالعی ناموبارەک ئەنجام و بەختی سیامە..

توخوا ئێستاکە نەختێ فیهرەستی کەشکۆڵی خەم و ئەندوهی خۆم عەرز کردن چ جا وەکو جو بە دیوار هەڵبگژێم بە عەجایەب مەزانن کە کورەی ناری شەمس بە تەئسیری حەرارەتی دەروونم گەرم و مەنتیقەی ساردی بەفراوییەکانی شیمال و جنوب لووتم بەردی ئەلحەد ئەکەوێ لە بانی هەموو وەزیفەی مقدەسەیەک لە بەحری خەم و حەسرەتا یا لە گۆمی لنگەفرتی کردن لە میراتی با و باپیر بەجێماو خۆم..

ئەم ژانە زەریفە لە قوڵایی دەروونی کوڕە کوردێکی بناری هەڵەبجە و دامێنی چیای بە ئاسمان سەرکێشا و کوڕە کوردێکی نائومێد و دەروون تەزیوی گوڵ هەڵوەریوی کۆڵەواری بێ بەهاری بناری هەڵەبجەی شاعیر و ڕۆشنبیر پەروەر. کوڕە جافێکی بینەری خێڵ بەرەو خوار و سەروو ژووری جافی ڕەوەند و کۆچەری بەو وشە و واژە بیانییانە غەمەکانی دەخاتە سەر کاغەز و بە ناوی «ع. جاف» دەنێرێ بۆ ڕۆژنامەی پێشکەوتنیساڵی ١٩٢١ز ژمارەی ٦١..

هیچ کەسێک زانا و دانا و ڕۆشنبیر نایەتە دونیاوە هیچ نووسەرێک لە پڕ نابێتە نووسەرێکی دیاری هیچ هونەرمەندێک لە پڕێکا نابیتە داهێنەر، هیچ میللەتێک لە پڕ نابێتە خاوەنی فەرهەنگ، ئەگەر بە پێی زەمان و مەرجەکانی ژیان قۆناغەکانی ڕۆشنبیری نەبڕێت و تەی نەکا. شاری هەڵەبجەی «١٩٢١» شاعیرانی ناسراو و بەناوبانگی تیا ژیاوە. «ئەوەی لە خەو هەڵسێ»ی وتووە، ئەوی «ترازا بەندی سوخمەی ئاڵی گوڵناری بە ئاهی» منی وتووە، کوڕە جافێکی بە گۆران بۆ ئەو پەخشانە پڕ لە وشەی عارەبییەی نووسیوە، کەچی هەمان گەنج دوای ڕەنج دانێکی بەربڵاو دەست دەخاتە سەر گەنجی وشەی پاراوی کوردی و چاپک سوارانە دێتە مەیدانەوە بە هەنگاوێک چەندین ساڵی بڕیوە، لاپەڕەی ناپەسند و بیانی بیزیاوی نێو ئەدەبی دڕیوە سەدەها وێنەی ناشیرینی سەر دیواری بنبەستی سڕیوە. ئەوە گۆران بوو..!!

ئەوەش روونە میللەتانی ژێردەستە بە زەحمەت ئەدەبیاتی گەشە دەکا و دەبێتە خاوەنی ڕێگە و ڕێبازی تایبەت بەخۆ. ئێمەی کورد تا چەند دە ساڵێک لەمەوبەر یا لە ژێر زوڵم و زۆری سەڵاتینی عوسمانیدا بووین یا لەژێر دەسەڵاتی شاکانی ئێراندا یان لەژێر تەوژمی دەمارگرژی خەڵکی تردا بوون. ئەشەهەدو لە پێشێلکردنماندا درێغییان نەکردووە. تا توانیویانە دەمکوتیان کردووین. ئێستاش هەر ئەو ئاشەیە ئەمما بە جۆرێکی دی. سەرەڕای ئەو هەموو پێشێلکردنە بە زیندووی مردنە یەشتا لە شیعردا شتێکمان هەیە بۆ وتن. سەردەمدارانی ئەدەبیاتی کورد لە کۆنەوە ڕێبازی شیعریان ناسیوە، لە غەزەلیاتەوە بیگرە تا سەر وەصف و هەجوو و تەصەوف جۆرەکانی دی دەبینین کەڵەشاعیرانی وەک نالی و سالم و کوردی و مەولەوی و مەحوی و شێخ ڕەزا و وەفایی و تایەر بەگ و لەم دواییەشدا هێمنی هەمیشە دەربەدەر بە وردی ئاگاداری ئەدەبیاتی فارسی بوونە و وەک دەرس دیوانی حافیز و سەعدیان خوێندۆتەوە و ئاگاداری عەتتار و مەولانا و کەلیم و خەیام بوون.

گۆرانیش هەر وا. ئەویش لە کانیاوی فەلسەفە و عیرفانی ئەدەبیاتی فارسی ئاوی خواردۆتەوە. «نیما یوشیج» ڕەچەشکێنی شیعری کلاسیکی فارسی بێگومان ناخ و دەروونی گۆرانی بزواندووە..

ئازیزانم..
زۆر لە شـوعەرا و ئەدەبا هەن بۆ شـێوەیەکی تایبەت دەنووسـن بازێک بۆ گرەو بردنەوەی ئەدەبی بازێک بۆ تەرجومە بۆ شـین و شـەپۆر بۆ شـیوەن بۆ شـایی بۆ پیاهەڵدان بۆ پێکەنین یا هەر بۆ خۆی دەنووسـێت. هەر یەکە لەوانە بۆ خۆی خاوەنی شـێوە و شێوازێکی تایبەتە. گۆران هەنگاوەکانـی تایبەت بـووە. گۆرانی تابلۆکێـش. گۆرانی هونەرمەندی خـاوەن رەنگ و رواڵەتی تایبەت. خاوەن هەیکەل و قامەتی تایبەت، خاوەن ئەندازە و قەد و قەبارەی تایبەت، گۆرانی رەنگ ناس پێش هەڵبژاردنی شـێوە و شـێواز بە هەوێنی هەسـت کەژ و کێوێک هەویری رەنگاوڕەنگی هەڵبژاردووە و بەهێز و توانا و تەوژمەوە بە مەچەک و بازوویەکی ئەفسـانەییەوە شـێلاویەتی و کردوویەتی بە تابلۆ.. کردوویە بە پەیکەر..

**پایز پایز بووکی پرچ زەرد**
**من مات و تۆ زیز هەردوو هاودەرد**
**من فرمێسکم. تۆ بارانت**
**من هەناسەم. تۆ بای ساردت**
**من خەم تۆ هەوری گریانت**
**دوای نایە دادم. دادت**
**هەرگیز هەرگیز. پایز پایز**
**پایز پایز شان و مل رووت**
**من مات تۆ زیز هەردووکمان جووت**
**هەرچەند گوڵ ئەرژێ بگرین**
**پۆلی باڵدار ئەفڕێ بگرین**
**بگرین بگرین چاومان نەسڕین**
**هەرگیز هەرگیز. پایز پایز**

ئاوڕێک لەم ئافرەتە زوڵف زێڕینە بدەینەوە وەرن با پێکەوە بڕۆینە حزووری دەریای شاژنی جوانی خەیاڵی گۆرانی غەمزەدە و پەلکەی هۆنراوەی ئاڵتوونینی پایز خانم کە وەک دوو تاڤگەی شێت و شەیدا و کەفچەڕێن بە خوڕ بە دۆڵی سنگ و مەمکدا سەرو خوارە:

**پایز پایز شان و مل رووت**
**من مات تۆ زیز هەردووکمان جووت**

گەرمی هەناسەی گۆران ئامیختە و تێکەڵاوی کزەبای ساردی پرچ و پەلکەی ئارام کەوتووی سـەر شـانی رووت و سینە و مەمکی تۆزێک پۆشـتەی پایز خانم دێنێتە جموجۆڵ و جووڵانەوە

ناڵەناڵی گریان و هەوری غەم دەکەونە بزیسکە و بریسکەوە بارانی گریانی گۆران دەبارێتە سەر کێڵ و مەزاری هەزارەها ئۆخەی نەکردووی ئەوسا و ئێستادا..

**بگرین بگرین چاومان نەسڕین**
**هەرگیز هەرگیز پایز پایز**

گۆران لە دوورەوە ریتمی ناسیوە خاوەنی راونکە و دیدگا و سۆما و گلارەییەکی تیژ بووە رەنگ و بنەماڵەکانی رەنگی بە وردی لەیەک جوێ کردووەتەوە پەردەی تابلۆکانی بە پان و پۆڕی ژانی ژیان و بێ بن و بێخی وژدان بووە هەزاران شەپۆلی شیفتەگی و شەیدایی لە ناخیدا هەڵهەڵەی کردووە، ئەوەی سنوور و مەرزە هاربۆیە بەسەر یەکدا. هیچ تابلۆیەکی نەخستووەتە نێو چوارچێوەوە، پانۆرامای خەیاڵی سنووری جوگرافیای نەناسیوە و سواری گالسکەی پاچکە زێڕێن و ئاگرپەرژینەکەی ئاپولۆ بووە و سەرتاسەری کەونی بڕیوە ئاسمانی دادڕیوە..

**زۆر قژی زەرد سەرنجی راکێشاوم**
**زۆر چاوی شین داویە پرشنگ لە چاوم**
**شان و مل و گەردنی رووتی بێگەرد**
**سنگی نەرم و مەمکی قووتی توند وەک بەرد**
**بەژن و باڵای کەڵەگەت و شۆخ و شەنگ**
**لەش و لاری کەمێک گۆشتن کەمەر تەنگ**
**پێستی سپی بە خوێنی گەش و مەیلەو ئاڵ**
**کوڵمی قەڵەو چەناگەی ناوەڕاست چاڵ**
**دەم و لێوی وەک گوڵی بەربەیانی**
**ئەمانە گشت گەلێکی تریش جوانی**

سەیر ئەم شێوە و شەمایل و ئەندازەیە کە هەڵبژاردووە وردبەرەوە لە رەنگی قژی زەردی گۆران لە چاوی شینی گۆران، ئاوڕێک بەرەوە لە بەژن و باڵای کەڵەگەت و شۆخ و شەنگ. سەیر چ دەنووسێت. لەش و لاری کەمێک گۆشتن و کەمەر تەنگ کێ دەڵێت گۆران پەیکەر ساز نەبووە..؟

کێ دەڵێت گۆران بە وردەکارییەوە لەش و لاری تۆزێک گۆشتنی پەیکەرە بەناوبانگەکەی میلتوسی «ڤینۆس»ی هەڵنەسەنگادووە و لە خەیاڵی ئەفسووناوی خۆیدا پەیکەرسازی نەکردووە..؟

گۆران بە رەنگ و ئەندازە و قەبارەوە دانەکەوتووە. پەیکەرەکانی ژیانی پێبەخشیون، لەنجەولار زەردەخەنە، نەغمەی دەنگ، شەرمی تاو تاو، نازکردنی رەنگاوڕەنگیشی هێناوەتە هانای زەرافەتی

پەیکەرەکانیەوە و ژنایەتێکی هەوەس ئەنگێزی لە ناخی خوێنەردا بزواندووە.

من لە خۆم دەپرسم ئەم هەموو ئیلهامە لە چوار تەنیشتێکی سەرەتایی زەوق تەزیندا لە خەیاڵ و قوولایی دەروونی گۆرانا چۆن جێگەی بۆتەوە، لە دڵ و دەروونی گەنجێکی هەڵەبجەیدا بەو هەموو کوێرەوەری و کۆڵەوارییەوە چۆن وا گەیشتووتە کەشکەشان و گەشەی کردووە..؟ کام مامۆستا. کام فەرهەنگ و رۆشنبیری دەستی لەرزۆکی گۆرانی گرتووە و گەیاندوویەتە دەرباری زەوق و زەرافەت جگە لە تەقەلای پڕ لە ژان و پڕ لە تاڵی و تفتی ژیان نەبێت.

**قژکاڵی لێوئاڵی پرشنگی نیگا کاڵ**
**ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا نەختێک ئاڵ**
**ئەی کچە مەنگەکەی بە دەنگی چپەدوو**
**گەندەمووی دەموچاو مەچەک هەڵنەگرتوو**
**ئەی ئەندام وردیلەی نەرمۆڵەی ئێسک سووک**
**ئەی بەرگی ساکارت دڵگیرتر لە هی بووک**

کام خولڤێنەر. کام شاعیر لە یەک ئاندا بەم زەرافەتە دەنگ و رەنگ و جوولانەوە دەخاتە ژێر فەرمانی خۆیەوە بۆ رازاندنەوەی هەڵبەستەکەی..؟

ئەندازەکانی گۆران بە ئەندازەیەک ورد و مەوزوون و پڕ کەیل و کێشانەن هەتاوەکو نەخوێندەواریش دێنێتە سەما. سەمای ستایش.. سەمای ئەشهەدو..

**قژ کاڵی لێو ئاڵی پرشنگی نیگا کاڵ**
**ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا نەختێک ئاڵ**

کاکە سیمفۆنیایە سیمفۆنی. گوێ لە ریتمەکەی بگرە چزە و تێژی نۆتەکانی چزە لە ناخ هەڵدەسێنن و رۆح و رەوان کەیل و سەرخۆش دەکەن و دەخرۆشێنن..

پەکۆ لەم چاوە سیحر ئامێزە کە چۆن لە سایە و سێوەری قژی کاڵ و لێوی ئاڵ و نیگای کاڵی تەلیسماویدا گەندەمووی هەڵنەگرتوویش وەدی دەکا ئەمە چاوی بازە یا ئەفسانە و رازە زەڕەبینە یا دووربینە..؟ ئاشکرا و روونە گۆران مەتەڵێکی هەڵنەهێنراوە. تەلیسمە. ئەفسوونە.. هەتا هەتایی بوون.

**کۆمەڵە شاخێک سەخت و گەردەن کەش**
**ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش**
**سەرپۆش لووتکەی بەفری زۆر سپی**

**دارستانی ڕەش ناو دۆڵی کپی**
**جۆگەی ئاوەکان تیایا قەتیسماو**
**هەر ئەوەن ناکەن پێچی شاخ تەواو**
**هاوار و هاژەی کەف چەڕینی چەم**
**بۆ تەنیای شەو لایەلایەی خەم**
**تۆڵە ڕێی باریک تونا و تون شکن**
**ڕێبوار ئەخاتە ئەندێشەی بێ بن**
**ناو ڕێگا تەق تەق لاڕێ بەردی زل**
**کە هێشتا گەردوون پێی نەداون تل**
**گا سەرەو ژوورە گا سەرەو خوارە**
**تاڵی و شیرنی دونیای ڕێبوارە**

تێکەڵییەکی ڕەنگاوڕەنگ شاخ و کەژ و کێوی کۆماوەی کەون و ئاسمان چیای سپی پۆش و چەرخی زەمان دەکاتە شـایەتی بۆ ئەزەلی بوونی تابلۆکانی، لە تاریکی شـەوا لە هاوار و هاژەی چەمـی لـە تاش و تـل و دەوەن گیر و ئاڵۆز دەکاتە هورە و لاوک و لایەلایەی ڕێبواری ماندووی هەزاران ساڵەش دەخاتە ئەندێشەوە و من و تۆیش سەرسام و واقوڕماو دەخاتە ئافەرین و ئەی خوا ئەی خواوە..

بەنـدە کاتێـک بازێک لە شـیعرەکانی گـۆران دەخوێنمەوە وەک لە گالری یـا موزەخانەیەکی هونەریدا بم و گێژ و وێژ و مەنگ و مەدهۆش دێم و دەڕۆم سـەرم سـڕ دەمێنێ. بێ مامۆسـتا، بێ کتاوخانە و قوتابخانە و تاقیکردنەوە گۆران ئەم بەهرە و خوڵقاندنەی لە کوێوە هێناوە؟ ئەوی راسـتی بێت ناگەمە وەڵامێکی وا لە قەناعەتەوە نزیک بێت. ئەمما ئەوەشـم لا ئاشکرایە کە گۆران عاشـق بووە عاشـقی جوانی سروشـت بووە و هەر سروشـتیش بووە بە یەکەمین مامۆسـتا و دواهەمینیش خاڵێک ماوە ناتوانم نەیڵێم و لێی بگوزەرم لە تەمەنی حەفتاو چەند سـاڵەی دەوڵەت و دەسـەڵات و عالەم گیرای دەبدەبەی یەکێتی سـۆڤیەتیدا کە لە زۆر ڕووداو و بوار و ڕێکەوتدا شـاهیدێک و تەماشـاکەرێکی ترسـنۆک و بێ دەنـگ و مەلوولی ورتە لـە دەم نەهاتە دەرەوەی تیاچوون و پێشێلکردنی گەلێکی چەوساوەی وەک کورد بووە، بۆ جارێک ناڕەزایی خۆی دەرحەق بـە کـوردی کۆڵـەوار دەرنەبڕیـوە و زاق و زاق نواڕیویەتە ونجـڕ ونجـڕ بوونیـدا. تەنیا کارێک کردوویەتی ئەویش لەبەر پروپاگندەی حیزبایەتی و کش و فشی کۆمەنیستبازی دونیا. نەک چاوی ڕەشی کورد دەنگی شاعیرێکی کوردی وەک گۆرانی گەیاندووەتە میللەتانی دوور و نزیک یەشتا جێی شوکری باقیە!!!

* ئەم چەند لاپەڕەیەم لە بیرەوەری تێپەڕبوونی سـی و چوار سـاڵ بەسەر مەرگی شاعیری نەمری کورد گۆران، لە ئێوارە کۆڕێکدا لە شاری بەغدا ڕێکەوتی ١٩٩٦/١١/١٨ خوێندۆتەوە.

# مینه جاف
# 1965-1913ز

محەمەد ئەمین بەگی جاف، کوڕە گەورەی کەریم بەگی سەرۆکی هۆزی جاف بوو، بە «مینە» ناسراوە. یەکێک بوو لە شاعیرە ناودارەکانی سەردەمی خۆی زۆربەی شیعرەکانی نیشتمان پەروەرانە بووە، یەکێک بووە لە شۆڕەسوارەکانی شەڕی ئاوباریک.

«مینە جاف» دیوەخاندار و میوان نەواز و راستگۆ بوو، هەر بەو ئەندازە حازر وەڵام و شیرین کەلام بووە..

لەناو خەڵکیدا لە نێوان خزم و خوێشدا خۆشەویست و رێزدار بووە، تەنیا کوڕ و کچێکی لێ بەجێماوە. سەرتیپ جاف و هەتاو خانم.



محەمەد ئەمین بەگی جاف

# ئەحمەد موختار جاف
# 1896-1935ز

شاعیری شۆڕشگێڕ و دڵسۆزی کورد، خاوەنی هەڵبەستی بەناوبانگی «لەخەو هەڵسن». کوڕی عوسمان پاشای جاف بووە و دایکی ناوی «عادیلە خانم»ی بەناوبانگە.

کە دەوڵەتی ئێراق دادەمەزرێت و پەرلەمان دادەنرێت دەبێتە نوێنەر لە پەرلەمان، ئەو بەڵێنانەی بە کورد دراوە هیچی ئەنجام نەدراوە و نادرێت، لەوێڕا رۆژ بە رۆژ هەستی نەتەوایەتی بڵێسە دەستێنێت و لەگەڵ «حەمە بەگ»ی ئامۆزایدا بڕیار دەدەن شۆڕشێکی چەکدارانە پێک بهێنن، بەڵام مەرگ مەودای حەمە بەگ نادا (باپیری نووسەرە) بە خوێنڕێژی مێشک کۆچی دوایی دەکات، بۆخۆشی دوای مردنی حەمە بەگی ئامۆزای جوولانەوەی چەکدارانە دەست پێدەکات و بەدەستی پیلانگێڕان شەهید دەکرێت.



ئەحمەد موختار جاف

**لە خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە**
**هەموو تاریخی عالەم شاهیدی فەزڵ و هونەرتانە**
**دەسا تێکۆشن ئەی قەومی نەجیب و بێکەس و مەزڵوم**
**بە گورجی قەتعی کەن ئەو ڕێگە دوورە وا لە بەرتانە**
**بخوێنن چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان**
**هەموو ئان و زەمانێ عەینی قەڵغان و سپەرتانە**
**بە خۆڕایی لە دەستی بەر مەدەن ئەم خاکە مەحبووبە**
**کە تۆزی وەک جەواهیر سورمە و کوحلی بەسەرتانە**
**بەسەر خاکا ئەگەر نازیش بکەن حەقتانە کوردینە**
**گوڵاڵە سوورەی ئەم سەحرایە خوێناوی جگەرتانە**
**دەمێکە ئەم وڵاتە وا ئەسیری پەنجەیی جەهلە**
**لە سایەی عیلمەوە ئەمڕۆ ئیتر نەوبەی زەفەرتانە**
**زبانی حاڵی «ئەحمەد» هەر ئەڵێ وریا بن ئەی میللەت**
**بزانن بەردی ئەم شاخە ئەلماس و گەوهەرتانە**

# محەمەد خانی حاجی ئەلوەند

شاعیری گەورە و ناوداری سەردەمی خۆی ١٠٥٠ک، محەمەد خانی حاجی ئەلوەند هەتاوەکو مەلا مستەفای بێسارانیش دانی بە شیعرەکانیدا ناوە، بە تایبەت پارچە شیعری «زڵیخام ساوان».

# ئاغا عینایەتی هیدایەتی 1335-1410ک

کوڕی مەلا نەشئەتی جوانڕۆییە لە بەگزادەکانی جوانڕۆیە، لە سەردەمی بگیربگیری ڕەزا شادا ئەویش دەستگیرکراوە و دە ساڵ لە زینداندا ماوەتەوە ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی:

**دوسەکەی گیانی رۆستەمی نەژاد**
**نامەی شەرینت خەمان داد بە باد**
**ئەشعار مەربوت مەعدەن شعور**
**سەدیقەی شەفاف بە وێنەی بلور**
**موناجات خاس دڵ پەسندیدە**
**وانام وەساوەم وەهەردوو دیدە**
**ئەشعار وەش ئاهەنگ شیرینت وەندەم**
**جەدوور ئەفشانیت من حەیران مەندەم**
**ئەشعارت جەلام وێنەی شەکەرەن**
**من جەوانە ویم قەلبم پەکەرەن**
**حەیفەن قاتی بو نەوشیرین وە تەلخ**
**ئەو ئاو سافەن ئید لەجەن هەم بەڵخ**
**ئەو دانە گەوهەر ئید سەنگ خاران**
**ئەو پارچەی حەریر ئید کۆنەی شاران**
**ئیسە ئەساسی تەحریرم نیەن**
**پەی ئەپتش ئایر نەقلبم شیەن**
**نگاش مەدارو تا دەردش کەرون**
**هەر وەخت وەسیلەش وەدەست باوەرەن**

# میرزا لوتفوڵڵای جوانڕۆیی

یەکێک بووە لە شاعیرە مەلحەمییەکانی دەڤەری جوانڕۆ، عیشق و عەلاقەیەکی پتەوی هەبووە بۆ ناوچەی جوانڕۆ، هەروەها ناودارانی ئەو ناوچەیە و ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی و لە شایی و شیوەندا توانای نواندووە، بە تایبەت لە شیوەنی گەورە پیاواندا شیعری دەخوێندەوە و خۆشی دەگریـا. میـرزا بە دەردی هەژارییەوە دەینالاند و خەڵکەکەش ئـاگاداری توانا و قابیلیەتی ئەویان نەدەتوانی هەڵسەنگێنن دیارە هەر ئەو نەتوانینە هێندەی تر دڵ و دەروونی ئەو شاعیرەی هێنابووە جۆش و خرۆش و هەر کێ ژیانی ئەو شاعیرە کڵۆڵەی بەلاوە بێت با بڵاویکاتەوە تا باشتر بتوانێت ئەو شاعیرە بە میللەتەکەمان بناسێنێت. ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی بە شێوەی موناجات.

**یا حەی بە حاجەت بینای بێ زەواڵ**
**قادر و قودرەت بەرزی بولەند ماڵ**
**یارەب بە حاجەت بینای لا یەنام**
**بە شەرافەتی سی جزمەی کەلام**
**یارەب بە حاجەت حەی لا یەموت**
**بێ خوردو بێ خەو واجبولوجود**
**بێ خوردو بێ خاو بێ مسل و مانند**
**فەرد فەریا ڕەس یەکتایی خواداوەند**

# نێرگز خانمی شارەزووری
# 650-713ک

ئەم خانمە شاعیرە، پەیڕەوی ئایینی یارسان بووە و هاوسەری «عابدین جاف»ە.. بۆ خۆیشی کچی شوکروڵای جافی شارەزوور بووە...

دیارە، مەلا عابدینی جاف لە پێش ئەوەی کەمەنکێشی ئایینی یارسان بێت، بۆ خۆی مەلایەکی ناوداری سەردەمی خۆی بووە لە ناو تیرەکانی جافدا، پێگە و جێگەی دیاری هەبووە..

ئەم نێرگز خانمە، شێوەی شیعرەکانی بە شێوازی جافی نووسیوە و لە پەرتووکەکانی ئەهلی حەقدا شێوەی شیعرەکانی نووسراون، وەک دەڵێت:

**بادەم یارە و جامم یارە**
**شادیم یارە و کامم یارە**
**بیرم یارە و هۆشم یارە**
**هوچی چی هەر نوشم یارە**
**دەربارم یارە و زەویم یارە**
**بەرزیم یارە و نەویز یارە**
**نەرگز خودا بووە یارم**
**ئیدی بەسەو ئەز رزگارم**

نێرگز لە شێخاندا مردووە...

# مەلا ئەحمەدی کڵاشی

مەلایەکی زیرەک و حازر وەڵام بووە و لە دەڤەری کڵاشی باوەجانیدا هاتووتە دنیاوە، لە دەستگای ئەردەڵانەکاندا دەست بەکار بووە، بە تایبەت بە لای عەلی ئەکبەر خانی شەرەفولمولکەوە، ئەمەش نموونەیەکە لە شیعری مەلا ئەحمەد:

**دڵ گوش بدەر دڵ گش بدەر**
**لادێ وەقەڵەم خاس خاس گوش بدەر**
**وەسوەسە و خەیاڵ نەخاتر بەرکەر**
**تاواچون پەریت یەک یەک دەردەسەر**
**باوجود وێت خاستر مەزانی**
**چیشت کەردەن چیشی نی دنیای فانی**
**راسەن جە ئەزەل یاگەی روحەنی**
**دەروازەی سرور رای فتوحەنی**
**زاهیر جای خالس دین و ئیمانی**
**خەیر شەریک نەفەس و شەیتانی**
**جەوەخت تفلی هیچ نەبێ ناخت**
**نەپێم من دڵتەنگ بەرزی دەماخت**
**پات نیا نە ساڵ سن بالغی**
**دڵا کەم کەم تۆ وەمن یاخی**
**جەرەفیقی روح مەیلت سەردکەرد**
**سوجدە وەخاک پای دیونەفست بەرد**

# محەمەد ئەسعەدولساحیب خالدی شارەزووری 1271-1347ک

ئـەم زاتـە بـرازای مەولانا خالدی بەناوبانگ بووە و کوڕی شـێخ مەحموودی سـاحیب و لە شاری «دیمەشق»دا هاتووتە دنیاوە. هەر لەوێشدا کۆچی کردووە، لە سەردەمی خۆیدا زانایەکی ناسراو و بە توانا بووە، کتێب و نووسینی زۆری لێ بەجێماوە وەک:

١- الجواهر المکنونة.
٢- نور الهداية والعرفان.
٣- الفیوضات الخالدية.
٤- جمع التلائد وجمع المشوار في الفرائید مولانا خالد.
لە خانەقای سوڵتان سلێمان خاندا لە شاری دیمەشق نێژراوە.

# ئەحمەد پریسی

کوڕی خســرەو چاوش بووە لە تیرەی مکەیالییە، بــەڵام لە ناو نەورولێدا ژیاوە دیارە باوکی ئەفسەری عوسمانی بووە، دەبێتە سۆفی شێخی سوراجەدین پلەی تەسەوف دەبڕێت و بە ئەحمەد «مەجزوب» ناو دەبرێت. ئەمەش چەند شیعرێکە لە هەڵبەستەکانی:

**سەید بەندەی دڵ وەخەم خەستە**
**عەبدوڵڵای وە ئەمر ئەح کەمەر بەستە**
**دانەی خەزانەی لاریب نەچی پاک**
**مەمنون خەڵات فاخیری لەولاک**
**رەشمەی بەحرنور چەشمەی سەفارێز**
**گوڵ خونچەی وشوی رەوزەی عەترامێز**
**خەڤات سەرمەشق عیشق نەوهلان**
**داخ دڵ خاڵخاڵ خەیاڵ خەڵان**
**نەسەر تەختانچەی تەن نە تەمەی چەم**
**تەوحید یەرابیش مەیو سۆفی خەم**
**نەو پایز هیجر وە وەیشومەی دەرد**
**وەلەگ سوەیل رەنگی شادیم پەرئاوەرد**
**ئەر ئەدەب جەیاد تۆ نەکەر دەبێ**
**سفتەی تەن شەماڵ سەدجا بەربێ**
**ئەورۆ دەفتەردار رای مافی العدم**
**خامەی سەر نویشت دانەروی رەقەم**
**هەر کاڵای جەلاش وەمن سپەردەن**
**لیقاشان جەعیشق من پەیدا کەردەن**
**هاڵای نەووەها لوتفت پێوارەن**
**جەو غونچەی عیشق من نادیارەن**
**ئەرامەندی بەخت دڵ ئەوکار**
**چ خاک وەسەرکەم وەچێش کەم مەدار..؟**

# سلێمان بەهرامی کەمانگەر
# 1397-1326ک

کوڕی میرزا عەلی خانی شوجاعولمەمالیک بوو، لە بنەماڵەی ناسراوی کەمانگەرەکانە، باوکی سلێمان خان گرنگی بە مزگەوت و خوێندن داوە، کوڕەکەی خستووتە بەر خوێندنی مەلا و مزگەوت، دیوەخانی میرزا عەلی خان هەمیشە پڕ لە میوان بووە، ئودەبا و شاعیرانی تیادا وەدی کراوە، «سلێمان»ی گەنج لەو جۆرە دیوەخان و کۆڕانەدا گەورە بووە، بۆ خۆشی پەیوەستە خەریکی خوێندن بووە. ئەمە شیعرێکی ئەم شاعیرەیە:

**لە شێواوی دەروون یەکسەر پەشێوە تەرزی گوفتارم**
**لەبەر ئەندوهی بێ سامان لە سامان ماوە رەفتارم**
**من و فیکری ویساڵی تۆ، ئەتۆ قەسدی فیراقی من**
**دەسا، لەم جەمع تەفریقە چ حاسڵ بێتە رێوارم**
**ئەگەرچی بولبولی گوڵزاری حوسنی تۆ هەزارانە**
**وەلێ گیانە لە نێوانیاندا هەزار ئەربێ منی زارم**
**لە بەزمی وەسڵدا دیام رەقیب مەدهۆشی دیدارە**
**لە کونجی میحنەت و غەمدا منیش مەنتوشی دیوارم**
**مەعازەڵا لە نیشی خەنجەری موژگان بناڵێنم**
**بەشەفقەت گەر بکا ئەو نەرگسەی بیمارە تیمارم**
**لە ئیقلیمی موحەبەتتا کە تۆی سوڵتانی مەحبوبان**
**لە جەوری غەم خلافی عەدلە وا من بەرزە هاوارم**
**نگینی عیشقی تۆم ئەمڕۆ لەدەست دا وەک سلێمان من**
**رەقیبی دێو سیفەت ئاخر لەپەی دا بوویە ئازارم**

# عەلی کەمال باپیر
# 1392-1305ک

کوڕی باپیر ئاغای یوزباشی بووە و لە تیرەی سمایل عوزێری هۆزی جاف بووە، وەک هەر فەقیـە و مەلایـەک خوێندنی مزگەوتی تەواو کردووە و بووە بـە کارمەندی دەوڵەت، زەمانێک لە ئێراندا ژیاوە و زمانی فارسـی بە باشـی زانیوە، شـیعری جوانی نووسیوە، پەرتووکی نووسیوە بە ناوی «گوڵ دەسـتەی شـوعەرای هاوعەسـر» شـیعرە دەستنووسـەکانی «ئەحمەد موختار جاف» دوای مردنی کەوتە لای «عەلی باپیر» ئیدی ئەو دەستخەتانە کەسێکی تر نەیدی. ئەمەش هەڵبەستێکی ئەم شاعیرەیە..

**پەلکە زێرینە. پەلکە زێڕینە**
**توبی توو خودا پەلکە زێڕینە**
**ئەمما پێم بڵێ ئەو ڕەنگە زەردەت**
**وەک ئاڵتون دوان و پاک و بێگەردەت**
**جوان و لەتیفە یا ڕەنگی زەردم**
**یا پەلکەی زەردی گەردەن بێ**
**گەردمگاهێ گرژ و لوول گاهگاهێ خاوە**
**ڕەگی روحمە زەرگفت کراوە**
**ڕەنگە سوورەکەت کە وەک گوڵنارە**
**ئەڵێی شەوقی ڕووی یاری نازدارە**
**توخوا ئەو جوانە یا لێوی نگار**
**ئەو لێوە ئاڵەی سونعی کردگار**
**مردووی سەد ساڵەی حەی دەکا دەرحاڵ**
**خەندەی شیرینی ئازیزی چاوکاڵ**

# سەمەنی دوداتی

ئەم خانمە، لە تیرەی مکەیاڵی عەشـــیرەتی جافە، پەیڕەوی ئاینی یارســـان بووە. شاعیرێکی بە توانا و تەمورە ژەنێکی ناوداری سەردەمی خۆی بووە..

ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی:

**ئەو زارت بنما ئەو زارت بنما**
**تۆ ئومێد منی ئەوزارت بنما**
**هامری کەس هەن گەردەنش نەما**
**من کەسم نیەن تومەنی زما**

# مەلا عەبدولقادری جاف



کـوڕی عەبدولموئمینە، یەکێک بووە لــە فەقیەکانی مەلا عەبدولڕەحمانی پێنجوینی، لە ڕێبازی تەســەوفدا ســەر بە شێخ عومەری زیائودینی نەقشــبەندی بووە، مەلایەتی لە چرچەقەڵا و پریس و قزرابــات ئەنجامــداوە، ئەم مەلایە لە بواری لۆژیک و حیکمەت و خۆشنووســیدا دەســتی باڵای هەبووە، شیعری مەوزوون و جوانی هەیە، ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی کە باس لە نیازەکانی ڕەشماڵ نشینی دەکات:

**فیراقی له هەردی دڵ دەس و دەم**
**هەوڵی دا رەش دەواری مەینەت و غەم**
**به گوریسی سیاتاری پەژارەم**
**به مێخی مەحکەمی ناڵه و پەژارەم**
**چلەی فرمێسکی قوڵفی چاوەکانم**
**چەلەم قامەت خەمیدەی وەک کەمانم**
**به کۆمای هەسوونی بێ دەماخم**
**به تیلا و چیخی ئەسپەرپێچی ئاخم**
**شەگ و کوچیل و سەردرزی هەناسەم**
**به سەیلی دووەمی خوێندنی تاسەم**
**لەبەر ماڵ و له یەشماڵ ناحاڵم**
**دەناڵێنم دەڵێم ویرانه ماڵم**

فیراقی تو له «هەردی» دل دەس و دەم — هەولیدا «رەش دەوار» ی مەینەت و غەم
«چله» ی فرمیسکی «قولف» ی چاوەکانم — به «میخ» ی مەحکەمی ناله و پەژارەم
«چله» ی فرمیسکی «قولف» ی چاوەکانم — «چەله» م قامەت خەمیدە وەک کەمانم
به «کوماج» ی «هەسون» ی بی دەماخم — به «تویله» و «چیخ» ی «ئەسپەریچ» ی ئاخم
«سەگ» و «کوچیل» و سەردرزی هەناسەم — به «سیلی» «دوودەمی» «خوینین» ی تاسەم
له «بەرمال» و له «یاش مال» ناله‌حالم
دە نالینم دەلیم ویرانه مالم

# بێسارانی
# 1702-1641ز



شـاعیری شـیرین کەلام و دڵ و دەروون پڕ لە ئۆف و تووف و زام، رەوەندی هەوارگەکانی دنیای عیشـقبازی سـەرفرازی ئاسـمانی ئەدەب و وێژە، ئەو فرمێسک رێژە هەمیشە و پەیوەستە لە فکری «ئامینە»ی باڵا بەرزی هەزار تەرزی دنیای عیشـقی خۆیدا بووە و دەسـتەمۆی سۆز و عیشقی ئاگرینی بووە، بنواڕە چی دەفەرمووێ:

**قیبلەم یە حەیفەن یونەی تو شاهی**
**بگیرنو لە دڵ خەشمی گەدایی**
**ئەگەر گوناهی وەتیم کەری بار**
**یەسەر یە شمشێر یە تەناف یەدار**

بنواڕە ئەو سەر سوپوردەگییە، بنواڕە ئەو مەرگە لەزەت بەخشە، بنواڕە ئەو عیشقە خودابیە بێ مەرز و سنوورە، ئەو دنیا پڕ لە بریسکە و مەشخەلانی نوورە. بێسارانی، ناوی مەلا مستەفای

کوڕی مەلا ئەحمەدی بێسارانە. یەکێک بووە لە ڕۆڵە هەڵکەوتووەکانی عەشیرەتی جاف لە دەڤەری بێسارانی کوردستانی ڕۆژهەڵات.

دیارە مەولەوی بلیمەتی و جێگە و پێگەی شاعیریەتی «بێسارانی» گەلێک بەلاوە بەرز و بڵند بووە، لە برێک لە شیعرەکانیدا سوودی لە بەیتە شیعرەکانی بێسارانی بردووە و خستوویەتە ناو شیعرەکانیەوە وەک دەفەرمووێت:

**های ڕەحمەت ئەو قەبر سەودایی کامل**
**سەر مەشق مەینەت «بێساران» مەنزل**
**یانە ویرانی، هەر وەمن ئامان**
**مەنا و گیرنەی، کە سیوتەر ئامان**

یان دەفەرموێت:

**بێسارانی یەن، نەتوی فەرد من**
**خەم چەنی خەمان رومەبو ساکن**

بێسـارانی کەڵەشـاعیری دونیای ئەدەبی کوردی، مامۆسـتا و لێزانی وردەکاری سروشـتی کوردسـتان، خاوەنی زەرافەتکاری دنیای شـیعر، عاشق و شەیدای وشــە و واژەی مەوزوون و دڵناسک و مەجزووبی دونیای سۆفیگەری جیهانی فەلسەفە و عیرفان. دەفەرموێت:

**چراخ وەنەوشە چنوور چەنی گوڵ**
**عەزم رای ویسال توشان هانەدڵ**
**چنوور جەسەرکو وەنەوشە جەچەم**
**گوڵ جە گوڵستان وەهەم بیەن جەم**
**واتە شان بە من بەندەی فلانی**
**چون حاڵ زانەنی بە حاڵ مەزانی**
**بونەرای «ئەلا» بکەرە کاری**
**بیاومێ بە وەسڵ ئەو دولبەر جارێ**
**چراخ یە هەرسیم بەستەن بە دەستە**
**چ دەستە، دەستەی زگاران بەستە**
**هەرسیم، یە ئاورد چون خاکە ساران**
**هەر یەک وایەی وێم وەچەم مەداران**
**چنوور پەی زولفت پەشێو حاڵێشەن**
**وەنەوشە سەودای خەیاڵ خاڵێشەن**
**گول پەی جەمینت مەسووتوو چون شەم**
**جە دووریت نیشتەن نەباش خاری خەم**
**ساحیب مالیەتی بلند بو پایەت**
**باوایەگیران هەر بو جەمایەت**

# خانایی قوایی
# 1168-1083

خانای قوبادی کەڵەشاعیری گەورەی کورد و هۆزی جاف با وەک لە سەردەمێکی لەبیرچوو و تاریکستانی میللەتی کوردا ژیاوە بەهەر لایەکدا ئاوڕی داوەتەوە ترووسکەی ئومێدی نەدیوە، نە ڕێز نە سەروەری، نە ڕۆشنبیری، نە دەسەڵات، نەپێگەی نەتەوایەتی، نە ساغلەمی و تەندروستی کۆمەڵگا، لەو چوار تەنیشتەیدا لەو هەلومەرجەیدا دەستی داوەتە قەڵەم و داستانی «شیرین خوسرەو»ی نووسیوە، شاکارێکی وا نەک شانازییە بۆ دونیای ئەدەبیاتی کورد، بەڵکو بە هیچ جۆرێک لە شاکارەکەی «نیزامی گەنجەوی» کەمتر نەبووە و کەمتریش نییە، هەر وەک خۆی باس لەوەی دەکا، کەوا خۆی لە «نیزامی» بە کەمتر نازانێت.

«شیرین و خوسرەو»ی خانا ٥٥٢٦ بەیتە و شیرین خوسرەوەکەی نیزامی گەنجەوی کە لە «باکۆ»ی ئەوسای سۆڤیەت لە چاپدراوە.

لە (شیرین و خوسرەو)ەکەی خانادا، کەوا دۆستی ئازیزم «حەمەی مەلا کەریم» لە چاپخانەی کوڕی زانیاری کورد، لە بەغدا ١٩٧٥ز چاپی کردووە، لە لاپەڕەی «دە»دا دەڵێت:

«بە داخەوە ئێمە مێژووی ژیانی «خانا» نازانین، تا تێی بگەم ئاخۆ یەکێک بووە لە مەلا پایە بەرزەکانی کوردستان، یان هەر یەکێک بووە لەوانەی پێیان ئەوترا میرزا..

بەندە دوای تەقەلای زۆر و زەبەنە، نەوە و ئەحفادی خانام دۆزییەوە، کە ئەوڕۆ بە تیرەی «قوبادی» یان «قوایی» ناسراون. لە بنەچەکدا باپیرانی ئێمەی بەگزادەی جاف مورادی، بەگزادەی جوانڕۆ، بەگزادەی باوەجانی، بەگزادەی وەڵەدبەگی قوایی تاوگۆزی و برێک لە ئالی بەگی مکەیالی، دەڕۆینەوە سەر یەک باوک و باپیرە. «خانا» بەگزادە بووە، دەسەڵاتدار بووە، خوێندەوارێکی باوەڕپێکراو لە سەردەمی خۆیدا ناسراوە و خاوەنی دیوەخان و هاتوچۆی ئەملا و ئەولای گەورە پیاوانی سەردەم بووە.

زۆر لە سـەردەمی «خانـا»ش کۆنتر نەتەوەی کورد پەیڕەوی دەسـەڵاتە گەورەکانی بێگانە بوونـە، ئیتـر عەجەم و تورک و عارەب و تەتـەر و تەواوی داگیرکەرانی کوردسـتان، بەڵام لەو سەردەمەشـدا کـەوا کورد لە ئاسـماندا ئەسـتێرەی نەبـووە، «خانا» ئەوەندە بـاوەڕی بە خۆی هەبووە، خۆی لە «نیزامی گەنجەوی» بە کەمتر دانەناوە، بە تەئکید ئەگەر خوێندەوارێکی گەورە و لێزان و بە توانا نەبووبێت ناڕواتە ناو دەریای باسی (موخەیەر- موسەیر)ەوە. ئەو باسە باسێک نەبووە نە ئەوساو نە ئێستاش هەمووان لێی بدوێن. «خانا» لەو رووەوە ئەسپی تاوداوە. «خانا» لە زمانی عارەبیدا لێزان و ئاگادار بووە، دووجار بە سەفەر چووە بۆ بەغدا، لە ئەدەبیاتی فارسیدا دەسـتی باڵای هەبووە، وا دەگێڕنەوە کەوا زۆر گرنگی داوەتە جلوبەرگ و رەنگ و پویی، باوەک لە دنیای ئەدەبیات و عیشـقدا سـەردەمداری ئـەو دوو بوارەی بووە، بـەڵام بەگزادانە جلوبەرگ و رەفتـاری کـردووە، وەک خان زادەیەک لەگەڵ گەورە پیاوانـی دوور و نزیکدا جووڵاوەتەوە و هاودەمی زۆربەی خوێندەوارانی سـەردەمی خۆی کردووە و شـیعر و هەڵبەسـتیان لەگەڵ یەکدا گۆڕیوەتەوە.

قوبـاد بەگـی باوکی «خانـا» وەک هەر گەورەپیاوی سـەردەمی خۆی تێدەکۆشـێت، کوڕی گـەورەی جێگـەی بگرێتەوە، کوڕە گەورەی قوباد بەگ ناوی «فەتـاح بەگ» بووە، باوکی زۆرتر مەیلـی بـە لای کوڕە گەورەکەیەوە دەبێت، تا جێگەی بگرێتـەوە، «خانا»ش لە دنیای ئەدەبیات و شیعر و شاعیراندا حەوت خوانی بڕیوە و زۆرتر فیکر و زکری هەر بە لای سەواد و رۆشنبیرییەوە رۆیشتووە، بەڵام رەفتار و کرداری برا گەورەکەی بە دڵ نەبووە، لەو رووەوە چەند جارێک ئەو باسـە لەگەڵ باوکیدا دەکاتەوە، کەوا ئەو برا گەورەیەی ئێمە بۆ جێگریی تۆ دەسـت نادات، باوکی وای بۆ دەچێت کەوا خانا ئیرەیی بە برا گەورەکەی دەبات، قسـەکانی «خانا»ی بە دڵ نابێت، کە خانا جارێکی تر ئەو باسە لەگەڵ باوکیدا دەکاتەوە، باوکی لێی ئاڵۆز دەبێت و «خانا» وەدەردەنێت و «خانا»ش بە بنەماڵەوە شـەیدای تێگەیشـتن و پێگەیشـتنی رۆشـنبیری بووە، ئەو وەدەرنانە دەکاتە بەڵگە و دەسـتەگیرەی وژدانی خۆی و وەک هەر شەیدایەکی فێربوونی زانیاری ئەو دەمە چەندین ساڵ مزگەوت بە مزگەوت دەکا و دەیەوێت و بە لای لێزانی و زانیاری ئەو سەردەمەوە عاشقەوار خەریک دەبێت و یەک دوو ساڵێکیش لە شاری بەغدادا نیشتەجێ بووە.

وردە وردە شۆرەت و ناوباوی «خانای قوبادی» دەڤەر بە دەڤەر دەڕوا و وەک دیاردەیەکی بلیمەتی سـەردەمی خۆی ئامادەیی بۆ دەکرێت و باوکی و براکانی شـانازی بەو شـۆرەتە دوور و نزیـک گیـرەی «خانا» دەکەن و ئەم وتەی «قوباد بەگـە» لە ناو خزمانی قوبادیدا دەم بە دەم وتراوە تا گەیشتووتە ئێمە، گوایە قوباد بەگ وتوویەتی:

«من نەمکردبوو خانا خودا کردی» ئیدی باوکی و براکانی و ریش سـپییەکانی کەس و کار و ئێلـی قوایـی دەڕۆنە دوایـدا و دەیگێڕنەوە ناو تایفەی قوبادی و بە تێکڕا دەنگی تیرە و براکانی و خودی قوباد بەگ لە جێگەی باوکی دادەنێن..

دیارە تا ئەو دەمە کە گەڕاوەتەوە ناو عەشیرەت «شیرین و خوسرەو»ی نەنووسیوە، لە دوای گەڕانەوەی ئەو شاکارەی نووسیوە. حەمەی مەلا کەریم، لە چاپکردنی «شیرین و خوسرەو»ەوە لە بەغدا چاپی کردووە ١٩٧٥، لە پێشەکییەکەیدا دەڵێت:

«بــە داخــەوە ئێمــە مێژووی ژیانی «خانــا» نازانین، تا تێی بگەین ئاخــۆ یەکێ بووە لە مەلا پایە بڵندەکانی کوردستان، یان هەر یەکێک بووە لەوانەی پێیان ئەوترا «میرزا» و چێژێکی شیعر و ئەدەبیاتــی هەبــووە و بە هێزی خۆیان توانایەکی رۆشــنبیرییان بۆ خۆیــان پێکهێناوە، هەر لەم ڕێگایەوە هی وایان تیا هەڵکەوت..»

ئەو چەند دێرەی کاکە حەمەی مەلا کەریم لە پێشــەکییەکەیدا نووســیویەتی بە داخەوە کاکە حەمە، تۆزەکێک نەخۆشە و تەندروستی باش نییە، من دوێنێ شەو ٢٠١٠/٢/٢٦ بە تەلیفۆن قسەم لەگــەڵ کــرد، مژدەم پێدا کەوا دوای تەقەلایەکی زۆر بەشــێکی ژیانی «خانا»م بەدەســت هێناوە، زۆری لا خۆش بوو و ســوور بوو لەســەر ئەوەی بیکەمە باســێک و بڵاوی بکەمەوە. لە وەڵامیدا وتم:

بــڵاوی دەکەمــەوە، بەڵام لە کتــاوی «مێژووی هۆزی جاف»دا کــە دوو بەرگە و بە ئومێدی خودا بە زووترین کات دەیخەمە کتاوخانەی کوردییەوە.

با بگەڕێینەوە ســەر «خانا»ی بلیمەت، ئەوانەی «شــیرین و خوســرەو»ی خانا دەخوێننەوە بۆیان روون دەبێتەوە ئەو زاتە چەند باوەڕی بە خۆی هەبووە و باوەڕەکەشی لە رووی بنەمایەکی فشــە و خۆ بە زلزانین نەبووە، ئەو گەلێک بەختەوەر بوو کەوا کوردە و لە کوردســتاندا ژیاوە، ئــەوی ئــەو مەلحەمەیەی دەخوێنێتەوە ئازاییەکەی ســەواد نەزەری فیکــری خانا و ئاگاداری ئەو پیاوەی دێتە بەرچاو کەچی بە وردەکارییەوە لە بارەی دەســەڵات و رەفتار و کرداری شــاکان و عیشق و پەیوەندی و پێگەی ئافرەت و ئیدی تەواوی دەست و پێوەندی ئەو سەردەمە و چۆنیەتی ڕووداوەکان و بــە شــێوەیەکی تێکڕایی هەڵســوکەوتی ژیانی ئەو زنجیرە دەســەڵاتە و مامەڵەی کۆمەڵایەتــی کۆمەڵــگای ئەو دەمەت بۆ شــی دەکاتەوە. لــەوەی گرنگتر خانا بە کــوردی فیکری کردۆتــەوە، بــە کوردی دەیگێڕێتەوە، کــەس وانازانێت ئەو رووداوانە لــە کۆمەڵگای کوردەواریدا دوور بووە هێندە بۆچوونەکانی کەرەســتە و ئامێرەکانی کوردەوارییانە وەدەرخســتووە خوێنەر لای وایە لە ناوچە و دەڤەرەکانی جوانڕۆ و لێواری رووباری سیرواندا روویداوە، سا وەرە بگرە و بەردەی ناو ئیمپراتۆرییەتی ساسانی هێندە کوردەوارییانە بە وردەکارییەوە باس بکەیت، کەس هەست بەوەی نەکا کەوا لەکولتوورە کوردەوارییەوە دوورە مامۆستایی و زمانی ماچوو و گۆران دەزانن چێژی (شیرین و خوسرەو)ی خانایان بەلاوە تەواو نابێت «خانا» شیرین و خوسرەو وا دەست پێ دەکات:

**ئەوڕۆ کە خامەی عەنبەر شەمامە**
**وەش بو کەرد جە موشک ئینشای ئەی نامە**
**تەئریخ هیجرەت «ختم المرسلین»**
**موطیع دویان شەرح شەرع و دین**
**رووی دووشەمە بێ (ذي حجة الحرام)**
**هەزار و پەنجا یەک سەدی تەمام**
**ناگا جە وەختی میناى صبوح دەم**
**حەجام خورشید رەوشەن بێ چون چەم**

**جە پەردەی ئەسرار لامەکان ماوا**
**سروشی پەی طەور بە گۆشم یاوا**
**واتن، هەی شوعەرای خۆش نەظم و شێوە**
**جانشین قەیس، پەی لەیلا لێوە**
**چیش مبو چون نەظم «نیظامی» دور سەنج**
**بە لەفظ شیرین بەبێ لارە و لەنج**
**جەوەصف فەرهاد شیرین و پەروێز**
**باوەڕی بە رەقصی خامەی عەنبەر بێز**
**عەیبەن پەری نو دانای دور شناس**
**دەمێ چون صەرراف یاقوت و ئەلماس**
**جەی بازار عەشق جەرای پڕ هوشی**
**مەشغول بی بەکار جەوهەر فروشی**
**حەیفەن وێنەی تۆ جەواهیر باری**
**نەکەرو پەی وێش رەنگین بازاڕی**
**خاطرەت جەم بۆ جەوهەری لال سەنج**
**دانای دور شناسی گەنجوەر کۆی کەنج**
**هەر کەس وێنەی گەوهەر بارشەن**
**داناو بزورگان خەریدار شەن**
**گوشاد کەر زوبان جەواهیر بارت**
**تا گەرم بو ظەریف سەودای بازاڕت**
**وەرنە جە دەوران تو جەبێ کاری**
**عومرێ بە زایە و بە پوش مەیاری**

خانا لە باوەڕێکدا بووە، عەدل و حەقیقەت دەستەمۆی دەستی زوڵمی زۆردارانە، هەر بۆخۆی لە نزیکترین کەسیەوە کە باوکی بووە دووچاری زوڵم و زۆرێکی یەکجار زۆر بووە، دوو جاران لە لایەن باوکییەوە ماڵەکەی سووتێنراوە، سەرەنجام لە خێڵ و هەواریش وەدەردەنرێت و ماڵ و منداڵی بەجێ دەهێڵێت و دەربەدەری شاران چەندین ساڵ بە دوای سەواد و فێربووندا دەگەڕێت و ئەوی مەلای بەناوبانگی ئەو سەردەمە هەیە دەڕواتە خزمەتیان و زۆر شتیان لێوە فێر دەبێت، بەڵام خانا باوەڕی بە شێوەی عەدالەتی ئەو سەردەمە نەبووە و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ژیانی ئەو خەڵکە بەو شێوەیە بەناعەدالەتی دادەنێت و دەڵێت:

**خانا، بو، وەسەن زوبان درازی**
**کۆن، ئەو صاحیب عەدل تۆ پێش بنازی؟**
**کوتاکەر ئەی حەرف بە دەوان دەو**
**ویردەر بە فەرمان دڵگیر خوسرەو**

خانا، شیفتە و عاشقی عەدالەت بووە، خانا دەربەدەری دەستی زوڵم و زۆری باوکی بیروڕای خێڵەکـی بووە، خانا لە دەروونیـدا پەرچەمی عەدالەت و بەرانبەری مرۆڤەکانی هەڵگرتووە، دیارە

ئیبراهیمە جافەکەی لای ئێمەش ماوەیەک بەرەو خوار بۆتەوە و لە شاری «ئور» ژیاوە.

ورد بەرەوە لەم پەیوەندییە عەفەوییانە، ئەمە زادەی بیر و بۆچوونی کابرایەک یان کۆمەڵێکی خوێندەوار نییە و رێکیان خستبێت. ئەو جۆرە رێکخستنانەش زۆرتر بیر لە سوود و زیانی کەسانێک یان کۆمەڵێک دەکەنەوە و لەم جۆرە داستانانەی دروست دەکەن، با واقیعانە لە خۆمان بدوێین، خۆمان مەبەستم ئێمەی کوردە.. وەک زانراوە، لە دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوبەرەوە ئێمەی کورد خاوەنی دەسەڵاتێکی ناوەندی بەربڵاو نەبووینە تا لە رووی بوونی زەڕ و زۆرەوە داستان سەرایی یا مێژووسازی بکەین وەک گەلانی دەست رۆیشتووی دەوروبەرمان.

لەو رووەوە رەشیان بە سپی کردووە و ئەوی بە کەڵکە و هی خەڵکە بردوویانە و بە ناوی خۆیانەوە تۆماریان کردوون ئێمەی کورد ئەو دەوڵەت و دەسەڵاتەمان نەبووە، ئەوی دزراوە لە ئێمەیان دزیوە، ئیدی ئەوە مێژووە، کەلتوورە، کەلەپوورە، زمانە، سامانە. بەڵام ئەوی بۆیان نەکراوە بیدزن، ئەفسانەکانە یان چیرۆکە خۆماڵییەکانە، ئەوانە سنگ بە سنگ ماونەتەوە، تاکو ئەمڕۆکەش دەیگێڕنەوە، ئەفسانەی میللەتان بەستەگییەکی راستەوخۆی هەیە لەگەڵ رەگەزدا، لەگەڵ جوگرافیا و جۆری زیندەگیدا، ئیدی جوگرافیای سروشتی، یان ئینسانی یان حەیوانی ناکرێت لە ئەفسانە و چیرۆکێکدا بوترێت، یاخۆ باخاتێکی دارخورما لە بناری چیای قەندیلدا یا هەورامان هەبووە، یا رەوەیەک حوشتر لە دامێنی چیای شاهۆدا دەلەوەڕان!.. یان کەنگەر و فیل و کەرکەدەن لە دۆڵی بالیساندا بووە...!

دەمەوێ ئەوە بڵێم، واقیعیەتی جوگرافیای راستەوخۆ بەشێکە لە جۆری داستان، سەرایی ئەفسانە داڕێژی، ئەمە لە لایەن بیر و رایەکی زانستییەوە سەلمێنراوە.

با بگەڕێینەوە لای چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیمی جافی لای ئێمە.. دەڵێم جافی لای ئێمە. تۆی غەیرە جاف دەمارگرژی نەتگرێت و بڵێی سەیر سەیر، خۆ ئەمە خەریکن حەزرەتی ئیبراهیم بە جاف دەکەن. مەبەستمان لەم باسە بە جافکردنی ئەو پیاوە مەزنە نییە، بۆ من «ئیبراهیم» جاف بێت، یان گۆران یا زەنگەنە، یا پشدەر یا هەرکییەکە، گرنگ ئەوەیە کورد بووە. ئەو واقیعە بسەلمێنرێت.. ئەگەر بێت و بە شێوەیەکی زانستییانە دۆڵ و دەربەند و تەپۆڵکە بەجێماوەکانی ناو کوردستان بخرێتە ژێر چاودێرییەکی ئەکادیمییانە و لێکدانەوەیەکی زانستییانەی ئاسەوارناسینەوە لەوەی دڵنیام بنەڕەت و بنەمای تیۆرە مێژووییەکان ژێر و روو دەکرێت. ئەورۆ لە کوردستاندا هەزاران شوێنی دیاریکراو هەروەها نەزانراوی ئاسەوار بەجێماوە، هەزاران ساڵە بێ خێو و خاوەنە برێکیان پێیان زانراوە و ناسراوە، بەڵام داپۆشراون تا درۆ و دەڵەسەی تۆمارکراوی بەمێژووبووی عارەب و عەجەم و تورک بە درۆ نەخاتەوە.

# یاخیبوونی مەحموود پاشای جاف

عەلی ئەکبەری وەقایع نیگاری کوردستانی لە کتاوی حەدیقەی ناسریە و «میرئاتولزەفەر»دا دەڵێت:

ئەو دەم دەسەڵات بەدەست، حەسەن عەلی خان ناسراو بە «ئەمیر نیزام»ەوە بوو، مەحموود پاشای جاف لە ئەستەمبوڵدا دەستبەسەرکرابوو، بەڵام ناوبراو لە فرسەت سوودی وەرگرت و و لە ڕێگای «تفلیس»ەوە دەگاتە شاری «باکۆ»، لەوێڕا خۆی دەگەیەنێتە ڕەشت و گێلان، لە باکووری ئێران و بە جلوبەرگی کرێکارانەوە، ئەو ڕێگا دوور و درێژە پڕ لە مەترسییەی تەی دەکا و خۆی دەگەیەنێتە ناو هۆزی جاف، دەوڵەتی ئێران لەبەر زویر نەکردنی دەوڵەتی عوسمانی ڕێگە بە هاتنە ناو ئێران و مانەوەی پێ نادا و «ئەمیر نیزام» بۆ ئەو قەدەغەکردنە دەکەوێتە تەقەڵلاوە و فەرمان دەداتە چاودێرانی سنووری ئێران تا لەو ڕووەوە هۆشیار بن و بەوەوە ڕانەوەستاوە، یەک تیپ چەکداری بە سەرپەرشتی «سەرتیپ غولام حوسەین خان» تا بەرگری لە دزەکردنی مەحموود پاشا بکات بۆ ناو ئێران، وا دیارە بودجەی ئەو تیپە لە لایەن ئەمیر نیزامەوە سەرف کراوە و دەوڵەت ئەو پارەیەی نەداوە و لەبەر ئەوەی دەوڵەتی ئێران لەو ڕووەوە سەختگیری کردووە. مەحموود پاشای جاف، ناچار دەبێت خۆی تەسلیمی دەوڵەتی عوسمانی کاتەوە..

ئەمە وەقایع نیگار بەو شێوەیە باسی لێکردووە، بەڵام حەقیقەتەکەی بەو شێوەیە نەبووە، وابزانم لە بەشەکانی تردا لەم ڕووەوە دواوم، ئەوەی ڕاستە دوژمنانی مەحموود پاشای جاف و زیرەکیی عادیلە خانمی حەرەمی عوسمان پاشای برای مەحموود پاشا و دوژمنایەتی و ناکۆکی والی وەختی بەغدا، لەگەڵ مەحموود پاشادا و هەروەک سەرۆک وەزیرانی ئەو دەمی بابولعالی، کە حەزی لە کار و کردەوەی مەحموود پاشا نەکردووە. دۆستی دوژمنی ئەو بووە، ئەوانە هەموو پێکەوە کۆمەڵیان کردووە و بووەتە هۆی دەست بەسەراگرتنی مەحموود پاشا، دوای دوو ساڵ چەرمەسەری و شاخ بە شاخ کردنی مەحموود پاشا، سەرۆک وەزیرانی بابولعالی دەگۆڕێت و یەکێک لە دۆستانی مەحموود پاشای جاف دەکرێتە سەرۆک وەزیران و دەتوانێت سوڵتان ڕازی بکات و تەواوی ناو و ناوونیشانی و ئیمتیازاتی بۆ گەڕاندۆتەوە لەگەڵ ڕیئاسەتی جافدا.

# شەڕی رووس و جاف

لە سەرەتای ساڵی ١٣٣٤ک تا ساڵی ١٣٤٩ک، لە نێو هۆزی جافدا واباوە بە سەردەمی دەسەڵاتی عەشایەری دەژمێردرێت.

لە مانگی محەڕەمی ساڵی ١٣٣٤ ک دا سوپا و لەشکری رووسیای تەزاری بە فەرماندەیی «مامانۆف» گەیشتە کوردستانی رۆژهەڵات و گەیشتە باکووری کرماشان، شەڕێکی یەکجار سەخت و خوێناوی لە نێوان سوپای رووسیا و هێزەکانی جافدا روویداوە، دیارە فەرماندەیی ئەو شەڕە لە لایەن عەباس خانەوە «سەردار رەشید» ئەنجام دراوە و توانیویانە هێزی رووسیای تەزاری ناچاری کشانەوە بکەن لە شەوی پێنج شەممەی هەژدەی مانگی محەڕەمی ساڵی ١٣٣٤ک دا، سوارەی جافی جوانڕۆ کە بریتی بوون لەم تیرانە: سوارەی وەلەد بەگی، روسەم بەگی «جوانڕۆ» قوبادی «قوایی»، باوەجانی، کەمانگەر. لەو شەڕەدا لە دەڤەری فەقێ سلێمانیدا هێزی رووس گەمارۆ دەدەن و لەو شەڕەدا قارەمانانی جاف شەڕی سەر و ماڵیان کردووە و هێزی قوزاقی رووسیایان پەرێشان کردووە و ئەوی لەشکرەکەیان هەیبووە لە لایەن سوارەی جافەوە تاڵان کراوە و رووسیان ناچار کردووە بکشێتەوە...

دیارە رووسەکان کۆشاون جاف لە سەردار رەشید دوور بخەنەوە، بۆ ئەو مەبەستە «ژەنراڵ پاراتۆف» لە ناو شاری سنەدا دەعوەت لە سەرانی جاف دەکات تا کۆمەڵەیەک دروست بکەن، بە ناوی ئەنجوومەنی عەشایەر دوور لە سەردار رەشید، بەڵام دیارە رووسەکان پەییان بەوە نەبردووە کە ئەو سووربوونە لە شەڕ زۆرتر بە شەڕێکی ئایینییان زانیوە و فەتوای مەلا و شێخ و خانەقاکان هانیانی داوە تا خۆشەویستی سەردار رەشید.. لە لایەکی ترەوە لێپرسراوانی عوسمانی ئەوانیش هەر لەو رووەوە لە کاردا بوونە و شەڕکەرانی جاف سەری رمی تەواوی ئەو شەڕانە بوونە دژ بە سوپای رووسیای تەزاری.

# جافی دەوروبەری شاری بەغدا

وازانراوە تیرەکانی جاف لە سەدەکانی شانزە و حەڤدەوە لە جوانڕۆ بڕێکیان لە ژێر دەسەڵاتی ئەردەڵانییەکانەوە گوێزایانەتەوە بۆ ئیمارەتی بابان و ئەو دوو دەسەڵاتە کوردە پەیوەستە دژی یەک بوونە و هەریەکەیان بە دوو دەسەڵاتە زلهێزەکەوە پەیوەند بوونە (ئێران ـ سەفەوی ـ قاجاری) لە لایەکەوە (عوسمانی) لە لایەکی ترەوە...

بەڵام دیکۆمێنت بە دەستەوەیە کەوا لە پێش ئەو مێژووەیدا هۆزی جاف لە دەوروبەری بەغدا ژیاون و دەسەڵاتیشیان هەبووە، لەم رووەوە ئەم هۆزە کۆچەرییە هەرگیز نەڕۆیشتنەتە ژێر دەسەڵاتەوە.

عیماد عەبدولسەلام، مێژوونووسی ناسراو لە کتابی: (دراسات وثائقية في تأريخ الكرد الحديث وحضاراتهم) دەربارەی هۆزی جاف لە لاپەڕە (٢٤٧، ٢٤٨، ٢٤٩)دا دەڵێت: «ئەم هۆزە بە گەورەترین هۆزی کورد دەژمێردرێت و تیرەیان زۆرە، بە زۆری لە باشووری کوردستان و رۆژهەڵاتدا» دەژین، لەو رووەوە مێژوونووس (زرار سدیق تۆفیق) لە کتێبی «هۆزەکان و سەرۆک هۆزە کوردەکان لە سەردەمە ناوەڕاستەکاندا، لاپەڕەی ٥١» دەڵێت:

بڕێک لە مێژوونووسان لایان وایە، ئەم هۆزە لە سەدەی هەژدەهەمدا گەیشتوونەتە ئەو ناوچانەی وا تیایدان: (ئیگلتون، هۆزە کوردەکان، ل٩٩). بەڵام دیکۆمێنتی مێژوویی لە بەرواری، زولقەعدەی ١١٢٩ک ـ ١٧١٦ز. (دەفتەمهمە ١٢٦ ل ١٦٥ ـ ١٦٦) تیشک دەخاتە سەر زادگاکانی هۆزی جاف، کە سەرەتا لەوێڕا بوونە، کە لە بنەڕەتدا (من الأصل من عشائر مضافات بغداد) کە ئەودەم سنووری بەغدا گەلێک پان و پۆڕ بووە...

لەو بەڵگەنامەیەدا ڕۆش نکراوەتەوە کە هۆزی جاف لە پێش چەندین ســاڵدا کۆچیان کردووە بۆ ئێران و شــەڕکەرەکانیان ئەمیری «قەسری شیرین»یان کوشتووە و (دیارە ئەو کاتە قەسری شیرین سەر بە بەغدا بووە)، لەو شەڕەدا زۆر لە چەکدارانی عەشیرەتی «باجەلان»یش کوژراون و ئەو پەلامارە بە هۆی پیلان و بەرنامەی والیی شاری «سنە» ئەنجام دراوە..

هەر لەو بەڵگەنامەیەدا هاتووە: کەوا فەرمانێک دراوە بە والیی بەغدا (حەســەن پاشــا، ١١١٦ ـ ١١٣٦ک ـ ١٧٠٤ ـ ١٧٢٣ز) کەوا ئەنجوومەنێکی شــەرعی بە ســەرۆکایەتی «قازی شەرعی بەغدا» لە جێگەیەکی شــیاودا بەسەر سنوورەوە پێکدێت، تا چۆنیەتی کوشتنی «عوسمان بەگ» ئەمیری قەســری شــیرین وەدەرکەوێ، هەروەها کوشــتنی ژمارەیەکی زۆری هۆزی باجەڵان کە لە لایەن هۆزی جافەوە کوژراون، کە تا ئەو دەم هۆزی جاف لەســەر عەشــایەری ولایەتی بەغدا لە قەڵەم دراون و لەبەر تالآن و بڕۆ ئەو ولآتەیان بەجێهێڵاوە.

دیارە، ئەو دادگا شەرعییە پێکهاتووە و فەرمانی خۆیشی دەرکردووە و تیایدا دەڵێت:

«ئەو پەلامارە لە ڕۆژی ٢٦ی مانگی شــەعباندا ڕوویداوە و بە هانی والیی شــاری «ســنە» عوســمان بەگی ئەمیری قەسری شــیرین کوژراوە، ئەو پەلامارە لە لایەن شەڕکەرانی عەشیرەتی جافەوە ئەنجام دراوە و عوســمان بەگ و دوو ســەد کەســی لەگەڵدا کوژراوە و زیاتر لە سەد و پەنجا ژن و منداڵ لەو پەلامارەدا کوژراون و ســەری بڕاوی عوســمان بەگ و دوو ســەد خێزانی بەدیل گیراویان گەیاندووەتە لای والی سنە.

ئەوی لەو شارەدا بووە بە تالآن بردوویانە و لە حوکمی قازی شەرعدا هاتووە: کەوا نوێنەرێک بنێرێت بۆ ئەو دادگایە تا وەڵامی ئەو تۆمەتانە بداتەوە و بەپێی پەیمانی ئیمزاکراوی نێوان ئێران و عوسمانیدا کە سوورن لەسەر دۆستایەتی، با ئەو نوێنەرە بگاتە ئەم دادگایە و مەبەست لەم دادگایە عەدالەتــە و گەڕانــەوەی ماف و دارایی تالآنکراوی خەڵکەکەیە، هەروا بژاردنی خوێنی کوژراوان.. بە پێچەوانەوە، والی بەغدا «حەسەن پاشا» ناچارە ئەم ڕووداوە بنێرێت بۆ ئەستەنبوڵ تا لەوێڕا مامەڵەی لەگەڵ بکەن.

# هۆزی جاف و دەسەڵاتی ئالبویە

ئــەوی روونــە هۆزی جاف یەکێکە لــە کۆنترین هۆزەکانی کورد و رەگ و ریشــەیان دەگاتە سەردەمی ساسانییەکان و سەرئەنجام وەک زۆری کورد دەگەنەوە سەر ماد.

ئەگــەر بــە وردی لــە دیاردە مێژوویــی و فەرهەنگــی و کۆمەڵایەتی ورد بینــەوە، پەیوەندی رەگەزی، کۆمەڵایەتی، جلوبەرگی پیاوان و ژنانی جاف هەروەک سەردەمی پێش ئیسلام ماوەتەوە، بە تایبەت هی ســەردەمی دەســەڵاتی ساســان و زۆر واژە و وشەی زمانی کۆنی فارسی، دەری، پەهلەوی بەکاردەبرێت، یان هەڵســوکەوت و رەفتار و کرداری رۆژانەیان دیســانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ســەردەمی پێش ئیسلام، هەتاوەکو ئەگەر بە وردی لە فۆنەتیک و ئاهەنگی «هورەی جاف»ی ورد ببینەوە، ئازا دەردەکەوێت ئەوە ئاهەنگێکی ستایشە، ئاوازێکی (جەنایزیە) ریتمەکەی ئایینییە، لاواندنەوەیەکی مەزهەبی عیرفانییە، ستایشــی ئاهورامزدایە، هــورەی جافی لەگەڵ تەواوی ئاواز و ئاهەنگی هۆزەکانی کەی کوردا، جیاوازە. نە مۆســیقای لا قەبوڵە و نە ریتمی ئاهەنگ جا بەندە «هــورەی جاف» بە بەڵگەیەکی کەی ئاشــکرا و روون دادەنێم بــۆ پەیوەندی رۆحی نێوان جافی ئێستا و جاوانی دوای ئیسلام و جاپانی سەردەمی ساسانی. ئەم هۆزە بەپێی رووداوەکانی مێژوو هەمیشــە دەورێکی ســازندەیان هەبووە و زۆربەی دەســەڵاتدارەکان نیازیان بە جەنگاوەری ئەم عەشیرەتە پەیدا کردووە.

لە ســەردەمی «دەیلەمەکان»دا و هۆزی دەســەڵاتی «حسنویە»ی کورد لە رۆژئاوای ئێراندا توانیویانە دەوڵەت پێکەوە بنێن و دژ بە خولەفای بەغدای عارەب رابوەستن.

هــۆزی جاف بە ســەر و ماڵــەوە لەگەڵ «ئالبویە» بوونە بۆ نیشــانەی دەســەڵاتیان «قەڵای سیروان»یان دروست کردووە.

لەبــەر ئەوەی دەســەڵاتی ئیمارەتــی «ئــەردەڵان» کەوتووەتە بەربڵاوی توانــا و دەوڵەت و دەسەڵاتییەوە و بەرەو خواری کوردستانی رۆژهەڵات داکشاون و گەیشتوونەتە دامێنی لوڕستان و لە «زبدة التواريخ»ی ســەنەندەجیدا، لەو رووەوە نووسراوە (سلێمان خان ١٠٦٨ز) کە سلێمان خان لە شــاری ئەســفەهاندا دەستبەســەر بووە و لە ژێر چاودێری «شــاە عەباســی» سەفەویدا بــووە، حکومەتــی ئیمارەتی ئەردەڵان دەدەنە کوڕەکەی بە نــاوی «کەلی عەلی خان» و ناوچە و دەڤەری جوانڕۆ و ئێلاخەکانی هۆزی جاف دەخەنە ژێر فەرمانی (ســەفی خانی ســوڵتانی گۆران میر زیائودین) سەفی خان و هۆزەکەی، لە زەهاوەوە کۆچیان کردووە لە جوانڕۆدا دابەزیون... لە سەدەی یانزەدا هەوارگەی هۆزی جاف گەلێک بەربڵاو بووە «سەفی خان» سەرەتا لە جوانڕۆدا و لە دواییدا قەڵای سەفی ئابادی دروست کردووە و لە تیرەکانی جۆراوجۆری هۆزی جاف، هێز و لەشــکرێکی پێکهێناوە ئەمە لە ســەردەمی دەســەڵاتی سەفەویدا، بەو شــێوە بەردەوام بووە، تا دەگاتە ئەوەی جاف هەســت بەوە دەکات ئیدی کاتی ئەوە هاتووە، فەرمانداری خەڵکی تر نەکا و لە لایەکی ترەوە بنەماڵەی گۆرانەکان لەگەڵ ئەردەلانەکاندا تێکچوون.

# داستانی مێجەرسۆن

مێجەرسـۆن، ئەفسەرێکی لێهاتووی دام و دەستگای جاسووسی بەریتانیا بوو، لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا خۆی گەیاندووەتە کوردستان و بە ناوێکی ترەوە «غولام حوسەین»ەوە. کە نووسەرێکی ئێرانییە، لە ماڵی وەسمان پاشای جافدا دەگیرسێتەوە.

دیـارە ئەودەم وەسـمان پاشـا لـە حەیاتدا نەبووە و دەسـەڵات بەدەسـت «عادیلە خانم»ی خێزانییەوە بووە. تاهیربەگی شـاعیر و ئەحمەد موختار جاف، دوو کوڕی وەسـمان پاشا بوونە، تایەر بەگیان کوڕی گەورەی «خانم» بووە، بۆیە دەڵێم بە «خانم» ناودەبرا. تاهیر بەگ عەرەبی، تورکی، فارسـی و نەختێک زمانی فەڕەنسـی زانیوە. دیارە تاهیر بەگ، هەر بە فەڕەنساوی لەگەڵ (سۆن)دا دواوە، سۆن بە هەڵە «نەء»ی زمانی ئینگلیزی بەکار بردووە، لە جۆیەی فەڕەنسی ئەوە سەرنجی تایەر بەگ رادەکێشێ و سەرئەنجام هەڵی دەپێچێت کە کێیە و کوێنەرییە؟. سۆن، ناچار دان بەوەیدا دەنێت کەوا ئەفسەرێکی سوپای ئینگلیزە..

بۆ پاراسـتنی مێجەرسـۆن، وا بە چاک دەزانێت، شـاری هەڵەبجە بەجێ بهێڵێـت.. لە دواییدا «سـۆن» لـە کتاوەکەیـدا ئەم رووداوەی نووسـیوە و باسـی زیرەکیی تایەر بـەگ و لێهاتوویی «خانمـی» زۆر تیادایـە.. «ئەدمۆنس» دوای دەرپەڕاندنی حکومەتی عوسـمانی دێتە لای خانم و دەپرسێت: ئایا هیچ گومانێکی لە «سۆن» هەبووە کاتێ لە ماڵیاندا بووە؟

خانم، وەڵامیان دەداتەوە دەڵێت: بەڵێ رۆژێک تاهیری کوڕم پێی وتم ئەم غولام حوسـەینەی کـە لـە ماڵی ئێمەدایـە، من پێم وایە ئێرانی نییە و ئەوروپاییە، منیـش پێم گوت: هەرچی هەیە لێی گەڕێ، میوانە...

مێجەرسۆن، ماوەی حەوت مانگ لە ماڵی (وەسمان پاشا)دا ماوەتەوە.



شاعیری گەورەی کورد
تاهیر بەگی جاف

# کەلار

مـن منداڵـی دێـی کەلارم. کـەلاری بێ ئاو و وشـک و برنگ هەر لـە منداڵییـەوە بیرم لەوە دەکردەوە و خۆزگەم دەخواست و دەموت. کاشکی ماڵمان بەسەر سیروانەوە بایە و وا مەجبوور نەباینا لە گڕەی گەرمی گەرمیاندا هەموو رۆژێک هەشـت کیلۆمەتر ئەمسـەر و ئەوسـەرمان بە پێیان یا بە وڵاخ یا ئەگەر هەڵکەوتایە و بە ئۆتۆمبیل بکردایە بۆ یەک سەعات مەلەکردن. لە راستیدا ئاواکردنەوەی دێی کەلار لەو تەختەڵانییە بێ ئاوەدا و لەوێشـەوە سـیروان بە هۆشـپە هۆشپ و هاژە و سەروخوار دەڕۆیشت و ئێستایش دەڕوا من یەکێک لەمە بە نیشانەی بێ زەوقی و دوور لە زەرافەتی دادەنێم..

لە سـەرەتاوە خێزانی بەگزادەکان لە قەڵای شـێروانەدا دەژیان وەک هەوارگەی زسـتانانیان بـەڵام دوای کوژرانـی حەمەپاشـای جاف بچووکترین کوڕی حەمەپاشـا کە فەتـاح بەگ بووە و باپیرەی گەورەی «نووسـەر» بووە هەمیشـە نیشتەجێی قەڵا بووە و دوو سێ مانگێک نەبێت کە تاقەت و توانای گەرما و هاڵا و گەردەلوولی دەشتی شێروانەی پێوە نەدەما و لەگەڵ خێڵا بەرەو ئەو لێلاخی هۆبەتو و بناری مەریوان و سەقزە دەڕۆیشتن و کەریم بەگی فەتاح بەگیش کە کوڕە گەورەی فەتاح بەگ بووە لەم دوا دواییەشـدا لە لایەن دەسـەڵاتی ئینگلیزەوە کرابووە سـەرۆکی تەواوی عەشـایەری جاف و ئەویش تا چەند سـاڵێک پێش مەرگی هەر لە قەڵای شێروانەدا دەژیا. دێی کەلار لە پێشـدا ئاوەدان کرابوویەوە لە لایەن جەماعەتی حەمەی حاجی ئەڵماسـەوە ئیتر بوو بە جێگەی بەگزادەکانی گەرمیان.

ئەمانە هەمووی نابێتە بەڵگەی نەبوونی وردەکاری و بە خۆڕایی دەرد و ئازار چێژانی رۆژانی هاوین و بێ ئاوی و سەوزە و سەوزی جات بە بوونی سیروانەوە کە لە بنەدەستدا هاژەی دەکرد و دەوروپشـت و بەندە بێ ناو هێنان وەسـفی ناوچەی کەلار و شـێروانەم لە رۆمانی «هیچ»دا کردووە.

بە بیرەوەری من کەلار هەمیشـە لە دەسـەڵاتی دەوڵەتەوە ـ دوور بووە ئەو حەلە سیستەمی عەشـایەری لە دەبدەبەی خۆیدا بوو هێندەی لەگەڵ رەوشـت و بۆچوونی سـەدەکانی ناوەڕستدا

جیاواز نەبوو وەک ئێستا عەشایەربازی نەبەسرابووە بۆچوونی میلیشیاسازییەوە دەوڵەتی پاشایەتی زۆر کۆشا تا کەلار بکاتە ناحیە و پۆلیس و کارمەندی تیا دامەزرێنێت ئەمەش لەگەڵ بیروڕای بەگزادەکان و سیستەمی عەشایەریدا نەدەگونجا و بە تەواوی توانایانەوە دژ بەو بیروڕایە وەستان و دەوڵەت بەوە رازی بوو کە تەنها قەڵای شێروانە بکاتە «مخفر» و چەند پۆلیسێکی سوارەی تیا دانێت.

لە بیرمە لە کەلاردا چەندین پیاوکوژ و راکردوو چوزانم لێقەوماوی کورد و عەرەب هەتاوەکو تورکمانیش تیادابوو وە دەوڵەتیش ئەوەی دەزانی و دەنگی نەدەکرد و یا لە راستیدا هیچی پێ نەدەکرا .. لە ئاوا چوار دەور و بیر و باوەڕ و بۆچوونێکدا «بابم» لە چلەکانەوە خەریکی کۆکردنەوەی کتاو و گۆڤار و رۆژنامەی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی بووە..

بەندە ئەو حەلەم وەبیر نایە ئەمما پەنجاکانم دێتەوە بیر کە گۆڤاری هەفتانەی جۆراوجۆرم لە ماڵی خۆماندا دەدی. هەموو هەفتەیەک «بابم» سوارێکی دەنارد بۆ شاری «قصر شیرین»ی ئێران بۆ هێنانی گۆڤاری هەفتانەی «تهران مصور» و «ئاسیای جوان» و «ترقی» و «سیاه و سفید» و بڵاوکراوە نهێنییەکانی حیزبی «تودە»ی ئێرانی کە دیارە لەو شارەدا چاوساقی هەبوون و لە شاری «کفری»دا بە بۆنەی دووکانی «محەمەد رەشید خەیات»ەوە تەواوی گۆڤار و رۆژنامە و هەتاوەکو بڵاوکراوەکانی حیزبی شیوعی عیراقی پێ دەگەیشت. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بابم ئەندامی حیزبی شیوعی بووبێت..

ئەگەرچی لە سەرەتای گەنجایەتییەوە هەوا و هەناسەیەکی رۆشنبیرانەی هەبووە و خولیای ململان و مافی رەوای خەڵکە زۆرەکەی لەسەردا بووە هەرگیز نەڕۆیشتنە ریزی هیچ حیزبێکەوە لە شەستەکان بەدواوە برێک بیروڕای جموجۆرتر کرد و بۆی دەرکەوت ئەوانەی وا بانگەوازی هەی ئێمە . هەی ئێمەیان دەکرد بۆ ساتێک بۆ جارێک نەهاتنە هانای گەلی کوردەوە وردە وردە و ناخۆ ئاگا تا دەبوو لە گێژاوی هەستی نەتەوایەتیدا نوقم دەبوو.. وە لەبەر چەند هۆیەک کەلاری بەجێ هێڵا و نیشتەجێی بەغا بوو. کتاوخانەکەشی هەر لە کەلار مایەوە.

ساڵ ساڵی شەست و شەش بوو.. خوا هەقە زۆر لەو برادەرانە کە لە هەوارگەی کەلاردا گیرسابوونەوە.. سوودیان لەو کتاوخانەیە برد و زۆریش لەو کتاوانەشیان بەخشییە خۆ و کتاوخانەکانیان پێ رازاندەوە.. ماڵیان ئاوا... خێر بۆ خوێش نەک بۆ دەروێش وەک هەموومان دەزانین کارەساتی جۆراوجۆری سیاسیی کوردستان دامێنگیری هەمووان بووە زۆری جێلەق کرد و زۆریشی تەفر و توونا و دەربەدەری وڵاتان کرد، «باب»یشم وەک هەزاران کوردی دی لە شاری تارانی زەمانی شادا گیرسایەوە. گوڕ و گورزی «ساواک»ی ئەو حەلە گرمەی دەهات.. رۆژێک بابمیان پەلکێش کرد یەک دوو رۆژێک بە دوایەوە بووین.. تومەز یەکێک لە بنکەکانی «بەرەی ملی یا وابزانم فیدائیانی خەڵق»یان دەست بەسەرا کێشاوە و چەندین کتاوی مۆردراوی کتاوخانە «محەمەد سەعید جاف»یشیان تیا دۆزیوەتەوە..

کابرایەکی کوردی پەنابەر داخۆ چ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەو کۆمەڵانەدا هەبێت.. زۆری خایاند

تـا دام و دەزگای «سـاواک» بڕواتـە ئەو باوەڕەوە کە ئەو کتاوانە لـە هەلومەرجێکی تایبەتدا لە کتاوخانەی «محەمەد سـەعید جاف» دەرهێنراون و ئەوەشـیان زانی کە ئەمە یەکەمین جار نییە دەسـتگایەکی ئەمنـی کتاوی مۆرکراوی «بابم»یـان لە بنکەی بەجێمـاودا دۆزیوەتەوە.. بۆ خۆم لەم دوو سـێ سـاڵی دواییەدا زیاتر لە سەد کتاوی مۆرکراوی «بابم» بە نرخێکی زۆر لە هەولێر سەندەوە.. ئێستاش دانەکەوتووم و هەر دەگەڕێم..!!

دوای سەدان و هەزاران ساڵ ژیانی ڕەوەندی و کۆچەری هۆزی جاف سەرئەنجام زەمان و گۆڕانکاری ژیان و پێداویستییەکانی زیندەگی لە لایەکەوە، بگرە و بەردەی سیاسی و دامەزراندنی دەوڵەتێک بە ناوی عیراقەوە ساڵی ١٩٢٠ز لە لایەکی ترەوە. هۆزی جاف بە تەواوی تیرەکانیەوە ناچاری نیشتەجێبوون کرا.

زۆر لە دەسەڵاتدارانی عوسمانی و سەفەوی و قاجاری کۆشان بە زۆر هۆزی جاف نیشتەجێ بکەن و سـەرنەکەوتن، بەڵام کە سیسـتەمی ژیان لە بنەماوە گۆڕا و مرۆ تەماحگیری ژیانی تازە و تـازە داهاتووەکان بـوو، وردە وردە غرووری بیروڕای ڕەوەندی بەرانبـەر ژیانی تازە کەوتە پاشەکشـە و تیرەکانی هۆزی جاف کەوتنە نیشتەجێبوون و زۆربەیان لە هەوارگەکانیاندا چنگیان خسـتە قوڕ و خانوو و بەردیان سـازاند و بە گوێرەی مانگ و سـاڵ دێهاتی تایبەتییان بۆ خۆیان دروست کرد.

بەگزادەکانی جاف بەتایبەت دوای فەرمانڕەوایی حەمەپاشـای جاف کە بۆ خۆی لە زسـتاندا لە قەڵای شـێروانەدا نیشتەجێ دەبوو، مەحموود پاشا و وەسمان پاشای جاف هەڵەبجەیان کردە هەوارگەی نیشتەجێبوون، تا دەسەڵات و سەرۆکایەتی عەشیرەتی جاف بە دەست مەحموود پاشا و وەسـمان پاشاوە بوو، هەڵەبجە مەرکەزی دەسەڵات و قایمقامیەت دەژمێردرێ، بۆ ماوەیەکیش خودی حەمەپاشای جافیش لە هەڵەبجەدا قایمقام بوو، کە سەرۆکایەتی هۆزی جاف کەوتە دەستی کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمەپاشای جاف، مەرکەزی دەسەڵات و سەرۆکایەتی جاف بۆ «کەلار» گوازرایەوە..

کەلاری کۆن، دێیەک بوو وەک هەر لادێیەکی دیکەی کوردستان، بەندە «خوسرەو جاف» لەو دێیەدا هاتوومەتە دنیاوە. لەو دێیەدا شەشـی سـەرەتاییم تەواو کردووە. لەم کتاوەیدا «مێژووی هـۆزی جاف» ناکرێت کەلار و ڕۆڵـی «کەلار»مان لە بیر بچێت...کاتێک لە بارەی مێژووی جاف بدوێین، بێگومان دەبێ لە بارەی کەلاریش چەند لاپەڕەیەک بنووسین.

# شەڕی ئاوباریک

یەشـتا بە شێوەیەکی راسـت و دروست دەربارەی چۆنیەتی شـەڕی ئاوباریک نەنووسراوە هەرکەسە بە شێوەیەک لەو شەڕە دەدوێت و رووداوە حەقیقییەکە کەم و زۆر فەرامۆش کراوە و ئیدی هەروا ناهەقی و بۆچوونی چینایەتی و بیگرە و بەردەی نێوان خێڵەکان و شێخایەتی قەڵەم بەدەستانی چەپگەرا بووەتە هۆی فەرامۆشکردنی نەخشی حەقیقی بەشداربووانی ئەو شەڕەی کە ناسراوە بە شەڕی «ئاوباریک»

بەندە وەک نووسـەرێک هیچ شانازییەک نە بەو شەڕەوە دەکەم و نە بەو قۆناغەشەوە، قەینا کەریم بەگی جاف یاریدە و فەرماندەی قۆڵێکی ئەو شەڕە بووە، بەڵام ناچارم برێک لە حەقیقەتی باس نەکراوی بە ئەنقەست فەرامۆشکراو بخەمەڕوو:

لـە رۆژی ١٩٣١/٤/١ز کەریم بەگی جاف لەشـکرێکی سـوارەی جافـی کۆکردبوویەوە وە لە «ملەبـۆڕی» دێی زەردا لەگەڵ لەشکری تێکەڵـی دەوڵەتی تازەی ئێـراق و ئینگلیزدا رووبەڕوو دەبنەوە دیارە قیادەی ئۆردووی دەوڵەتی بەدەست کەسێکەوە بووە بە ناوی «حاجی قایمقام»

لەو شەڕەیدا چەندین کەسایەتی عەشیرەتی جاف بەشدارییان کردووە وەک:

١ ـ کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمەپاشای جاف سەرۆکی ئەو کاتەی عەشیرەتی جاف.
٢ ـ داود بەگی جاف برا بچووکی کەریم بەگ
٣ ـ محەمەد ئەمین بەگی جاف کوڕە گەورەی کەریم بەگ.
٤ ـ حەمەی مەحموودی نادر
٥ ـ قادری مەحموودی نادر
٦ ـ حەمەڕەشیدی حەمەهەسەنی تەرخانی
٧ ـ شێخ حەمیدی شێخ قادری گۆران
٨ ـ حەمەی شاسواری ئەلک
٩ ـ نەجمی حەمەی لاوە

لەو شەڕەیدا چوار شەڕکەری جاف کوژراون:
١ ـ مەجید مایخانی سۆفی وەن
٢ ـ حەمەی عەبدوڵڵای هەسەنی تەرخانی
٣ ـ حەمەقادری یاسین باشکی
٤ ـ ناوی کوژراوی چوارەم نەزانراوە.

لـەو پەلامارەیـدا چەندین شـەڕی بڕبڕ روویداوە لە دێی «سـماق»دا شـەڕێکی کەی گەرم روویداوە دوو کەسی کەی جاف کوژراون بە ناوی:
١ ـ عەلی عەوڵای گوڵی
٢ ـ مەتحەتی ئەحمەدی عەولا

لە رۆژی ١٩٣١/٤/٥ز شەڕ گەیشتە دەڤەری ئاوباریک وە ئەو شەڕە بەو ناوەوە ناسراوە.
سوپاسی کاک جەلالی حەمەی مەحموودی زەرد دەکەم بۆ هاوکارییەکانی.

# ئیبراهیم خانی دەلۆ

مەلا و شێخی سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی مووچە و مەواجیبیان لەلایەن دام و دەستگای سوڵتانی عوسمانییەوە بۆ بڕابوویەوە وە ئەو مووچەخۆرانە بوونە هۆی کوژانەوەی گڕ و بڵێسەی بڕێک راپەڕینی نەتەوایەتی وە لەناوبردنی دەســەڵاتی وەک دەســەڵاتی پاشــا کوێرەی رەواندز و زۆر لە راپەڕینەکانی ناو کوردستانی باکوور، تابووریکیان پێکهێنابوو بە قسەی پڕوپووچی ئومی پەسەندانە سەرناژەنیان دەکرد بۆ سوڵتانی عوسمانی کەوا سوڵتان خەلیفەی ئیسلامە و فەرامێنی فەرمانــی خــودا و پەیامبــەرە و خاوەنی رێبازی پیرۆزی ئیســلامە و ئەوی نافەرمانی ســوڵتانی عوسمانی بکات نافەرمانی خودا و قورئانی کردووە و تەڵاقی دەکەوێ.

وەزعی سیاسی و ئابووری دەوڵەتی عوسمانی کەوتبووە ئاشوفتەبازاڕییەوە چینی رۆشنفکری میللەتانی ژێردەســتەی دەســەڵاتی عوسمانی و خودی رۆشنبیرانی تورکیش کەوتبوونە تەقەڵلا و جووڵانەوە و نارەزایەتی کە زۆر وڵاتانی ژێردەستە و هەتاوەکو شارەکانی ناو خودی تورکیاش بە وردی وەدەرکەوتبوو، ئەنجوومەن و حیزبی ئازادیخوازانە دژ بە دەســەڵاتە بێ ســنوورەکەی سوڵتان کەوتبوونە تەقەڵلاوە، دەوڵەتی عوسمانی لە دونیای ئەو سەردەمەیدا بە (پیاوە نەخۆشەکە) ناودەبرا لە چەند لاوە میللەتانی ژێردەستە لە سوڵتان یاخی بووبوون، شەڕی جیهانی یەکەم وردە وردە گەرم بووبوو ١٩١٤، رۆژ بە رۆژ نیشــانەی لەناوچوونی دەســەڵاتی عوســمانی ئاشــکرا و باشتر وەدەر دەکەوت تابووری پێنجەمی سوڵتانی عوسمانی زۆرتر لە ناو کوردەکەدا لە رێی مەلا و شێخ و بڕێک لە بەگ و ئاغاگەلدا قسەیان دەڕۆیشت و چەواشەکارییان بەگوێرەی بەرنامەیەکی داڕێژراو لە ناو کوردەکەدا کردبووە باو، وە فرسەتیان بە خەڵکەکە نەدەدا تا بە راستی ئاگاداری وەزعی شــەڕ و ئابووری و رووداوە سیاســییەکانی دوور و نزیک بن و لە خەڵک هەڵخەڵەتاندندا سەرکەوتوو بوون.

لەم وڵایەتەدا کە ئەو دەم بەس ولایەتی عوســمانی دەســەڵاتی عوسمانی دەژمێردرا (ولایەتی موســڵ، بەغدا، بەســرە) یەشــتا حکومەتی ئێراق پێک نەهاتبوو بەریتانیا لەو خوارەوەی لەشکری پیــادە کرد و خەڵکەکەش لە رووی ئیســلام گەڕایەوە بێ ئاگا لــە رووداوەکانی جیهان و وەزعی شــەڕی جیهانی و دونیای ئەو ســەردەمە وە بە قەناعەتی (غەزا) کردنەوە وە دیفاع لە خەلیفەی ئیسلام و (نەکا تەڵاقی بکەوێت) چونکە لە مزگەوتەکاندا بڵاویان کردبوویەوە ئەوی لە سوڵتان کە خەلیفەی ئیســلامە دیفاع نەکا ژنەکەی پێ حەرامە و تەڵاقی دەکەوێ، ئەوەبوو زۆر لە ناســراوانی

کورد بە شێخ مەحموودیشەوە لەشکریان کرد و بەرەو ئەو خوارە بوونەوە و کوڕی نازداری ئەم میللەتەیان لە (شـوعەیبە)دا لە رووی دەمارگرژی ئایینییەوە بۆ سـوڵتانی عوسمانی دا بە کوشت ئەم بێ ئاگاییەی لە رووداوەکانی سیاسـی ئەو دەمە تەئسـیری لەسـەر میللەتی کوردەوە یەشتا ماوە کە لە سەدەی بیست و یەکەمداین.

داگیرکردنی ئێراق لە لایەن بەریتانیاوە کە بە لای خەڵکەوە زۆرتر بە لەناوچوون و بێ رێزی لە ئیسلام بووە لە لایەن غەیرە دینەوە ئەگینا لە پێشدا بە درێژایی ٤٠٠ ساڵ وڵات لە لایەن تورکی عوسمانییەوە داگیرکرابوو ئیدی ئەو لەشکرکێشییەی بۆ داگیرکەری عوسمانی بۆ نەکرابوو.

ئەوانـەی لەگـەڵ برایم خانی دەلۆدا بوونە و پەلاماری نزیکترین مەرکەزی دەسـەڵاتیان داوە (کفـری) زۆربـەی زۆریان لە هۆزی جاف بوونە و لە دوو تیـرەی (تەرخانی وە روغزایی)، بەڵام ئەوی حەقایقی ئەو رووداوەیان چەواشـەکاری کردووە (مامۆسـتا موکەڕەم تاڵەبانی وە مستەفا نەریمان) بوون لەبەر دوو هۆی جیاواز:

یەکـەم: د. موکـەڕەم تاڵەبانی لە رووی بۆچوونێکی چینایەتـی دژ بە بەگەکانی جاف دەوری سـەرەکی ئەو دوو تیرەی جافەی وەبەرچاو نەخسـتووە (روغزایی و تەرخانی)وە بە پەلامارێکی چینی ژێردەستەی داوە لە قەڵەم ئەمەش دوورە لە حەقیقەتی رووداوەکەوە.

دووەم: مامۆسـتا نەریمـان لەبـەر ئەوەی دایکی لە عەشـیرەتی دەلۆ بـووە زۆرتر لە رووی دەمارگرژی خزمایەتییەوە ئەو رووداوەی بەرجەستە کردووە وە دەوری ئازایەتی پەلاماردەرانی جافی فەرامۆش کردووە و نەخستۆتە روو..

وەک زانـراوە (ئیبراهیـم خـان) دوای ئەو رووداوە بۆ ماوەی یەک مانـگ لە ناو جافدا بە دە کەس لە خزمانییەوە پارێزراوە وە لە (زەردی ژووروو)دا مێوانداری لێکراوە.

ئـەو هەواڵـە دەگاتە دام و دەسـتگای ئینگلیز وە لەو رووەوە هـەواڵ دەگەیەننە کەریم بەگی جاف وەپێش ئەوەی ئۆردووی تێکەڵاوی ئینگلیز و ئێراق بگاتە (زەرد ئیبراهیم خان) لەوێ دووری دەخەنەوە.

دەوڵەت و دەسەڵاتی ئەو کاتە پارێزی لەوەی کردووە بە دوای بەشدارانی جافی پەلاماردەردا بگەڕێت تەنها (ئیبراهیم خان)یان دەستنیشان کردووە، ئەو پارێزەش لەبەر نەورووژاندنی زۆرتری جافە زۆرەکە بووە و بەس.

بەندە لێرەدا ئەم واقیعەتەم دوور لە دەمارگرژی چینایەتی یان خێڵەکی خسـتە بەر دەسـتی رۆشـنبیران ئومێدەوارم رۆژێک لە رۆژان بە شـێوەیەکی ئەکادیمییانە یەکێک لە دڵسۆزان بیکاتە ریسالەیەک بۆ بەکالۆریۆس یان ماجستێر یا هەر بابەتێکی تر.

# کوردەکان هاتن

دەمارگـرژی لە هـەر کار و کردەوەیەکدا خاوەنەکەی دەگەیەنێتە سـەر سـنووری تیژپەڕی و سـەرئەنجام هەڵە و هەڵەشـەیی، با وەک سیسـتەمی عەشایەری ئەسـاس و بنەماکەی لەسەر ئـەو دەمارگرژییـە بونیات نراوە و پەیڕەویش کراوە، تا بـە ئەمڕۆیش لێرە و لەوێش کەم و زۆر وەدەردەکەوێـت، وەک ئـەو فەرموودەیەی دەڵێت: «**أنصر أخاك ولو كان ظالماً**». یانی پاڵپشـتی لە براکەت بکە با زاڵمیش بووبێ. ئالیەتی بیروڕای خێڵەکی بەو شێوەیە بووە، وەک وتم هێشتا هەر ماویشە، ئومێدەوارم ڕۆژێک لە ڕۆژان بەو ئەندازەی کە باسمان کرد لە کوردستاندا دەمارگرژی بۆ ئەنجامدانی کاری سـەردەمانە و پاراسـتن لە «حەق» و کردار و ڕەفتاری پەسەند و شیاو لە تەواوی کوردستاندا بکرێتە دروشمێکی تێکڕایی بۆ هەمووان یاسا و حەق بەسەر هەمووواندا موو بە موو ئەنجام بدرێت و چاوپۆشی لە ناڕەوایی «سەپانی ماڵی شێخ»یش نەکرێت بە ئومێدی ئەو ڕۆژە.

دەمارگـرژی عارەبەکان لە چەندین سـەرچاوەدا زاڵمانە ڕەگـەزی ئێمەی «جاف» دەگەیەننە سـەر عارەب و کوردیش بۆ سـەر جنۆکە، بەڵام سـەیر لەوەدایە، ئێمەی جاف هەتاوەکو لە ناو کورد و کوردەواریشدا بە «کوردەکان» ناوبراوین و خاوێنترین ڕەگەزی گەلی کورد چ لە ڕەفتار و کردار و زمان و گفتار و شـێوەی ژیاندا یان لە ڕەسـانەیەتی کۆمەڵگای کوردەواریدا.. ئەمەش تەنها لەبەر ئەوە نەبووە، کە هۆزی جاف کۆچەر بوونە، خۆ تاکو ئێسـتاش. بڕێک لە عەشـایەری کورد هێشتا کۆچەرن، عەشیرەتێکی گەورەی وەک «هەرکی» تا چەند ساڵێک لەمەوبەر زۆربەیان کۆچەر بوونە، ئەی بەوان بۆ نەوتراوە کوردەکان؟!.. بەهەر حاڵ ئێمەی جاف و دەڤەرەکانی جاف لە کۆنەوە لە نێوان دوو دەسـەڵاتی زلهێزی سـەردەمدا ژیاوین و ئەو دەسەڵاتە بەهێزانە غەیری کـوردن «سـەفەوی ـ قاجاری» لە لایەکەوە، عوسـمانی لـەولاوە، بەردەوام ئێمـەی جافی کورد خۆمان و دەڤەرەکانمان بە ئاگری ناکۆکی ئەو دوو دەسـەڵاتەوە سـووتاوین، بەتایبەت لە دوای سـەدەی شانزەهەم بەملاوە، ئیدی تەماحگیری ئومەرای «ئەردەڵان»یش سەرباقی، کە پەیوەستە چاویان بڕیوەتە دارایی و توانای هۆزی جاف و بەپاڵپشتی دەسەڵاتی مەرکەزییەوە، سا سەفەوی بووبێت یان قاجاری، لە کوشتن و بڕین و تالانی هۆزی جافدا درێغییان نەکردووە.

لە سـییەکاندا گوزەریانی کەوتووبێتە ناو شـاری سـلێمانی دەیانگوت کـوردەکان هاتن، لەم ڕووەوە «تۆفیق وەهبی» زمانەوانی گەورەی کورد چەندین بابەتی نووسیوە و لەو سەردەمانەیدا وشەی «کوردەکان» هەر بۆ عەشیرەتی جاف دەوترا و بەس..

# داستانی مەولەوی و ڕەعنا خانم

حەمەپاشـــای جاف دەیزانی دەوڵەت و دەسەڵاتی میرنشـــینی بابان لە کۆتاییدایە، کەم و زۆر خـــۆی بـــۆ ئەو ڕۆژە ئامـــادە کردبوو، کە ئـــەو ڕۆژە هاتە دی کەوتە تەقەڵلاوە بۆ دروســـتکردنی ئیمارەتێکی بەربڵاوی کوردی وەتا دەبوو لەگەڵ ســـەرۆک عەشـــیرەکانی کوردی دوور و نزیکدا پەیوەندی پتەوتر دەکرد.

یەکەمین هەنگاوێک نای بۆ پاڵپشتی بەهێزکردنی ئەو بیر و ئەندێشەیە بە چاکی زانی پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ سەرۆک هۆزی «گۆران»دا، «حوسەین خانی گۆران» ببەستێت، بۆ ئەو مەبەستە «خانزاد خانم»ی خوشکی خۆی دا بە حوسەین خانی گۆران و نەنە خانمی خوشکی حەمەخانی مارەکرد، لەو دوو پەیوەندییە «حوسەین خان» لە خانزاد خانم کچێکی بوو بە ناوی ڕەعنا خانم و نەنەخانم منداڵی نەبوو، جوانی «خانزاد خانم»ی خوشکی حەمەپاشای جاف هەموو لاگیربوو، هەتاوەکو شـــاعیران و هۆرەچڕانی دەڤەرەکانی گۆران و زەهاو شـــیعر و بەســـتەی زۆریان پێدا هەڵداوە، وەک:

**خانزاد خانەزاد دەشتی زەهاوەن**
**جوانی مەشهوورەن وە رووی دونیـاوەن**

دیــارە دوژمنانــی یەکگرتنی کورد بــەو تەقەڵلا و نزیکبوونەوەیە نیگــەران بوونە، بە پیلانێک حوســەین خانی گۆران تیرۆر دەکرێت و دوای ماوەیەک بە شــێوەیەکی تر «حەمەپاشای جاف» تیرۆر دەکرێت. بەڵام لەسەر هەمان بیروڕا مەحموود پاشای جاف دەکەوێتە کۆشش و تەقەڵلاوە و «کۆنگرەی زەڵم» دەبەســتێت، کە پیرەمێردی شــاعیر «مونشی» و راوێژکاری ئەو موئتەمەرە بووە و لە دواییدا لە رۆژنامەی «ژین»دا بڵاوی کردۆتەوە.

کە حوسەین خانی گۆران دەکوژرێت، حەمەپاشا، خانزاد خانم و کۆرپەکەی دەگەڕێنێتەوە ناو جــاف، کچــە کۆرپەکەی خانزادخانم «رەعنا» دەدرێتە لای «عەنبــەر خانم»ی خێزانی مەولەوی. رەعنــای کۆرپــە، گەورە دەبێت وەک باوک ســەیری مەولــەوی دەکات. لە جوانــی و خانومانیدا هاوتای کەم بووە.

داوا لــە مەولەوی دەکات دووعای چاوەزاری بۆ بــکات، مەولەویش لە جویەی چاوەزار، ئەم شیعرەی بۆ دەڵێت:

**تۆ پەند و نافکیت جەحەد یوەردەن**
**بینایی خەیاڵ راکەش گوم کەردەن**
**شەفات خەجاڵەت دان وەجام جەم**
**دیدەی بەد دەردش نادیاری بو**
**جەکۆد مەینون تالیت کاری بو...**

ماناکەی ئەمەیە:

تۆ ئەوەندە ناســک و زەریف و جوانیت، ئەگەر چاوێک بە حەســادەتەوە بنوارێتە تۆ، ئەوەندە پڕ لە جوانی و زەرافەتیت، لە تۆدا ئەو چاوە پیســە ئاوێنەئاســا هەڵدەگەڕێتەوە و لە خۆیدا کاری دەبێت...

رەعناخانــم، بە نەخۆشــی گرانەتا دەمرێت.. نەنەخانم کە حەمەپاشــای جــاف تیرور دەکرێت دەگەڕێتەوە بۆ ناو گۆران و لەوێڕا کۆچی دوایی دەکات، تەرمەکەی لە مەزاری باوەیادگاری ناو چیای داڵەهۆدا نێژراوە.



«نەنە خانم» ژنی حەمە پاشای جاف تەرمەکەی لە مەزاری باوەیادگاردا نێژراوە

# مەزارەکانی دەڤەری جوانڕۆ

قردانە ـ سنجاوی
داروسەرە ـ دایار
کانی با ـ سەوزەلاخ
ئیمام حەسەن ـ نورولەی سەروو
دارسپی ـ زالوپ
چەرموسوار ـ نورولەی سەروو
چەوت سوارە ـ کەندوولە
قڵالان ـ قڵالان
پیرمحەمەد ـ وەڵەدبەگی
سەید کائینات ـ وەڵەدبەگی
داربادەم ـ کرە ـ گۆڕستانی وەڵەدبەگییەکان
زودەک سوار ـ دەروێشی
مەلا محەمەد ـ کانی پاشا
شێخ ئەحمەد ـ بناوە چکۆ
هاجەرە خاتوون ـ کڵاوسەر
شێخ رەسوڵ ـ دەوڵەت ئاباد
شێخ مەحموود ـ نم نم
شێخ سەرا ـ کانی کەوە
سوری مەرد ـ کانی باخ
باوەجەیران ـ روانسەر
وەیس قەرەنی ـ ماهیدەشت
فریشتەچەرمو ـ سەرکەوە
قازان قایە ـ شوانکارەی دەوڵەت ئاباد
پیرەشەلە ـ شایگان
گۆڕی سەیدەکان ـ حەسەن ئاباد
خاتوون ئامان ـ هلۆڵ
داری ئەز ـ میرئاباد
خاڵی نازدار ـ هلۆل
سواری برا ـ سواری برا
شیخوڵڵا ـ بازان
شێخ تورکی ـ گاڵۆک زێڕین
خەلیلی باوەشێخ ـ نەهراب
بارگەی حەزرەتی وەیس ـ ملەلۆکە
نەزەرکردنی عەزەم خان ـ نەهرابی شێخ ئەحمەد

شێخ زەینەڵ ـ وەڵەدبەگی
بارگەی بالوول ـ بەهلوولی دانا
داڵەهۆ ـ باوەیادگار ـ زەردەی بان یاران
شێخ عەبدوڵڵا ـ راوێژ
ئیمام ئەبودووجانە ـ راوێژ
شێخ محەمەد غەریب ـ راوێژ
شێخ نەزرانی ـ گورگ شایگان
خاتوون خەیاتە ـ وەڵەدبەگی
سوڵتان شێخ نوردار ـ جوانڕۆ
شێخ ئەحمەد ـ جوانڕۆ
کانی با ـ مامنان
ملەی سەلامگا ـ شوانکارە
خەلیفە قەمەر ـ وەڵەدبەگی
حەوت شەخسە ـ جوانڕۆ
هاجەرەخاتوون ـ جوانڕۆ
قەدو کەریم ـ شاڵیگان
شێخ سیلە ـ شێخ سیلە
مەزاری مەولەوی ـ تاوەگۆز ـ داروەنی مەولەوی
ئیمام حەسەن ـ قەسری شیرین
سواربیلەکی ـ کلەخانی
شێخ ئەحمەد ـ دوالی
ریزە ـ ساراوەن ریز
باوەلارە ـ زیران
شێخ گوڵاڵە ـ گوڵاڵە
داری تیلەکۆ ـ داری تیلەکۆ
برایم سەمین
ئیمام محەمەد ـ باوەسی
شێخ جبریل ـ شێخان
باوە مەحموود ـ بیرونە
شێخ روزین ـ سەرقەڵا
ئیمام عەباس ـ جێگیران
چەرمو نوور ـ باغەکوون
ملە دزگە ـ بۆرەسوار
شاتوتیا ـ قەڵەمەی زەهاو
مەلاقاسم ـ دەڕەژاڵە
ئەزگلە ـ حەوت مەقەد
ئەبداڵان ـ ئەوداڵان
شیرپەڕ ـ دارەڕەش
دارگەنجە ـ بروین
شاویلەلان ـ خانەشور
شێخ رەسووڵی خانەشۆڕ ـ خانەشۆڕ

زەهاو ـ مالکی نەشتەر
سواری بیلەپی ـ باوەجانی
شەخسە پەژارە ـ جوانڕۆ
ملەدز ـ ئەسحابی سەروخوار
حاجی ئیبراهیم ـ قولیجان
کاکەئاشە ـ قەڵای جوانڕۆ
کاکەجانە ـ کوری
حاجی هۆمەر ـ دێ سوور
چەرموسوار ـ عەلی ئاباد
حەزرەتی پیرە ـ سپی بەرگ
عامەخیل ـ نوخان
ملەکەوەڵە ـ بزنەگەورە
شێخ عالەمین ـ گردک
حەسەن کایار ـ چەمی جوانڕۆ
ئەسحاب ـ یوسف خانی
شێخ محیەدینی کۆسە ـ ئایشە دۆڵ
سنگی سوار ـ بیوەن
سوڵتان ئیسحاق ـ لێواری سیروان
نەجاڕ ـ نەجاڕ
ملەگوری ـ سەریاس
زەردوک سوار ـ مەنسوور ئاقایی
باوەنووری ـ شمشێر
گولاڵە ـ باوەجانی
دوانزە ئەسحابی بیلەیی ـ خوێڕی ئاوا
سەوزەپۆش ـ کلاشی باخان
باوەپیرعەلی ـ بیوڵە
پیرپرچن ـ بلەیی
چل یاران ـ کانی حزرانی
مەلا زەیدی ـ موراد ئاباد
شێخ ئەحمەد ـ پشت تەنگی وەڵەدبەگی
خەلیفە حەیدەر ـ بانیگان
مەلا زەیدی ـ موراد ئاباد
پیرمکاییل جاف ـ دودان
مزگەوتی عەبدوڵلا ـ زەردوویی
لاران ـ پیر پرچن
سەریاس: لە سەریاسدا زیاتر لە پەنجا گۆڕی بەکۆمەڵ دەستنیشان کراوە و بە لای خەڵکەوە وەک مەزار وایە، بەڵام لە راستیدا لە کاتی هێرشی سوپای ئیسلامدا لەوێڕا کوردەکان بەرگرییان لەو هێرشە کردووە و کوژراون.
شێخ ئەحمەدی کولیان ـ عەبدالان
شێە ئەلماس ـ شیورینە
زەردک سوار ـ قەیتوول

# نازناوی سەرۆک تیرە و عەشایەری دەڤەری ڕۆژئاوای ئوستانی کرماشان

١- وەکیل: ئەم ناوە تەنها تایبەتمەندی سەرۆکی جوانڕۆیە و کەسێکی تر نەیتوانیوە ئەو ناوە بەکاربێنێت.

٢- سان: لە هەورامانی لهۆندا، ئەو ناوە تایبەتمەندی سەرۆکی تێکڕای لهۆنە و بەس.

٣- خان: لە ناو تیرەی باوەجانی، قوبادیدا، خان تەنیا بۆ سەرۆکە و بەس، بەڵام بەگزادەکان ناوی «بەگ»یان پێ وتراوە.

٤- خان: لە ناو عەشیرەتی سنجاویدا، ڕەئیسی کول و خان بۆ زۆربەی خەوانین زادەکان بەکاردەبەن.

٥- سوڵتان: لەقەبی سەرۆکی گشتی گۆرانە بە حەوت سوڵتانی گۆران، ئەوسا دەستنیشان دەکران چوار لەو حەوت سوڵتانە جاف بوونە و بەقیەی ناسراوەکان یابەخان ناودەبران یانی ئەمین.

٦- خان: بە سەرۆکی گشتی عەشیرەتی کەلهۆڕخان دەوترا، بەڵام بە بنەماڵەکەشی خان دەوترا.

٧- ئەمیر: لە ناو عەشایەری «کولیایی»دا بە سەرۆکی گشتی دەوترا ئەمیر.

٨- ئەمیری کول: یان ئەمیری گشتی، لە ناو عەشیرەتی زەنگەنەدا بەکاردەبرا.

خان: کەمانگەرەکان، بە سەرۆکی خۆیان دەگوت: خان.

خان: زۆربەی عەشایەری ئوستانی کرماشان نازناوی خانیان بۆ گەورەکانیان بەکاردەبرد.

بەگ: بەگزادەکانی وەڵەدبەگی، بە بەگ ناودەبران و سەرۆکی گشتی بەئیل بەگی ناودەبرا.

# بڕێک لە مەزارەکانی ناو دۆڵی قەرەداغ

ئیمام محەمەدی ناوتاوێر
وەسمانی لای بەڵخە
ئیمام هەمزە لە بەڵەکەجار
زەینەڵ عابدینی گوندی گومەنە
ئیمام قادری لای سەی سوێنان
شێخ رەسولی گۆمەنە
دوانزەی برای ئەسیل
ئیمام ئەعزەمی هومەر قەڵا
دار یەعقوبی گوڵان
ئیمام محەمەدی کانی ئاسکان
سەیدی حەق
ئیمام محەمەدی لای باوەخوشین
شیوی قازی
ئەسحابی لای داری زیائین
قازی بەنێ شاخی فەقیرە
خالۆی قازی بەنێ
ئیمام محەمەدی گوندی چاڵگە
ئیمام حەمزەی دێی تەکیە
مستەفا داوانی لای کوڵەجۆ
شێخ سمایلی قەڵاقایمە
خاتوو زێبای دووکانی قەرەداغ

# مەزار و شەخسە پیرۆزەکانی دەڤەری جاف

هەڵەبجە: مەزاری شێخەکانی نەقشبەندی ـ باخەکۆن ـ شێخ بەهائودین ـ شێخ حوسامەدین بیارە ـ شێخ عومەری بیارە ـ نەقشبەندی

تەوێڵە ـ شێخ سوراجەدین، شێخ بەهائودین، شێخ عوسمانی گەورە.
عەبابەیلی ـ مەزاری ئەباعوبەیدە.

شێخ موئمنی سازانی ـ شێخ نەجیبی هانەسوورە

میری سوور ـ باوەزەردەڵە ـ ئەبوشەمامە ـ شێخ سەلام، لە پشتی بیارە ـ باوەناووس لە سەرگەد ـ ئەسحابەدرێژ، لە نزیکی دەرەشیش ـ شێخ مەحموودی تەراتەوە، نزیکی شانەدەری ـ سەیدسادق.

شارەزوور:

مەحموودی سەرواڵە
کامیل حەوت بەیاخ

شێخ عەلی کۆسەی دۆڵ پەمو
شێخ محەمەدی تەراتەوە
شێخ محەمەدی خۆرەتاو ـ دەربەندیخان.

قەرەداغ:

ئەسحاب
قازی بەنی
ئیمام محەمەدی دووکەروی
سۆڵە
شێخ رەسووڵە کەچەڵ
شێخ قادری قەمچی رەش
شێخ رەزا
شێخ حوسەینی چرچەقەڵا
پیری شەوگیل
هەواسەلی روغزایی
شێخ کەریمە سوورەی کەسنەزان

گەرمیان:

خەرقەڕەش
سەید خەلیل
سەی سونە
مامەحاجی
شێخ عەبدولڕەحمان
عوسمان بڕنە
دوانزە ئیمام
باوەشاسوار
برایمی سەمین
شێخ باوە

# داستانی مەحموود پاشای جاف و مستەفاخانی باوەجانی

مەحموود پاشای جاف بە پێچەوانەی باوکیەوە، نێوانی لەگەڵ مستەفاخانی باوەجانیدا «مەسعودلسەڵتەنە» باش نابێت..

سوێند دەخوات کەوا کۆتەرەداری ئاگردان بە کۆڵی مستەفاخاندا بدات. ساڵ دەگوزەرێت، پاشا لەگەڵ خێڵی جافدا دەڕوات بۆ کوێستان، مستەفاخان سوێنەکەی مەحموود پاشای جافی بیستبوو، بڕیار دەدات بڕوات بۆ لای مەحموود پاشا، لەشکرێک رێک دەخا و بەرەو هەوارگەی پاشا دەکەوێتە رێ. کە لە دەوارەکانی خێڵ و هەوارگەی پاشا نزیک دەبێتەوە، بە چەند کەسێک دەڵێت: چەند کۆتەرەدارێکم بۆ کۆبکەنەوە، مستەفاخان پێش ئەوەی بگاتە دەواری مەحمود پاشا لە ئەسپ دادەبەزێت و دەڵێت:

ئەو کۆتەرەدارانە بە شانمدا بدەن.. مستەفاخانی باوەجانی هەڵگری نازناوی «مەسعودلسەڵتەنە» بە کۆتەرەداری سەرشانییەوە دەڕواتە دەواری مەحموود پاشا و روو دەکاتە مەحموود پاشا و دەڵێت:

ئەوا هاتووم تا سوێنەکەت نەکەوێت.

پاشا هەڵدەستێت، باوەشی پیادا دەکات و هیچ نیگەرانی و ناخۆشییەک لە نێوانیاندا نامێنێت.

# پارچە هۆنراوەیەک لەسەر پێستی ئاسک دۆزراوەتەوە

## باسی هێرشی عارەب دەکات بۆ سەر ئێران و کوردستان

**هورمزگان رمان ئانزان کژان**
**ویشان شاردەوە، گەورە گەورەکان**
**زۆر کاری ئارەب کردنە خاپوور**
**گنائی پالە هەتا شارەزوور**
**شەن و کەنیکاوە دیل پشینا**
**مەرد ئازاتلی وەڕووی هەوینا**

واتــە: پەرســتگاکان هەڕووژان، ئاگــرەکان کوژانەوە، گەورەی گەورەکان خۆیان شــاردەوە، ســتەمکاری عــارەب وڵاتیــان لێرەوە وێران کرد تا شــارەزوور، ئەوی ژن و کــچ و دارایی هەیە بە تاڵان بردیان و ئازاکانیشــیان لە نێو خوێنی خۆدا گەوزاندەوە. رەوشــتی زەردەشــت بێ کەس مایەوە، ئاهورامزدایش بەزەیی بە کەسدا نایەتەوە..

لــە پەنجاکانــدا بوو بە باو کەوا ئەو پارچە شــیعرە لەســەر پێســتی ئاســک لە کوردســتاندا دۆزراوەتەوە. لەســەر ئەم پارچە شــیعرە لە نێوان رۆشــنبیرانی ســەردەمی رابوردوودا بوو بە گاڵــە و قاڵەیەکــی بەربڵاو، ســەرەتا بە لای رۆشــنبیرانی فارســەوە باس لەو پارچە شــیعرە کرا و زۆر لــە چاوســاقانی دنیــای مێژووی ئەدەبیاتی فارســییەوە ســەلماندیان و بــۆ پەلاماری ئەو ســەردەمەش گریان.. ســا ئەم پارچە هەڵبەســتە، دەستکرد بێت یان راســتەقینە ئەگەر دەستکرد بێــت ئافەرینی دەوێت، خۆ وەڵاهی دەســتکردێکی جوانە، گەر راســتیش بێت ئــەوا جوانتر ئەوی

لەم ڕووەوە سەرنجی ڕاکێشاوم ئەو سێ بەیتە شیعرە نییە، بەڵکو ململانە هەمیشەییەکەی ناو کوردە و بە تایبەت لە ناو توێژی خوێندەواراندا، ئەو من منمە تا سەر پێشە زیانی گەیاندۆتە تەواوی بوارەکانی بەرژەوەندی گشتی، لە ناو میللەتانی زیندووی دنیادا لە پێناوی سەربەرزی و سەرفرازی هەمووان‌دا یەکێک بۆ هەمووانە و هەمووان بۆ یەکێکە لێهاتووانیان زۆرتر لە کردەوە و توانای ستایش دەکەن و بەرز و بڵندی دەکەنەوە، لە ناو ئێمەی کوردا کارەکە بە پێچەوانەوەیە، تەواوی توانامان بەکاردەبەین، ئەوی بکرێت دەیخەینە گڕ، تا لە ئەندازەی کارو کردەوەیەکی لێهاتوویەکمان کەم بکەینەوە، دەگێڕنەوە، کەوا خەڵکی دەڤەری لیوای «ناصریە»ی خوارووی ئێراق لە شەڕ زیاتر خێری کەسیان ناوێت.. یەکێ: لە خەڵکی ناسریە بڕیاری مەرگی بەسەردا دەدرێت و لە پێش ئەوە یەکێک دەبەن بۆ ئیعدامکردن، لێی دەپرسن ئاخرین ئارەزووت چییە؟ بڵێ با ئەنجامی بدەین.. کابرا دەڵێت: دەمەوێ دایکم ببینم، کابرای خەڵکی ناسریە گوێی لەو دوا ئارەزووە دەبێت، ئینجا نۆرە دێتە سەر کابرای خەڵکی ناسریە و پێی دەڵێن: ئەی دوا ئارەزووی تۆ چییە؟ تا بەرئاوردی کەین... دەڵێت: مەیەڵن ئەو سەگبابە دایکی ببینێت....! دەڵێن: باشە ئەو کابرایە دەناسیت؟

دەڵێت: نەوەڵڵا، بە حەیاتی نەمدیوە، بەڵام با بەو خەفەتەوە سەر بنێتەوە.. ئینشائەڵڵا ئێمەی کورد ناگەینە ئەو ڕادە و پلە ناپەسەندە.. بەڵام ئایا ڕۆژی ئەوە نەهاتووە دوور لە هەوا و هەناسەی (من من و کەسی تر نا) ئەمڕۆیانە بیر لە ئێستا و پاشەڕۆژی میللەتەکەمان بکەینەوە؟

بنواڕە هەر دەربارەی ئەو چوار بەیتە شیعرە، چەند کەس خۆی کردە چاوساق و بە درۆ خستنەوەوە، بڕێک لەبەر ئەوەی خۆی بە قەرزاری عارەب زانیوە، بڕێکی تر نان و نەوا و مەواجیبی بە لای سەردەمدارانی عارەبەوەیە، بڕێکی تر بۆ شکاندن و بێ باییکردنی قەڵەم بە دەستێکی کوردی تر، ئیدی ئەوسا، بەپێی یاسای دەرەبەگایەتی و دەمارگرژی خێڵەکی ئاغاکانی کورد یەکتریان قەبووڵ نەبوو، ئەوڕۆ ئەو ململانە گەوجانە بووەتە ئیرس و پشکی بڕێکی زۆری قەڵەم بەدەستانی ئێستای کورد، تۆ بڵێی ئێمە لە خوو و پیشەی کەڵەبابدا بین؟

ئەگینا کام لۆژیک ئەوەی دەسەلمێنێت نووسەر و ڕۆشنبیرانی کورد ئەوەندە بۆ یەکتر لە سەنگەردا بن؟ ئەوەندە دژ بە لێهاتووانی خۆماڵی لەکاردا بن و ستایشکەری قەڵەم بەدەستانی بیانی بن، بە دڵنیاییەوە دەڵێم ئەو دیاردەیە هانی بیر و ڕای نۆکەر سفەتی دەدا و هێندەی تری ئەم میللەتە مەزلوومە بەرەو هەڵە و هەڵەشەیی و سەرئەنجام بێ باوەڕی بەخۆبوردن دەبا.. بەندە لام وایە بەم نزیکانە.. چوزانم.. ساڵێکی تر، دووی دیکە خوێندەوارانی کورد بەخۆدا دەچنەوە و چەندین ئەنجوومەنی نەتەوایەتی بۆ پاراستن و ڕێزلێگرتنی کەسایەتییە ناسراوەکانی بوارە جۆراوجۆرەکان دەسازێنن ئەگەر خەڵات بکرێن، تەنها بۆ تفەنگ تەقێن نەبێت و تفەنگ و ئار پی جی ئەوڕۆی کورد لێهاتووانی ژیانی سەردەمانەیە، ئەوانەی داهێنەرن، ئەوانەی لێزانن، ئەوانەی ڕێچکەی ژیانی سەردەمانە دەخەنە پێش پای ئەم میللەتە چەوساوە..

دەی ئەگەر لێهاتووانی ئەمڕۆی کورد خەڵات نەکرێن.. با تامولیان هەبێت و هەڵیگرن بۆ ئەو دنیا...!!

# فەرمانڕەوایانی ئەردەڵان لە ناو هۆزی جافدا

محەمەد سادق خانی ئەردەڵان
نەجەف قولی خانی ئەردەڵان
عەلی ئەشرەف خانی باوەجانی
عەلی خانی زەفەرولمولک
سلێمان خانی شەرەفولمولک
حوسەین خانی موزەفەرولسەڵتەنە
عەباس خانی سەردار رەشید

ململانێی نێو دەســەڵاتی ئەردەڵان، بۆ خۆی بووبووە دیاردەیەکی ئاشــکرا و روون، زۆربەی هۆزەکانی ژێر دەســتەیان ســوودیان لەو دووبەرەکی و چەند بەرەکییە بردووە، ئەو شــێوە هەتا وەکو گەیشتبووە نێوان باوک و کوڕیش بۆ نموونە کاتێک محەمەد سادق خانی ئەردەڵان لە لایەن باوکییەوە دەکرێتە فەرمانڕەوای جوانڕۆ و ناوچەکانی جاف، ئەوی موڵک و سەنەوی زەویوزاری ناوچەکان هەیە قەواڵەی بە ناوی خۆیەوە دەنووسێت، کە ئەمانوڵاخانی باوکی دەمرێت (١٢٥٤ک) و خوسرەوخان جێگەی دەگرێتەوە، بەو تۆمەتەوە لە فەرمانڕەوایی لای دەدەن، بەڵام دووبارە لە ساڵی ١٢٤٦ک دا دەکرێتە فەرمانداری جوانڕۆ.. و بە عینوانی ناڕەزایەتی ١٢٥٤ک دژ بە حکومەتی رەزا قولی خانی ئەردەڵان دەکەوێتە تەقەڵڵاوە و بە حکومەتی ئەو رازی نابێت، ســوپا و ســانێک لە چەکدارانی جاف پێکدێنێت و بەرەو سنەی پایتەختی دەسەڵات وەڕێ دەکەوێت و لەبەر ئەوەی ئــەو چەکدارانــە لە دڵەوە (محەمەد ســادق خانیان) خۆش نەویســتووە و بێزاندوویانە، شــەڕیان نەکردووە و خراو لەشکرەکەی حەمەسادق خان دەشکێت و راو دەنرێن..

وەک باســمان کرد نێوانی بنەماڵەی ئەردەڵان بە شێوەیەکی چاوگیر ناکۆک بوونە، هەتاوەکو ئەو ناکۆکییە گەیشتۆتە نێوان باوک و کوڕەوە. شەڕی نێوان ئەمانوڵاخانی ئەردەڵانی باوک لەگەڵ محەمەد حەســەن خانی کوڕ، لــە دێی «ناڕاوی» یەکێکە لە بەناوبانگترین ئەو شــەڕ و ناکۆکییە، کە لەو شــەڕەدا هۆزی جاف لایەنگیری محەمەد حەســەن خانیان کردووە و لەو شەڕەدا محەمەد ســادق خــان کە بە لایەنگیری ئەمانوڵاخانی باوک بەشــداری کردووە، بریندار بووە و لە هەمان شەڕدا حەمەحەسەن خانی ئەردەڵان، دوای بیست و حەوت ساڵ فەرمانڕەوایی بە شێتی لە ساڵی ١٢٤٠ک دا مردووە.

## نەجەف قولی خانی ئەردەڵان

دوای مردنی محەمەد حەسەن خانی ئەردەڵان کوڕەکەی جێگەی گرتەوە، ئەو کوڕە زۆر ئازا بووە. بە لای محەمەد شـای قاجارەوە زۆر ڕێزی لێگیراوە و لە شـەڕی گرتنی هیراندا بەشداری کردووە ١٢٥٤ک.

ئەم حاکمەش نەیتوانیوە جاف رازی بکا، لە هەمان کاتدا وەک بنەماڵەکەی لە زۆر و زەوت و تاڵانی ئەملاکی جافدا قسـووری نەکردووە و بە فەرمانی ناسـرودین شا بووە بە نائیب حکومەتی کوردسـتان، ئـەوی تـاڵان و بـڕۆی کردبوو لەو مەقامەیدا سـەرفی کردووە و بە دەسـتی خاڵی ڕۆیشتووە بۆ تاران لەویَ لە کاریان خستووە و کوڕی محەمەد سادق خان جێگەی گرتۆتەوە بۆ ماوەیەکی کورت.

## عەلی ئەکبەر خانی ئەردەڵان

دوای محەمـەدی ڕەزاخـان حکومەتی هۆزەکانی جافیان سـپاردۆتە عەلـی ئەکبەر خان، کە یەکێـک بـووە لە بەهێزترین ئومـەرای ئەردەڵان و تا توانیویە لە جاف و هەورامییان کوشـتووە. سـەرەتا بەگزادەکانی جوانڕۆی لە خۆیەوە نزیک کردووەتەوە، دوای لەناوبردنی محەمەد سەعید سـوڵتانی هەورامی ١٢٨٦ک. تیرەی باوەجانی بە سـەرۆکایەتی حەبیبوڵلاخان و ڕۆسـتەم بەگی وەلەدبەگـی پەلامـاری قەڵاکـەی دەدەن و لـە ئاکامدا ڕۆسـتەم بەگی وەڵەدبەگـی دەکوژرێت و حەبیبوڵلاخانی باوەجانی لە دژایەتیدا بەردەوام دەبێت، سـەرئەنجام حەبیبوڵلاخان دەبێتە حاکمی جوانڕۆ (١٣٠٣ک). ئەمە بە یەکەمین سـەرکەوتنی جاف دەژمێردرێت، دژ بە دەسەڵاتی ئەردەڵانی بە پشتیوانی قاجارییەی دەسەڵاتدار.

## عەلی خان ئەردەڵان

عەلـی خـان «زەفەرولمولک» کوڕی عەلی ئەکبەر خانی ئەردەڵان بووە، دوای مردنی «ئیمام قولی میرزا» عیمادولدەولە. ئەوەبوو سـوڵتانەموراد میرزای ناسراو بە «حوسامولسەڵتەنە» بوو بە فەرمانڕەوای کرماشان ١٢٩٣ک، ئەم عەلی خانە کرایە حاکمی جوانڕۆ، بەڵام هۆزی جاف بەو هاتنە ناڕازی بوون، هەرا دەستی پێکرد، بڕیار درا «شەرەفولمولک» بۆ جوانڕۆ بڕوات. ئەو بەو ناردنە، ناڕازی بوو، بەڵام ناردیان، دوو ساڵی ڕەبەق مۆڵەتی پێ نەدرا بۆ کرماشان بگەڕێتەوە.

لـەو کاتانـەدا، حەبیبوڵلاخـان باوەجانـی، بـە فەرمان کرایە سـەرۆکی هۆزەکانـی جاف، تا ڕادەیەک ئەردەڵانییەکان دەخالەتیان لە ئومووری هۆزی جافدا نەدەکرد و تیرەکانی جاف و هۆزی جـاف لـەم قۆناغەدا توانا و دەسـەڵاتی زۆری خۆیان هەبـووە و زۆر نەدەچوونە ژێر فەرمانێی ئەردەڵانییەکانەوە.

لەم دواییانەدا زۆر رووداو روویانداوە:

١ ـ شەڕی یەکەمی جیهانی و شەڕکردن دژی رووس.
٢ ـ شەڕی یەکەمی نێوان تیرەی مەنمی و جاف و گەڵباخی

## سەردەمی شەریفولدەولە:

١ ـ شەڕی دووهەمی نێوان مەنمی و گەڵباخی
٢ ـ دەستگیرکردنی سەردار رەشید و هەناردنی بۆ تاران
٣ ـ سەیفولدەولە دەبێتە فەرمانداری جوانڕۆ

## کودەتای ١٢٩٩ک:

سەردار رەشید لە لایەن سەید زیائودینەوە ئازاد دەکرێت
١ ـ دژ بە سەردار سوپای رەزا شا دەکەوێتە تەقەڵڵاوە.
٢ ـ شەڕی هەورامان
٣ ـ سوپای ئێران بەرەو کوردستانی رۆژهەڵات دێت
٤ ـ رەوانسەر دەگیرێت
٥ ـ عەشایەر دژ بە سەردار رەشید هەڵدەستن
٧ ـ گەڕانەوەی سەردار رەشید بۆ ناو ئێران.
٨ ـ کۆمەڵەی عەشایەر و شەڕی گریش خانی.

## کوژرانی قادربەگ:

لە سەرەتای زستان و دوا دوایی پایز، کۆچی تیرەکانی جاف بە دوای یەکدا کوێستان بەجێ دەهێڵن و بەرەو گەرمیان سەربەرەو خوار دەبوونەوە. دوو تیرەی جاف (سەیانی و بەیاخی) لە ئێراندا دەمانەوە.

# ژنانی شاعیری ناوچەکانی جوانڕۆ

ئــەم ناوانــە بەندە لە مەلا محیەدین ســاڵحی و کاک فەتحوڵڵای ئەمینــی وەرمگرتوون، ئەگەر ناوی خانمگەلێکی تری شاعیری تیادا نییە لە نەزانینمەوەیە و داوای لێبوردن دەکەم:

١ ـ لەیلای غەفووری
٢ ـ شەمسەی موورادیان.
٣ ـ بەیانی پژوتەن.
٤ ـ شلێری نادری
٥ ـ فەرزانەی نادری
٦ ـ ئارەزووی ئیمامی
٧ ـ عایشەی میرانی
٨ ـ لەیلای میرزایی
٩ ـ سەحەری موورادی
١٠ ـ فەراسەتی کەریمی
١١ ـ پەروینی شێخزادی
١٢ ـ گەلاوێژی گردپور
١٣ ـ شەوبۆی حوسەینی
١٤ ـ سەرشینی موریدی
١٥ ـ فریشتەی رەحمانی
١٦ ـ رووناکی محەمەدی

وادیارە، ئەم خانمگەلە شاعیرانە تازە پایان خستۆتە دنیای شیعر و شاعیرییەوە، بەندە لێرەوە دوعای سەرکەوتنیان بۆ دەکەم.

# حەمەپاشای جاف بۆ قەڵای شێروانەی دروستکرد؟

بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان، یەکێک لە دیاردەکانی دەسەڵات قەڵا و ساختمان و شوورەی دەورەی شار و شارسازی بووە...

جگە لە هۆزە سەرەتاییەکان، یان ئەوانەی کۆچەر بوونە و دەوارنشین بوونە، وەک هۆزی ئاتیلا و مەغۆل و تاتار، کە لە دواییدا بوونەتە خاوەن دەسەڵات و سەرئەنجام شارنشین، لەم رووەوە بەندە کتاوچەیەکم نووسیوە، بە ناوی ((قەڵای شێروانە)) کە تێیدا کورتەی مێژووی میعماری و چۆنیەتی قەڵاسازی و هەروەها چۆنیەتی دروستکردنی خودی قەڵای شێروانەم تیادا هەلاجی کردووە، لێرەدا ئەو باسە دووبارە ناکەمەوە، بەڵام بەگوێرەی وتەی باو و باپیرانمان کە گێڕاویانەتەوە، پانتایی بیر و رای حەمەپاشای جاف لە سنووری تیرەکانی هۆزی جاف بەدەر چووبوو، وەکو دەسەڵاتدارێکی سەرخێڵ و دەستڕۆیشتووی عەشایەری فکری نەدەکردەوە – ئاگاداری بەرەو ململانێی سیاسی و نێو دوو دەسەڵاتی قاجاری و عوسمانی بوو.

لە هەردوولا دۆستان و پاڵپشتی لێ دەکرا و دۆست و دوژمنی خۆی دەناسی و دەیزانی هێزی دەوڵەت بەلای چ لایەنێک و کام بەرە سەرەو لێژ دەبێتەوە، کام گرووپ بەرەو پۆپەکە دەڕوا، لە سەر ئەو بنەما و لێکدانەوەی پڕ لە وردەکارییەوە هەنگاوی دەنا و پەیوەندییەکانی پتەوتر دەکرد... یان دەیپچڕاندن لە خوالێخۆشبوو باوکم (حەمەسەعید جاف)م بیستووە دەیگوت: (حەمەپاشای باپیرم، ئەگەر بەو پیلانە نەکوژرایە، جێگەی ئیمارەتی بابانی دەگرتەوە، بۆ ئەو مەبەستەش کۆشاوە و ئامادەگی ئەنجام داوە...)

وەک ئاشکرایە تیرەکانی جاف بە سەرۆکەکەشیانەوە رەوەند بوونە لە گەرمیان و کوێستان بوونە وەک گەڕیدە کلودیوس ریچ لە گەشتەکەیدا بۆ ناو کوردستان لە کتاوەکەیدا دەڵێت: (کەیخوسرەو بەگی جاف دەعوەتی لێکردووم بۆ ناو هۆزەکەی لەو رۆیشتنەیدا بۆ ناو هۆزی جاف و هەوارگەی کەیخوسرەو بەگی جاف باسی لە خەیمەگای کەیخوسرەو بەگ دەکا، کە چەند رازاوە و پۆشتە و بە تفاق بووە «تکایە رۆمانی پاشایان کوشت»ی خوسرەو جاف بخوێننەوە....)

ئەگەرچی ژیانی حەمەپاشا، زۆرتر هەر لە دەوار و گەرمیان و کوێستاندا گوزەراوە و لە هۆزەکەی دوور نەکەوتۆتەوە، بەڵام بۆ ئەنجامدانی بیر و راکانی کەوتووەتە تەقەڵڵاوە.

هۆزی جاف لە زستاندا، لە شێروانە دادەبەزین و لە دەشتی شێروانە و شاکەلدا دوور و نزیک خێڵەکانی جاف هەوارگەکانیان دەستنیشـانکرا بووە لە کەریم بەگی جاف کە بۆ خۆی سـەرۆکی رەسمی هۆزی جاف بووە بیستراوە کە وتوویەتی:

((تا چاو بڕی کردووە رەشماڵی جاف بە دەوری قەڵای شێروانەدا بووە... بێ شک یەکێک لە دیاردەکانی دەسەڵات و حوکمڕانی سیستەمی قەڵاداری بووە بۆ ئەو مەبەستە حەمەپاشا کۆشاوە و نامەی ناردووە بۆ لای والی لوڕسـتان، تا وەسـتایەکی باشـی بۆ بنێرێت لە ماوەی سێ ساڵدا قەڵای شێروانەی دروست کردووە.

حەمەپاشا، لە رووی بەراوردی خۆیەوە، هەروەها زانیاری دۆستان و برادەرانی نێو دەسەڵاتی عوسـمانی زانیویـە کـە ئیمارەتی بابان بـەرەو تیاچـوون دەڕوا و نامێنێت، بۆ ئەو مەبەسـتەش پێکهێنانی دەسـەڵاتی بەربڵاوتر پەیوەندی پتەوی لەگەڵ سەرۆک هۆزەکاندا پەیدا کردووە، لەگەڵ ئەمیری گۆراندا بووە بە ژن و ژنخواز، خوشکی خۆی داوە بە ئەمیری گۆران و کچەکەی هێناوە، بە ناوی (نەنەخانم).

ئەو نەنەخانمە، بە سـەفەر دەگەڕێتەوە ناو هۆزەکەی و نەخۆش دەکەوێت، لەسـەرە مەرگدا دەڵێـت: ئەو هەموو سـاڵە ژنی حەمەپاشـا بوومە نوێژ و رۆژیشـم بە زاهیر کـردووە بەڵام هەر لەسەر ئایینی خۆم مامەتەوە و لە مەزاری باوەیادگاردا دەینێژن..

دوای دوو سـاڵ لە مردنی (نەنەخانم) خوشـکەکەی حەمەپاشاش دەمرێت، دوو منداڵی بووە و حەمەپاشـا دەنێرێـت ئـەو دوو منداڵە دەدزن و دەیانهێنن بۆ ناو جاف، زۆر ناکێشـێ ئەو دوو منداڵەش دەمرن..

گوایە ئەو خوشـکی حەمەپاشـای جافە، گەلێک جوان و نازدار بووە، هۆرەیان پیادا چڕیوە و گۆرانییان پیادا هەڵداوە. ناوی (خانزاد) بووە، وەک ئەم بەیتە کە دەڵێت:

**خانزاد خانەزاد دەشتی زەهـاوەن**<br>**ناوی مەشهوورەن بە رووی دنیـاوەن**

# سەرچاوەکان


## سەرچاوە عەرەبییەکان:

١- وليام اغلتون، القبائل الكردية، ترجمة احمد محمود خليل، اربيل، موكرياني، ٢٠٠٦، ص ٩٩-١٠٠.
٢- الاستخبارات البريطانية، العشار الكردية، ترجمة فؤاد حمه خورشيد، بغداد، ١٩٧٩، ص ٧٦-٨٨. مطبعة الحوادث،
٣- د.عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث، القاهرة، دار الكتاب العزلي، ١٩٦٨، ص ١٢٠-١٢٤.
٤- عباس العزاوي، تاريخ العراق بين إحتلالين، ج ٨، بغداد، ١٩٥٦، ص ١٩، ٢١، ٣٩.
٥- عبدالرحمن السويدي، حديقة الزوراء، تحقيق د.عماد عبدالسلام رؤوف، المجمع العلمي، بغداد، ٢٠٠٢، ص ١٤٤.
٦- د.عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، مطبعة وزراة الثقافة، ٢٠٠٨، ص ٢٤٧-٢٤٩.
٧- د.زرار صديق توفيق، القبائل والزعامات القبلية الكردية في العصر الوسيط، اربيل، موكرياني، ٢٠٠٨، ص٥١.
٨- عثمان بن سند الوائلي البصري، مطالع السعود بطيب اخبار الوالي داود، تحقيق د.عماد عبدالسلام رؤوف، بيروت، الدار العربية، ٢٠١٠، ص ٤٧٧.
٩- آواز محمد علي عبدالكريم، الكورد الجاوانيون/ دورهم السياسي والحضاري في العصر العباسي ٣٩٢-٦٥٦ هـ ، رسالة ماجستير غير مطبوعة، جامعة دهوك ٢٠٠٣، ص١٤٨.
١٠- عباس العزاوي، العشائر الكردية، بغداد، مواضع عديدة.
١١- اعلام الكرد العراق، جمال بابان.
١٢- اعلام السياسة في العراق الحديث- مير بصير.
١٣- تاريخ السليمانية، محمد أمين زكي بك.
١٤- السليمانية في نواحيها المختلفة، جمال بابان.
١٥- جاوان قبيلة الكرد المنسية، د.مصطفى جواد.

## سەرچاوە فارسییەکان:

1. مجموعه جغرافیای تاریخی و تاریخ مفصل كرماشاهان، د.محمد علی سولتانی.
2. تذكره حدیقه سلطانی، د. محمد علی سولتانی.
3. تاریخ جاف، د. محمد علی سولتانی، د. حسن جاف.
4. خاطرات سلطانی، محمد طاهر سلطانی.
5. سفرنامه ریچ، 1820.
6. شاعران كورد، سید عبدالحمید حیرت نجات.
7. شرفنامه میر شرفخان بدلیسی.
8. تاریخ مشاهیر الاكراد، بابا مردوخ.
9. قمهای كهنی در قفقاس و ماوراء قفقاس وبین نهرین، رقیه بهزادی.
10. جلوهای تصوف وعیرفان در ایران و جهان عطائولای تدین

## سەرچاوە کوردییەکان:

1. مێژووی کورد و کوردستان، ئەمین زەکی بەگ.
2. تاریخی جاف، کەریم بەگی جاف.
3. رشتەی مرواری، عەلائەدین سجادی.
4. گێڕانەوە و بیروەرییەکان.

# پێڕست

# خوسرەو جاف

- لە شەوی ١٩٤٥/٣/٢١ لە دێی کەلار هاتووەتە دونیاوە.
- ماجستێری لە میعماریدا هەیە و خاوەنی پەنجەمۆری خۆیەتی لە دونیای میعماریدا.
- تا ئێستا چەندین خەلاتی میعماری و ئەدەبی وەرگرتووە.
- گەورەترین خەلاتی رۆشنبیری ئێراقی پێ بەخشراوە بە ناوی قەڵغانی جەواهیری (درع جواهري) تا ئێستا بە کەس نەدراوە.
- تا ئێستا پەنجا و حەوت کیتاوی جۆراوجۆری کەوتووەتە کتاوخانەی کوردییەوە.
- دائیرەتولمەعارف «زانیاری و هونەر»ی بە کوردی نووسیوە، بیست و سێ بەرگە، هەشت بەرگی چاپ کراوە و ئەوانی دیکەشی لەژێر چاپدان.